## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوردی



### بەشی فارسی



### بەشی عەرەبی - القسم العربي



### بەشی ئینگلیزی

## ڕێنمایی بڵاوکردنەوە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

- گۆڤـاری ئـەکادیمیای کـوردی، گۆڤـارێکی زانسـتی وەرزییـە، بـاس و توێژینـەوەی زانستی تایبەت بە مەسەلەکانی کـورد و کوردسـتان بـڵاو دەکاتـەوە، بەمـەرجێك لـە هیچ شوێنێکی دیکە بڵاو نەکرابێتەوە یاخود بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.
- زمانی بڵاوکردنەوەی باس و توێژینەوەکان لە گۆڤارەکەدا کوردی و عەرەبییـە، ئـەو باس و بابەتانەش کەوا سەروکاریان لەگەڵ مەسەلەکانی کورد و کوردستان هـەبێت، ئەگەر بە زمانی دیکەش بن، بڵاودەکرێنەوە.
- پێویستە توێژەر لە لاپەڕەی یەکەمی توێژینەوەکەیدا، ناونیشـانی باسـەکەی، نـاو و ناسناوی زانستی، شوێنی کارەکەی، ئیمێڵ و ژمارەی تەلەفۆنی خۆی بنووسێت.
- لــە هەڵبــژاردنی ناونیشــان و نووســینەوەی توێژینەوەکانــدا، پێویســتە ڕەچــاوی بنــەماکانی میتــودی زانســتی بکرێــت. لەمەســەلەکانی پەیوەســت بــە ڕێکخســتنی سەرچاوە و چۆنیەتی سوودوەرگرتن لێیان، وەکو چۆن پێویستە نووسـینی بـاس و بابەتــەکان بــە زمـانێکی زانسـتی شـیاو بێـت، بـە پێچـەوانەوە هـەر توێژینەوەیـەك پێڕەوی لەم بنەمایانە نەکات لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە وەلادەندرێت.
- پێویسـتە توێـژەر پوختـەی توێژینەوەکـەی بـە دوو زمـانی دیکـە، جگـە لـە زمـانی نووسـینی دەقەکـەی لـە کۆتـایی توێژینەوەکەیـدا بنووسـێت، بەمـەرجێك لـە یـەك لاپــەڕەی A4 زیـاتر نـەبێت و تیایـدا گرینگـی باسـەکە و ئەنجامـە سـەرەکییەکانی توێژینەوەکەی بخاتە ڕوو.
- هـــەر بـــاس و بابـــەتێك لـــەبارەی ســـاغکردنەوەی (پەیـــدۆزی، تحقیـــق) ی دەستنووســەکانەوە بێـت. پێویسـتە پەیدۆزییەکـە بـە گـوێرەی بنـەما زانسـتییە کارپێکراوەکانی ئەو بوارە ئەنجام بدرێت. هەروەها چەند لاپەڕەیـەکی کۆپیکراو و، زانیاری تەواو سەبارەت بە دەستنووسەکە و شوێنی هەڵگرتنی بخرێتە ڕوو.
- دەبــێ بــاس و بابەتــەکان بــەجۆری فــۆنتی یونیکـورد بنووسـرێن. لەمەســەلەی بــەکارهێنان و ڕێکخســتنی سەرچـاوەکان پێـڕەوی لـە شـێوازی هارفـارد بکرێـت. ناونیشـانی بـاس و توێژینـەوەکان بـە فـۆنتی قـەبارە (١٥) بێـت، نـاوی توێـژەر و توێژەران لەگەڵ ناونیشانە لاوەکییەکان بە فۆنتی (١٤) و دەقی باسەکەش بە فۆنتی (١٣) بێت.

- لەکاتی سوود وەرگرتن لەو باس و بابەتانەی کە لە گۆڤارەکاندا بلاوکراونەتەوە، بەم شێوەیە ئاماژە بە سەرچاوەکەی دەکرێت: ناسناو و ناوی نووسەر، ڕێکەوتنی دەرچوون، ناونیشانی باسەکە، ناوی گۆڤارەکە (لەنێوان دوو کەوانەدا)، ژمارەکەی، شوێنی دەرچوون.
- هەموو باس و بابەتێك بە (٣) دانەی سەرکاغەز و دانەیەکی سەر (CD) پێشکەش دەکرێت، بەمەرجێك ژمارەی لاپەڕەکانی، بە هەموو وێنە و خشتە و سەرچاوەکانەوە لە (٢٥) لاپەڕە تێپەڕنەکات.
- دوا بەدوای پەسەندکردنی هەر توێژینەوەیەك لەلایەن هەڵسەنگێنەرانی پسپۆڕەوە، توێژەر دانەیەك لە نووسراوی پەسەندکردنی توێژینەوەکەی لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە پێدەدرێت. لەدوای ئەوە توێژەر بۆی نییە باسەکەی پێشکەش بە هیچ لایەنێکی دیکە بکات، بە بێ نووسراوێکی ڕەزامەندی لە لایەن سەرنووسەری گۆڤارەکەوە.
- دەستەی نووسەران ئەو مافەی دەبێت کەوا هەندێك برگەو دەستەواژەی توێژینەوەیەك لابدات، یا بگۆڕێت و دووبارە دایبڕێژێتەوە تاوەکو لەگەڵ ڕێنماییەکانی بلاوکردنەوە لە گۆڤارەکە دا بگونجێت.
- چۆنیەتی ڕیزکردنی باس و بابەتەکان پەیوەندی بە ڕێبازی بابەتبەندی گۆڤارەکەوە هەیە نەوەکو بابەت و بایەخی توێژینەوەکان، یاخود پلەو پایەی زانستی توێژەرەوە.
- گۆڤاری ئەکادیمیا ئەو باس و توێژینەوانەی کەوا لە نامەکانی ماستەر و دکتۆرا وەردەگیرێن، واتە (مستل) ن، بلاوناکاتەوە.
- هەرباس و بابەتێك کە ڕەزامەندی لەسەر بلاوکردنەوەی نادرێت، بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێندرێتەوە.

# ڕەنگدانەوەی سەبکی هیندی(*) لە شیعری سالمی ساحێبقڕاندا

**پ. د. عوسمان دەشتی**
ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی
زانکۆی کۆیە/ فاکەڵتی پەروەردە
بەشی زمانی کوردی

**پێشەکی**

(سالمی ساحێبقڕان) بە یەکێک لە پێشەنگەکانی شیعری کلاسیکی کوردی (قوتابخانەی بابان) دەناسرێت، شارەزایی تەواوی لە زمانەکانی ڕۆژهەڵات لە وێنەی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکیدا هەبووە، بەتایبەتیش زمانی فارسی. کاریگەربوونی بە زمان و فەرهەنگ و ئەدەبیاتی فارسی زۆر بەڕوونی بە شیعر و بەرهەمەکانییەوە دیارە شەیدای شاعیرانی فارسی زمان لە وێنەی (حافز و سائیب و کەلیمی کاشانی) بووە و زۆر جار لە شیعرەکانیدا ناوی بردوون. لە دیوانەکەیدا ژمارەیەکی بەرچاو لە شیعری مولەمەع و تێهەڵکێشی کوردی و فارسی هەیە. لە ڕووی زمان و شێواز و سەبکی شیعرییەوە پێڕەوی لە (سەبکی هیندی) کردووە و تاروپۆی بەشێک لە غەزەل و قەسیدەکانی بەم جۆرە سەبکە تەندراوە. ئەم باسە هەوڵێکە بۆ بەدیارخستن و تیشک خستنە سەر ئەو لایەنە ئەدەبی و هونەرییەی شیعرەکانی سالم لەبەر ڕۆشنایی شاعیرانی فارسی زمانی سەبکی هیندیدا.

**تەوەری یەکەم:**

**أ- کورتەیەکی ژیننامەی سالمی ساحێبقڕان:** (سالم) ناوی عەبدوڕەحمان بەگی کوڕی محەمەد بەگی کوڕی ئەحمەد بەگی ساحێبقڕانە، زێدگای بنەڕەتی بنەماڵەکەیان لە ناوچەی (سنە) و (ئەردەڵان)دا بووە، ئەحمەد بەگی ساحێبقڕان کە باپیرە گەورەی ساحێبقڕانەکانی سلێمانییە و لەویێ بە (ئەحمەد بەگی گەورە) دەناسرێت، لە ڕۆژگاری حوکمداری (خالید پاشای بابان)دا (لەنێوان ١٧٤٧ تاوەکو ١٧٦٣ی زایینی حوکمڕانی کردووە) لەسەر خواستی ئەو، لەگەڵ بەشێک لە بنەماڵەکەیان دەگوێزنەوە بۆ پایتەختی (میرایەتی بابان)، کە ئەوسا لە (قەلاچوالان) بووە. ((ئەمین، ١٩٩٨: ١٨٧)).

ئەحمەد بەگی گەورە دوو کوڕی بوون:

١. مەحمود بەگ، کە باوکی مستەفا بەگی (کوردی)یە.

٢. محەمەد بەگ، کە بە (قەرە جەهەننەمی) ناسراوە و باوکی (سالم) بووە. دوا بەدوای بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوەی شاری سلێمانی (١٧٨٤ز)، وەکو پایتەختی تازەی میرایەتی، خانەوادەی ئەحمەد بەگیش، کە بەشێک بوون لە دەسەڵاتی میرایەتی و ئەو خۆیشی سوپاسالاری میرنشینەکە بووە لە قەلاچوالان، هاوڕێ لەگەڵ بابانەکاندا دەگوازنەوە بۆ سلێمانی و دەبن بە دانیشتووی شاری تازە. لەوێ (مەحمود بەگ) لە شوێنی باوکی کاروباری سەربازی و سوپایی میرایەتی پێ دەسپێردرێ و دەبێت بە وەزیری جەنگی بابانەکان. لە دەستنیشانکردنی ساڵی هاتنە دنیای (سالم)، جیاوازی لەنێوان لێکۆڵەرانی کورد (ئەمین زەکی بەگ، ڕەفیق حیلمی، مامۆستا سەجادی و مارف خەزنەدار،...)دا هەیە، بەڵام هەموو لە سەر ئەوە کۆکن کەوا لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیا و، لەوێ خوێندوویەتی و پێگەیشتووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە، ((خەزنەدار، ٢٠٠٣: ١١٧)).

سالم هاوڕێ و هاوسەردەمی ڕابەرەکانی دیکەی بزووتنەوەی شیعری بابان؛ (نالی، نەفعی، کوردی، مەلا وەسمان) بووە، ئاڵوگۆڕی

نامە و نامەی شیعری لەنێوانیاندا هەبووە. (سالم) لە ڕۆژگاری خۆیدا وەکو کەسایەتی و کەڵە خوێندەوار و شاعیر و ڕووناکبیرێکی هەڵکەوتە بەدیارکەوتووە. لە پارچەیەکی چەند بەیتیدا سەر ڕشتەی سوارچاکان و هونەرمەندانی شیعری کوردی (دەوری بابان)ی بۆ تۆمار کردووین:

**لە ڕۆژی ئیمتیحانا دیم بەرابەر ڕوئیەتی مەعشووق**
**کەمەربەستەی هونەر هاتن لە تیپی عیشقبازانا**
**لە یەک لا (نالی و مەشوی) لەلایێ (سالم و کوردی)**
**لە هەنگامەی هونەرگەرمی تکاجۆبوون لە (مەولانا)**
**لە مەیدانی بەلاغەتدا بەسواری مەرکەبی مەزموون**
**بە کوردی هەریەکە تازی سوارێ بوون لە بابانا**

(سالم) لەنێو شاعیرانی کوردا (نالی و مەولانا خالیدی شارەزووری) بە مامۆستای خۆی زانیوە و بەندی پێنج خشتەکی لەسەر شیعری ئەواندا هۆنیوەتەوە.

لەگەڵ ئەوەی کتێبخانەی کوردی تاوەکو ئەمڕۆ خاوەنی دیوانێکی تەواو و پوخت و زانستیی شاعیر نییە، بەڵام چاوگێڕانێکی خێرا بە ڕەشنووسی ئەو دیوانەی لەبەر دەستی ئێمەدایە و (ساڵانێکە بنەماڵەی زانیارانی کورد: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕەکانی خەریکی بوون و ئێستا لە سەروبەندی تەواوبووندایە و، لە ڕێگەی مامۆستا سدیق ساڵحی، کارگێڕی بنکەی – ژین – لە سلێمانی، کۆپییەکی وەدەست ئێمە کەوتووە)[**]، چەند ئامارو ئاماژەیەکمان بۆ پشتڕاست دەکاتەوە بەم جۆرە:

**ئاماری کۆی شیعرەکانی دیوانی سالم**

| پیته سەروا | غەزەل | | قەسیدە | | پارچەی مولەمەع | | پارچەی داشۆرین | | شیعری موناجات | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | پارچە | دێڕ | پارچە | دێڕ | پارچە | دێڕ | پارچە | دێڕ | پارچە | دێڕ |
| ا | ٣٨ | ٢٨٠ | ٣ | ٧٨ | ١ | ٨ | ٤ | ٨٢ | – | – |
| ب | ٥ | ٣٨ | – | – | ١ | ٧ | ١ | ٨ | – | – |
| ت | ٢٢ | ١٦٤ | – | – | ٢ | ١٨ | ٣ | ٥١ | – | – |
| ث ج ح خ د ذ | ١٠ | ٧٣ | – | – | ٢ | ٢٠ | – | – | – | – |
| ر ز | ٢٥ | ١٨٧ | ١ | ٣٧ | ٤ | ٣٣ | ٤ | ٤٣ | ١ | ١٠ |
| س ش ص ض ط ظ | ٩ | ٥٢ | – | – | ٣ | ٢٢ | – | – | – | – |
| ع غ ف ق ک ط ل | ١٢ | ٨٢ | – | – | ١ | ٧ | ١ | ٨ | – | – |
| م | ٢٤ | ١٧٤ | – | – | ٢ | ١٦ | ١ | ١٢ | ١ | ٨ |
| ن | ٢٤ | ١٧١ | ٤ | ٢٣٧ | ١ | ١٢ | – | – | – | – |
| و وو | ٤١ | ٢٨٦ | – | – | ١ | ٩ | ٣ | ٤٣ | ١ | ٦ |
| ی | ١٨ | ١٢٨ | ٢ | ٤٤ | ٢ | ١٩ | – | – | – | – |
| ێ | ٣١ | ٢٢١ | – | – | ٤ | ٢٨ | ١ | ١٢ | – | – |
| هـ | ٥٤ | ٣٨٧ | ١ | ٤١ | ١ | ٩ | ٣ | ٣٣ | ١ | ١٧ |
| کۆ | ٣١٣ | ٢٢٤٣ | ١١ | ٤٧٣ | ٢٥ | ١٨٩ | ٢١ | ٢٩٢ | ٤ | ٤١ |

٣٧٤ تێکستی شیعری = ٣٢٣٨ دێڕە شیعر + ٢ تاک = ٣٢٤٠ دێڕ

لەبەر ڕۆشنایی ئەم داتا و ئامارانە دەتوانین بڵێین:

– سالم شاعیر و شاسواری غەزەلخوێن و غەزەلنووسی یەکەمینە لە شیعری کلاسیکی کوردیدا.

– لە قەسیدەسەراییدا خاوەنی چەندین چامە و قەسیدەی مێژوویی و داستانی و قارەمانێتییە، کە کەم وایە شاعیرانی کورد لەم مەیدانەشدا شان لە شانی بدەن، سەرباری چەندین پارچەی پێنج خشتەکی و تێهەڵکێش.

- خاوەنی زۆرترین پارچەی شیعری مولەمەعاتە، بەتایبەتیش مولەمەعاتی (کوردی – فارسی).

**ب- دانوستانی کولتووری – سالم و فەرهەنگ و ئەدەبی ئێرانی:**

لە سۆنگەی هۆکارگەلێکی مێژوویی و سیاسی، لە ڕابردوودا زمانی کوردی نەبۆتە زمانی خوێندن و نووسین و فەرهەنگ لەبەرامبەردا زمان و فەرهەنگ و کلتووری (عەرەبی – فارسی – تورکی) لە کۆمەڵی کوردەواری و لەناو چینی خوێندەوار و ناوەندە رۆشنبیرییەکانی کوردستاندا باو و باڵادەست بووە. بەو هۆیەوەش کەوا چەپەری مزگەوت و گۆشەی حوجرە و مەدرەسەی ئایینی تەنها شوێنی زانست و خوێندەواری بوون، بۆیە دەبینین کەوا:

- زمانی عەرەبی هەر لە سەرەتاوە، وەکو زمانی قورئان و حەدیس و زانستەکانی ئایین و شەریعەتی ئیسلام، سەرچاوەی یەکەمی خوێندەواری بووە لە کوردستان و بەو هۆیەوەش بەشی هەرە زۆری شاعیر و ئەدیب و زانا و دانایانی کورد لە بەراییدا مەلا و زانای ئایینی بوون.

- زمانی فارسی لە هەموو خوێندنگا و مەدرەسە ئایینییەکانی کوردستاندا، وەکو زمانی فەرهەنگ و شیعر و ئەدەب، هەمیشە ئامادە بووە و دەستی یەکەمی سەرچاوەکانی زمان و ئەدەبی فارسی، بەتایبەت بەرهەمەکانی (سەعدی و حافز و جامی و مەولانا...) بەشێک بوون لە بەرنامەکانی خوێندن ((موتابچی، ١٩٧٣: ٧٢)) لەمەوە شاعیرانی کلاسیکی کورد ڕاستەوخۆ لەژێر کاریگەری زمان و ئەدەبیاتی فارسیدا بوون.

- لە قۆناغەکانی دواتر زمانی تورکیش، کە زمانی ئیدارە و دەوڵەتداری بووە، لە کوردستاندا پەرەی ستاندووە و بڵاوبۆتەوە، ئەمە وای کردووە دەستەی یەکەمی (منەوەرانی کورد) لە سەروبەندی سەدەی (١٩ و ٢٠)دا کاریگەری زمان و ئەدەبی تورکیشیان بەسەرەوە بێت.

کەواتە لە سەروبەندی چەکەرەکردنی بزووتنەوەی شیعری بابان، گەلێک بوار لەبەردەم بەریەککەوتنی کلتووری و کاریگەری زمان و ئەدەبی فارسی ئاوەڵا بووە. (سالم) کە یەکێک لە ڕابەر و کۆڵەگەکانی ئەو بزووتنەوە ئەدەبییە بوو، دیارە لەو کاریگەری و کارتێکەرییە بە دوور نەبووە، ئەمە لە کاتێکدا کە زمانی رەسمی میرنشینەکەی بابانیش هەر فارسی بووە ((میرزا، ٢٠١٣: ٢٦)).

بەدەر لەو هۆکارە مێژوویی و گشتییانە، پەیوەست بە (سالم) هۆکارگەلی تایبەت و کاریگەری دیکەش لە ئارادا بوون، تا ئەوەی ڕەنگدانەوەی زمان و ئەدەب و کلتووری فارسی لە ناو شیعرەکانیدا خەستتر و پڕ ڕەنگتر بێت لەوانەش:

- هامشۆی بەردەوامی (سالم) لەنێوان سلێمانی و سنە و تاراندا خواستە و ناخواستە، لە سۆنگەی دوو هۆکارەوە:

یەک: بەشێکی خانەوادەکەی لە ناوچەی سنە و ئەردەڵاندا مابوونەوە، بۆیە سالم، وەک چۆن (کوردی)ی ئامۆزاشی، بەردەوام قاچێکیان لەم دیو و یەکێکیان لەو دیو بووە، ئەمە لە شیعرەکانیدا دیارە:

**- لە حوسنی دلبەران، گەرچی (سەنەندوج) گوڵستانێکە**
**بەبێ دلبەر لەبەرچاوم چ وێرانە مەکانێکە**

**- بەبێ ڕووی تۆ فەزای باغی (سەنەندوج)**
**لەناودڵما وەکو ناری سەقەر بوو**

**- دەڵێی فیردەوسە گوڵزاری (سەنەندوج)**
**وەلێ بێ تۆ لەلای من وەک دەرەک بوو**

**- چ بڵێم حاڵەتی دڵ چۆنە لە هەجرا (سالم)**
**سەحنی گوڵزاری (سەنەندوج) وەکو زیندانی منە**

**- (سەنەندوج) باوجودی باغ و گوڵزار**
**بەبێ تۆ تارە لێم وەک شامی میحنەت**

دوو: بەهۆی ململانێ و باڵباڵێنی ناو بنەماڵەی میرەکانی بابان، زۆر کەڕەت خانەوادەی سالم بەهۆی لایەنگیرییان بۆ لایەنێک، دووچاری کۆچ و ڕەو و ئاوارەیی بوون لە ئێرانا، سالمیش، (ئەگەر لە ناچاری و بە نابەدڵیش بووبێت) سەری ئاوارەیی هەڵگرتووە، واش بووە لەوێ گیری خواردووە و ڕێگەی گەڕانەوەشی نەبووە. بۆیە لە چەندین پارچە شیعردا، کە پێدەچێت لە دەورانی ئەو ئاوارەیی و دەربەدەرییەی ئێرانیدا هۆنیبێتییەوە، گلەیی لە بەختی خۆی و گازاندە لە زەمانە دەکات و ناڕەزایی دەردەبڕێت:

**- شۆڕەزاری خاکی (ڕەی) ئەمجارە دامەنگیرمە**

**ڕوو لە هەر وادی دەکەم خاری وەکو زنجیرمە**

**ئیبتیدا بۆ (ڕەی) کە هاتم فیکری عەقلیم لێ نەکرد**

**حەپسی تارانم گوناهی کاری بێ تەدبیرمە**

**- لەگەڵ دڵ شەرتە (سالم) گەر نەجاتم بێ لە (تارانا)**

**بەهەشت گەربێتە دەشتی (ڕەی) بەئێرانا گوزەر ناکەم**

**- خۆزگە دەمزانی لە (تارانا) نەجاتم کەی دەبێ**

**کۆیی یارە مەشهەدم، یا مەدفەنم هەر (ڕەی) دەبێ**

**- بە عەقل ئەو ڕۆژە پێم زانی دەفەوتێ**

**کە (سالم) عازیمی موڵکی عەجەم بوو**

جێکەوتە و کاریگەری زمان و ئەدەب و فەرهەنگی ئێرانی لەسەر سالم و بەرهەمی شیعری لەسەر سێ ئاستدا بەدیار دەکەوێت:

١- لەسەر ئاستی وشە و زاراوە و پێکهاتەی زمانی: زمانی شیعری سالم تەژی لە وشە و زاراوە و پێکهاتەی بوارەکانی جیهانی ئەدەب و فەرهەنگی فارسی و کلتووری ئێرانییە، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە یەکێک لە سیماکانی فۆرم و روخساری شیعری شاعیر پێکدەهێنێ و لە شاعیرانی دیکەی هاوسەردەمی جیادەکاتەوە، ئەم خاسیەتە واتا (فەرهەنگی شیعرەکانی سالم لەبەر ڕۆشنایی ئەدەبی فارسیدا) بۆتە بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمیی تایبەت کە لەم بوارەدا ئەنجام دراوە،

بگەڕێوە بۆ (میرزا، ٢٠١٣). تەنانەت ئەو زمانە شیعرییە فارسی ئامێزەی سالم کاریگەری لەسەر لایەنی چەمکی واتا و دەربڕینە سەخت و ئاڵۆزەکانی شاعیریشەوە هەبووە، کە لە پێکهاتە و دەربڕین و سنعەتسازی شیعرەکانییەوە ڕەنگی داوەتەوە ((سەرچاوەی پێشوو: ٦٥)).

٢- کاریگەری ڕاستەوخۆی شاعیرانی فارس، لەوێنەی (سەعدی، حافز، کەلیم، سائیب) لەسەر ئاستی ئەدەبییەوە، بەسەر هزر و بیر و شیعر و بەرهەمی سالم، ئەو بەڕادەیەکی بەرز سەرسامی شیعر و بەرهەمی مەزن شاعیرانی فارس بووە ((سەجادی، ١٩٧١: ٢٦٥)). ئەمە کارێکی وای کردووە کە هەموو پارچە مولەمەعاتەکانی دیوانەکەی، شیعری مولەمەعاتی (کوردی – فارسی) بن. تەنانەت بەشێکی بەرچاویش لەمانە شیعری مولەمەعاتی تێهەڵکێشبن لەسەر شیعر و بەرهەمی شاعیرانی فارسی، وەکو لەم نەخشە ڕوونکەرەوەیەدا بەدیار دەکەوێت.




٣- ئاستی واتا و دەلالەت:

پەیوەندیی شیعر و بەرهەمی سالم لەگەڵ ئەدەبیاتی فارسی لە دوو ڕوانگەی دیکەوە خۆ دەنوێنن، لەسەر ئاستی بابەتی ناوەرۆک و واتا و دەلالەتدا، یەکێکیان ئەوەیە کەوا زۆر جار سالم واتا و دەلالەتی شیعرەکانی لە واتا و بیر و بەرهەمی شاعیرانی فارسی هەڵبژاردەی خۆی هەڵێنجاوە و ئەنجا لە بەرگ و پۆشاکێکی کوردی بەشێوەیەکی

وەستایانە و هونەری لەنێو دێڕە شیعرەکانی خۆیدا گونجاندوویەتی، لێرەدا بەگوێرەی دەرفەت چەند نموونە بە بەراورد لەگەڵ (حافز) دەهێنینەوە کەوا یەکێتیی واتا و دەلالەت کۆیان دەکاتەوە ((میرزا، ٢٠١٣: ٦٤)):

حافز:

**دوش از مسجد سوی میخانه آمد پیر ما**

**چیست یاران طریقت بعدازاین تدبیر ما**

سالم:

**بۆ تۆبە سویی مەسجید هاتم بچم لە ڕێدا**

**بۆ کۆیی مەیفرۆشان عەزمم شتابی هێنا**

حافز:

**از بهر بوسه ز لبش جان همیدهم**

**إینهم همی ستاندو آنهم نمیدهد**

سالم:

**گیان دەدەم ئەمساڵ بەنرخی ماچێکی دووساڵی تر**

**قەت بەمەشرووتی سەلەم لەم بەیعەشا سەودا نەبوو**

ئەم مەسەلەیە لەئاست شاعیرانی دیکەشدا لەوێنەی (سەعدی، جامی، هاتیف...) دا بەڕاست دەگەڕێت.

ڕوانگەی دووەمیان ئەوەیە، کە سالم لەشێوەی دەربڕین و چۆنییەتی خستنەڕووی بیر و بابەت و مەبەستە شیعرییەکانی پێڕەوی لە شێوازەکانی (سەبکی شیعری) فارسی کردووە، لەوێنەی (خوراسانی و عیراقی و هیندی) ((سەرچاوەی پێشوو: ٦٠)).

بەتایبەتیش شێوازی (سەبکی هیندی) کە دیارترین تایبەتمەندییەکانی بریتین لە؛ بایەخدان بەناوەرۆک (ناوەرۆکسازی) و واتای ورد و تازە و خەیاڵپەردازی و بیری ئاڵۆز و جەختکردن لەسەر وێنەی ڕەوانبێژی ((میر صادقی، ١٣٧٣: ١٣٠ – ١٣١)).

دیارە ڕەنگدانەوەی زمان و شێواز و فەرهەنگی ئێرانی لە شیعرەکانی سالمدا بەشێکی بۆ پاشخانی فەرهەنگی و مەعریفیی شاعیر و بەشێکی بۆ باری کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەو سەردەمە و بەشێکی بۆ ژیانی تایبەتی و کەسێتی خۆی دەگەڕێتەوە. نالەباریی چەرخ و ئەو شکستی و ناهەموارییەی بەسەر وڵات و نەتەوەکەیدا هاتوون، ناتەندروستی و غەم و پەژارەی بەدرێژایی تەمەن، هەموو ئەمانە بوون بە هەوێنی ژیان و لە شیعرەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە ((کاکی، ٢٠٠٨: ١١١)).

**تەوەری دووەم:**

**أ- لەبارەی زاراوە و چەمکی شێواز و شێوازگەری:**

لە فەرهەنگی (خاڵ) لە بەرانبەر وشەی (شێواز)داهاتووە: شێوەی تایبەتی نووسین یان قسەکردن (اسلوب) ((خال، ١٩٦٤: ٣٥١)) لە فەرهەنگە کوردییەکانی دیکەدا، شێواز بە (شێوە، ڕوخسار، ڕەفتار و ڕێباز...) لێکدراوەتەوە، کە زیاتر واتای گشتی وشەکە دەبەخشن و بۆ بابەتەکەی ئێمە لێکدانەوەکەی (خاڵ) دروست و گونجاوە. وشەی شێواز لە بەرانبەر وشەی (style)ی ئەوروپیدا بەکار دەبرێت، کە لە بنەڕەتدا لە وشەی (Stilus)ی گریکی – لاتینییەوە وەرگیراوە، لە زمانی عەرەبیدا (أسلوب) و لە زمانی فارسیدا واتای (سبک) دەگرێتەوە (کاکی ٢٠١٢: ١٨)).

لە کوردیدا (شێوازگەری – یاخود – شێوازناسی) ئەو زانستەیە کە لە مەسەلەکانی تایبەت بە شێواز و شێوازی ئەدەبی دەکۆڵێتەوە، کە لە بەرانبەر زاراوەکانی (stylistics)ی ئەوروپایی و (الاسلوبیة)ی عەرەبی و (سبک شناسی) فارسیدا هاتووە.

ئەم زانستە ڕەگو ریشەکەی بۆ ڕۆژگارێکی کەونارای سەردەمانی گریک و ڕۆمانەکان دەگەڕێتەوە. (ئەرستۆ) بە پشتبەستن بە (زمان و شێواز)ەوە ڕەگەزە ئەدەبییەکانی لەیەکتر جیاکردۆتەوە، بە نموونە (پاراوی زمان) بە یەکێک لە مەرجەکانی بابەتی (تراژیدیا –Tragedy) دادەنێت و دەڵێت: (مەبەستم لە زمانی پاراو ئەو زمانەیە کە ڕیتم و

مۆسیقا و گۆرانی تێدابێت)، واباوە کە زمانی تراژیدیا زمانێکی چێژبەخشە، چونکێ زمانێکی بەرز و ڕازاوە و چێژدارە، لە قالبی گفتوگۆدایە و ئاواز و ڕیتمێکی تایبەتی هەیە ((هۆراس، ١٩٧٤: ٢٧)).

لێکدانەوەی فەرهەنگ و لوغەتنامە عەرەبی و ئیسلامییەکان بۆ وشەکە هەمووی وەکو یەکە، بە ڕیزێک دارخورما، یان ڕوخسار و ڕووکار لێکدراوەتەوە، هەروەها بە واتای (هونەری ئاخاوتن)یش هاتووە ((بوملحم، ١٩٦٨: ٩)).

ڕوونترین پێناسە لای زانایانی پێشین و نزیک لە تێگەیشتنی ئەمڕۆیی، لەلایەن (ئیبن خەلدون – لە ٨٠٨ی کۆچی مردووە) لە کتێبی (المقدمة)داهاتووە، ئەو دەڵێ: (الاسلوب – شێواز) بریتییە لەو قالب و چوارچێوە هۆشەکییەی کەوا پێکهاتە زمانییەکانی تیادا دادەڕژرێت، بەشێوەیەک کە لەگەڵ ئامانجی گوتار و هونەری ئاخاوتندا بگونجێت ((سەرچاوەی پێشوو: ١١ – ١٢)).

لەم پێناسەیەدا چەند خاڵ تێبینی دەکرێت:

١. شێواز قالب و چوارچێوەیە کە وشە و پێکهاتەی زمانی تیادا دادەڕژرێت. لێرەدا شێواز خۆی لە وشە و پێکهاتە زمانییەکان جیایە، هەروەها لە عەرووز و لە ڕەوانبێژیش. لە کاتێکدا وشە و پێکهاتە زمانییەکان مادde و کەرەستەی شێواز پێکدەهێنن، کەچی ڕەوانبێژی و عەرووز خاسیەت و تایبەتمەندیی ئەو کەرەستە و پێکهاتانە دەستنیشان دەکەن. لێرەوە شێواز دەبێتە: شێوەی داڕشتنی قسە و ئەندازیاریی ئەو قالب و چوارچێوەیەی کەوا قسەکەی تیادا دادەڕژرێت. لەمەوە ئیبن خەلدون ڕێگە لەو تێکەڵاوییە دەگرێت کە لە بیرو مێشکی مرۆڤدا دروستدەبێت، لەنێوان زمان وەکو وشە و پێکهاتە، لەگەڵ چۆنییەتی هەڵبژاردن و داڕشتنی وشە و پێکهاتەکان کە کرۆکی شێواز خۆیەتی.

٢. شێواز وێنەیەکی هۆشەکی وشە و پێکهاتەکانە کە خەیاڵ لە شێوەی قالب و چوارچێوەدا دەریدەخات، لەمەوە پەیوەندی لەنێوان بیر و دەربڕین (تەعبیر) دەخرێتە ڕوو، کە لە وێنەی دوو ڕووی دراوێکن و

ناکرێت لە یەکتر جیا بکرێنەوە. ئەنجا کە هات و شێواز بریتی بێت لەو وێنە هۆشەکییەی کە لە ڕێگەی خەیاڵەوە دەردەخرێت، لەمەوە شێواز حوکمە کەوا تەعبیر لەو بیر و خەیاڵە و تەنانەت لە کەسایەتی خاوەنەکەی بکاتەوە. لەمەوە لەو پێناسەی ڕۆژئاواییەکان نزیک دەکەوینەوە کە دەڵێ: شێواز بریتییە لە کەسێتی مرۆڤ خۆی.

٣. شێواز بە گوێرەی بابەت دەگۆڕێت، چونکێ هەر یەکێک لە هونەرەکانی ئاخاوتن شێوازی تایبەت بەخۆی هەیە کە تیایدا لەوێنەی جۆراوجۆردا دەمەبێت. لەمەوە شێوازی زانستی لە شێوازی ئەدەبی جیا دەبێتەوە. لەناو شێوازی ئەدەبیشدا شێوازی هونەری پەخشان جیاوازە لەشێوازی هونەری شیعر، لەناو شێوازی شیعریشدا، شێوازی پارچەی فەخروشانازی جیاوازە لە شێوازی غەزەل و .... تاد.

٤. بناغەی شێواز بریتییە لە (هەڵبژاردن)ی وشە و بێژە و پێکهاتەی دروست و گونجاو و (ڕیزکردن) یان لە باڵ یەکتر لە چوارچێوەیەکی هۆشەکیدا. لەمەوە کاری نووسەر و شاعیر لە کاری وەستای دیوار (بەننا) دەچێت. نووسەر و شاعیران کەرەستەکانیان (کە گوتە و بێژە و پێکهاتەی زمانین) لەسەر زار و زمانی خەڵک، یان لە دووتوێی کتێب و فەرهەنگەکاندا هەڵدەگوێزن و هەڵدەبژێرن، وەکو چۆن وەستای دیوار کەرەستەی باش و پوخت و دروست لە سروشتدا هەڵدەبژێرێت بەمەبەستی سازکردنی دیوار و خانوو. ((بۆ ڕاڤە و لێکدانەوەی پێناسەکەی ئیبن خەلدون سوود لە سەرچاوەی پێشوو: ١١ – ١٢ وەرگیراوە)).

لە ڕەخنەی نوێدا چەمکی شێواز (سەبک) لەوەدا کورتدەکرێتەوە، کە بە واتای لادانە لە ڕێڕەوی ئاسایی دەربڕین، (لادان لە نۆرم Norm)، بەم پێیە سەبک و شێواز بەو لادان و جیاوازییانە دەناسرێت کە لە شێوەی دەربڕینی هەر نووسەرێک لەگەڵ شێوەی دەربڕینی نووسەرانی دیکەدا بە دەیدەکرێت ((رضایی، ١٣٨٢: ٣٢٣)).

ئەوەی ڕاستی بێت ئەوەیە کەوا (شێوازگەری) لە ئێستادا زانستێکی بەرفراوان و فرەلایەنە، لەهەر ڕوانگە و ڕووکارێکەوە لێی

بڕوانیت چەندین ڕەهەندی جیاواز و چەشنی جۆراوجۆری لێدەکەوێتەوە. لەو ڕوانگەیەوە کە بابەتەکەی ئێمە هەڵیدەگرێت، بەقەڵەمی درشت و بەشێوەیەکی گشتی ئاماژە بۆ چەند لایەنێکی دەکەین.

تێکڕای واتا و چەمک و پێناسەکانی شێواز لە دەوری سێگۆشەی (نووسەر/ پەیامدەر) و (تێکست/ پەیام) و (خوێنەر/ پەیامگر) دا دەخولێنەوە.

دەستەی یەکەم لە شێوازناسان مەسەلەی شێواز لە پەیوەندیی دەروونی لەنێوان نووسەر و تێکستدا دەبینن، بەو مەعنایەی گرینگی بە پرۆسەی دەروونی ئەفراندنی تێکست دەدەن. دەستەی دووەمی توێژەران ئەوانەن کە باس لە مەرگی نووسەر دەکەن، لەمەوە ئەوان لە پانتایی خودی تێکستدا بەدوای چەمک و پێناسەی شێوازدا دەگەڕێن. دەستەی سێیەم چەمکی شێواز لە کاردانەوەی خوێنەر و وەرگری پەیام لە بەرانبەر تێکستدا ڕاڤە دەکەن ((چالی، ٢٠٠٨: ٢٢)) بەدیوێکی دیکەدا هەموو چەمک و پێناسە جیاوازەکانی شێواز لەلایەن توێژەرانەوە لە کۆن و تازەدا لەژێر سێ ناونیشانی سەرەکیدا پۆلینبەندی کراوە، کە بەم شێوەیەن:

١. بینینی تایبەت: شێواز حاسڵ و دەرەنجامی ڕوانین و جیهانبینی ناوەوە و دەرەوەی نووسەرە کە لە ڕواڵەت و شێوەیەکی تایبەتی زمان و بەیان خۆی نمایش دەکات. لەمەوە شێواز لە سیمای کەسایەتی دەچێت و کەسایەتی نووسەر لەو دەقەدا دەردەکەوێت کە دەینووسێت و سروشتی خۆی پێدەبەخشێت ((عەلی، ٢٠٠٩: ٢٣)).

٢. هەڵبژاردن: لەم بۆچوونەوە شێواز بریتییە لە هەڵبژاردن و بژارکردنی نیشانە و کەرەستەکانی زمانێکی دیاریکراو، بەمەبەستی دەربڕینی هەڵوێستێکی دیاریکراو، ئەم هەڵبژاردنە لەنێوان ئەو کەرەستە و نیشانە زمانییانەدا دەبێت کەوا هاوشان و جێگرەوە و بەدیلی یەکترن ((چالی، ٢٠٠٨: ٢٤)).

٣. لادان لە باو: لەمەوە شێواز لە بەزاندنی یاسا و ڕێسا باوەکانی زمان و بەکارهێنانێکی تازە و نوێی زمان و ڕێزمانەوە دێتەدی، زمانی ئەدەبی یاساکانی زمانەوانی پێشێل دەکات و لەو شێوە باوەی زمان دەردەچێت کە خەڵک لەسەری ڕێککەوتوون، بەمە لە واتا فەرهەنگییەکەی دوور دەکەوێتەوە تا ئەوەی ناو و واتایەکی نوێ بە شتەکان ببەخشێت، ئەمە خۆی لەخۆیدا بەشێکە لە پڕۆسەی (داهێنان) و بە لادان لە باو (Norm) ناو دەبرێت ((عەلی، ٢٠٠٩: ٢٧)).

ئەم سێ ڕەهەندە سەرەکییەی شێواز لە ئەنجامدا یەکدەگرنەوە و تێهەڵکێش دەبن، چونکێ هەردید و بۆچوونێکی تایبەت و نوێ، پێویستی بەهەڵبژاردنی کەرەستەی نوێ و تایبەت هەیە، لە ئەنجامی ئەم پرۆسەیەشدا لادان لە زمانی باو و ئاسایی دێتە ئارا.

تا ئێرە وا هەستدەکرێت کە پرۆسەی شێوازناسی هەمان پرۆسەی کاری ڕەوانبێژییە، چونکێ زیاتر چەمکی شێواز و جۆراوجۆری دەربڕین بۆ تاکە واتایەک بەرجەستە بووە، یاوەکو دەربڕینی واتایەک بەشێوازی جۆراوجۆر کە هەمان پێناسەی (زانستی بەیان)ە، بەڵام ڕاستییەکەی شێوازناسی لەمە فراوانترە، چونکە لە شێوازناسیدا بابەتی ((Frequency) یاخود (بسامد – التواتر) و دووبارەبوونەوەی دیاردە شێوازییەکان (Stglistic features) لە ئارادایە، لە کاتێکدا لە ڕەوانبێژیدا ئەم بابەتە لە ئارادا نییە ((چاڵی، ٢٠٠٨: ٢٧)).

– جۆرە سەرەکییەکانی شێواز:

جیاواز لە قوتابخانەکان و ڕێبازەکانی لێکۆڵینەوە لە شێواز، بابەتی شێوازناسی سێ ڕێچکەی سەرەکی دەگرێتە پێش:

١.شێوازی تاکە کەس (شاعیر و نووسەر و ئەدیب).

٢.شێوازی چەرخ و قۆناغ و سەردەم.

٣.شێوازی نەتەوەیی، هەر گەل و میللەتێک.

– ئەو هۆکارانەی کەوا کاریگەرییان بەسەر شێوازەوە هەیە:

١. کەسایەتی نووسەر لە ڕووی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجی و بایۆلۆجی.
٢. بابەتی نووسین، کە وابەستەیە بە جۆری (ژانر)ی ئەدەبییەوە.
٣. ڕەگەز و ڕەچەڵەکی نەتەوەیی.
٤. ڕۆشنبیری و زانیاری نووسەر ((بوملحم، ١٩٦٨: ٦٢)).

**ب- دەورەی سەبکی لە مێژووی شیعری فارسی و کوردیدا:**

١. مێژوونووسی ئەدەبی فارسی: بەپێی سەرچاوەکان لە مێژوونووسیی ئەدەبیاتی فارسیدا دوو ڕێباز تێبینی دەکرێت، یەکەمیان نووسینەوەی مێژووی ئەدەبە بە گوێرەی زنجیرەی ساڵنامە و سەدەکان (کرۆنۆلۆجی). واتا دابەشکردنی تەواوی مێژووی (١٢٠٠) ساڵەی ئەدەبی فارسی بۆ چەند قۆناغ و سەردەم و چاخێک، کە هەر قۆناغێک سەدەیەک یا چەند سەدەیەک دەگرێتەوە و تیایدا ڕەوتی پەرەسەندنی زمان و ئەدەب فەرهەنگی فارسی خراوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوەوە، لە پاڵ ئەوەشدا ژیان و بەرهەمی ئەدەبی و فیکری شاعیران و نووسەرانی قۆناغەکە یەکلایی کراوەتەوە، بۆ وێنە لە سەرچاوە ڕەسەنەکانی مێژوونووسی ئەدەبی فارسی، لەوێنەی: (تاریخ ادبیات در ایران – ادوارد براون)، (تاریخ ادبیات ایران – جلال الدین همایی)، (تاریخ ادبیات ایران – ذبیح الله صفا)، پێڕەوی لەم ڕێبازە کراوە ، مێژووی ئەدەبی فارسی هەر لە چاخی کۆنەوە تاوەکو سەردەمی نوێ، بەپێی سەدەکانی کۆچی و میلادی بۆ چەند چەرخ و سەردەم دابەشکراوە، زۆریش وا هەیە کەوا ئەم چەرخ و قۆناغە ئەدەبی و فیکرییانە لەگەڵ قۆناغەکانی مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و شارستانییەتی دەوڵەتی ئێران ئاوێتە کراوە.

دەستەی دووەمی مێژوونووسانی ئەدەبی فارسی لە دەروازەی ڕەخنەی ئەدەبییەوە بۆ مێژوونووسیی هەردوو هونەرە سەرەکییەکەی ئەدەبی فارسی بە (شیعر و پەخشان)ەوە چوون و، لە ڕوانگەی

مێژووی زمان و زمانەوانی و سەبک و شێوازەوە لە ژێر ناونیشانی (ادوار سبکی) لەمێژووی گەشەکردنی ئەدەبیاتیان کۆڵیوەتەوە. لێکۆڵەر و توێژەرانی ناوداری ئەدەبی فارسی لەوێنەی (ملک الشعرای بهار)، (محمد غلامرضایی) (سیروس شمیسا)، (شفیعی کدکنی)، پێڕەوییان لەم ڕێبازە کردووە. ئەم دەستەیە ڕەوشی پەرەسەندن و پێشکەوتنی زمان و ئەدەبیاتی فارسییان لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ بەسەر پێنج قۆناغ و (دورە سبکی)دا دابەشکردووە بەم شێوەیە:

- سبک خراسانی.
- سبک عراقی.
- سبک هندی.
- سبک دورە بازگشت.
- سبک ادب نو

دیارە ئەم پۆلینبەندییە بەشێوەیەکی گشتییە و دەشێ هەر کام لەم دەورانە، کە خۆی قوتابخانەیەکی ئەدەبی پێکدەهێنێت، لە ناوخۆیدا بۆ لق و بەشی بچووکتر دابەشبکرێن ((شمیسا، ١٣٨٣: ١٤)).

**تەوەری سێیەم:**

**أ- دەورەی سەبکی هیندی:**

کۆتاییەکانی سەدەی یانزەهەمی کۆچی هاوکات بوو لەگەڵ کۆمەڵێک ئاڵوگۆڕی سیاسی و کۆمەڵایەتی کەوا ئاڵوگۆڕێکی ئەدەبی بەدوای خۆیدا هێناوە، بەتایبەت لەدوای سەقامگیری دەسەڵاتی سیاسی لەدەستی زنجیرەی (سەفەوی) لە (ئیسفەهان) و پیادەکردنی (ئایینزای شیعە) وەکو مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەت.

دەوڵەتمەدارانی سەفەوی دیدێکی ئایدیۆلۆژییان بۆ شیعر و ئەدەبیات لەبەرچاو دەگرت، لە ئەنجامی ئەمەدا بەشێکی زۆر لە شاعیران و نووسەرانی ئێرانی کۆچ و باریان تێکنا و ڕوویان کردە کۆشک و سەراو دەرباری پاشایان لە وڵاتی هیند (شمیسا، ١٣٨٣: ٢٧٢).

لەمەوە قوتابخانەیەکی تازە لە شیعری فارسی نەشونمای کرد و بڵاوبوویەوە کە ماوەی سەد و پەنجا ساڵ درێژەی کێشا و لە دوایە بە (دوره سبک هندی) ناودێرکرا. لە سەرچاوەکانی تایبەت بە ڕەخنە و مێژووی ئەدەبی فارسی بە دووروودرێژی هەڵوەستە لەسەر ئەم قۆناغ و قوتابخانە ئەدەبییە و شاعیرانی پێڕەوکاری و لایەنی تایبەتمەندییە هونەرییەکانی ئەم ڕێبازە ئەدەبییە کراوە. (کەلیمی کاشانی – ١٠٦١ی کۆچی مردووە)، (سائیبی تەبریزی – ١٠٨٠ی کۆچی مردووە)، (بێدلی دەهلەوی – ١٠٥٤ – ١١٣٣ کۆچی) بە سەر دەستەی شاعیرانی پێڕەوکاری ئەم قوتابخانەیە دەناسرێن.

لێرەوە ئەگەر ئاوڕێک بۆ لای شیعری کلاسیکی کوردی بدەینەوە دەبینین کەوا ئەو سەرچاوەی کەوا ئاوی لێ خواردۆتەوە و جێکەوتەی لەسەرداناوە شیعر و ئەدەبی فارسی بووە، بە واتایەکی تر کانیاوی هاوبەشی شیعری کلاسیکی کوردی بە هەردوو قوتابخانەی (کرمانجی و بابانییەوە) شیعری فارسییە. مەلای جزیری (١٥٦٧ – ١٦٤٠ز) لەگەڵ ئەوەی لە سەردەمی دەوڵەتی سەفەوی و نەشونمای سەبکی هیندی لە ژیاندا بووە، وەلی بەهۆی بارگرژی بەردەوامی نێوان ئێران و عوسمانی و، نوێباوی ڕێبازەکە لە ئێران لەلایەک و، لایەنگیری مەزهەبی و مەسەلەی سۆفیزم و عیرفان لەلایەکی تر، زیاتر لە ژێر کاریگەری (سەبکی عیراقی) و کارتێکردنی هەردوو نوێنەرە سەرەکی و بەرجەستەکەی ئەم شێوازە، واتا (سەعدی و حافز)دا بووە ((چالی، ٢٠٠٨: ٨٤)). شاعیرانی دواتری قوتابخانەی کرمانجی لەوێنەی (خانی و پرتەوبەگی هەکاری و ...) هەر بەم شێوەیە.

بەم ڕەنگە ڕەنگدانەوەی (سەبکی هیندی) لە شیعری کلاسیکی کوردی تا پایەدار بوونی قوتابخانەی شیعریی بابان وەدوادەکەوێت. تا ئەوەی لە ڕێگەی شاعیرانی قافڵە سالاری ئەو بزووتنەوە شیعرییە، لە نموونەی (نالی و سالم)، چەکەرە دەکات و بڵاودەبێتەوە.

**ب- خاسیەت و بنەماکانی سەبکی هیندی/**

شیعری سەبکی هیندی خاوەنی چەند خاسییەت و تایبەتمەندی تایبەت بەخۆیەتی:

١. لە باری زمان و فەرهەنگی شیعری.

٢. لە ڕووی هزر و بیرەوە.

٣. لەلایەنی ئەدەبییەوە.

ئەنجا بەمەبەستی کورتی و پوختی و خۆ بە دوور گرتن لە درێژدادڕی، لەسەر گرینگترینی ئەو تایبەتمەندییانە دەوەستین، لەم چەند بڕگەیەی لای خوارەوەدا:

١. نواندن و هاوتاکردن (تەمسیل و موعادەلە): لەنگەری بایەخپێدان و سەنگی مەحەک لە سەبکی هیندیدا دەخرێتە سەر تاکە یەک بەیتی شیعر، (واتا دوو نیوەدێڕ). ئەنجا مەسەلەکە چۆنییەتی گرێدان و بەیەکەوە بەستنەوەی هەردوو نیوەدێڕەکەیە کە لە ڕێگای نواندن و هاوتا کردنەوە جێبەجێ دەبێت. شاعیر لە بابەتێکی ژیری و ناهەستییەوە لەنیوە دێڕی یەکەمدا بۆ وێنە و واتا و لێکدانەوەی شتی بەرجەستە و بەرهەست دەچێت لە نیوەدێڕەکەی تریدا، ئەویش لە ڕێگای نواندن و جوانی بایس و چوواندنەوە ((حسینی، ١٣٧٨: ١٨)). لە نموونەی ئەم دێڕەی (سائیب):

**- دنیا به أهل خویش ترحم نمی کند**

**آتش امان نمی دهد آتش پرست را**

٢. ناوەڕۆکسازی: بە واتای بایەخدان بە مەبەست و ناوەڕۆک و خستنەڕووی بیری ورد و نوێ و نەگوتراو (بابەتی نوێ و مەعنای بێگانە) لە چوارچێوەی یەک تاکە بەیتی شیعر، وەک (سائیب) دەڵێ:

**یک عمر می توان سخن از زلف یار گفت**

**در فکر آن مباش که مضمون نمانده است**

٣. نا ئاشنایی و هێنانەوەی واتا و چوواندنی دەگمەن و نامۆ، (سائیب) دەڵێ:

**هر که دید آن خالها بر گرد چشم یار گفت**

**این غزالان بین که بر گرد حرم آسوده‌اند**

٤. پەیوەندی چەند لایەنەی وشە و دەستەواژە و نیوە دێڕەکان لەگەڵ یەکتری، بە قەولی (سائیب) کە دەڵێ:

**گل رخسارت از دلسوزی تب آتشین گشته**

**ملاقات لب تبخاله را تنگ شکر کرده**

٥. بازیکردن بە وشە و داتاشینی زاراوە و پێکهاتەی تایبەت، وەکو (بیدل) کە دەڵێ:

**قیامت میکند حسرت، مپرس از طبع ناشادم**

**که من صد دشت مجنون دارم و صد کوه فرهادم**

٦. زیادە ڕۆیی و خەیاڵ بەرزی، وەکو (کەلیم) کە دەڵێ:

**می نهم در زیر پای فکر، کرسی از سپهر**

**تا به کف می آورم یک معنی برجسته را**

یان (سائیب) گوتەنی:

**نزاکت آن قدر دارد که هنگام خرامیدن**

**توان از پشت پایش دید نقش روی قالی را**

٧. شانازیکردن و سەوداسەری و خود سەرسامی، لەوێنەی (سائیب) کە دەڵێ:

**چون سرمه از نظرها هرگز گران نگردیم**

**ما در سواد عالم چون شعر انتخابیم**

**ج- سالم و شیعری سەبکی هیندی:**

بێ گومان پاشخانی ڕۆشنبیری و مەعریفی سالم و ئاشنایەتی لەگەڵ ئەدەب و شیعر و بەرهەمی مەزن شاعیرانی ئێرانی، ڕێگە خۆشکەر بوون بۆ شارەزابوونی لە سەبک و شێوازەکانی شیعری

فارسی و لەوانەش خاسیەت و بنەما هونەرییەکانی شێوازی هیندی، دووریش نییە کەوا ئەم ئاراستە هونەرییە لەگەڵ باری دەروونی و زەوق و سەلیقەی شاعیری ئەودا باشتر گونجاو بێت، بۆیە پێڕەوی لەو جۆرە سەبک و شێوازە کردووە و شیعر و بەرهەمەکانی لەژێر ڕۆشنایی ئەو ڕێبازە ئەدەبییەدا هۆنیوەتەوە و کەفوکوڵی دەروون و هزرو بیرەکانی پێ دەربڕیوە ((کاکی، ٢٠٠٨: ١٣٥)).

لێرەدا دوو مەسەلەی گرینگ دێنە پێشەوە و پێویستە سەرنجیان بۆ ڕابکێشین، یەکیان ئەوەیە کاتێک دەگوترێت کەوا دیارترین بنەماکانی سەبکی هیندی بریتییە لە ناوەڕۆکسازی و واتای ورد و تازە و خەیاڵپەردازی و بیری قووڵ و جەختکردن لەسەر وێنەی ڕەوانبێژی، پێویستە ئەو ڕاستییە لە بیرنەکەین کەوا ئەم بنەما هونەرییانە بەشێوەیەکی گشتی ڕۆڵیان لە بنیاتنانی شیعری کلاسیکی کوردیدا بینیوە بەتایبەتیش بزووتنەوە شیعرییەکەی قوتابخانەی بابان ((میرزا، ٢٠١٣: ٥٨)). دووەمیش ئەوەیە کەوا سالم نەهاتووە موو بە موو لاسایی خاسیەت و بنەماکانی سەبکی هیندی بکاتەوە وەک چۆن لە شیعری شاعیرانی بەرجەستەی ئێرانی سەربەو ڕێبازەدا هاتوون. بەڵکو ئەو لەلایەک پێڕەوی لەو بنەما شێوازییانەی ئەو ڕێبازە کردووە کە وەڵامدەرەوەی هەستونەست و باری دەروونی کەسایەتی خۆی بووە، لەلایەکی تریش ئەم بنەما هونەری و دیاردە شێوازییانەی لەگەڵ بنیاتی زمان و ئەدەبی کوردی و هەست و بیری کوردانەی خۆی و ئاسۆی چاوەڕوانییەکانی سەردەم و کۆمەڵگاکەی گونجاندووە، بۆیە شیعری سەبکی هیندی لەلای سالم بە ئارایشت و بەرگ و پۆشاکێکی کوردانە ڕازێندراوەتەوە و پێشکەش کراوە.

لێرەوە گەشتێک بەشیعر و بەرهەمی شاعیردا دەکەین و لە هەوڵی ئەوەدا دەبین لە چەند لایەنێکەوە ڕەنگدانەوەی خاسیەتەکانی سەبکی هیندی لە شیعرەکانی سالم بەرچاو بخەین و بۆچوونەکان بەنموونەی شیعری ڕوون بکەینەوە:

- ناوەڕۆکسازی: لەشێوازی هیندیدا بەو مەعنایە دێت کە شاعیر ناوەڕۆکی ورد و بیری پێچاوپێچی ئاڵۆز و ئەندێشەی دوورە دەست بەهۆی ڕاڤە و چواندنی نائاشنا لە تاکە دێڕێکدا بخاتە ڕوو.

**لە زوڵمی چەرخی دوونپەروەر سەخی تەبعانی حاتەم دڵ**

**بەڕاهی کوویی دوونانا لە هەر سوو کاسەگەردانن**

لێرە واتا و مەبەستی شاعیر بەسانایی دەسگیر نابێت. دەبێ سەرەداوەکان بدۆزینەوە و بەشوێنیاندا بڕۆین لە دواییدا بە یەکەوەیان گرێبدەینەوە، شوێنپێی گوزارەکان هەڵدەگرین تا بەمەبەست دەگەین:

لە زوڵمی ←—— (چەرخی دوونپەروەر) ←—— (سەخی تەبعانی - حاتەم دڵ) ←—— (بەڕاهی کوویی دوونانا) ←—— لەهەر سوو ←—— (<u>کاسەگەردانن</u>).

شاعیر تەنها بۆ گەیشتن بەحاڵی بەدی (کاسەگەردان)ی بابانەکان، زۆر دوور و پێچاوپێچ ڕۆیشتووە. دواتر سەرنجی ئەم تەعبیرە ناسروشتی و خەیاڵییە بدە: ((بەڕاهی کوویی دوونانا))، شتی لەو جۆرە مەگەر تەنها خەیاڵی شاعیرانەی سالم پەی پێبردبێت!.

**<u>بەدەستی کەشمەکەش</u> هەرسوو دڕا بەرگی خودئارایی**

**قەبایی نۆکەر و ئاغا هەموو بێ <u>چاکودامانن</u>**

ئەمجارە دەبێ لە کۆتاییەوە دەستپێبکەین، دەپرسین بۆ (بێ چاکودامان) بوون؟ بۆ وەڵامی پرسیارەکە پێویستە بۆ دواوە بگەڕێینەوە، تا لە فریزی بەرایی لە (بەدەستی کەشمەکەش)دا دەیدۆزینەوە.

لەم دێڕانەشدا نموونەی هەمان پێچ و پەرچ و تەعبیری بێگانە دەبینن:

**- هەوای ماچی لەبت <u>ڕێی بەندەری زوڵفی</u> بەدڵ ون کرد**

**موسافیر بۆ سەیاحەت سوویی چین چوو تووشی ماچین هات**

**دوعام بۆ دەفعی چاوی بەد لە حوسنی تۆ ئەکرد ئەمشەو**

**لەدەم روح الامین تا سوبحدەم <u>ئاوازی ئامین</u> هات**

ئەم گرێ وەسفییانە (ڕێی بەندەری زوڵف) و (ئاوازی ئامین) داهێندراو و نائاشنان.

- نواندن و هاوواتایی: بەهۆی چوواندنی ورد و جوانی بایسی (حسن التعليل) ناوازە لەنێوان (عیللەت و مەعلوول)، شاعیر لەنیوە دێڕی یەکەم کە باس لە دروشم و بابەتێکی ژیری و ناهەستییە (غير محسوس)، بۆ بابەتێکی هەستی (محسوس) و بەرجەستە دەچێت لەنیوە دێڕی دووەم و بەیەکەوەیان گرێ دەداتەوە. وەک ئەوەی نیوەدێڕی دووەم شەرح و تەفسیرێکی بەرجەستە بێت بۆ بابەتەکەی نیوەدێڕی ئەووەڵ:

**- چ سوڵحێکە وتم زوڵفت لەگەڵ ڕوو پێکەوەن دایم** (ژیری)

**وتی هەرگیز لە شەودا مەجلیسی من بێ چرا نابێ** (هەستی)

**- جەوانانی سەهی قەد بەسکە داماون لە بێچیزی** (ژیری)

**لە ژێر باری غەما هەر یەک لە خەمدا میسلی چەوگانن** (هەستی)

**- ئەبەد قەت سیرڕی ئەندامت بەتای جامەی کەتان نابێ**

**بەڵێ شەوقی چرا ئەڵبەت لە فانۆسا نیهان نابێ**

**- زەمانە قەت لەگەڵ ئەولادی ئادەم باوەفا نابێ**

**وەکو گوربەی سیەهـ ئەسڵا بە مەردم ئاشنا نابێ**

- دوور ئەندێشی و وردبینی: یەکێکی دیکە لە بنەما هونەرییەکانی سەبکی هیندی گەڕان و وردبینییە بەدوای دۆزینەوەی پەیوەست و هاوبەستەگی تازە و نوێ لەنێوان شتەکاندا لەڕێگەی خەیاڵی بە پێزو بیری ورد و دوور و قووڵ. بابزانین سالم لە وەسفی سوارچاکی و قارەمانێتی (عەزیز بەگی بابان)دا چەند ورد و دوور ڕۆیشتووە:

**- پەناهم شەهسەوارێکە گوزەرکا گەر بە ئەلبورزا**

**دەکا زەربی سمی ئەسپی لە خارا تووتیا پەیدا**

شـاعیر بەشـێوەیەکی سەرسـوڕهێنەر ئـازایەتی ئەو شاسـوارەی بابـان لە سـیمایەکی خەیـاڵی و بەبیردانەهـاتوودا بەرجەسـتە دەکـات، ئەویش بەرکەوتنی نووکی سمی ئەسپەکەیەتی بە خارو بەردی کێوی ئەلبورزا، ئەمە چۆن تەسویر و نواندنێکە!.

**– هەمـوو ئـەشعاری دۆشینم لە وەسفی لێوی نۆشین بوو**
**دەچەسپا لەب بەسەر یەکدا، حیکایەت بەسکە شیرین بوو**

– یاریکردن بە وشە و داتاشینی پێکهاتەی تایبەت: ئەمە سەلیقە و بلیمەتی شاعیر بەدیار دەخات لە هەڵبژاردنی وشەگەلێک کە لە داڕشتندا لە یەکەوە نزیکن بەڵام لەواتادا دوور.

**– خەمی قەددم لە غەمدا شێوەیی ئەبرووتە تا مووتە**
**بـەدایم پـێچشی خـاتر وەکـو گـیسووتە تـا بووتە**

**– زولفی تۆ موو بە موو خەریکی خەمە**
**دڵـی مـن نـەوبـەنەو غـەریقی غەمە**

لەم دێڕانەدا بازیکردن بە وشە و بێژەکان ڕوون و ئاشکران، ئەنجا بۆ سازکردنی پێکهاتەی تازە ئەم نموونانە ببینە:

**– چـیهرەیی مـەقسەد هوەیدا بوو لە هەر جا سوبحوار**
**موژدە ئەی (یەعقوبی دڵ) یوسف بە کەنعان هاتەوە**

**– وەک (هەماوەردانی) مەیدان چاو و ڕووی هەروا لەمن**
**بـۆ کـەمینم گـەردشی (ڕوو بـەر قەفا) بوو ئاسمان**

**– نـەنووسراوە لە (مەکتەبخانەیی عیشقا) حرووفی نـا**
**لە جوابت هەر بەڵێ بۆ (سالم)ە گەر ئەمری مردن بێ**

ئەم پێکهاتانە (یەعقوبی دڵ، هەماوەردان، ڕووبەرقەفا، مەکتەبخانەیی عیشق) باڵا دەستیی شاعیر لە پێکهاتەسازیدا نیشان دەدات.

- ئاڵۆزی واتا و بیری پێچاوپێچ: ئەمەش جۆرێکە لە خەیاڵبازی و بژارەکاری لە واتادا لە ڕێگەی جۆرێک لە تەشبیهات و چواندنی سەخت و ڕەق.

**– بە خۆر خوێن بێنە ئەی گریە لەچاوەی چاوی تاری من**
**حەنا لازم بووە بۆ پێی سەگی کۆیی نیساری من**

**– لەسەر سەبزی چەمەن یاری سەهم قەددم کە جلوەی کرد**
**لە سوجدەی خاڵی لالێوی بنەوشە گەردەنی خەم بوو**

**– لە تەوافی حەرەمی کەعبەیی ئەربابی وەفا**
**وەکو حوجاجی حەبەشە سیلسیلەهای موویی حەبیب**

- غەم و بێزاری لە ژیان و داد و فریاد لەدەست زوڵم و ستەمی دنیا، ئەمە جۆرێک لە ڕەشبینی لە جیهانبینی شاعیردا پێکهێناوە، کە دەشێ ڕەنگدانەوەی باری ژیان و دۆخی دەروون و دەوروبەری کۆمەڵایەتی سالم بووبێت، کاتێک دەزانین کەوا جەوروستەمی ڕۆم و نەهامەتییەکانی بابانییانی بەچاوی خۆی دیون:

**– دەزانی باغی بەختی ئەهلی دڵ بۆ قەت سەمەر نادا**
**فەلەک هەرگیز مورادی مەردمی ئەهلی هونەر نادا**

**– تەماشای جەوری دنیا کەن چ قەهرێکی لە خوسرەو گرت**
**نە بۆ تاجی نیشانێ ما نە بۆ تەختی نیا پەیدا**

زۆرجار زێدەڕۆیی لە دەربڕینی غەم و پەژارە و ناخۆشی و نەخۆشی، کە ئەمیش لە شێوازی هیندییەوە سەرچاوە دەگرێت، لە شیعری (سالم)دا بە خەستی بەدی دەکرێت و دەبێت بە دیاردە ((کاکی، ٢٠٠٨: ١١٣)).

**– غەم وەکو یەم هاتە جۆش و کەوتمە گێژاوی بەڵا**
**ئاوی هایل زایە کەشتی کەوتمە حاڵی حەلوەلا**

**– شەتتی میحنەت هات لەسەردا سەددی هۆشی ڕاڕفان**
**بادی غەم لێم بوو بە شەرکێ جیسری شادیم تێکشکا**

– بەهێزیی دەربڕین و نەفەسی توند و پێکهاتەی زمانی و ڕێزمانی نائاشنا لە ڕستە شیعرییەکاندا. شاعیر بۆ ئەوەی سەرنجی بەرانبەری بۆ هەواڵ و خەبەرێکی تایبەت ڕابکێشێت کە ئەو مەبەستییەتی، پەنا بۆ بەزاندنی یاسا و دەستوورەکانی ڕێزمان دەبات (لادانی ڕێزمانی)، لەوێنەی پاش و پێشخستنی کارو بەشەکانی ڕستە، کە هێزوتین و برەو بە ناوەڕۆک دەبەخشێت.

**– بەسەرچێ گەر حەیاتم بێ زەمستانی غەم و هیجران**
**دەکەم ڕۆژێ تەماشای باغ و گوڵزارم وەلی زەحمەت**

**– بە گیسوو چاکە زنجیرم بکا دلبەر لە ڕووی موژگان**
**لە ڕوویا با منی دێوانە بەس ڕوویی دڵ لە خەنجەر کەم**

**– بنێری یاری شیرینم ئەگەر بۆ جانی شیرینم**
**دەرەک بێ جێم لە دۆزەخدا ئەگەر ئانێ تەئەممول کەم**

**– بنووسم چۆن لە هیجرانا بەبادی سیمبەر کاغەز**
**دەکا گوم دووکەڵی ئاهم لەبەر مەددی نەزەر کاغەز**

لەم نموونانەی پێشەوەدا ڕیزبەندی ڕێزمانی کەرەستەکان پچڕێندراون، لە پێناو گەیاندنی واتا و مەبەستی تایبەت، ئەنجا بەشێوەیەکی تازە ڕێکخراونەتەوە.

– گیانی حەماسەت و شانازی: گیانی حەماسەت و بیری قارەمانی لە شیعری سەبکی هیندیدا تیشک دەداتەوە، بەجۆرێک کە خواست و ئاواتەکانی مرۆڤ دەورووژێنێ و هاوکاری لە بەرزکردنەوەی روحییەتی بەهێزدەکات ((حسینی، ١٣٧٨: ١٢)). سالم لە قەسیدە داستانییەکانیدا، بایەخی زۆری بەوێنەی سفت و وەسفی چڕوپڕی

جوامێری و ئازایەتی سوارەی بابان داوە، کە نیشانەی عەشقی شاعیرە بۆ ڕیتم و ئاهەنگی حەماسەتئامێز و ورە بەرزی:

**- وەختی حەملەی ڕۆژی مەیدان موددەعی واپێدەکەن**
**دێتە لەغزش پێ و ڕیکاب و سست دەبێ دەستی عینان**

**- ڕەنگی سەحرای مەحشەری بوو شیوەکەی لای پیرمە سوور**
**گرمە گرمی تۆپی ڕۆمی هەو هەوی سوارەی بەبان**

**- ئەگەر ئاوی بەقای نۆشیبێ دوشمن، فائیدەی نادا**
**لەمەوجی جەوهەری تیغی حورووفی لابەقا پەیدا**

دیارە داستانە کۆنەکانی قارەمانی و سوارچاکی، لە نموونەی چیرۆک و داستانەکانی (شانامەی فیردەوسی) و پالەوانەکانی وەکو (ڕۆستەم، سام و نەریمان، ئەفراسیاو، پووری دەستان، کەیخوسرەو، روویین تەن، پیل ئەفگەن، سیاوەش...) هەمیشە وێردی سەر زارو زمان و ناو دێڕە شیعرەکانی سالم بوون.

- وشە و زاراوەی کلیلی: زۆرجار کۆمەڵێ وشە و زاراوە هەن شاعیران خواستە و ناخواستە دەپەڕژێنە سەریان و لەزۆربەی شیعرەکانیاندا شوێن دەگرن و چەندبارە دەبنەوە. تا ئەوەی دەبن بەدیاردەیەکی شێوازی و شیعری زۆر لە شاعیران لە ڕێگەی ئەم وشە و زاراوە کلیلییانەوە دەناسرێنەوە ((چالی، ٢٠٠٨: ١٢٦)). بە نموونە شاعیرێکی وەکو حافز وشەی (رند) دیوانەکەی داگرتووە، لە شیعری (مەلای جزیری)دا وشەی (چیچەک: چۆلەکە) هەمیشە لە گوڵزاری شیعرەکانیدا دەخوێنیت. لای شاعیرانی سەبکی هیندی وشەیەکی وەکو (بسکە) یاخود (از بسکە) کە وشەیەکی چەندێتی ڕێزمانییە و لە فارسیدا بەواتای (زۆر، ئەمەندە، بەشێوەیەکی ئەوتۆ..) دێت ئامادەیییەکی بەرچاوی هەیە، وەکو ئاماژەیەک بۆ زیادەڕۆیی و پێ لێهەڵبڕین، وەک لەم نموونانەدا دیارە:

**– خام گویان بسکه می سازند معنیها شهید**
**شد زمین شعر آخر، چون زمین کربلا**
(غنی)

**– زمانه بسکه مرا خاکساری مردم کرد**
**به آب دیدهء من می توان تیمم کرد**
(میر الهی)

**– فرشته راه نیابد بر زمین آید**
**به چرخ بسکه دعاهای مستجاب رود**
(کلیم)

**– بسکه چون جوهر آیینه تماشا نظریم**
**می چکد خون تحیر ز رگ و ریشهء ما**
(بیدل)

چاوگێڕانێک بە شیعرەکانی سالم ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەم تەعبیرە (بەسکە و ئەزبەسکە) لە زۆر جێگا و دێڕە شیعرەکانیدا هاتووە و چەندبارە بۆتەوە تەنانەت تەنیا لە قەسیدەی (لە ئەحواڵی پەرێشانی بابانەکان)دا چوار کەڕەت ئەم وشەیە پاتە بۆتەوە:

**جەوانانی سەهی قەد بەسکە داماون لە بێچیزی**
**لەژێر باری غەما هەریەک لە خەمدا میسلی چەوگانن**
**گەهێ (قلب الاسد) ئەز بەسکە بێ سایەن لە وادیدا**
**وەکو مەجنوونی سەحرایی لەبن خاری موغەیلان**
**کزەو دوودی کەباب دەردێ لە مەتبەخهای بێ دوودا**
**بەیادی قووتی شامی شەو جگەرها بەسکە بوریانن**
**لە جەوری چەرخی گەردوون بەسکە حەیرانن بەناچاری**
**بەلەب خەندان و شادانن بە دڵ غەمگین و گریانن**

ئەنجا لە زۆر دێڕی شیعر و غەزەلەکانی شاعیردا ئەم وشەیە بەدی دەکرێت و تا ئەوەی بۆتە وشەیەکی کلیلی و شیعری پێ دەناسرێتەوە.

- ڕەدیف و پاش قافیە و شانازیکردن بەدەسەڵاتی شیعری:

ڕەدیف و پاش قافیە لە شیعری شاعیرانی فارسی زمانی سەبکی هیندی دیاردەیەکی بەرچاوە، دیوانە گەورەکەی (سائیب) ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت. لای سالم مەسەلەی پاش سەرواو ڕەدیف وەکو هونەرێکی شیعری زۆر بەدی دەکرێت. تەنانەت تەنها لەو پارچە شیعرانەی کە لە دیوانەکەیدا لە بەشی دەنگەسەروای (واو)دا تۆمارکراون، کە سەرجەمیان (٤٧) پارچەیە، (١١) غەزەلیان بە پاش سەروای (ئەمشەو) کۆتایی هاتووە، کە ئەمە چەند نموونەیەکێتی:

**- لە مەهتابا کە دڵ دیی ئەگریجەی وەک عەقرەبت ئەمشەو**

**گوریزی دا لە عەقرەب، کەوتە چاهی غەبغەبت ئەمشەو**

**- بە تەنگە دڵ لە سینەمدا وەکو مورغی قەفەس ئەمشەو**

**بەجان شیوەن دەکەم یاران لە هیجرانا هەوەس ئەمشەو**

**- هەمیسان ڕوح لە تەن بێزارە ئەمشەو**

**لە دڵما بـاز خـەیاڵی یارە ئەمشـەو**

هەروەها شانازیکردن بەخۆ و بەدەسەڵاتی شیعری لایەنێکی دیکەی شیعری سالمە کە لە سەبکی هیندی بەهرە وەردەگرێت، ئەمەش چەند نموونە لەو بارەوە:

**- لە دڵما ڕاستەی سەر مەشقی فیکرم بوو قەدت، بۆیێ**

**هەموو شیعرم کە مەوزوونتر لە بـاڵای نازەنینان بوو**

**- نووکی قەڵەمم تیژە وەک نووکی درەوشی تۆ**

**سووهان زەدەیە فیکرم وەک گازنـی بوڕڕانت**

**- ڕەنگینە هەموو شیعرم وەک نەقشی تەکەڵتووی زین**

**مەزموونکەشە فیکرم وەک قولاپی درووما نت**

دیارە گەڕان و پشکنین و وردبوونەوە لە شیعری سالم زۆر گۆشە و لایەنی دیکەی لەم بابەتەمان بۆ ئاشکرا دەکات، لەپێناوی ئەوەی باسەکەمان چوارچێوەی گونجاو و ئاسایی تێنەپەڕێنێت بەم چەند تێبینی و ڕوونکردنەوە شیعرییانە واز دەهێنین.

**ئەنجام**

١.دانوستاندن و ئاوێتەبوونی کلتووری، لە کۆن و لە ئێستادا لەنێوان گەلانی ڕۆژهەڵات لە نموونەی (کورد و عەرەب و فارس و تورک)دا شتێکی بەرچاو و ئاساییە، بەم پێیە زمان و ئەدەب و فەرهەنگی عەرەبی و فارسی و تورکی ڕەنگدانەوەی لە سامانی شیعری کلاسیکی کوردیدا بەشێوەیەکی گشتی تا ئەندازەیەکی زۆر هەبووە.

٢.لە سۆنگەی کۆمەڵێک هۆکار و فاکتەری مێژوویی و کۆمەڵایەتی زمان و ئەدەب و کلتوورو فەرهەنگی فارسی بۆتە سەرچاوەیەک لە پایەداربوونی بزووتنەوەی شیعری کوردی ناوەڕاست (قوتابخانەی بابان) و، شاعیرانی پێشەنگی ئەم بزووتنەوەیە لەم سەرچاوەیە سوودمەند بوون و ئەمەش لە دیوان و شیعر و بەرهەمەکانیان ڕەنگی داوەتەوە.

٣.سالمی ساحێبقڕان، بەشێوەیەکی تایبەت پەروەردەی زمان و ئەدەب و فەرهەنگی مەزن شاعیرانی فارسی زمان بووە، کە بەخەستی لە زمان و شێواز و فەرهەنگە شیعرییەکەی ڕەنگی داوەتەوە.

٤.سالم شارەزاو ئاشنای شێوازەکانی شیعری فارسی و بەتایبەتیش شێوازی شیعری سەبکی هیندی بووە، بنەما هونەری و ئەدەبییەکانی ئەم جۆرە شێوازە، بەهۆی کۆمەڵێ هۆکاری خودی و بابەتی لە بەشێکی زۆری شیعرەکانیدا بەدی دەکرێن.

* ئەم توێژینەوەیە لە ساڵی ٢٠١٥دا ئامادەکراوەو لە (کۆنفرانسی نەتەوەیی کورد و فەرهەنگ و ئەدەبی ئێرانی و ئیسلامی)، کە لە ڕۆژانی ٧–٨ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٥ لە (دانشگای کوردستان – سنە) بەڕێوەچوو، پێشکەشکراوە.

** دیوانەکە لە ئێستادا چاپکراوە

**لیستی سەرچاوەکان:**


- ئەمین، نەوشیروان مستەفا، ١٩٩٨، میرایەتی بابان لەنێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەم دا، سلێمانی، چاپەمەنی خاک.
- بوملحم، علي، ١٩٦٨، في الاسلوب الادبي، بيروت، المكتبة العصرية.
- چالی، شەعبان، ٢٠٠٨، شێوازی شیعری جزیری، دهۆک، دەزگەها سپیرێز.
- حسيني، حسن، ١٣٨٧، بيدل و سپهری و سبک هندی، تهران، سروش.
- خاڵ، شێخ محمد، ١٩٤٦، فەرهەنگی خاڵ، جزمی دووەم، سلێمانی، چاپخانەی کامەران.
- خەزنەدار (د.)، مارف، ٢٠٠٣، مێژووی ئەدەبی کوردی، ب٣، هەولێر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس.
- رضايي، عربعلى، ١٣٨٢، واژگان توصيفى، ادبيات، انگليسى– فارسى، تهران، فرهنگ معاصر.
- (١) کاکی، حەمەنوری عومەر، ٢٠٠٨، شێواز لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، سلێمانی، مەڵبەندی کوردۆلۆجی.
- (٢) کاکی، حەمەنوری عومەر، ٢٠١٢، شێوازی شیعری نوێی کوردی، سلێمانی، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوە.
- سەجادی، علاءالدین، (١٩٧١) مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، بەغدا، چاپخانەی مەعاریف.
- (١) شميسا (دكتر)، سيروس، ١٣٨٣، سبک شناسی شعر، ویرایش دوم، تهران، نشر میترا.
- (٢) شميسا (دكتر)، سيروس، ١٣٨٤، کليات سبک شناسی، ویرایش دوم، تهران، نشر میترا.
- عەلی، پەخشان، ٢٠٠٩، شێوازی شیعری گۆران، سلێمانی، مەڵبەندی کوردۆلۆجی.
- موتابچی (د.) ئەمین عەلی، ١٩٧٢، شاعیرانی کورد و ئەدەبیاتی فارسی، گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات، ژمارە (١٦)، بەغدا.
- میرزا (د.)، ئاڤان عەلی، ٢٠١٣، فەرهەنگی شیعرەکانی سالم لەبەر ڕۆشنایی ئەدەبی فارسیدا، سلێمانی، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوە.
- مودەریس، مەلا عەبدولکەریم، ٢٠١٥، دیوانی سالم، ((ڕەشنووسی بڵاونەکراوە).
- میر صادقی (ذوالقدر)، میمنت، ١٣٧٣، واژەنامه هنر شاعری، تهران، کتاب مهناز
- هۆراس، ١٩٧٩، هونەری شیعر، وەرگێڕانی: حەمید عەزیز، بەغدا.

## ملخص البحث

### تأثيرات الخصائص الفنية للسبك الهندي في شعر سالم صاحبقران

إن مصطلح (السبك) في اللغة الفارسية يأتي مقابل مصطلح (الاسلوب) في اللغة العربية و(Style) في اللغات اللاتينية. تنقسم اللغة والادب الفارسي الى مدارس اسلوبية عدة تعرف بـ(ادوار الشعر الفارسي)، ومنها دورة السبك الهندي، وحيث يظهر تأثير الثقافة والادب الفارسيين جلياً على الشعر والشعراء الكورد الكلاسيكيين، وبالتالي انعكاسات تلك المدارس الاسلوبية.

الدراسة تتناول تأثيرات الخصائص الفنية للسبك الهندي لدى الشاعر الكوردي (عبدالرحمن سالم صاحبقران) الذي هو أحد رواد مدرسة (بابان) الشعرية.

يتكون البحث من ثلاثة محاور رئيسية، في المحور الاول تم عرض نبذة عن حياة الشاعر ونشأته ومدى تأثير اللغة والادب الفارسي في تكوين فضائه الشعري. المحور الثاني يدور حول المسائل الاسلوبية في الشعر وخاصة خصائص السبك الهندي بشكل نظري. أما المحور الاخير فقد تم فيه عرض انعكاسات هذا النوع من السبك وخصوصياته في شعر عبدالرحمن سالم.

# Abstract

## The Effects of Artistical Proprties of Indian Form on the Poems of Salim Sahibqran

The term of (Al – Sabik) in the Persian Language means (Al – Esloob) in the Arabic language and (Style) in the Latinian languages the Persian language and literature consist of many stylistic School called (The Persian Poetry Eras), including the Indian style era where the impact of Persian literature culture appears clearly on the classic Kurdish Poetry. Accordingly, it represents those stylistic schools.

This study deals with the impacts of technical particulars of Indian style on the Kurdish Poet, AbdulrahmanSalimSahibqran is one of Pioneers of Baban Poetry School.

The study consists of three main topics in the first topic, a Summary of the Poet's life is dealt with and the scope of impact of the Persian language and literature on the stand points of the poet.

And the second topic touches upon stylistic matters, in particular, the Indian style Properties, in theoretical method.

Moreover, in the last topic, the application of the Kind of style and its Particulars has been Presented in the Poetry of AbdulrahmanSalim.

# سایکۆلۆژیای ئەدەب

**م.ی. ئاوات ڕەحیم کەریم حەسەن**
بەشی زمانی کوردی-- کۆلێژی پەروەردە
زانکۆی گەرمیان

**پێشەکی**

کۆمەڵێ لێکۆڵینەوەی ورد و بەرچاو دەربارەی ئەدەب خراوەتە ڕوو، بەڵام بەشێوەیەکی کەمتر ئاوڕ لە پەیوەندیی نێوان ئەدەب و سایکۆلۆژیا دراوەتەوە، بە پێویستمان زانی کە لە پەیوەندیی نێوانیان و بەرهەمە شیعرییەکانی (هێمن) لێکبدەینەوە لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە بەپێی ڕێبازی دەروونشیکاری، بەو ئامانجەی کە تیشک بخەینە سەر هەندێ لایەنی دەروونی بەرهەمە شیعرییەکانی، لە ڕێگەی شیکردنەوەی سایکۆلۆژییانەی دیوی ناوەوەی دەقە شیعرییەکان و لێکدانەوە و ڕاڤەکردنیان بەپێی بنەما دەروونی و خەسڵەتە دەروونییەکانی شاعیر، کە لە ناو دەقە شیعرییەکاندا بەدی دەکەین و ڕۆڵیان لە بەرهەمهێنان و بەدیهێنانی تێکستە شیعرییەکاندا هەبووە، بەم شێوەیەش کۆمەڵێک لایەنی شاراوەی تێکست و ژیانی سایکۆلۆژیی شاعیر دیاری دەکەین و هەندێ لایەن و حاڵەتی دەروونیی شاعیرمان بۆ ڕوون و ئاشکرا دەبێت.

پلان و ڕێڕەوی باس و توێژینەوەکەمان لە پێشەکی و دوو بەشی سەرەکی پێکدێت، لە بەشی یەکەمدا لە ژێر ناونیشانی (سایکۆلۆژیای ئەدەب) کە تیایدا ئاوڕمان لە چەمکی دەروونناسی داوەتەوە بە شێوەیەکی تیۆری و پاشان هاتووینەتە سەر چەمکی ئەدەب بەتایبەتی ئەو چەمکانەی، کە گوزارشت لە کەسێتی داهێنەر و دەقی شیعری دەکات . هەروەها ئەو چەمکانەمان باس کردووە کە ئەدەب و دەروونناسی پێکەوە دەبەستێتەوە، لە بەشی دووەمدا لە ژێر ناونیشانی (نموونەی شیعری و شیکردنەوە و لێکدانەوەیان بەنموونەی

هەندێ دەقی شیعری (هێمن))، ئەم دەقانە شیکراوەتەوە بەو مەبەستەی، کە پەردە لە سەر لایەنە شاراوەکانی ژیانی و دەروونی هەڵبدەینەوە ، پاشان ڕوومان لە ژیانی کۆمەڵایەتی کردووە و چۆنێتی ڕەنگدانەوەی باری دەروونی لە پانتایی جیهانە شیعرییەکەیدا و هەروەها شیکردنەوەی شیعرەکانی (هێمن) لە بەر ڕۆشنایی بنەماکانی دەروونناسیدا تیشک خراوەتە سەر چەند چەمکێکی دەروونی وەکو (ڕەشبینی و گەشبینی و نامۆیی و خەمۆکی و دڵەڕاوکێ و خۆشەویستی و ......هتد. لە دواییشدا ئەنجام و پوختەی لێکۆڵینەوەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراوەتە ڕوو, پاشان ئەو سەرچاوانەمان نووسیوە، کە لە لێکۆڵینەوەکەدا سوودمان لێ وەرگرتوون، لەم لێکۆڵینەوەشدا پشتمان بە دیوانی (ناڵەی جودایی) هێمن بەستووە.

## بەشی یەکەم

### سایکۆلۆژیا

زانستی دەروونناسی (psychology) ئەم زاراوەیە لە دوو وشە پێکهاتووە (سایکۆ(psycho) بە مانای دەروون و(logy) بە واتای زانست یان زانستی دێت ، سایکۆلۆژی بە مانای (دەروونناسی ) یان زانستی دەروونناسی دێت ، ئەم زاراوەیە بۆ یەکەم جار لە لایەن دەروونناسی ئەمریکایی (ولیەم جەیمس)ەوە ساڵی ١٨٩٨ لە کتێبەکەیدا (بنەماکانی دەروونناسی (principle of physiology) بەکار هاتووە) (سامان عیزەدین سەعدوون، ٢٠١٥،ل١٩.)

بە گەلێ شێوەی جۆراو جۆر پێناسەی دەروونناسی کراوە لێرەدا بە پێویستی دەزانین هەندێ لەو پێناسانە بخەینە ڕوو، هەندێ لە دەروونناسان پێیانوایە کە (دەروونناسی جۆرە زانستێکە لە لایەنە گشتییەکان دەکۆڵێتەوە، زانای دەروونناسی بەکاری شیکارییەوە

خەریک دەبێت ئەدگارەکانی مرۆڤ شی دەکاتەوە بۆ دۆزینەوەی ماکە هاوبەشەکان) (د. سامی الدروبي ، ١٩٧١، ص١٠٥.)

دەروونناسی ئەو زانستەیە، کە باسی دەروونی مرۆڤ دەکات و لێکۆڵینەوە لەسەر ڕووداوەکانی ناخی تاک و کاریگەری لایەنی دەروونی مرۆڤ وەکو بیر و سۆز و حەز و...هتد دەکات، کەواتە (دەروونناسی ئەو زانستەیە، کە لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری مرۆڤ دەکۆڵێتەوە ، مەبەست لە هەڵسوکەوت و ڕەفتار ئەوەیە کە هەموو چالاکی و پرۆسێسێک، کە مرۆڤی پێ هەڵدەستێت) (د. محمد جاسم محمد، ٢٠٠٤، ص١٦.)

واتە دەروونناسی لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی تاک لە نێو کۆمەڵدا دەکۆڵێتەوە و پەردە لەسەر هەستە شاراوەکانی دەروونی مرۆڤ هەڵدەداتەوە ، چونکە کۆمەڵێک فاکتەر هەن وا لە مرۆڤ دەکەن بەرەو کاری چاکە یان خراپەی ببات واتە زانستی دەروونناسی هەوڵی شیکردنەوەی هەموو ئەو لایەنانە دەدات، کە لە تاکدا هەیە و هەروەها هەوڵی چارەسەرکردنیشی دەدات، واتە بە دوای چارەسەری ئەو گرفتانە دەگەڕێت، کە کاریان کردۆتە سەر تاک وەکو (دڵەڕاوکێ و ترس و خەمۆکی و بێزاری و هەستکردن بە نامۆیی ............... ).

**ئەدەب**

چەمکی ئەدەب، بەپێی قۆناغەکان و ڕێبازە ئەدەبییەکان کۆمەڵێ پێناسە و تێڕوانینی لەبارەوە کراوە، چونکە تا ئێستاش نەتوانراوە یەک پێناسە بۆ ئەدەب دەستنیشان بکرێت، ئەویش بە هۆی ئەوەی، کە ئەدەب ڕەنگ پێدەرەوەی دەروون و دەنگی ئادەمیزادە و ئاوێنەی باری کۆمەڵە و ڕەنگدانەوەی ژیانە، دەروونی مرۆڤیش لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر، هەروەها لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تریش لە گۆڕاندایە ، لە لایەکی تریشەوە باری کۆمەڵیش لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر بە هەمان شێوە لە گۆڕاندایە و جێگیر

نییە واتە پەرەسەندنی ئەدەب بەندە بە پەرەسەندنی کۆمەڵەوە دواکەوتنیشی بەندە بە دواکەوتنی کۆمەڵەوە، بەڵام هەندێکی تر پێیانوایە ئەدەب ئەو زانستەیە کە (بریتییە لە بەرهەمی مێشک بەگشتی و ئەو نووسراوەیە، کە بە زمانێکی باش و پاراو چێژێکی هونەری و واتایەکی بەرز دەدات بە بەرامبەرەکەی ) (مامۆستا عەتا حسێن، وانەکانی بکالۆریۆس، ٢٠٠٨...)

هەر نەتەوەیەک خاوەنی بەرهەمی ئەدەبی تایبەتی خۆیەتی و جیاوازە لە نەتەوەیەکی تر و هەر یەک لە تاکەکانی کۆمەڵگا بیرکردنەوەیان جیاوازە و بە شێوەیەک بیردەکەنەوە و تێکست و بەرهەمی ئەدەبی خۆیان دادەڕێژن، کەواتە (ئیشی ئەدەبی بەرهەمێکی زیندووە لە بیرو هەستدا، ئەو شتانەی کە نووسەر هەستی پێدەکات لە پێکدادانی نووسەر و واقیعدا، پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان نووسەرو ئەو واقیعەی کە نووسەر دەیەوێ دروستی بکات ) (سعاد جبر سعید ، ٢٠٠٨، ل٨٣،٩١)

بۆیە بەرهەمە ئەدەبییەکان (چەندین پێوەری دەروونی و ئاکاری و کۆمەڵایەتی پێشکەش بە کۆمەڵگا دەکەن و ڕەنگدانەوەی هەڵچوونەکانی مرۆڤن لە حاڵەتی هێمنی و بێدەنگیدا) (ئازاد عبدالواحید کەریم ،٢٠٠٥،ل٩١.)

گومانی تێدا نییە ئەدەب وێنەیەکی هونەری و دەرخستنی مرۆڤایەتییە، هەروەها لایەنەکانی ژیان دەردەخات ئەو دەرفەتەی کە پێی دەردەبڕێت زمانە، کەواتە (ئەدەب کۆمەڵێ بیری بنەڕەتی مرۆڤایەتییە، بەڵام بەشێوەیەکی هونەریی جوان (http://lib.uin-malang.ac.id/files/thesis/chapter_i07310091). هەروەها دەکرێ لە پێناسە و دەرخستنێکی تری چەمکی ئەدەبدا بوترێت، کە ئەدەب (ئەو قسە جوان و نەخشی دڵفڕێن و نیگاری پەسەند و ئاوازە بەجۆشانە دەگرێتەوە، کە وەکو مرواری وان لە کۆنەوە لە باو باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە جا چ لەسەر بەرد هەڵکەندرابێت یان لەسەر دیواری ئەشکەوتەکان نووسرابێتەوە ) (سەرچاوەی پێشوو) ئەگەر بە چاوێکی

ورد و زانستییانه له چەمکی ئەدەب بڕوانین له دووتۆی چەند پێناسەیەکەوە، کە خستمانە ڕوو دەکرێت بوترێت ئەدەب بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕوو لە ژیانی کۆمەلآنی خەلّک دەکات و لە گەلّیدا ئەدوێت و ڕەخنەی دروستکەر و ڕووخێنەری لێ دەگرێت ، لە هەمان کاتدا پەردە لە سەر شتە ناڕاست و کارەکانی کۆمەلّگا هەلّدەداتەوە، واتە لەگەلّ ئەوەی، کە ئەدەب زادە و بەرهەمی مرۆڤە و گوزارشت لە هەست و نەستی خاوەنەکەی دەکات، ئاکارەکانی تاک دەخاتەڕوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە هەر لەگەلّ پەیدابوون و هاتنەکایەی مرۆڤدا ئەدەبیش پەیدابووە.

### سایکۆلۆژیای ئەدەب

سایکۆلۆژیای ئەدەب بابەتێکی پڕ بایەخی زانستی دەروونناسییە، لێکۆلّینەوەیەکی ئەدەبییە، کە کار و کردەوەکانی بەشێکە لە کردەوەی دەروونی مرۆڤ واتە دەتوانین بلّێین، کە (زانستی دەروونناسی ئەدەبی لێکدانەوەی ڕەفتار و هەلّسوکەوتی کەسێتی پالّەوانی ناو چیرۆک و ڕۆمانە، بەمەبەستی شیکردنەوەی لایەنی دەروونی نووسەرەکەی بۆ تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی شاراوەی دەقەکان، بەلآم لە شیعردا شیکردنەوە و لێکدانەوەی ڕەمزو خوازەی ناو دەقە شیعرییەکان دەکات بەمەبەستی شیکردنەوەی لایەنی دەروونیی شاعیرەکە و تێگەیشتن لەمانای دروستی شیعرەکە بەگشتی، وەک چۆن ئەدەب کار دەکاتە سەر سایکۆلۆژیا بە هەمان شێوەش سایکۆلۆژیا کار دەکاتە سەر ئەدەب، چونکە شاعیر بەهۆی ئەو هەستە پەنگخواردووەی، کە لە ناخیەتی هەولّ دەدات، ئەو هەستانە لە نێوەندی دەقی ئەدەبی دەربېڕێت و بیخاتە سەر کاغەز، کەواتە لایەنی دەروونی شاعیر بووە هۆی لەدایکبوونی دەقی شیعری، وەک دەبینین لێرەدا زانستی دەروونناسی ڕۆلّی خۆی هەیە بۆ دروستبوون و لەدایکبوون و سەرهەلّدانی دەقی ئەدەبی، ئەو لایەنە دەروونییانە دەکرێت بەهۆی (ترس و قەلەقی و

خەفەت و نامۆبوون و هەستکردن بە نائارامی و خۆشی و ناخۆشی......هتد) کەواتە هەردوو لایەنی ژیان بە خۆشی و ناخۆشییەکانەوە رۆڵیان هەیە لە بواری داهێنانی ئەدەبیدا دەکرێ بڵێین، کە هەردووکیان دوو فاکتەری گرنگ و سەرەکین لە ژیانی تاکدا .

بەپێی تێڕوانینی عبدالرحمن العدس دەربارەی سایکۆلۆژیای ئەدەب دەڵێت (ڕاستە زانستی دەروونناسی لە دەروونی ئەدەب ماوەتەوە، وەکو بەشێک بۆ لێکۆڵینەوەی دەروونی لەبەر ئەوەی ئەدیبەکان کاتێک دەربارەی هەر بابەتێک دەنووسن وەکو (شیعرو پەخشان) هەڵگێڕانەوەی یان ڕەنگدانەوەی هەست و نەست و سۆزی ناخیەتی ) http://lib.uin-malang.ac.id/files/thesis/chapter_ii/07310091

وەک چۆن ئەرستۆ ئەوەی بۆمان ڕوون و ئاشکرا کردووە کە (ئەدەب کاریگەری لەسەر ڕەفتاری مرۆڤ دەبێ، واتە بابەتی ئەدەب، بەتایبەتی (تراژیدیا)، لەڕێگەی ڕووداوەکانی کاریگەری لەسەر دەروون و ناخی پەیام وەرگر جێدەهێڵێت، لە ئەنجامدا چێژێکی عاتیفی و هونەری پێدەبەخشێ، کە جگە لە سوود بایەخی بە چێژی هونەریش داوە) (د. شکری عزیز الماضي ، ٢٠١٠،ل٣٩.)

لە ئەنجامی بیر و بۆچوون و تێڕوانینی ئەرەستۆوە دەگەینە ئەوەی، کە ئەدەب کاریگەری لەسەر ناخی مرۆڤ دروست دەکات و هەستی دەجووڵێنێ، ئەم جوولاندنی هەستەش بۆ خۆی لایەنێکە لەو لایەنانەی، کە پەیوەندیی نێوان ئەدەب و سایکۆلۆژیا دروست دەکات، چونکە (کارتێکردنی سایکۆلۆژیانە لە سەر ئەدەب شتێکە مایەی نکۆڵی لێکردن نییە، لای ڕەخنەی ئەدەبیش بەپێی پێوندانگی خۆی نرخ و بەهای خۆی هەیە) ( پێشڕەو عەبدوڵلا ، ٢٠١٣، ل١١٣.) کەواتە ئەدەب لە ڕوانگەی دەروونناسەکانەوە بریتییە لە ناخی کەسێتی ئەدیب لە دەربڕینی هەست و نەستی خودێتی شاعیر، واتە دەتوانین ئەو ڕاستییە دەستنیشان بکەین، کە ئەدەب و دەروونناسی پەیوەندییەکی بەهێز بە یەکتریان دەبەستێتەوە ، بۆیە بەپێی تێڕوانینی ڤیکتۆر هۆگۆ، کە گەورە

شاعیرێکی فەرەنسییە پێیوایە کە (بۆ ئەوەی شتێکی ڕاستەقینە سازبکەین ، پێویستە وەسفی باری دەروونیی ڕاستی بکەین) (د. کامل بەسیر ، ١٩٨٣، ل٦٢.) هەروەها بەپێی تێڕوانینی هەندێک لە نووسەران پێیانوایە کە (ئەدەب و دەروونناسی یەک ڕێڕەویان هەیە یاخود بڵێین هاوگەشتن، لە باسکردنی هەر بنەمایەک لە بنەماکانی ئەدەب (نووسەر ، کاری ئەدەبی، خوێنەر) بەپێی پێویست بەرەو باسکردنی حاڵەتی دەروونی و لایەنی ویژدانی و داهێنەر و خوێنەر دەبات ) (د. شکری عزیز الماضي ،١٤٧،٢٠١٠.)

هەروەها بەپێی ئەو توێژینەوانەی دەربارەی پەیوەندیی نێوان ئەدەب و سایکۆلۆژیا کراوە بۆ نموونە (سانت بیڤ) یەکەم کەسە کە (گرنگی بە لێکدانەوەی دەروونی بۆ ئەدەب داوە و لە ڕێگەی کارەکانیەوە پەردە لە سەر دەروونی نووسەر لابەرێت و لایەنی دەروونییان ڕوون بکاتەوە و نهێنییەکانی ژیانیان بدۆزێتەوە، کە کاریگەرییان لەسەر داهێنەر لە پرۆسەی داهێناندا هەیە) (محمد عزام سلطة الکاتب ،www.ningawy .com)

## بەشی دووەم

نموونەی شیعری و شیکردنەوە و لێکدانەوەیان بەنموونەی هەندێ دەقی شیعری (هێمن)

لێرەدا پێویستە ئەوە بخەینەڕوو، کە لەم لێکۆڵینەوەدا سوود لەو چەمکە و بنەمای دەروونی زانستی دەروونناسی و دەروونشیکاری وەردەگرین بۆ شیکردنەوەی دەقە شیعرییەکانی (هێمن)، بەپێی تێڕوانینی فرۆید (هەر دەقێکی ئەدەبی دوو ڕووی هەیە، ڕووی دەرەوە و ڕووی ناوەوە، کە ڕووی دووەم ڕوویەکی شاراوەیە و کەرەسەی شاراوەی تێدا شاردراوەتەوە ، پێویستە ڕەخنەگر شارەزایی ڕەمزەکان و بۆچوونەکان و سەرنجە تیژەکانی نووسەر بێت ، تا بەو هۆیانەوە لە هەردوو دیوەکەی نووسینەکە بگات)، (ئەکرەم قەرەداخی، ٢٠٠٩، ل٢٠٣.)

لە فەرهەنگی زمانی شاعیردا کۆمەڵێک وشە هەن، کە ئاماژەیە بۆ ڕەهەندی دەروونی شاعیر، واتە دەکرێت بوترێت، کە (لە فەرهەنگی شیعریی هەر شاعیرێکدا، کە پەیوەندی بە زمانی شیعرییەوە هەیە کۆمەڵێک وشە هەن، کە ڕەهەندی دەروونی دەبەخشن و وابەستە بە لایەنی ڕاڕایی و خەم و ئازاری دەروونی شاعیرن، کەواتە بنیاتی سەرەکی ئەو جۆرە شیعرانە لە هەست و سۆزی خەمبارییەوە دروست دەبێت ، کە زمانی شیعری ئەم جۆرە شیعرانە پابەندە بە وشەی تەنیایی و نائارامی و تێکچوونی باری دەروونی شاعیرەوە هەندێک جار نامۆیی لە تەواوی ئەو شیعرانەدا دەبینرێت، کە وشەکانی دەربڕی هەستی دەروونیی شاعیرە.) (ئازاد عبدالواحید ، ٢٠١١، ل٥٥.)

لە ئەنجامی هەندێ کاریگەری دەروونییەوە، کە لە پێشدا ئاماژەی پێکرا وەکو دڵەڕاوکێ و نائارامی و نامۆیی و هەستکردن بە تەنیایی و ئارەزووە پەنگخواردووەکانی ناخی دەروونی شاعیر، ئەمانە دەبنە هەوێنی لەدایکبوونی شاعیرێک، کە بتوانێت لە ڕێگەی بەرهەمی ئەدەبییەوە گوزارشت لە هەست و نەست و نامۆیی و قەلەقی و ..........بکات و دەقێکی ئەدەبیی جوان پێشکەش بکات و لێرەیشەوە دەبێت ئاماژە بەوە بدەین، کە کەسایەتی شاعیر جیاوازە لە مرۆڤی ئاسایی، چونکە شاعیر لە توانایدایە بەرهەمی ئەدەبی بە پێز و باش پێشکەش بکات و بەردەوام داهێنان لە دەقە شیعرییەکانی بکات، بەڵام مرۆڤی ئاسایی بەو شێوەی شاعیر ناتوانێت تێکستی ئەدەبی بنووسێت و دەقی پوخت دروست بکات.

(هێمن) ئەستێرەیەکی درەوشاوەی شیعری نوێی کوردییە، خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەڵاتە، ساڵانێکی زۆری بە دەربەدەری و ئاوارەیی بردۆتە سەر و ناودارترین شاعیری کوردە، لە ڕووی چەشتنی ئازارو ئەشکەنجە و نامۆیی، چونکە تەمەنێکی زۆری لە تاراوگە بردۆتە سەر و لە شیعری (ناڵەی جودایی) ئەفسانەیەکی جوانی نامۆیی تاکی کوردی خەباتگێڕ و تێکۆشەری دروستکردووە، بە

شێوەیەکی وا کە لەم شیعرەدا چەندین جۆری نامۆیی و بیری کۆمەڵایەتی و سیاسی و جوگرافی تێدا بەرچاومان دەکەوێت ، هەروەها نامۆیی یەکێکە لەو گرفت و قەیرانە دەروونی و کۆمەڵایەتییانەی، کە لە ژێر کاریگەری چەند هۆکارێکدا دووچاری مرۆڤـ دەبێت و سەرچاوە و فاکتەرەکانی نامۆیی هەرچەندە جیاواز بن، بەڵام ناکرێت ئەو ڕاستییە لە بیر بکەین، کە تێکڕای حاڵەتەکان دەروونین لە سەرچاوەیەکی دەرەکییەوە کار دەکەنە سەر مرۆڤـ و هەست و هۆش و کەسایەتییەکەی، بەڵام ئاکام و ئەنجامەکان یەکن، شاعیر لەم هۆنراوەیەدا هەستێکی ناسک و جۆرە مۆسیقایەکی غەمناکی بە شیعرەکە بەخشیوە، چونکە ئەگەر سەرنجی ناونیشانی شیعرەکە بدەین، کە (ناڵەی جودایی)یە پەیامی شیعرەکەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کەوا ئەم شیعرە دەربارەی ناڵەی دەروونی مرۆڤە، کە دوورکەوتۆتەوە لە خۆشەویست و خێزان و خزم و کەس و کاری، بۆیە دابڕانی مرۆڤ لە کەسایەتیی ڕەسەنی خۆی و شێواندن و ئاڵۆزبوونی ژیانی ئاسایی و سروشتییەکەی، لەگەڵ ئەرک و پەیام و بەها و ئامانجە ڕەسەنەکانیدا ناتەبا و ناکۆک دەکەوێتەوە، کاریگەری نەرێنی لەسەر هەڵسوکەوت و ڕەفتارو سروشتی مرۆڤـ هەیە و وای لێدەکات، کە بەردەوام لەگەڵ واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و تەنانەت ئایینیشدا نەتوانێت خۆی بگونجێنێت. دەبینین شاعیر لەم شیعرەیدا کۆمەڵێ وشەی خەمی لەنێو شیعرەکەدا بەکار هێناوە، بە شێوەیەکی زۆر کەم وشەی شادی بەخشی تێدا بەکارهێناوە ئاشکرایە، کە بەکارهێنانی زۆری ئەم وشە خەم بەخشانە هێزێکی تایبەتی دەروونی بە دەقەی شیعرەکە بەخشیوە.

هەستی نیشتمان پەروەری و نەتەوایەتی تێکەڵاو بوونیان، بە هونەری شیعرە بەرزەکانی (هێمن)، هەستی نەتەوایەتی شاعیر و شیعرە پڕ سۆز و هونەرییەکانی، کە داوای ئازادی و یەکسانی دەکات بۆ گەلی کوردی ستەمدیدە ، وەکو خۆی لەم دوو دێڕە شیعرەدا ئەو پەیامەمان پێ ڕادەگەیەنێت و دەڵێ:

**شیوەنی من شیوەنی ئینسانی‌یە**
**بانگی ئازادی و گرۆی یەکسانی‌یە**
**شیوەنی من شینی کوردی بێ بەشە**
**ئەو گەلەی حاشا دەکەن لێی و هەشە**

(هێمن، ١٩٧٩، ل١٨-١٩.)

ئەو زەمینەی، کە کۆمەڵگا دەیڕەخسێنێت سنووری هەموو کێشە و ململانێکانی خودی و بابەتی لە کارە ئەدەبییەکاندا زۆر لەیەک نزیک دەکاتەوە بەشێوەیەک کە تێکەڵی یەکتری بن، دەکرێ بەم شێوەیە لێک بدرێتەوە (ئەو کێشەیەی لە دەروونی ئەدیب هەیە ڕەمزێکە بۆ ئەو کێشانەی لە ویژدانی مرۆڤایەتیدا هەن ، چونکە کۆمەڵگە بوارێکە ئەزموونە ئەدەبییەکان کامڵ دەکات و بە یەکیان دەگەیەنێت هەروەکو چۆن تاکەکانیش لەم بوارەدا بەیەک دەگەن و کامڵ دەبن (رجاء عيد ،١٩٧٤، ص ٨٤ )، لە دێڕێکی تردا هەمان هەستی خۆی بۆمان دەردەبڕێت هەروەکو دەڵێت:

**کوردەواری ، ئەی وڵاتە جوانەکەم!**
**ڕۆڵەکەم! خێزانەکەم! باوانەکەم!**

(هێمن، ١٩٧٩، ل٢١.)

پاڵنەرە دەروونییەکان، کە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێن بۆ بەرهەمهێنانی دەقی شیعری دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزوو هەستە شاراوەکان، کە کاریگەرییان لەسەر ژیانی ئاگایی هەیە ، هەروەها خەمۆکی بارێکی دەروونییە، کە لە دۆخێکی غەمبارییەوە سەرهەڵدەدات، کە دەبێتە هۆی تووشبوونی کەسێ بە خەمۆکی و یان لەدەستدانی کەسی خۆشەویستی و یان کۆچکردنی، خەمۆکی ئەنجامی ئەو دڵتەنگییە، کە لە ڕێی ڕووداوێکی کاریگەر و پڕ ئازاردا تووشی مرۆڤ دەبێت ، هەروەها خەمی شاعیر لە تێکستە شیعرییەکانی دەردەکەوێت، کە بەرگێکی تاریک و ترسناک و ماتەم لەبەر دەکات بۆیە دەڵێ:

**ژانی ناسۆری جودابیم چێشتووە**

**هەرچی خۆشم ویستووە جێم هێشتووە**

( هێمن، ١٩٧٩، ل٢٠.)

بە هۆی ئەو دۆخەوە شاعیر دەروونی نائارام و نیگەران و بێ هیوا دەبێت لە بەردەم قۆناغی ژیانیدا ڕەشبینییەکەی وای لێ دەکات، کە هەمیشە وەسف و تێڕوانینەکانی لە پانتایی دەقەکەدا ڕەنگدانەوەی ئەو دۆخە دەروونییە ناجێگیرەی بێت، بۆیە کۆڵ نادات تا دەگاتە ئەوەی، کە تا توانای هەبێت پێداگری لە بەدەستهێنانی خاک و ماف و خۆشەویستەکانی بکات، چونکە شاعیر وای لێدێت، کە بگاتە ئەوەی، کە هێندە یاخی بێت و پێداگری لە هاتنی خۆی بکات تا توانا و هێز لە لاشەیدا بمێنێت، ئەمەش تەنها لە دێڕێکدا وشەی (دێم) شەش جار دووبارە بکاتەوە ئەمە جگە لەوەی، کە چەندین جاری تر لە چامەی ناڵەی جودایی دووبارەی کردۆتەوە

**تا بمێنێ نووری چاو و هێزی پێم**

**دێم و دێم و دێم و دێم و دێم و دێم**

(هێمن، ١٩٧٩، ل٢٤.)

پاشان شاعیر لەم دێڕەدا خەسڵەتێکی ڕەشبینی دەستنیشان دەکات ئەویش ئەوەیە، کە هێندە ڕەشبینە و ئایندەی لێ ڕوون نییە و نازانێ لە دواییدا چی بەسەر دێت و چارەنووسی بە کوێ دەگات ، ئەم بارە دەروونییە بەرجەستەکردنی ئەو بارە نائارامییەی شاعیرن، کە بەرامبەر ژیان هەیەتی هەروەکو دەڵێ:

**لێم گەڕێ با دەربڕم سۆزی دەروون**

**لێم گەڕێ با هەڵوەرێنم ئەشکی ڕوون**

(هێمن، ١٩٧٩، ل١٨.)

ئەگەر مرۆڤ تەنها لایەنی خراپی و ناخۆشی و دیاردەکانی ژیانی ببینی ئەوا هیچ هیوا و ئاواتێکی ئایندەی بە باش و جوان نابینێ، هەمیشە هەست دەکات، کە هەموو شتەکانی دەوروبەری پێچەوانە و

دژی دەوەستێتەوە، بۆیە ڕەشبینی ئاسۆی گەشی ژیانی دادەپۆشێت، هەروەها باسکردنی خەم و گرفتە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی سەردەمەکەی ، لێرەدا دەڵێ:

**نابینم خاک و وڵات و شاری خۆم**
**نابینم ناسیاو و دۆست و یاری خۆم**
**ڕوو لە هەر لایە دەکەم نامۆیە بۆم**
**نابینم جێ ژوان و کەونە لانی خۆم**

(هێمن، ١٩٧٩، ل١٩.)

هێمن هەندێ جار میکانیزمی بەرگری دەروونی بەکار دێنێ بۆ دەربڕین و گوزارشتکردن لە هەستەکانی، ئەم دەقە شیعرییانە ئەوە دەسەلمێنێ، کە فاکتەری سەرەکی هەستکردن بە دڵەڕاوکێ و دوورکەوتنەوە لە خاک و بەسەربردنی ژیان لە خاکی غەریبی، بووەتە بنیاتی سەرەکی هەڵبەستەکە، ئەمانە لەم دەقە شیعرییەدا ڕەنگ دەداتەوە ، چونکە بۆ یەکەم جار لە زێدی باوباپیرانی دوور دەکەوێتەوە و دەچێتە شار و ژینگەی نوێ ، کاتێک دڵەڕاوکێی ناوەکی دروست دەبێت ئارەزووەکان لە هەوڵدان بۆ ئەوەی بە شێوەیەک لە شێوەکان خۆیان پڕ بکەنەوە، بەوەش لە نەستی مرۆڤدا نقوم دەبن ، وەکو لەم دەقەدا دەردەکەوێت

**مەی حەلاڵە بۆ منی وێرانە ماڵ**
**بۆ منی سەرگەشتەو و ڕووت و ڕەجاڵ**
**بۆ منی بابردەڵەی گردە نشین**
**بۆ منی دڵ پڕ لە ناسۆر و برین**

(هێمن، ١٩٧٩، ل١٦.)

یان دەڵێ:

**بۆ منی ئاوارە و و دوورە وەتەن**
**بلبلی بێ بەش لە گوڵزار و چەمەن**

(هێمن، ١٩٧٩، ل١٦.)

پێویستە دەقنووس شارەزایی لە بواری خۆشەویستی پاک و بێگەرد هەبێت، پاشان سایکۆلۆژییەکی تەواوی دەبێت لەڕووی پێگەیشتوویی تاک و تێگەیشتنی لە بوارەکانی ژیان، خۆشەویستی مرۆڤ یان خاک و نیشتمان کاریگەرییەکی زۆر لەسەر دڵ و دەروونی شاعیر دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی، کە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە بەرهەمە ئەدەبییەکە دابڕێژێت، بە تایبەتی لایەنی خەم و ڕاڕایی، کە زۆر کار دەکاتە سەر ناخی شاعیر، بۆیە دەتوانین بڵێین کە (ئەزموونی خۆشەویستی تاکە ئەزموونی ژیانە، کە یارمەتی کامڵبوونی سایکۆلۆژی خود دەدات) (د. عەبدولحەلیم سەمعان ، و.سۆزان جەمال، ۲۰۰۷، ل۹۷.)

هەربەپێی لۆجیکی شاعیر، چامەی (ناڵەی جودایی) دەرمانی خەمە، شاعیر پێیوایە، کە دەردی دووری و دابڕاوی بەسۆی وای کردووە کە ڕوو لە مەیخانەکان بکات، بۆیە هەرکەسێک خاوەنی ناسۆر و خەمێکی ئێجگار زۆر نەبێت مەی حەرامە بۆیان، لەم بەیتانەی خوارەوەدا وێنەیەکی تەواو ڕاستەقینە و ڕاستگۆمان لەبارەی هەست و نەستی گڕگرتووی خۆیمان بەڕوونی بۆ دەخاتە ڕوو، کە دووری و دابڕان لە کەسوکارانی، هوشیارکردنەوەی کۆمەڵگا و دڵدانەوەی خۆی بە سەبووری کردن، واتە ئارامگرتن دەبنە تابلۆیەکی ڕەنگاوڕەنگی شیعری، کە تیایدا ئازار  و حەسرەتی دووری و جودایی، خواردن و خەو لە شاعیری دوورە وڵات حەرام دەکەن:

**دەردی دووری .. دەردی دووری کوشتمی**
**دەردی وشیاری و سەبووری کوشتمی**
**یادی یاران و وڵاتم ڕۆژ و شەو**
**لێی حەرام کردم قەرار و خورد و خەو**
**خەم ڕەوێنێک لێرە من  ناکەم بەدی**
**چۆن پەنا بۆ مەی نەبەم، ساقی! ئەدی!؟**

(هێمن، ۱۹۷۹، ل۱۹.)

یان لە دێڕێکی تردا دەڵێ:

**مەی حەرامە بۆ سەهەند و بێ خەمان**

**مەستی بێ خەم بۆچی بگرن ئێخەمان**

(هێمن، ١٩٧٩، ل١٢.)

پانتایی چامە شیعرییەکە دەلالەت بۆ ئەو ڕاستییە دەکەن، کە شاعیر تووشی خەمۆکی و ئازار بووە، دەروونی پڕمات و کڵۆڵ و حەسرەت و پەستی شاعیر زیاتر ڕەهەندی دەروونی غەمگینانە بە شیعر دەبەخشن ئەمەش لە نێو دەقە شیعرییەکانی دەبینرێت، کە بۆ جوانی نووسیویەتی، کە جوانی بووە بە گرێیەکی دەروونی لای شاعیر، هەروەها دەربڕینی بە دەقی شیعری دەبێتە مایەی خاڵیکردنەوەی ناخ و ئاسوودەیی دەروون.

هێمن لەم شیعرانەدا، کە جوانپەرستیی خۆی بۆ ئافرەت دەردەخات، هەستی نائاگایی خۆی هاویشتۆتە نێو دەقە شیعرییەکانەوە، کە ئاماژەیەکە بۆ هەستێکی کپکراو، چونکە جوانپەرستی بۆ ئافرەت لای هێمن سەرچاوە و پاڵنەری حەزی دڵ و دەروونە، تا بگاتە ئەو ئاستەی، کە بڵێت جوان پەرستم، هێمن گرێی دڵ و دەروونی خۆی لە جیهانی ئافرەتدا دەکاتەوە بۆ ئەوەی لەو دنیا ئاسوودە و ئارامەدا ڕۆحی فەراهەم بکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەست بەوە دەکات، کە تەنها هەست و سۆز و کۆشی گەرمی ئازیز دڵی پڕ لە حەسرەتی ئارام دەکاتەوە هەروەکو دەڵێ:

**جوان پەرستم ، جوان پەرستم**

**بەدیداری جوانان مەستم**

**کە دەبینم کیژی تەڕپۆش**

**گشت خەمێ دەکەم فەرامۆش**

**کە کیژێکی جوان دەبینم**

**سارێژ دەبنەوە برینم**

(هێمن، ١٩٧٩، ل٤٦.)

یان لە دێڕێکی تردا کە ناز و مەکری ئافرەت شاعیر بەرەو دنیای بەهەشتی بەرین دەبات و دەڵێ:

**نــــــازی شۆخێکی نازەنین**

**دەمباتە بەهەشـــــتی بەرین**

(هێمن، ١٩٧٩، ل٤٧.)

شیعری (ئێوارەی پایز) کە بە زمانێکی سادە و ڕەوان، بەڵام بە ناوەڕۆکێکی دەوڵەمەند هەموو حاڵەتەکانی دەروونی کەسێکی شێواو و پڕ گوماناوی و نیگەران دەردەخات، لەگەڵ ئەوەشدا لە دوابەشی شیعرەکەدا گۆڕینی باری سەرنجی دەربارەی ژیان لە هێڵی نائومێدی و بێ هیوایییەوە بۆ هێڵی هیوا و ئومێد وەکو خۆی دەڵێ:

**گوتم "کەوا بوو، ئاشنا !**

**بەشی ئێمە لەنێوچوونە"**

**گوتی : "نا، نا، دوور بنوارە**

**دوور بنوارە .. ئاسۆ ڕوونە.."**

(هێمن، ١٩٧٩ ، ل٣٦.)

هەروەها لە شیعری (تاوانی بێ هێزی) تێڕوانینی شاعیرە بەرامبەر خەم و خەفەت و پەژارە، زیاتر لە فرمێسک ئەچن، غەمی تایبەتی و گشتی هێمن جیهانێکی زۆر فراوانە، کە تارمایی و کاریگەری بەسەر سەرتاپا شیعرەکەیدا هەیە ، تەنانەت لەو دەقە شیعرییانەش، کە بۆ سروشت و جوانی ئافرەت و هەستی کوردایەتی و ئایدۆلۆژیاش نووسیویەتی هەیە، چونکە ئەم لایەنانەش لە ڕەگ و ڕیشەی ناخ و دەروونی قووڵی کەسێتی (هێمن)دا ڕەنگی داوەتەوە

**لە کۆ ئەسرین دەبارێنم لە بۆ کوردی پەراگەندە**

**لە گەرمێن غەرقی ئارەق بووم و چاوم هەر لە سامرەندە**

**منی زنجیر پسێن لێرە ئەسیری بسکی جوانێکم**

**زەمانە گەرچی ئاڵۆز و پەشێوە، "کەڵ بە موو بەندە"**

(هێمن، ١٩٧٩ ، ل٢٦.)

هەروەها لە شیعری (جوانی بەس نییە)  شاعیر زۆر بە جوانی وەسفی ئافرەتی میللەتی کوردی کردووە، هەروەها شانازییان پێوە دەکات بە شێوەیەکی ورد و سەرنجڕاکێش تابلۆی کچی کوردی بۆمان کێشاوە، کە کچی بە هیوا و  ڕێگای ڕۆشنکەرەوەی ژیان و نووری چاو و سارێژ کردنی برین داناوە، هەروەکو خۆی دەڵێت:

**کچ ئاواتی پیرۆزمن**

**خۆشی دڵی پڕ سۆزمن**

**کچ نووری دیدە و چاومن**

**بەندی جەرگ و هەناومن**

**کچ ڕووناکی ژینمن**

**کچ هەتوانی برینمن**

(هێمن، ١٩٧٩، ل٤٧.)

ئەم شاعیرە، چونکە ئاستێکی رۆشنبیری و هۆشیاری هەبووە لە زەمەنی خۆیدا وەک رۆشنگەرێک رەخنەی ئاراستەی ئەو دۆخە کۆمەڵایەتییە کردووە، کە لە دیدی شاعیردا مایەی شەرمەزارییە، کە نەتەوەیەک لە سەدەی بیستەمدا لە ناو بۆتەی کۆنی چەقبەستوودا پاڵی لێدابێتەوە، بۆیە شاعیر لە شیعری (عیشق و ئازادی)دا بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو سزا و زیانەی، کە لەڕووی عەقڵانییەت و رۆشنبیری لێی دەدرێت پەنا بۆ مەی  خواردنەوە دەبات، تا دەگاتە ئەوەی کە شاعیر ئەوەندە بە گومانە لە ژیان،  ئاواتی ئەوەی  نامێنێت، کە  ڕۆژ و سەردەمێکی تر ببینێت و مۆمێکی تر لە سەر تەمەنی دابگیرسێنێت.

هەروەها ئایندەی نادیار و پەی پێ نەبراو بۆ مرۆڤی غەریب لە بۆسەدایە، دەترسێت ئەو ڕۆژەی بە هیوایەتی و رەنجی بۆ داوە پێی نەگات و لە بەری رەنجی خۆی نەخوات:

**لە بادە ئەم ژەمە تێر کە منی تینووی جگەرسووتاو**

**بە چی دیارە کە دەیبینم شەوێکی تر ، ژەمێکی تر!**

**ئەوەندە دەردەدار و بێ پەرستارم کە پێم وایە:**

**لەسەر کێکی تەمەن هەڵناکرێ تازە، شەمێکی تر**

(هێمن، ١٩٧٩، ل٥١.)

بەڵام هێمن ئەوەندە لە تەمەنی خۆی بە گومانە بڕوای پێی نەماوە پێی بگەیەنێتە ساڵێکی تر، مەبەستی لەو تەمەنە درێژە نییە، کە کەسانی تر ئاواتی بۆ دەخوازن، بەڵکو ئەو دەیەوێت بە چاوی خۆی سەردەمێکی نوێ ببینێت، کە تێیدا وڵات ئازاد بێت، ئەمیش بە سەرکەوتوویی بگەڕێتەوە، ناو زێدی باوباپیرانی خۆی، بۆیە پێمان دەڵێت:

**خدر نیم بۆ تەمەن شێت بم بەکانیی ژینێدا نووسێم**

**ئەوەندەم ژین دەوێ تا دەم دەنێمە نێو دەمێکی تر**

(هێمن، ١٩٧٩، ل٥٢.)

هەر دەقێک حاڵەت و میزاجی کەسایەتی شاعیر دەستنیشان دەکات، بۆیە شیعر وەکو بارانێکە بەسەر ناخ و دەروون و سروشتی شاعیردا دەبارێت، بۆیە ڕەشبینانە لە ژیان و ئایندەی دەڕوانێت، هەروەکو لە شیعرەکانیدا ئاماژەی پێدەکات کۆمەڵە وێنەی شیعری هەمەجۆر دەبینرێت، کە هێمایەکە بۆ حاڵەتی دەروونی و ڕەشبینی (هێمن). دەربڕینی (من چیم- من هەم) ئاماژەیەکە بۆ دەرخستنی لایەنی ڕەشبینی شاعیر، کە بەگومانە هەیە یان نییە بۆیە ژیانی ڕابردووی کاریگەری لەسەر ڕەشبینی شاعیر هەیە، کە ئەم لایەنە ڕەنگدانەوەی ناخی دەروونییەتی، بۆیە دەڵێ:

**چۆن دەتوانم بە تۆ بڵێم من چیم ؟!**

**خۆم گومانم هەیە کە هەم یا نیم**

(هێمن، ١٩٧٩، ل٤١.)

هێمن خاوەنی هەست و سۆزێکی ناسکە، بۆیە دەیەوێ ئەوەمان پێ ڕابگەیەنێت، کە هەورێکی تاریک و ڕەش سووچێکی ئاسمانی داپۆشیوە ، لەگەڵ ئەوەشدا باسی زەردیی گەڵای دارەکان دەکات، کە لە وەرزی پایزدا زەرد دەبێت و لەناکاو ڕەشەباش هەڵدەکا و دەیبات

بەرەو چارەنووسێکی نادیار ، بەهۆی ئەو ئازارانەی لە دەروونیدا دروست بووە شاعیری بەرەو نامۆیی بردووە، کە هێمن ئاوێنە دەروونێکی پڕ لە خەمە تەعبیر لە حاڵی پەرێشانی خۆی دەکات دەڵێ لە شیعری ( ئێوارە پاییز)دا پێمان دەڵێت:

**پەڵە هەورێکی چڵکنە**
**گرتی سووچێکی ئاسمان**
**گەڵای زەردی دارێک وەری**
**زریان بردی بەرەونەمان**

(هێمن، ١٩٧٩، ل٢٧ .)

## ئەنجام

لەمیانەی ئەم لێکۆڵینەوەماندا گەیشتینە ئەو ڕاستییەی کە پەیوەندیی دەروونناسی بە ئەدەبەوە پەیوەندییەکە ناتوانرێت نکۆڵی لێبکرێت ، لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان شیعر و دەروونناسی هەیە، بنەما دەروونییەکانی شاعیر ڕەنگپێدەرەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و خێزانیی شاعیرە, هەروەها دیاردەی ڕەشبینی و گەشبینی لە دەقەکانی هێمندا لەدایکبووی ڕۆژانی ژیانی شاعیر بووە هەمیشە هەستی ئارامی و نائارامی بەنێو ناخ و دەروونی شاعیردا هاتوچۆی کردووە ، سەرباری ئەوەش هەستی خەمۆکی و دڵەڕاوکێ ...هتد وەکو حاڵەتێکی دەروونی و پاڵنەرێکی بنچینەیی بووە بۆ داڕشتنی زۆرێک لە تێکستە شیعرییەکانی هێمن بەهۆی بێ ئارامی و نەگونجانی شاعیر لەگەڵ واقیعدا ، هەروەها لایەنێکی تریش کە بە ڕوونی لە نێو دەقە شیعرییەکانی هێمن دەبینرێت ئەویش هەستی نامۆبوونە ، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین کە هەوێنی لەدایکبوون و تاقیکردنەوە شیعرییەکانی شاعیر زیاتر ژیانی کەسیی خۆی و کۆمەڵگاکەی بووە کە بەهۆی بێبەشبوون لە سۆز و خۆشەویستیی خێزان و خاک و نیشتمان ئەم لایەنانە بوونەتە گرێ و لە دەروونی شاعیردا پەنگیان خواردۆتەوە.

**سەرچاوەکان**

**کتێب- کوردی:**

١- ئازاد عەبدالواحید کەریم، ڕەنگاڵەکانی دەق ، چاپی یەکەم، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، کەرکوک ٢٠١١.

٢- ئازاد عەبدالواحید کەریم، سۆسیۆلۆژیای شیعری کوردی (لەڕووی پێوەرە ئاکارییەکانەوە) نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، لە بڵاوکراوەکانی لقی کەرکوکی یەکێتی نووسەرانی کورد (١٤) چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ،چ١، هەولێر، ٢٠٠٥.

٣- پێشڕەو عەبدوڵلا ، دەروونشیکاری شیعر ، هەولێر، ٢٠١٣.

٤- د. شکري عزیز الماضي، تیۆری ئەدەب ، و . پ. ی. د. سەردار ئەحمەد گەردی، چ١، چاپخانەی ماردین ، هەولێر،٢٠١٠.

٥- سامان عیزەدین سەعدوون، دەقە شیعرییەکانی گۆران لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە، چاپخانەی تاران، ٢٠١٥.

٦- عەبدولحەلیم سەمعان ، و . سۆزان جەمال ، سایکۆلۆژیی ژیانی هاوسەرێتی ، چاپی یەکەم ، ٢٠٠٧.

٧- کامل بەسیر ، ڕەخنەسازی، مێژوو و پەیڕەوکردن ، بغداد، ١٩٨٣.

٨- هێمن، ناڵەی جودایی، چاپخانەی علاء، بەغدا، ١٩٧٩.

**کتێب - عەرەبی:**

٩- رجاء عید، فلسفة الالتزام في النقد الادبي (بین النظریة والتطبیق )، دار الثقافة للطباعة والنشر، مطبعة دار النشر الثقافة، ١٩٧٤.

١٠- د. سامي الدروبي ، علم النفس والادب، دار المعارف بمصر، ١٩٧١.

١١- سعاد جبر سعید، سیکولوجیا الادب الماهیة والاتجاهات ، الطبعة الاولی، ٢٠٠٨.

١٢- محمد جاسم محمد، المدخل الی علم النفس العام ، دار الثقافة للنشروالتوزیع، الاردن — عمان، ٢٠٠٤.

**گۆڤار:**

١٣- ئەکرەم قەرەداخی ، میکانیزمە بەرگرییە دەروونییەکان ، گ. زانستی سەردەم ، ژمارە ٣٦، ٢٠٠٩.

**سایت**

14. http://lib.uin-malang.ac.id/files/thesis/chapter_ii/07310091.

15. محمد عزام سلطة الكاتب، www.ninjawy .com

**وتارەکان:**

١٦- مامۆستا عەتا حسێن (وانەکانی بەکالۆریۆس، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٨.

## ملخص البحث
## سايكو لوجيا الادب

**اوات رحيم كريم**
قسم اللغة الكوردية – كلية التربية –
جامعة گرميان

يتالف هذا البحث من المقدمة وفصلين اساسيين مهمين ومن ثم تليها النتائج المستخلصة من البحث واخيرا تأتي قائمة المصادر .

في الفصل الاول الذي يحمل عنوان (علم نفس الادب) حيث تطرقنا فيه لمفهومين مهمين، اولهما مفهوم (علم النفس) حيث تطرقنا اليه بشكل شامل ونظري، وثانيهما مفهوم (الادب) وخاصة تلك التي تركز على النص الادبي، وتطرقنا في هذا الفصل ايضا الى العلاقة ما بين علمي النفس والادب.

الفصل الثاني بعنوان (تحليل وتفسير النماذج الشعرية من خلال التطرق لبعض النصوص الشعرية للشاعر هيمن)، حيث ركز هذا الفصل على تلك النصوص الادبية التي تربط بين علم الادب وعلم النفس، ومن هذا المنطلق سلطنا الضوء على بعض النصوص الشعرية للشاعر (هيمن) في ديوانه (نالّەی جودایی – انين الفراق) بقصد ازالة الستار عن الجوانب الخفية والكامنة لنفس وحياة هذا الشاعر، بالاضافة الى تحليل النصوص الشعرية للشاعر اعتمادا على اسس علم النفس المعلومة .

وفي ختام هذا البحث وضحنا النتائج المهمة المستخلصة للبحث .

## Research abstract

## Psycgology of literature

**Awat Rahim Karim Hassan**
Garmian university , College of education , Kurdish deparment
Scientific title: Assistant teacher

This research consists of the introduction and two main important basic chapters, followed by the results of the research and finally the list of references.

In the first chapter, which is entitled (Psychology of literature), where we touched on two important concepts, the first concept (Psychology), where we wrote it in a comprehensive and theoretical way, and the second concept (Literature) especially those that focus on literary text, and in this chapter also touched on the relationship between psychology and literature .

The second chapter is entitled (Analyzing and interpreting poetic models by addressing some poems of the poet of Heimen), this chapter focuses on those literary texts that link the science of literature and psychology, in this sense, we highlighted some poetic texts of the poet (Heimen) in his diwan ( Naleh Gudaye) in order to remove the curtain on the hidden aspects of life and soul of this poet, In addition to analysis of the poetic texts of the poet based on the known foundations of Psychology science .

At the end of this research, we explained the important conclusions of the research.

# بازرگانی لە کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی ئێلخانیانی مەغۆلدا

## (٦٥٦_٧٣٦ ك/ ١٢٥٨_١٣٣٦ز)

**پ. د. قادر محەمەد حەسەن** **پ. ی. رابیعە فەتاح شێخ محەمەد**

بەشی مێژوو_ کۆلیژی ئەدەبیات/ زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**١– پێشەکی**

هۆلاکۆ لە ساڵی (٦٥٦ ک/ ١٢٥٨ز) دەوڵەتی ئیلخانانی مەغۆلی ڕاگەیاند و شاری مەراغەی لە هەرێمی ئارەزبایجان کردە پایتەختی خۆی، یەکێ لە هۆکارەکانی هەڵبژاردنی شارەکە و هەرێمی ئازەربایجان ئەوە بوو، کە شوێنێکی گونجاو بوو و کەوتبووە ناوەڕاستی هەرێمەکانی دەوڵەتەکەی و بەشێکی بەرفرەوانی بەیەکەوە بەستبووەوە، بۆیە لە ڕووی بازرگانییەوە لەسەر ڕێگەی ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەڵات بە تایبەتی ڕێگەی حەریر بووە، چونکە کاروانە نێودەوڵەتییەکان بەو هەرێمە هاتوچۆیان کردووە (ابن تغری بردی: ١٩٧٢، ٧/ ٣٧. شرین بیانی: ا_ ٢٠١٣، ٢٤١. سلمان: ٢٠١٥، ٤٠) بۆیە بازرگانی بەشێکی زیندوو و گرنگی بەردەوامی ژیانی دەوڵەتی ئیلخانانی مەغۆلی بوو، بەشێکی پڕ بایەخ و گەورەی جیهانی ئیسلامی کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی، کە ڕاستەوخۆ بە چەندان ئایین و مەزهەب و نەتەوەی دیکەی ڕۆژهەڵات و ناوەڕاستی ئاسیای بەستۆتەوە، هەروەها شوێنی ئەو دەوڵەتە کەوتبووە سەر ڕێگەکانی نێوان ئاسیا و ئەوروپا لەلایەک و ئاسیا و دەوڵەتی مەملوکی لەلایەکی دیکە، کە چەندان ڕێگەی گرنگی بازرگانی بەسەرەوە بوو، بۆیە ببووە پردێ لە نێوان هیند و ناوەڕاستی ئاسیا و چین لەلایەک و قوستەنتینیە و شام و قاهیرە لەلایەکی دیکە، ئەو شوێنە کاریگەری بەسەر ڕەوشی بازرگانی هەبوو، هەروەها لە نێو دەوڵەتی ئیلخانانی مەغۆلی چەندان بازرگان دەرکەوتن (امل: ٢٠١٦، ٧٧).

## ٢- سنووری کوردستان لە هەرێمەکانی دەوڵەتی ئیلخانانی مەغۆلی:

سەرچاوەکانی مەملوکی هاوسەردەمی دەوڵەتی ئیلخانانی مەغۆلی بە تایبەتی ئیبن فوزلوڵڵای عومەری (م: ٧٤٩ ک/ ١٣٤٨ز) کە لە کتێبەکەی باسی سنووری کوردستانی کردووە، بەڵام بەڕوونی و ئاشکرا ناتوانین سنوورێکی دیاریکراو هەڵێنجین، لە باسی چیاکانی کوردان کە مەبەستی وڵاتی کوردانە گوتوویە: "چیا بەربەستەکانی نێوان وڵاتی عەرەب و وڵاتی عەجەم، سەرەتاکانی لە چیاکانی هەمەدان و شارەزوور و کۆتاییەکانی لە قەڵاکانی کافران لە وڵاتی تەکفور (ئەرمینیای بچووک)، کە ئەویش وڵاتی سیس (پایتەختی ئەرمینیای بچووک)ە"(٢٠١٠، ٣/ . زرار صدیق: ٢٠٠٩، ص٢٣. درویش یوسف: ب_ ٢٠١٨، ٣). عومەری ڕاشکاوانە باسی وڵاتی کوردستانی بە هەرێمی کوردستانەوە کردووە، کەچی لای مێژوونووسان و جوگرافیناسانی دەرباری ئیلخانان بەتایبەتی لای ڕەشیدەددین فەزلوڵڵا (م: ٧١٨ک/ ١٣١٨ز) چیاکانی کوردان شوێنی ڕێگر و جەردەن (ا_ ١٣٦٢، ٦٩٨/٢.)، حەمەدوڵڵا مستەوفی قەزوینی وەک یەک زەویی دانەبڕاو باسی ئێرانی کردووە (١٣٨٩، ١٩-٢٨.). لە سەردەمی ئیلخانانی مەغۆلی دەتوانین بە شێوەیەکی تەقریبی رووکاری گشتیی سنووری کوردستان دەستنیشان بکەین، کە لە رووی پانییەوە لە زنجیرە چیاکانی هەمەدانەوە دەستی پێکردووە تا وڵاتی سیس و مەڵاتیە درێژ بووەتەوە، هەروا لە رووی درێژییەوە کەوتووەتە نێوان ئەرمینیای گەورە لە باکوور و عیراقی عەرەبی لە باشوور، هەروا لەلای ڕۆژئاوا سغور (الثغور)ی شام (ئەنتاکیە و تەرسووس) و لە باشووریش خووزستان و باشووری ڕۆژئاوای عیراقی عەرەبی و لە ڕۆژهەڵاتی ئەسفەهان دەورەیان داوە تا بەرەو باکوور بۆ تەورێز و باکووری ئەرمینیا درێژبووەتەوە (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ٨٥، ١٠٠_ ١٠٨. درویش یوسف: ب_ ٢٠١٨، ٣). لە رووی جوگرافی و ئیدارییەوە شوێنی کوردستان (وڵاتی کوردان) لە سەردەمی دەوڵەتی ئیلخانانی مەغۆلی

کەوتبووە نێو چەند هەرێمێکەوە، هەرێمی کوردستان زۆربەی زۆری دانیشتوانی کورد بوون و لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیا، هەرێمی کوردستان لە سەردەمی مەغۆلی جوداکرایەوە و بووە هەرێمێکی سەربەخۆ (لسترنج: ١٣٨٣، ٢٠٨-٢٠٩. زرار صدیق: ٢٠٠٩، ٣٥-٣٦.). سنووری لە باشوورەوە بە هەرێمی خووزستان و لە ڕۆژهەڵات عیراقی عەجەمی و لە باشووری رۆژئاوا هەرێمی عیراقی عەرەبی و لە ڕۆژئاوا هەرێمی دیاربەکر و رەبیعە و لە باکوری بە هەرێمی ئازەربایجانەوە گرێ درابوو، مەرکەزی هەرێمەکە قەڵای بەهار بووە (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ١٠٧، ١٠٨- ١٠٩). هەرێمی دیاربەکر و رەبیعە (جەزیرە) کە شاری مووسڵ پێگەی ئەو هەرێمە بووە، (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ١٠٢، ١٠٣-١٠٦.). لە راستیدا لەو هەرێمە ڕێژەی دانیشتوانی کورد زۆرە و تێدا دەسەڵاتدار بووە (درویش یوسف: ا_ ٢٠٠٦،١٨٥_ ١٩١).

هەرچی هەرێمی عیراقی عەرەبییە، شاری بەغدا مەرکەزی هەرێمەکە بووە (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ٢٨، ٣٠، ٣٣.)، بەشی باکوری رۆژهەڵاتی هەرێمی عیراقی عەرەبی زۆرینەی دانیشتوانی کورد بوون، کە بریتین لە شارەکانی خانەقین و داقووق و بەندینجین (مەندەلی) و جەلەولا و قەسری شیرین و حولوان و شارەبان (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩: ٣٩، ٤٠، ٤١، ٤٣، ٤٦. العینی: ٢٠٠٣، ٢٣، ١٧٢. علاء محمود: ٢٠١٥، ١٢٠.). هەروەها لە هەرێمی عیراقی عەجەمی چەندان شاری کوردی لکاو بە هەرێمی کوردستان هەبوون، بریتی بوون لەو شارە کوردییانەی کە لە دێرینەوە کورد لێی نیشتەجێ بووە، بە تایبەتی سەرزەمینی لورستان بە هەردوو بەشی گەورە و بچووکیەوە لە سەردەمی ئیلخانانی مەغۆل سەر بە عیراقی عەجەمی بووە (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ٧). سەرباری ئەو دوو ویلایەتە لەو هەرێمە، حەمەدوڵڵا باسی لەوە کردووە کە شاری نەهاوەندی سەر بە هەمەدان هەموویان کوردن، سەرباری ئەوە ناو شاری هەمەدان کورد بەشێکی گرنگی شارەکە بووە، هەروەها شاری ئەسەدئاباد بە هەمان شێوە جێگەی کورد بووە و سنووری بە هەرێمی

کوردستانەوە لکاوە (١٣٨٩، ٧٢- ٧٣). هەروەها هەرێمی ئازەربایجان کە سەرەتا شاری مەراغە دارولمولکی ئازەربایجان بووە، دواتر شاری تەورێز پایەختی دەوڵەتی ئیلخانانی مەغۆلی بووە، تومانی خوی هەر چوار شاری خوی و سەلماس و ورمێ و شنۆی لەخۆگرتووە، لە کاتێکدا دانیشتوانی سەلماس و شنۆ تەواوی کورد بوون و لە هەردوو شارەکەی دیکە کورد بەشی سەرەکیی دانیشتوان بووە (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ٧٥، ٨٤-٨٦). هەرچی ویلایەتی ڕۆمە ئەو شار و شارۆچکە و دەوروبەرانەی کورد بەشێکی گرنگ بووە تێیدا، بریتین لە ئەرزنجان و ئەرزن ڕۆم و بایبورت و خەربووت و کوماخ و مەلاتیە (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ٩٤، ٩٥، ٩٦، ٩٨). لە هەرێمی ئەرمینیای گەورە تومانی خەلات گەورەترین شار و پێگەی بووە، ئەو شار و شارۆچکانەی کە کورد تێدا زۆرینە بووە، شاری خەلات و ئەرگیش و ئەتاق و بەرگری و وان و وستان بوون (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ١٠٠-١٠١).

### ٣- سیاسەتی بازرگانیی ئیلخانانی مەغۆلی:

لەگەڵ ئەوەی لە ئەنجامی هێرشەکانی مەغۆل بۆ ناوچە کوردییەکان زیانی زۆری بەرکەوت و کاریگەریی خراپی بە تایبەتی لەسەر هەرێمی دیاربەکر هەبوو، چونکە ببووە گۆڕەپانی ململانێی نێوان مەغۆل و دەوڵەتی مەمالیک، بازرگانان لەبەر نائارامی و هێرشی مەغۆل لە مەترسی بوون ( سبط ابن الجوزی: ١٩٥٢، ٨/ ٥٢٢)، بەڵام دوای دامەزرانی دەوڵەتی ئیلخانانی مەغۆلی، دەسەڵاتدارانی مەغۆل و ئیلخانان بەرە بەرە بایەخیان بە بازرگانی داوە، چونکە خۆشگوزەرانی بەدی هێناوە و لە ڕێگەی بازرگانییەوە زانیارییان لەسەر وڵاتانی دەوروبەر کۆکردووتەوە (ابن العبری: ب_ ٢٣٠. رشیدالدین فضل الله: ب-١٣٨٨، ٢٧٨_٢٨١). لە سەرەتای دەوڵەتی ئیلخانانی لە سەردەمی هۆلاکۆ و ئەباقای کوڕی (٦٥٦_٦٨٠ک/ ١٢٥٨_ ١٢٨٢ز) نێوان هەردوو دەوڵەتی ئیلخانان و دەوڵەتی مەملوکی لە میسر و شام (٦٤٨- ٩٢٣ک/ ١٢٥٠- ١٥١٦ز) زۆر ناخۆش بوو گەیشتبووە ڕادەی دوژمنایەتی، بۆیە بازرگانیی نێوانیان

دەتوانین بڵێین سەخت بووە و بازرگانان رووبەڕووی مەترسی بوونەتەوە، بازرگانی لە ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی ئیلخانان و بەلای هەردوو بەندەری ترابزوون لەسەر دەریای ڕەش و بەندەری ئەیاس لەسەر دەریای سپی برەوی هەبووە (امل: ٢٠١٦، ٧٧. شوکت: ٢٠١١، ٤٢١_ ٤٢٢، ٤٣١_ ٤٣٢)، سوڵتان ئەحمەد تەکودار (٦٨١_٦٨٣ک/ ١٢٨٢_ ١٢٨٤ز) دوای دەسەڵات وەرگرتن نوێنەری نارده میسر لە نامەکەیدا داوای کردووە هیچی دیکە خوێن نەڕژێ و ڕێگە بە بازرگانان بدرێ چۆنیان دەوێ سەفەر بکەن (ابن الفوطي: ب_ ١٣٥١ ٤٢٤_٤٢٥. القلقشندي: ١٩٨٧، ٨/ ٦٥_٦٨)، بۆیە ئیلخانان بایەخیان بە ڕێگەی بازرگانی داوە تا هەم بازرگانیی ناوەخۆ و هەم دەرەکی بەرەو پێشەوە ببەن.

غازان خان (٦٩٤_ ٧٠٣ک/ ١٢٩٥_ ١٣٠٤ز) لە کۆتاییەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی/ سێزدەی زایینی کۆمەڵێ یاسا و ڕێوڕەسمی بۆ پاراستنی ڕێگەوبان دەرکرد، بەوپێیە هەر کەسێ لە دانیشتوان بەرپرسیار بوو لەو ڕێگەیانەی بە ناوچەکەیان تێپەڕیوە، نەدەبوو ڕێگری یا هەر کارێکی دیکە دژی بازرگانان ئەنجام درابا. بۆیە هەزاران پاسەوانی لە خودی ناوچەکان بۆ سەلامەتی ڕێگە هەڵبژارد و سەرانی مەغۆل چاوەدێرییان کردوون (رشیدالدین فضل الله: ب-١٣٨٨، ٢٧٧_ ٢٨١). هەروەها مارکۆ پۆلۆ گەڕیدەی ڤینیسی لە میانەی سەفەری بۆ هەرێمی فارس باسی لەوە کردووە، خەڵکی ئەوێ ڕاهاتوون زیان بە بازرگان و موسافران بگەیەنن، بەڵام لەبەر ترسیان لە تەتاری ڕۆژهەڵات نەیانوێراوە هیچ بکەن، چونکە بە توندترین شێوە سزایان داون، هەروەها درێژەی پێداوە، کە لەسەر هەموو خەڵکی سەر ڕێگەکان پێویستە لەو کاتەی مەترسییەک رووبەڕووی بازرگان دەبێتەوە، کە بازرگانان داوای یارمەتی و ڕێبەری دەکەن، کۆمەکیان بکەن و لە مەترسی دووریان بخەنەوە، لە بەرانبەردا بە گوێرەی دووری ڕێگە و بارەکەیان کرێیەکی گونجاویان پێدراوە (مارکو بولو: ١٩٧٧، ٤٦. جعفر خصباك: ١٩٦٨، ١٣٥. احمد حمدی: ١٩٤٩، ٢٥٧).

ئیلخانان لەپێناو جووڵە و چالاکیی بازرگانی چەند هەنگاوێکیان نا، پێش هەر شتێ ئیلخانان هەوڵی جدییان داوە تا پارێزگاری لە ئارامی و ئاسایش بکەن و ڕێگەکانی نێو دەوڵەت بپارێزن، ئەمەش هانی زۆر بازرگانانی بێگانەی داوە تا لەگەڵ هەرێمەکانی ئیلخانان بازرگانی بکەن، بە تایبەتی غازان ڕێوشوێنی توندی گرتەبەر بۆ پاراستنی ڕێگەی بازرگانی (رشیدالدین فضل الله: ب_١٣٨٨، ٣١٦_ ٣١٧. الباز العرینی: ١٩٦٨، ٣٤٦)، هەروەها ڕێگەیان بە بازرگانانی بێگانە داوە بە ئازادی کاری خۆی بکا و تەواوی سنووری دەوڵەت بگەڕێ و باجیان لەسەر بازرگان لاداوە، تەنیا ڕەسمی گومرگی و ڕەسمی پاسەوانییان هێشتۆتەوە ( هایدو: ١٩٩٤، ٣/ ٣٧٤. سلمان: ٢٠١٥، ١٤٢). لە ساڵی (٧٢٠ک/ ١٣٢١ز) ئەبوسەعید کوڕی ئولجایتو کوڕی ئەرغۆن کوڕی ئەباقا کوڕی هۆلاکۆ (٧١٦_ ٧٣٦ ک/ ١٣١٦- ١٣٣٥ز) دوا ئیلخانی مەغۆلی، فەرمانی دا هەموو باجی سەر ڕێگە ئەوانەی لە بازرگانانی بێگانە وەرگیراون کە کاڵا و کەرەستەیان هێناوەتە نێو دەوڵەتی ئیلخانی، هەڵگیرێن (هایدو: ١٩٩٤ ، ٣/ ٣٦٧_ ٣٦٩. سلمان: ٢٠١٥، ١٤٢). هەروا غازان لە درێژەی چاکسازییەکانی بۆ ئەوەی زیاتر برەوی پێ بدا، باجی لەسەر بازرگانیی ناوەخۆ هەڵگرت (الصفدی: ١٩٩٨، ٢/ ٦٩. سلمان: ٢٠١٥، ١٤٠). لەلایەکی دیکەوە ئیلخانان و پیاوانی دەربار و شازادە و وەزیران سەرمایەی خۆیان داوە بە هەندێ بازرگانان بۆ ئەوەی کاری پێبکەن، جووەینیی مێژوونووس (م: ٦٨١ ک/ ١٢٨٢ز) لە باسی کاری بازرگانی لە دەوڵەتی مەنگوخان کوڕی تولوی (برا گەورەی هۆلاکۆ) خانی گەورەی مەغۆل لە چین، بازرگانانی بە دوو دەستە دابەش کردووە، بازرگانی ئاسایی، کە بە سەرمایەی خۆی کاری کردووە، لەگەڵ شەریک کە سەرمایەی خۆیان لە ئیلخان وماڵباتەکەی و دەربارییان وەرگرتووە (١٩٣٧، ١/ ٨٩. رشیدالدین فضل الله: ب_١٣٨٨، ٢٧٠، ٣١٣. ابوالفضل رضوی:ا_ ١٣٨٨، ٥٥)، کە لەبەرانبەردا ساڵانە لە سوودەکەی بەشێکیان بردووە، ئەو بازرگانانە لەبەر ئەوەی لە رووی سیاسییەوە

پشتگیرییان لێ کراوە، سوودیان لە ئیمتیاز و خەزێنەی دەوڵەت و ڕێوڕەسمی دیکە وەرگرتووە، هەتا لە باج بەخشراون (الجوینی: ١٩٣٧، ١/ ٨٩. رشیدالدین فضل اللە: ب_١٣٨٨، ٢٧٠، ٣٢٩_٣٣٠. ابن الفوطی: أ_ ١٤١٦، ٢/ ١٠٨. ابوالفضل رضوی: أ_ ١٣٨٨، ٥٥_٥٦). ئەمەش هێز و گوڕێکی بە چالاکیی بازرگانی داوە، بۆیە هەندێ لە هۆزی مەغۆلی سەرمایەیان خستۆتە کار و داویانە بە بازرگانانی موسڵمان (ابوالفضل رضوی: أ_ ١٣٨٨، ٥٥).

**٤– بازرگانی:**

بازرگانی پێوەندیی توندوتۆڵی بە کشتوکاڵەوە هەبووە، زیادەی بەرهەمی کشتوکاڵی وای لە جووتیار و بازرگان کردووە، بیبەن بۆ شوێنی دیکە و بازاڕی بۆ بدۆزنەوە، یاخود بەرهەمەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە ئاڵوگۆڕی پێکراوە، دەوڵەتی ئیلخانان رووبەرێکی بەرفرەوانی هەبووە، بەرهەمی زۆربەی وەرزەکانی هەبووە، ئەمەش جووڵەی خستۆتە نێو بازاڕەکانی ناوەخۆی دەوڵەتەکە بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی. وەک دەرکەوتووە ئیلخانان هەر تەنیا بایەخیان بە بازرگانیی ناوەخۆ نەداوە، بەڵکو بازرگانیی دەرەکیشیان بە گرنگ زانیوە، لەو سەردەمەدا بازرگانی بۆ دوو جۆر دابەش کراوە، ناوەخۆ و دەرەکی:

**٤_١_ بازرگانیی دەرەکی :**

هەرچەندە کوردستان کەوتبووە سنووری دەوڵەتی ئیلخانانی مەغۆلی، کەچی شوێنێکی چالاکی بازرگانی بوو، لە رووی بازرگانیی دەرەکیی هەرێمەکانی کوردستان و دیاربەکر و ئازەربایجان و ئەرمینیای گەورە و هەردوو عیراقی عەرەبی و عەجەمی بەیەکەوە بەستبۆوە، لێرەدا لە بازرگانیی دەرەکی زیاتر مەبەستمان بازرگانیی شار و شارۆچکەکانی تەواوی کوردستان لەگەڵ دەرەوەیەتی، دوای دامەزرانی دەوڵەتی ئیلخانانی مەغۆلی لەبەر کێشەی سیاسیی نێوان ئیلخانان و دەوڵەتانی دراوسێیان (فەرمانڕەوایانی ئوردوی زێڕین و

جوغوتای)، هەروەها ململانێی نێوان ئیلخانان و دەوڵەتی مەملوکی کاریگەریی سەلبی لەسەر بازرگانی بە تایبەتی بازرگانیی دەرەکی کردووە، بەڵام هەر کاتێ ئارامی هاتبێتەکایەوە بازرگانی بەرەو پێشەوە چووە، سەرچاوەکانی سەردەمی ئیلخانان بۆیان دەرخستووین، کە بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی وەکو ئوردوی زێڕین و تورکستان و چین و هیندستان و ڕۆم و فەرەنج و شام و میسر کراوە (رشیدالدین فضل الله: ب_١٣٨٨، ٢٧٢)، چونکە کەرەستە و کاڵای میسری و چینی و هیندی و رووسی و ڕۆمی و قەبچاقی لە بازاڕەکانی دەوڵەتی ئیلخانان بە تایبەتی بازاڕی بەغدا بینراون (کاشانی: ١٣٨٤، ١٠٩)، هەروەها میوەی وشککراوە لە ئەسفەهانەوە بۆ هیند و ڕۆم نێردراوە (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ٤٩). ڕێگەکانی کوردستان گەشەی زۆری بە بازرگانیی دەرەکی داوە، چونکە زۆربەی هەرێمەکانی دەوڵەتی ئیلخانانی بەیەکەوە بەستۆتەوە (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ١٦٥. لسترنج: ١٣٨٣، ١٧١_١٧٣). بازرگانیی دەرەکی لە نێوان دەوڵەتی ئیلخانان لەگەڵ دەوڵەتی دیکە بووە، دەوڵەتی مەغۆلی لە چین و مەنگۆلستان تا دیاربەکر و شام و میسر چالاکی بازرگانی هەبووە، شارانی تەورێز و مووسڵ و بەغدا ناوەندی سەرەکیی بازرگانی بووە، چونکە گوند و شارۆچکەکانی بەیەکەوە بەستۆتەوە و جۆرەها کاڵا و کەرەستەی دیکەی تێدا مامەڵە کراوە و بواری زیاتری بۆ جوولە و چالاکیی بازرگانی هەبووە (امل: ٢٠١٦، ٧٨).

سێوی ئەخلات هێندە بەناوبانگ بووە، بۆ ئەرمینیا و ئازەربایجان نێردراوە، هەروا ساڵانە لە کوردستانەوە سێ هەزار سەر مەڕ و بزن و نزیکەی سێ هەزار ناڵی ئەسپ لەگەڵ مەڕ و بزنەکان هاوردەی شام کراوە (البدلیسی: ٢٠٠١، ١٤٦، ١٩٠، ٣٥٠، ٣٥٦، ٤٤٧، ٥٨٩. مصطفی احمد:٢٠٠٧، ١٨٧. ١٨٩_١٩٠).

شاری مووسڵ ناوەندێکی گرنگی بازرگانی ناوەخۆ و دەرەکیی سەردەمی ئیلخانانی مەغۆلی بووە، چونکە چەندان ڕێگەی شارەکانی جەزیرەی بەخۆیەوە بەستۆتەوە و ڕووباری دیجلە وەکو هۆکاری

هاتوچوو سوودی لێ وەرگیراوە، شاری ئەربل و دەوروبەری پەمۆی زۆر و چاکی لێ بەرهەم هاتووە (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ١٠٢_ ١٠٣. علاء قداوی: ٢٠١٥، ١٦٧)، بۆیە زۆر پەمۆ و کاری ڕستن و جلوبەرگی پەمۆیی هاوردە کردووە، بۆیە بەرهەمی قوماشی شاری مووسڵ پشتی بەو پەمۆیە بەستووە و لەوێدا بۆ شام و میسر بارکراوە (یاقوت الحموی: ١٩٥٧ ٢/ ٢٥٦. مارکو بولو: ١٩٧٧، ٣٧ . المقریزی: ١٩٧٢، ٤/ ١/ ٦١١. ٤/ ٢/ ٧٩١_ ٧٩٢. ابن تغری بردی: ١٩٧٢، ١٦/ ٨٠. زرار صدیق: ٢٠٠٩، ٣٢٧). هەروەها پەمۆی ماردین لەو سەردەمدا زۆر ناسراو بووە، قوماشی پەمۆی ماردین هەناردەی دەرەوەی دەوڵەتی ئیلخانان کراوە، بۆتە هۆکاری بازرگانیی خەڵکەکەی، بە جۆرێ قوماشی ماردین و مووسڵ ڕەوانەی ئەوروپا کراوە (مارکو بولو: ١٩٧٧، ٣٧. یاقوت الحموی: ١٩٥٧، ٧/ ١٩٤. علاء قداوی: ٢٠١٥، ١٧١).

شاری بەغداش ناوەندێکی دیکەی بازرگانان بوو، گوندی تەرسخی سەر بە بەندینجین خوێی بۆ بەغدا هاوردە کردووە و زۆربەی خوێیەکانی شاری بەغدا لەو گوندەوە هاتووە ( یاقوت الحموی:١٩٥٧، ٢/ ٢٢). هەروا لە شوێنانی دیکە لە گوندی تەرجەلەی سەر بە ئەربل و دەوروبەری حولوان سەرچاوەی کبریت و مەعدەنی کبریت هەبووە، لە ماسبەزان کبریت و شووشە و بابەتی دیکەی مەعدەنی و خوێی لێ بووە (یاقوت الحموی: ١٩٥٧، ٢/ ٢٢. ٥/ ٤١. القرمانی: د.ت، ٤٨٧. زرار صدیق: ٢٠٠٩، ٣٢٦). لە نزیک خانەقین سەرچاوەی نەوتی مەزن لە کۆنەوە هەبووە (یاقوت الحموی: ١٩٥٧، ٢/ ٣٤٠. البغدادی، ١٩٩٥، ١/ ٣٣٦)، هەروەها کێڵگەی نەوتخانە و هی دیکە لە داقووقا هەبوون ( حمدالله مستوفی:١٣٨٩، ٤١).

لە راستیدا لە کوردستان دوو هۆکاری سەرەکی کاریگەرییان بەسەر چالاکیی بازرگانییەوە هەبووە، بە تایبەتی بازرگانیی دەرەکی، کوردان بەشێکیان لە دژی دەوڵەتی مەغۆلی بەردەوام چالاکیی سیاسییان هەبووە و ڕاپەڕیون و پشتی دەوڵەتی مەملووکییان گرتووە، بۆیە لە سنوورەکانی ڕۆژئاوای دەوڵەتی ئیلخانی زۆربەی کات ئارامیی سیاسی بەخۆوە نەدیوە و چالاکیی بازرگانی سست بووە، لەلایەکی

دیـکەوە ململانێـی هەردوو دەوڵەتـی ئیلخانـان و مەملـووکی چـالاکیی بازرگانی لە هەمـان سنوور لاواز کردووە، ئەمەش وای کردووە زیاتر بازرگانیی بەرەو ڕۆژهەلات و دەوڵەتی مەرکەزیی مەغۆل بکشـێ. بەلام لە سـاڵی (٧٢٠ ک/ ١٣٢٠ز) لە سـەردەمی سـوڵتان ئەبـو سـەعید دوا سـوڵتانی ئیلخانـان (٧١٦_ ٧٣٦ک/ ١٣١٦_ ١٣٣٦ز) پێوەنـدیی نێـوان هەردوو دەوڵەتی ئیلخانان و مەملووکی بەرەو باشی چوو، پاش ئەوەی هەردوولا ئامادەیی ئاشتییان نیشان دا، بۆیە لە ئەنجامی ئەو پێوەندییە ئارامی و ئاسایش رووی لە ناوچەکە کرد و بازرگانیی دەرەکی لەگەڵ شـام و میسـر بـووژایەوە ( المقریـزی: ١٩٧٢، ٢/ ١/ ٢١١_٢١٤. ٢/ ٢/ ٣١٠_ ٣٧٢. جعفر خصباک: ١٩٦٨، ١٤٧).

هەرچـی هەنـاری بـاغچە بەربڵاوەکـانی زێـی گەورەیە بـۆ شـاری بەغدا نێردراون و لە ڕێگەی ئـاوی لە زێی گەورە و دواتر لە رووبـاری دیجلـەوە ڕەوانەی بەغـدا کـراون (ابـن سـعید: ١٩٧٠، ١٥٧). میوەکـانی شـاری ئەشـــنۆ و گونـــدەکانی دەوروبەری بە تـــایبەتی هەرمـــێ نایـــاب و بەناوبـانگەکەی بـۆ تەواوی وڵات نێـردراون (یـاقوت الحمـوی: ١٩٥٧، ١/ ٢٠١. القزوینـی: ١٩٦٠، ٢٨٤)، شـاری خیـزان شـابەڕووی لـێ بەرهەم هـاتووە بـۆ وڵاتـی شـام و عیـراق و جەزیـرە هەنـاردە کـراوە (یاقوت الحموی: ١٩٥٧، ١/ ٣٣١). هەروەها لە شاری شەنگال سرکەی هەنار و هەنجیری وشککراوە هەناردە کراوە (ابن سعید: ١٩٧٠، ١٥٧). هەروا لە جەزیرە و مووسڵ خۆراک و میوەجات بۆ بازاڕەکانی شـاری بەغدا نێردراوە (ابن الفوطی: ب_ ١٣٥١، ٤٢). هەتا بازرگانانی جەزیرە و مووسڵ بە ڕێکوپێکی روویان لە شـاری تەورێز کـردووە (مارکو بولـو: ١٩٧٧، ٤٢). شـاری نوسـێبین باشـترین جـۆری گـوڵاوی لـێ بەرهەم هـاتووە، کە بـۆ زۆر شـوێنان هەنـاردە کـراوە و گوڵاوی نوسـێبین بەناوبانگ بـووە، سـابوونی دیـاربەکریش بەناوبانـگ بـووە، بـۆ حەلەب و ناوچەکـانی دیـکەی شـام هەنـاردە کـراوە ( ابوالفداء: ١٨٤٠، ٣٨٣. ابن الشحنه: ١٩٠٩، ٢٥١، ٢٥٤).

لە وڵاتــانی دیــکەوە کــاڵا و کەرەســتە و بەرهەمــی دیــکە بــۆ کوردســتان هــاوردە کــراوە، شمشــێر و قەلغــان و تیــر و خەنــجەر و کەرەستەی دیکەی جەنگی لە وڵاتی شام بۆ کوردستان هاوردە کراوە، ئاسن و مس و کاری گڵی و کاغەز و شووشـە و سـابوون لە حەلەبەوە بـۆ زۆر شـوێنان لەوانە بـۆ ڕۆم و دیـاربەکر و عیـراق و وڵاتـی شـام هاوردە کراوە (ابن الشحنه: ١٩٠٩، ٢٥٤. زرار صديق: ٢٠٠٩، ٣٣٠).

**٤_٢_ بازرگانیی ناوەخۆ:**

بازرگانیی ناوەخۆ چالاکی کاڵا و کەرەستە بە شێوەیەکی ئاسایی لە نێوان گوند و شار یاخود لە نێوان شارەکان خۆیان یان گوند لەگەڵ یەک بـووە، بە شـێوەیەکی سـەرەکی بـۆ بازرگـانیی نـاوەخۆ پشـت بە ڕێگەی وشکانی بەستراوە، لەبەر ئەوەی کوردستان چەندەها گوندی لێ هەبـووە یـاخود هـۆز و خێڵـی کـوردی بەدەوری شـارەوە بـوون و مــاوەیەک مــاونەتەوە تــا بەرهەم و کاڵاکانیــان لە شــارەکان ســاغ کردووەتەوە.

لەبەر ئەوەی میری جۆلەمێرگ میر ئەسەدەدین موسای هەکاری (سـەرەتاکانی سـەدەی ٨ ک/ ١٤ز) چەنـدان مەعدەنی بەنرخـی هەبـووە، زەرنـیخ لە وڵاتـی ئەوێ بـۆ تەواوی شـوێنانی دی گواسـتراوەتەوە و بازرگــانی پێکــراوە، هەتــا لە ترســی مەغــۆل لازەوەردی بەقیمەتــی شاردۆتەوە، نەوەک لێی زەوت بکەن (ابن فضل الله العمری: ٢٠١٠، ٣/ ٢٠٣).

جـوولەی بازرگــانیی نــاوەخۆ بە جـۆرێ بـووە، کە لە نــاوچەی ســورچییان دار و قــامیش هــاوردەی شــوێنانی دیــکە کــراوە، یــاقوت حەمەوی لەوە دواوە، کە داهــاتی ســاڵانەی دار و قامیشــی نــاوچەکە گەیشتۆتە، پێنج هەزار دینار (١٩٥٧، ٤/ ٢٢١. درويش يوسف: ا_ ٢٠٠٦، ٢٢٣).

لە شـارەکانی دیـاربەکری سـەروو لە پـالو و میافـارقین و حـانی ئاسن بەرهەم هێنراوە و بۆ هەموو وڵات نێردراوە (ياقوت الحموی: ١٩٥٧، ١/ ٣٣٠. ابن شداد: ١٩٩١، ٣/ ١/ ٢٦٩_ ٢٧٠)، شـاری سێرت لە دروسـتکردنی تـاس

و بابەتی مس بەناوبانگ بووە، تاسەکانی ئەوێ لەو سەردەمەدا هاوتای نەبووە و هەروا میوەی هەنجیر و هەناری زۆر بووە و هەناردە کراوە (حمدالله مستوفی: ۱۳۸۹، ۱۰۵). ڕۆژئاوای هەرێمی چیا ناوچەیەکی دەوڵەمەند بووە، بازرگانی لەگەڵ عیراق (عەرەبی) کردووە، شاری نەهاوەند چەندان جۆر میوەی لێ هەبووە، هەناردەی شوێنانی دیکە کراوە (ابوالفداء: ۱۸٤۰، ٤۱۷)

بازرگانیی ناوەخۆ لەسەر مەڕ و مالآت و بەرهەمی سپیاتی و خوری و پێستە و ڕۆن و مووی بزن وەستابوو، کورد لە وەرزی بەهاردا روویان لە زۆزان کردووە و مەڕومالآتیان فرۆشتووە یا لە شوێنانی دیکە کڕیویانە (ابن الاثیر: ۱۹۸۲، ۱۲/ ۱۳۲. درویش یوسف: ا_ ۲۰۰٦، ۲۲٤). هەروەها ڕەزە زۆر و زەوەندەکانی شەقڵاوە و تریێ بەناوبانگەکەی لەو سەردەمەدا بوونەتە میوەی سەرەکیی شاری ئەربل (یاقوت الحموی: ۱۹۵۷، ۱/ ۱۳۸).

رووباری دیجلە لەبەر ئەوەی تا دەگاتە شاری مووسڵ بە تەواوی شارە کوردییەکانی هەرێمی دیاربەکر تێدەپەڕێ، بۆیە ڕۆڵی گرنگی لە گواستنەوەی کالآ و کەرستە هەبووە، بە جۆرێ بازرگانیی نێوان شارەکانی هەرێمی ئەرمینیا (وان) و دیاربەکر و مووسڵی پەرە پێداوە، هەروەها لە دەریاچەی وان بازرگانی بە هۆی بەلەمەوە کراوە، نێوان شارەکانی ئەو سەر و ئەم سەری بەیەکەوە بەستۆتەوە بە تایبەتی بۆ خەلات و دواتر بۆ شارەکانی جەزیرە ئالوگۆڕ کراوە ( ابن سعید: ۱۹۷۰، ۱۷۱. علاء قداوی: ۲۰۱۵، ۱۷٦).

### ٥- بازاڕ و سەنتەری بازرگانیی کاریگەر:

### ٥_۱_ بازاڕ :

بازاڕیش هەم لە بارزگانیی ناوەخۆ و هەم دەرەکی شوێنێکی گرنگی چالاکیی بازرگانی بووە، زۆربەی شاری کوردی بازاڕی تایبەت بەخۆی هەبووە و پێویستی ڕۆژانە و هەفتانە و مانگانەی خەڵکی پڕکردووەتەوە. بازاڕ کاریگەری بەسەر چالاکی و جوولەی بارزگانی بە

تـایبەتی نـاوەخۆ هەبـووە، هەرچەنـدە شـاری میافـارقین رووبەڕووی داگیرکاری بوویەوە، بەڵام چەندان بازاڕی لێ هەبووە، لەوانە بازاڕی ئەسپان و بازاڕی عەتاران و قوماش، سەرباری ئەو بازاڕانە هەروەها خان و کاروانسەرای لێ بووە (ابن شداد: ١٩٩١، ٣/ ١/ ١٤٧، ٢٧٦، ٢٨٢)، گومان لەوە نییە بوونی خان و کاروانسەرا رووکارێکی گرنگی بازرگانی بووە. هەروەها حەمدوڵڵا ئیشارەی بەوە داوە، کە میافارقین حقوقی دیوانی دووسەد و بیست و چوار هەزار دینارە (١٣٨٩، ١٠٦). بازاڕ لە شاری ماردین کاریگەری بەسەر بازرگانییەوە هەبووە (ابن شداد: ١٩٩١، ٣/ ٢/ ٥٤٢. هدار سليم: ٢٠١٣، ٢٦٦)، هەروەها شاری شنگال بازاڕی ئاوەدان بووە، شاری نوسەیبین بازاڕی تیر و کەوانی لێ بووە و هەم لێی دروستکراوە و هەم کڕین و فرۆشی لێ کراوە، شاری ئەرزن چەندان بازاڕی لێ هەبووە، خەڵکەکەی جلوبەرگی گرانبەهایان بۆ شارانی دەوروبەر ناردووە (ابن شداد: ١٩٩١، ٣/ ٢/ ١٢٩_١٣٠، ١٥٦، ٣/٢/ ٥٣٦)، شاری بەدلیس چەندان خان و دووکانی لێ بووە کە لە چیاکان هەڵکۆڵراون و ڕێگەیان بۆ بازرگان ئاسان کردووە ( البدليسي: ٢٠٠١، ٥٨٦، ٥٨٩). شاری ئامەد بازاڕێکی گەورەی قەیسەری تایبەتی قوماشی لێ بووە (ابن شداد: ١٩٩١، ٣/ ١/ ٢٩). وەک دەرکەوتووە لە کوردستان کاروان و ڕێگەی کاروان و خان و کاروانسەرا و ڕێگەی بازرگانیی نێوان شارەکان ئاماژەی بە ڕۆڵی بازرگانی داوە، کە میر و سەرکردەی کورد ڕۆڵی سەرەکییان لە چالاکیی بازرگانی هەبووە (البدليسي: ٢٠٠١، ١٤٦، ١٩٠، ٣٥٠، ٣٥٦، ٤٤٧، ٥٨٩. مصطفى احمد: ٢٠٠٧، ١٨٧. ١٨٩_١٩٠).

هەروا هۆزی زێبار لە ناوچەی خۆیان خاوەن بازاڕی تایبەت بە خۆیان بوون و خەریکی کاری بازرگانی بوون (ابن فضل الله العمري: ٢٠١٠، ٣/ ٢٠٣)، لەبەرئەوەی شوێنی هۆزەکە لە شاری مووسڵ نزیک بووە (جعفر: ١٩٦٨، ١٣٥، ١٣٨) زۆر ڕێی تێدەچێ لەو شارەدا خەریکی کاری بازرگانی بووبن.

**٥_ ٢_ سەنتەری بازرگانیی کاریگەر :**

لە سەردەمی دەوڵەتی ئیلخانانی مەغۆلی چالاکیی بازرگانی لە کوردستان بە هەمان شێوەی پێشوو بەردەوام بووە، وەکو روونە کوردستان لەنێو دەوڵەتی ئیلخانان کەوتبووە سەر سنووری رۆژئاوای و هاوسنووری دەوڵەتی مەملووکی بوو، کە ماوەیەکی زۆر لەبەر ململانێی سیاسی، چالاکیی بازرگانی زەحمەت بوو، بۆیە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، تەورێز و مەراغە و سولتانییە هەر سێ شار لە ماوەی جودا پایتەختی دەوڵەتی ئیلخانان بوون، بوونەتە سەنتەری بازرگانی، لەبەر ئەوە پێوەندیی بازرگانی لەگەڵ ئێران زیاتر هەبووە و بازرگانی بەرەو لای رۆژهەڵات بەرەو هیند و چین و ناوەڕاستی ئاسیا کشا، چونکە بەشێکی زۆری ئاسیا بەدەست مەغۆلانەوە بوو، بازرگانان روویان لە چین و هیند کردووە، بە پێچەوانەوە هەرچەندە کوردستان لە شام و میسر نزیک بووە، کەچی لەبەر بارودۆخی سیاسی و دوژمنایەتیی دەوڵەتی ئیلخانان و مەملووکی، بازرگانیی کوردستان لەگەڵ شام و میسر رووی لە کزی کردووە. رێگەی وشکانی بەلای رۆژهەڵات ئەو رێگەیانەی بەلای باکوورەوە رۆیشتوون، زیاتر برەویان هەبووە، چونکە بە تەورێزی پایتەختەوە تێپەڕیون (جعفرخصباک: ١٩٦٨، ١٣٣). گومان لەوە نییە کوردستان لە شارەکانی پایتەختی ئیلخانان هەم مەراغە و هەم تەورێز نزیک بووە، هەروەها لە سولتانییەش دوور نەبووە، بۆیە تاڕادەیەک کاریگەری لە چالاکیی بازرگانی کردووە، چونکە هەرێمەکانی کوردستان لە ناوەندی بازرگانییەکانی دەوڵەتی مەغۆلی نزیک بوون.

کوردستان رووبەرێکی بەرفرەوانی لە رۆژئاوای دەوڵەتی ئیلخانان پێکدەهێنا، بۆیە لە هەر سێ ناوەندی بازرگانیی دەوڵەتەکە نزیک بوو، هەر سێ شاری تەورێز و بەغدا و موسڵ لە گرنگترین شارەکانی بازرگانیی دەوڵەتەکە بوون و رێگەکانی ئەو سێ ناوەندە بە کوردستان تێپەڕیون، هەروەها بازرگانانی کورد بەشداری لە بازرگانیی شاری

مووســڵ و بەغــدا کــردووە، هەروا تــاڕادەیەک بەشــداری لە کــاری بازرگـانیی شـاری تەوریـزیش کـردووە، لەگەڵ ئەوەی بەشـێکی کـورد بوونەتە ڕێگر لەبەردەم بازرگانی، کەچی خودی ئیلخانان بایەخیان بە ڕێگەکـانی بازرگـانی نێـو کوردسـتان داوە، شـاری مووسـڵ کە جێگەی تەواوی بازرگانـان بـووە و بـووەتە وێسـتگەی دیـکەی بازرگانـان بـۆ تەواوی وڵات (یاقوت الحموی: ١٩٥٧، ٥/ ٢٢٣. القلقشندی: ١٩٨٧، ٤/ ٣٥٨. زرار صدیق: ٢٠٠٩، ٣٢٤). لە راسـتیدا هەڵبژاردنـی هەرێمـی ئازەربایجـان بـۆ پـایتەختی دەوڵەتـی ئیلخانـان لەگەڵ ئەوەی چەنـدان هۆکـاری سیاسـی کـاریگەری بەســـەرەوە هەبـــووە، لە هەمـــان کاتـــدا پشـــکداری لە بەســـتنەوەی هەرێمەکـانی دەوڵەتەکە کـردووە و لە رووی ئـابووریەوە سـوودی بە دەوڵەتەکە گەیانــدووە و چــالاکیی بازرگــانی زیــاتر کــردووە، ئیــبن فەزلوڵلای عومەری لەوە دواوە کە "تەوریز ئەمڕۆ دایکی تەواوی ئێرانە، قاسید لە هەموو لایەکەوە رووی تێکردووە، لەوێ وێستگەی بازرگانان هەیە" (٢٠١٠، ٣/ ١٦١).

هەروەهـا شـاری تەوریـز ناوەنـدێکی گرنگـی بازرگـانیی دەوڵەتـی ئیلخانـانی مەغـۆلی بـوو، لەبەر شـوێنی و نزیکـی لە کوردسـتان و ئەو ڕێگەیانەی بە کوردستان تێپەڕیون و بە دەریای ڕەشی بەستووەتەوە، کـاریگەری بەسـەر بازرگـانیی کوردسـتانەوە هەبـووە، چـونکە شـوێنی بازرگانـان و گەڕیـدەکان بـووە (القلقشـندی: ١٩٨٧، ٤/ ٣٥٨. جعفـر: ١٩٦٨، ١٣٣)، کاروانی بازرگانان لە تەواوی وڵاتان روویان لە تەوریز کردووە، بازاڕ و دووکان و پیشەی جۆراوجۆری لێ هەبووە، چەندان کاروانسەرای لێ بـووە، کەلـوپەل و قومـاش و زێـڕ و زیـو و بـۆن و جوانکـاری بـابەتی سـەرەکیی بازرگانـان بـووە و لە هەمـوو لایەکەوە بازرگانـان روویـان تێکـردووە، بازرگانـانی مەسـیحی لە وڵاتـی ترابـزۆن (ابن بطوطه، ١٩٩٧، ١/ ٢٩٤) لە دەریـای ڕەشـەوە و بازرگانـانی موسـڵمانان لە بەغـدا و وڵاتـی شـام و ئاسـیای بچـووک (دیـاربەکر و وڵاتـی ڕۆم) سـاڵانە روویـان لە شـاری سـوڵتانییە کـردووە، کەلوپەلیـان لـێ گۆڕیـوەتەوە (کلاویخو: ١٣٣٧، ١٦٢_ ١٦٥، ١٦٨. زرار صدیق: ٢٠٠٩، ٣٢٤_٣٢٥).

**٦- بازرگانانی ناسراوی کوردستان:**

بازرگانان لای ئیلخانان خاوەن پایەیەکی بەرز بوون و بەرێزەوە لە بازرگانیان ڕوانیوە و پایەی کۆمەڵایەتیی بازرگانیان پاراستووە، دوای کەوتنی بەغدا هۆلاکۆ فەرمانی دەرکرد، کە شەش یارلیغ (واتە فرمان) بنووسرێ تێیدا قازییەکان و زانایان و شێخەکان و سادات و بازرگانان و ئەوانەی لەگەڵ ئێمە نەجەنگاون، ئەمانیان پێبدرێ (رشیدالدین فضل الله؛ ا_ ١٣٦٢، ٢/ ٧١٠. ابن الفوطی: ب_ ١٣٥١، ٣٢٩. محمد مفید: ٢٠٠٩، ١٠٢_١٠٣). لەو دەقەدا پێگەی قازی و زانا و شێخ و پیاوانی گەورە وەک یەک تەماشاکراوە، سەرەڕای پێگەی ئابووریيان، خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتیی بەرز بوون.

لە سەرچاوەکان لەبارەی بازرگانانی کوردستان ناوی کەم بازرگانان دەست کەوتووە، ئەگەر لە سەرزەمین و شوێنی کوردستان بڕوانین بۆمان دەرکەوتووە، چالاکیی بازرگانی پێویستییەکی گرنگ بووە، بەڵام ڕۆڵی ئەوانەی خەریکی بازرگانی بوون، تاک و تەرا لە میانەی دەقی مێژوویی و سەفەرنامە و ژیاننامە و هی دیکە دەرکەوتوون، ئیبن شەداد لە کاتی ئابڵوقەی میافارقین لەلایەن مەغۆل لە ساڵی (٦٥٧ ک/ ١٢٥٩) باسی لە ئەبابەکر کوڕی عەبدلڕەحمان بەزاز کردووە ( ١٩٩١، ٣/ ٢/ ٥٠٨)، کە دیارە ناوبراو لە بازاڕی بەزازەکانی شارەکە خەریکی بازرگانی بووە، هەروا ئەبوحەسەن عەلی کوڕی ئەبوبەکر کوڕی سلێمان دونبولی کە ئەسڵی هی شارۆچکەی معلسایا (نزیک دهۆک) بووە، یەکێ لە بازرگانە گەورەکانی ئەو سەردەم بووە (ابن الفوطی: ا_ ١٤١٦، ٣/ ٥١١)، بۆ بازرگانی گەلێ ناوچە گەڕاوە لەوانە رووی کردووەتە شاری ئەسکەندەرییە و بەغدا، لە میانەی سەفەرەکانیدا لەلای شێخ و زانایان ماوەتەوە و دەرسی خوێندووە، تا بووەتە یەکێ لە موحەدیسان (ابن النجار: ١٩٩٧، ١٨/ ١٥٠).

لە دەقی ئیبن عیبری سەبارەت بە باوکی مەسعود بەرقوتی حاکمی ئەربل، کە ناوی ئەعلەمەدین یەعقوب بەرقوتی بوو، بازرگانێکی

گەورەی شاری ئەربل بووە، ئاماژەی ئەوەی پێداوین کە مەسیحییەکان لە سەردەمی ئیلخانانی ناموسڵمان بازرگانی گەورەیان لە سنووری دەوڵەت هەبووە و بگرە زیاتر بازرگانی بەدەست ناموسڵمانانەوە بووە، ئەو بازرگانانە پێوەندیی توندوتۆڵیان لەگەڵ مەسیحییەکانی مەغۆلستان لە ڕۆژهەڵات هەبووە و هەم بۆ کاری بازرگانی سەردانی ڕۆژهەڵاتیان کردووە و هەم سەریان لە کەسایەتیی گەورەی مەغۆل داوە، ئەعلەمەدین دوای گەڕانەوەی لەلای قوبیلای خانی (٦٥٩-٦٩٣ک/١٢٦٠-١٢٩٣ز) گەورەی مەغۆل لەگەڵ یەشموتی باڵیوزی ئەیغوری و راهیبی مەسیحی سەریان لە ئەباقا داوە، دەریخستووە، کە پێوەندییان لەگەڵ ئیلخانان زۆر بەهێز بووە، بۆیە ئیلخانان هانی مەسیحییەکانی نێو دەوڵەتی ئیلخانانیان داوە لەگەڵ ڕۆژهەڵات خەریکی بازرگانی بن، بۆیە پێگەی بەرزیان هەبووە، لەبەر ئەو پێوەندییانە ئەباقا مەسعودی کوڕی کردووەتە حاکمی ئەربل و مووسڵ (٢٠٠٥، ٣٣٤_ ٣٣٥).

ئەبو محەمەد عەبدولڕەحمان کوڕی ئیبراهیم کوڕی قنینوی ئەربلی ناسراو بە بەدرەدین ئەربلی یەکێ لە بازرگانانی سەردەمی ئیلخانانی مەغۆلی بوو، بێجگە لەوە هەم ئەدیب و مێژوونووس بووە، کتێبی (خلاصة الذهب المسبوک_ مختصر من سيرة الملوک) ی نووسیوە لە ساڵی (٧١٧ ک/ ١٢١٧ز) کۆچی دوایی کردووە (ابن حجر: ١٩٦٦، ٢/ ٣٢١، عباس العزاوی: ١٩٣٥، ١/ ٤٥٠. محمد مفيد: ٢٠٠٩، ١٠٦- ١٠٧، ١٢٤). هەروەها شێخ عەبدولڕەحمان کە باوکی مەملووکی رۆمیی خەلیفەی عەبباسی موستەعسەم بیللا (٦٤٠-٦٥٦ ک/١٢٤٢-١٢٥٨ز) بوو، دوای داگیرکردنی بەغدا رووی لە مووسڵ کردووە لە بازاڕێکدا خەریکی بازرگانی بوو، دواتر رووی لە قەڵای عەمادییە کردووە و پێوەندیی لەگەڵ دەسەڵاتداران خۆش بووە (ابن العبری: ا_ ٢٠٠٥، ٣٥٠. ابن الفوطی، ب_ ١٣٥١). هەروەها حەسەن ئەربلی رووی لە وڵاتی بەرەکەخان کردووە و تا قەرەقورومی پایتەختی مەغۆل شارەزا بووە (القلقشندی: صبح الاعشی، ٤/ ٤٨٥). بەدرەدین حەسەن ئەسعەرتی تاجر رووی لە وڵاتی چین و خەتا

کردووە و بە ژمارەی سوپای مەغۆل لەوێ سەرسام بووە (القلقشندی: صبح الاعشی، ٤/ ٤٨٦). شێخ شەرەفەدین شنگالی (سنجاری)ی تاجر و شێخ محەمەد شنگالی (سنجاری) بۆ بازرگانی روویان لە شام و میسر کردووە (ابن ایبک الدواداری: ١٩٧١، ٨/ ٢٧٢_ ٢٧٣)، هەروا ئەوحەدەدین سنجاری بەهۆی کاری بازرگانییەوە رووی لە چین کردووە و لەوێ نیشتەجێ بووە (ابن بطوطه: ١٩٩٧، ٢/ ٢٢٧). هەروەها قاسم کوڕی ئەبی بەکر کوڕی قاسم ئەربلیی ناسراو بە ئەمینەدین لە بازرگانە گەورەکانی سەردەمی خۆی بووە و لە نێوان ئەربل و وڵاتی میسر و عەجەم و خوارەزم هاتووچووی کردووە (الیونینی: ١٩٦١، ٤/ ١٢١. علاء قداوی: ٢٠١٥، ١٧٣).

### ٧- ڕێگەکانی بازرگانی:

### ٧_ ١_ ڕێگەی بازرگانیی دەرەکی:

چەندان ڕێگەی بازرگانیی دەرەکی بەنێو کوردستان تێپەڕیون، ئەو ڕێگەیانە شارەکانی کوردستانی بە هەر سێ ناوەندی بازرگانیی نزیک لە کوردستان تەورێز و بەغدا و مووسڵ بەستۆتەوە و هەم شار و گوندەکانی کوردستانی لەگەڵ یەک گرێ داوە، لەبارەی ڕێگەی بازرگانی دەرەکی کە بە کوردستان تێپەڕیوە، ڕێگە گرنگەکان بریتین لەمانە:

یەکەم/ ڕێگەی تەورێز بۆ ترابزۆن: ئەو ڕێگەیە تەورێزی پایتەختی بە جیهانی ڕۆژئاوا بەستۆتەوە، بازرگانانی ئەورووپی لە ڕێگەی ترابزۆنەوە لەسەر ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەشیان بەکارهێناوە، ڕێگەیەکی ئارام و ئەمان بووە، چونکە بازرگانان بخووریان لە هیندستانەوە بۆ وڵاتی فارس و بۆ شاری تەورێز هێناوە و دواتر بۆ کەنارەکانی باشووری دەریای ڕەش بۆ بەندەری ترابزۆن بردوویانە (سلمان: ٢٠١٥، ١٤٥). ئەو ڕێگەیە چەند لکێکی هەبووە، لکێکی بە کەنداوی فارس بە ڕێگەی وشکانی بۆ بەسرە و بەغدا و دواتر رۆژئاوای هەرێمی چیا (هەرێمی کوردستان) پاشان بۆ شاری مەراغە و تەورێز چووە، ئەو ڕێگە لە تەورێزەوە بە ڕێگەی خوی و دۆڵەکانی ئەرزەڕۆم و بایبۆرت

بەرەو ترابزۆن چووە (هایدو: ١٩٩٤، ٢/ ٣٦٠). ڕێگەیەکی دیکەی ناوەخۆی کوردستان چۆتەوە سەر ئەو ڕێگە، ڕێگەی مووسڵ بۆ جەزیرە بۆ حسن کێفا بۆ ئەرزن بۆ سعێرت و بەدلیس و وستان و وان و دواتر بارگری لەوێوە تێکەڵ بە ریگەی بازرگانی سەرەکیی تەورێز _ترابزۆن بووە ( ابوالفداء: ١٨٤٠، ٢٧٣_ القلقشندی: ١٩٨٧، ٤/ ٤٠٣. لسترنج: ١٣٨٣، ). هەروا ڕێگەی دیکەی بازرگانیی ناوەخۆی چووەتەوە سەر ڕێگەی سەرەکیی بازرگانی، کە لە شاری ئامەد بۆ حانی و میافارقین و ئەرزن و بەدلیس و ئەخلات و عادل جەواز بە درێژایی کەنارەکانی دەریاچەی ئەخلات درێژ بۆتەوە بۆ ئەرگیش دواتر بە ڕێگەی تەورێز _ ترابزۆن گەیشتۆتەوە، لەوێوە بۆ ئەرزەڕۆم و خنس و مەلازگرد هەروا بە ڕێگەی حسن کێفا گەیشتۆتەوە و تا خوی و مەرەند (باکووری دەریاچەی ورمێ) و تەورێز (حەمدوڵلا بەشێکی ئەو ریگەیەی بە فەرسەنگ باس کردووە، ١٣٨٨، ١٨٣_ ١٨٤. شرین بیانی: ب_ ١٣٤٥، ١٦٥_ ١٦٦. زرار صدیق: ٢٠٠٩، ٣٣٥).

دووەم/ ڕێگەی خوراسانی گەورە: ڕێگەیەکی کۆن بووە، هەر لە سەردەمی عەبباسییەکانەوە بە ڕێگەی خوراسانی گەورە ناسراوە، کە بەغدا و هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی بەیەکەوە بەستۆتەوە، لە بەغداوە بۆ دەسکەرە و حولوان و خانەقین و دەربەندی تاج خاتوون و کەرەند و قرمسین (کرمانشا) و چیای بێستوون و هەمەدان (هەرێمی چیا) و رەی و دواتر بۆ هەرێمی خوراسان ( لسترنج: ١٣٨٣، ١٠، ٩٢).

شاری بەغدا چ لەرووی بازرگانیی دەرەکی و ناوەخۆ پێگەی خۆی لەدەست نەداوە، یەکێ لە سەنتەری گرنگی بازرگانیی سەردەمی ئیلخانان بوو، بەتایبەتی ئەو کاتەی بنەماڵەی جووەینی ئیدارەی شارەکەیان لە ئەستۆ گرتبوو، بە جۆرێ هەرچی کاڵایەکی بەنرخ و کەرەستەیەکی بەسوود هەبووە، بۆ بەغدا هەنارده کراوە (القزوینی: ١٩٦٠، جعفر خصباک، ١٩٦٨، ٦٥_٦٧. ١٣٧)، بەغدا شارێ بووە زەنگینی زۆر لێ بووە، جێگەی رەفاهییەت و خۆشی بووە، پڕ بووە لە کەلوپەلی خواردن،

مرۆڤ هەرچی بویستایە دەستی کەوتووە (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ٣٤_٣٥).

ئەو ڕێگەیە چەند ڕێگەیەکی دیکەی لێ بووەتەوە، لە بەغداوە بۆ هەرێمی کوردستان لەوێوە ڕێگەیەکی دیکە بەرەو شاری تەورێز چووە (شیرین بیانی: ب_ ١٣٤٥، ١٦٥. زرار صدیق: ٢٠٠٩، ٣١٤). گەلێ لە ئیلخانان ئەو ڕێگەیان بڕیوە و لە سەردەمی وان ڕێگەیەکی تاڕادەیەکی باش ئارام بووە و مەترسیی تێدا نەبووە، لە وەرزی زستان روویان لە شاری بەغدا کردووە، غازان و ئیلخانانی دیکە لە زستاندا سەریان لە بەغدا داوە، هەتا ئولجایتو لە سامانی خۆی قەرەبووی سووتانی بازاڕی قوماشی چەندان جۆر وڵاتی، کردووەتەوە (رشیدالدین فضل الله: ب_ ١٣٨٨، ١٣٩، کاشانی: ١٣٨٤، ١٠٩. حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ٣٥). وەک دەرکەوتووە ئەو ڕێگەیە هەم ڕاستەوخۆ بۆ خوراسان بە کوردستان تێپەڕیوە و هەم بۆ شاری تەورێز بە کوردستان تێپەڕیوە، بۆیە چالاکی بازرگانیی کوردستانی بە بەغداوە بەستۆتەوە.

سێیەم/ ڕێگەی مەراغە بۆ مووسڵ و حەلەب: ئەو ڕێگەیە مەراغە و تەورێزی بە مووسڵی ناوەندی هەرێمی دیاربەکر و رەبیعە بەستۆتەوە، لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیلخانانی مەغۆلی لەبەر چالاکیی کوردان و ترسی مەملووکی لە ناوچەکە ڕێگەکە جێگەی هاتووچووی چەکدارانی مەغۆل بووە، هەروەها سەربازگەیان لێ هەبووە (ابن العبری: ا_ ٢٠٠٥، ٣١٩_ ٣٢٢، ٣٢٦، ٣٣٤، ٣٥٥، ٣٥٩،). لەگەڵ ئەوانەش لە سەردەمی ئەباقا قەیاچی و کورد ڕێگرییان لێ کردووە (کاشانی: ١٣٨٤، ١١٣). هەروا غازان لەو ڕێگەیەوە لەساڵی (٦٩٩ ک/ ١٢٩٩ز) لە تەورێزەوە بۆ مەراغە و زێی زاب (زێی گەورە) و سەربازگەی کوشاف و دواتر مووسڵ و شام لەشکرکێشی کردووە (رشیدالدین فضل الله: ب_ ١٣٨٨، ١٢٥)، عومەری لە باسی هۆزی کوردی ناوچەکە باسی لە ئێشکگری لەسەر ڕێگەکە کردووە، کە بە ڕێگەی ئەربل بۆ دۆڵی بەست (بەستۆڕە) و دەربەندی گەورە و تەل هەفتون و ئەشنە (شنۆ) و مەراغە و تەورێز تێپەڕیوە (١٩٥٧، ١/ ٢١٠، ٤١٤، ٢/ ٤٥. ٢٠١٠، ٣/ ١٩٨، ١٩٩، ٢٠١، ٢٠٧.

زرار صـدیق: ۲۰۰۹، ۳۳٤). چەنـدان ڕێـگەی دیـکەی نـاوەخۆ بەسـەر ئەو ڕێگەیەوە بوون، له مووسڵەوە ڕێگەی بازرگانی بۆ بەغدا هەبووە، که بایەخی زیاتری به ڕێگەی خوراسـان داوە و له ڕێگەی مووسڵەوە به شـارەکانی هەرێمی دیاربەکری بەستۆتەوە، به تایبەتی جەزیرە (جعفر خصباك: ۱۹٦۸، ۱۳٦). دوای ئاشتی نێوان دەوڵەتی ئیلخانان و مەملووکی ئەو ڕێگەیە زیاتر بووژانەوەی بەخۆیەوە دی، هەتا ئیسماعیل کوڕی مـحەمەد کـوڕی یـاقوت سـەلامی بازرگـانی عیراقـی هەوڵـی بـۆ نزیککردنەوەی ئەبوسەعید و مەلیک ناسری کوڕی قەلاون سوڵتانی مەملـووکی داوە (۷۰۹-۷٤۱ک/ ۱۳۰۹-۱۳٤۰ز، بـۆ جـاری سـێیەم). (ابن حجر: ۱۹٦٦، ۳/ ٤۲۹.، محمد مفید: ۲۰۰۹، ۱۰۱).

چـوارەم/ ڕێـگەی تەورێـز بـۆ ئەیـاس (شـارێکە له ئەرمینیـای بچـووک): ئەو ڕێگەیە له تەورێـزی پایتەختەوە دەستی پێکـردووە تـا بەنـدەری ئەیـاس له دەریـای ناوەڕاسـت، چەنـدان شـار و وێسـتگەی بەسەرەوە بووە، دوای تەورێز به ڕۆژئاوای هەرێمی ئازەربایجان بۆ ئەرزەڕۆم و سیواس و تودرجا و شۆڕبووتەوە بۆ خاندوس (جوپیدەر) و دواجار بەندەری ئەیاسی ئەرمینیای بچووک له دەریای ناوەڕاست (هایـدو: ۱۹۹٤ ، ۲/ ۳٥۰_ ۳٥٦. سلمان: ۲۰۱٥، ۱٤٤). ئەو ڕێـگەیە له سـەردەمی ئیلخانـانی ناموسڵمان جـێگەی هەڕەشـەی دەوڵەتـی مەملـووکی بـووە، چەنـدان جـار هێرشـیان بـردووتە سـەر ئەرمینیـای بچـووک و ئەو بەندەرەیان گرتووە، تا ناکۆکیی بەندەرەکانی میسر نەکا، له سەردەمی غـازانیش نـاوچەی باشـووری ڕۆژهەڵاتـی ئەنـادۆڵ ئـارام نەبـووە، مەملووکەکـان زۆر هێرشـیان بـردووتە سـەر ئەرمینیـای بچـووک، ئەو بەندەرەیان وێران کردووە، بۆیە چەندان بازرگان ڕێگەی تەورێز بۆ ترابزۆنیـان هەڵبـژاردووە (اشـتور: ۱۹۸٥، ۲٤۱_۲٤۲. سـلمان: ۲۰۱٥، ۱٤٥). له ڕاستیدا ئەو ڕێگەیە تا سەردەمی ئەبوسەعید نائارام و سەخت بووە، هەرچەندە بەشێکی به کوردستان تێپەڕیوە، بەڵام بارودۆخی سیاسی و ململانێی هەردوو دەوڵەت چالاکیی بازرگانی له ناوچەکە کز کردووە.

**٧_ ٢_ ڕێگەی بازرگانیی ناوەخۆ:**

ڕێگەی بازرگانیی دەرەکی لە بنچینەدا لە ڕێگەی بازرگانیی ناوەخۆ سەرچاوەی گرتووە، کاڵا و کەرەستە و بەرهەم و بەروبوومی ناوەخۆ کۆکراونەتەوە، دواتر بۆ شاران و ناوەندی دوور گوێزراونەتەوە، هەروەها ڕێگەی بازرگانیی دەرەکی زۆر سوودی بە بازرگانیی ناوەخۆ گەیاندووە، لەبەر ئەوە گەلێ ڕێگەی بازرگانیی دەرەکی لە بنەڕەتدا لە چەند ڕێگەیەکی ناوەخۆ پێکهاتووە، یاخود چەندان ڕێگەی ناوەخۆ لە سەرڕێکەوە بە ڕێگەی بازرگانیی دەرەکی بەستراونەتەوە. لە کوردستاندا نەک هەر شارەکان بەڵکو گوند و شار یان گوند و گوند بەیەکەوە بەسترابوونەوە و سوودیان لە بەرهەم و کەلوپەلی یەکدی وەرگرتووە، چەندان ڕێگەی گرنگی ناوەخۆ هەبووە، لە گرنگترین ڕێگەکان ئەمانە بوون:

**یەکەم: ڕێگەکانی هەرێمی دیاربەکر:**

أ/ ڕێگەی ئەربل بۆ دۆڵی بەست (بەستۆرە) دەربەندی گەورە بۆ تەل هەفتون و ئەشنە و مەراغە، ڕێگەیەکی کۆنی کاروانی بازرگانی بووە یاقوت حەمەوی خۆی چەند جارێک بەو ڕێگەیەدا گوزەری کردووە، هەروەها لە ئەربلەوە لکێکی دیکەی بۆ خوفتیدکان (کۆیسەنجەق) بۆ شارەزوور درێژ بووەتەوە (١٩٥٧، ١/ ٢٠١، ٤١٤، ٢/ ٤٥، ٣٧٩_ ٣٨٠. البغدادی: ١٩٩٥، ١/ ٤٧٥). هەروەها ڕێگەی دیکە لە ئەربل بۆ ئاڵتوون کۆپری بە کەناری زێی بچووک بۆ قەڵای کەرخینی (کەرکووک) دواتر بۆ داقووقا و قەڵای خورماتوو دواجار بۆ بەغدا ڕۆیشتووە (یاقوت الحموی: ١٩٥٧، ٢/ ٣٨، ٣١٠، ٤٥٩. ٤/ ٤٥٠. زرار: ٢٠٠٩، ٣٣٤). ئەو ڕێگەیە لکێکی لە زێی بچووکەوە بۆ مووسڵ درێژ بووەتەوە (الشامی: ١٩٣٧، ١٤٤_ ١٤٥. الغیاثی: ١٩٧٥، ١٨٩). لە شاری خوی ڕێگەیەک لە باشوورەوە بەرەو شاری سەلماس و ئورومیە (ورمێ) چووە و بەرەو ئەشنو دواتر بۆ ئەربل درێژ بووەتەوە (کلاویخو: ١٣٣٧، ١٣٩، ١٥٥_ ١٥٦، زرار: ٢٠٠٩، ٣٣٦).

ب/ لەبەر ئەوەی مووسڵ شارێكی گرنگ و سەنتەرێكی بازرگانیی ناوچەكە بووە و كورد رێژەیەكی زۆری دانیشتوانی دەوروبەری پێكهێناوە، بۆیە چەندان رێگەی لێ بۆتەوە و چووەتە ناوی شار و شارۆچكەكانی كوردستان لەو هەرێمەدا، رێگەی مووسڵ بۆ معلسایا (گوندی ماڵتەی نزیک دهۆک) بۆ حەسەنییە و جەزیرەی ئیبن عومەر بۆ حسن كێفا و ئامەد، هەروەها لە معلسایا لكێكی بۆ رێگەی عەمادییە (ئامێدی) لێ بۆتەوە و لكێكی دیكە رۆیشتووە بۆ حسن كێفا و ئەرزن و بەدلیس و وستان و وان و بارگری و لەوێوە تێكەڵی رێگەی سەرەكیی تەورێز بۆ ترابزۆن بۆتەوە (ابوالفداء: ١٨٤٠، ٢٧٣_ ٢٧٤. القلقشندی: ١٩٨٧، ٤/ ٤٠٣. زرار: ٢٠٠٩، ٣٣٥). لە مووسڵەوە رێگەیەكی دیكە بۆ بەلەد بۆ شنگال و دواتر حەلەب رۆیشتووە. رێگەیەكی دیكە لە مووسڵەوە بۆ بەلەد بۆ نوسێبین و ماردین و ئامەد چووە (القلقشندی: ١٩٨٧، ٤/ ٤٠١، ٤٠٣. لسترنج، ١٣٨٣، ١٣٥. زرار: ٢٠٠٩، ٣٣٥).

ج/ شاری ئامەد ناوەندێكی دیكەی گرنگی هەرێمەكە بووە، رێگەكانی زۆر شار و شارۆچكەكانی ناوچەكەی بەیەكەوە بەستۆتەوە، لەوانە رێگەی ئامەد بۆ حانی و میافارقین و ئەرزن و بەدلیس و ئەخلات و ئەرگیش، لەوێوە تێكەڵ بە رێگەی سەرەكیی بووەتەوە و چووەتە شاری حسن كێفا، هەروەها لكێكی بۆ شاری خوی چووە (شرین بیانی: ب_ ١٣٤٥، ١٦٥_ ١٦٦. زرار: ٢٠٠٩، ٣٣٥).

### دووەم: رێگەی كرماشان – هەمەدان – نەهاوەند بۆ بروجەرد لە لوڕستانی بچووک:

أ/ ئەو رێگەیە بەشێكە لە رێگە و كاروانی بازرگانیی نێوان عیراقی عەجەم و كرماشان و عیراقی عەرەبی، ئەو بەشەی كەوتۆتە كوردستان زۆربەی شار و شارۆچكەكانی ناوچەكەی بەیەكەوە بەستووەتەوە، كاتێ هۆلاكۆ لەشكركێشیی بۆ عیراقی عەرەبی دەست پێكرد، بەشێک لە سوپای مەغۆل بە سەركردایەتیی كیتۆبوغانۆیان لەو رێگەیەوە دەستی

بە جووڵە کرد، دوای ئەوەی مەغۆل لە لوڕستانی بچووک خۆی تۆکمە کرد لە ڕێگەی کوردستان بۆ عیراقی عەرەبی پێشڕەوی کرد (رشیدالدین فضل الله: ا_ ١٣٦٢، ٢/ ٧٠٩)

ب/ لەسەر هەمان ڕێگەدا لکێکی دیکە لە شاری سوڵتانییەوە بەرەو هەمەدان بۆ کرماشان هاتووە، کە لەسەر ڕێگەیدا بە شارەکانی ئەسەدئاباد و کەنگاوەر و سەحنە و چەمچەماڵ و کەرەند و خوشان و حولوان گەیشتۆتە قەسری شیرین، دواتر بۆ بەغدا چووە. هۆلاکۆ لە هێرشی بۆ بەغدا بەو ڕێگەیەدا لەشکرکێشی کردووە (رشیدالدین فضل الله: ا_ ١٣٦٢، ٢/ ٦٩٧_٧١٠. حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ١٦٥)

## سێیەم: ڕێگەی عیراقی عەجەمی بۆ شارەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی ئازەربایجان و ئەرمینیا:

بەشێکی ئەو ڕێگەیە بەو شارانەدا تێپەڕیوە کە زۆربەی دانیشتوانی کورد بوون، هەرچەندە بە دیاریکراوی ناوی شارەکان بە تایبەتی شاری کوردی نەهاتووە، بەڵام ڕوونە کە لە ڕۆژئاوای هەرێمی ئازەربایجان لەو سەردەمدا تومانی خوی شارەکانی سەلماس و ئەشنە و ورمێی لەخۆگرتووە، کە بە شارەکانی باشووری ڕۆژئاوای هەرێمی ئەرمینیاوە بەستراوەتەوە، ئەو ڕێگەیە بەگشتی چەندان لکی دیکەی لێ بۆتەوە و بە شاری مەراغە و سوڵتانییە و شارەکانی دیکەی عیراقی عەجەمی بەستراوەتەوە (حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ١٨٠_ ١٨٢. ابوالفضل رضوی: ب_ ١٣٨٨، ٢٥)

## چوارەم: ڕێگەکانی بازرگانیی هەرێمی ئازەربایجان:

ا/ ڕێگەی ئازەربایجان بۆ ئەرمینیا و ویلایەتی ڕۆم، ئەو ڕێگەیە بە تەورێزەوە دەستی پێکردووە بە ئەرزەڕۆم تێپەڕیوە، کە شارەکانی ئەرمینیای گەورەی گرتۆتەوە لەوانە ئەرگیش و مەلازگرد و خونەس دواتر گەیشتووە بە ئەرزەڕۆم لە ویلایەتی ڕۆم بۆ ئەرزنجان و

سیواس، له شاری سیواس چەندان ڕێگەی دیکەی بۆ باشوور و باکوور لێ بووەتەوە (حمدالله مستوفی: ۱۳۸۹، ۱۳۸۹،۱۷۹)

ب/ ڕێگەی تەورێز بۆ مەراغە بۆ ئەرمینیا و ویلایەتی ڕۆم، ئەو ڕێگەیە لە سەرێکەوە بە عیراقی عەجەمی بەستراوەتەوە، لکێکی لە مەراغەوە بۆ ئەرمینیا و ویلایەتی ڕۆم ڕۆیشتووە تا گەیشتۆتەوە ڕێگەی پێشووی بە هۆی ڕێگەی تەورێزەوە (حمدالله مستوفی: ۱۳۸۹، ۱۳۸۹،۱۰۰_۱۰۲، ۱۸۰_ ۱۸۱. ابوالفضل رضوی: ب_ ۱۳۸۸، ۲۵).

ج/ ڕێگەی تەورێز بۆ جەزیرە و شام، ئەو ڕێگەیە بە هەمان ڕێگەی تەورێز بۆ ئەرمینیا دەستی پێکردووە، بەڵام لە شاری ئەلەتاغ و خەڵات جودا بۆتەوە و رووی لە دیاربەکر کردووە، بە زۆربەی شارەکانی جەزیرە تێپەڕیوە، تا بەرەو ڕووباری فورات بەلای شام چووە، لکێکی دیکە لە بەغداوە بۆ جەزیرە بۆ شام چووە و تێکەڵی ئەو ڕێگەیە بووەتەوە (حمدالله مستوفی: ۱۳۸۹، ۱۲۰_۱۲٤. لسترنج: ۱۳۸۳ ، ۱۳۳_۱۳٤) لە ساڵی (٦٥٧ ك/ ١٢٥٩ز) هۆلاکۆ لەو ڕێگەیەوە لەشکرکێشی بۆ جەزیرە و شام دەست پێکرد (رشیدالدین فضل الله: ا_ ۱۳٦۲، ۲/ ۷۱۸_ ۷۲۰).

د/ ڕێگەی تەورێز و مەراغە بۆ کرمانشا، شا ڕێگەکەی لە عیراقی عەرەبییەوە بۆ عیراقی عەجەمی دەستی پێکردووە، دواتر جودابووەتەوە و دوا ڕێگە لە کەناری کێوی (سن سەیمیرە/ ددانی سەیمیرە) لە باکووری کرمانشا بەرەو لای شاری دینەوەر چووە و لەوێوە بۆ ئازەربایجان درێژ بووەتەوە. لکێکی بە نزیک دەریاچەی ورمێدا چووە، لەوێوە بووەتە دوو لکی دیکە بەلای ڕاست بۆ شاری مەراغە و چەپ بۆ تەورێز ڕۆیشتووە، ئەوەی ورمێ بەرەو شاری خوی چووە بۆ ئەرمینیا درێژبووەتەوە (لسترنج: ۱۳۸۳، ۲٤۸، ۲٦٤).

### پێنجەم: ڕێگەی بازرگانیی عیراقی عەرەبی:

أ/ ڕێگەی بازرگانیی بەغدا بۆ کرمانشا و عیراقی عەجەمی، ئەو ڕێگەیە لە کرمانشاوە بۆ هەردوو لورستانی بچووک و گەورە درێژ

بووەتەوە، دواتر بەرەو شاری ئەسفەهان ڕۆیشتووە ( حمدالله مستوفی: ١٣٨٩، ١٦٥. لسترنج: ١٣٨٣، ١٧١_١٧٣)

ب/ ڕێگەی عیراقی عەرەبی بۆ جەزیرە، لە شاری تکریتەوە دێ بۆ هەرێمی دیاربەکر (جەزیرە)، دواتر بەرەو شاری مووسڵ دەکشێ، تا بەوەی ڕێگەکە درێژ بووەتەوە و لەگەڵ ڕێگەی تەورێز بۆ جەزیرە تێکەڵ بووە (لسترنج: ١٣٨٣، ١٣٢_١٣٤)، جێگەی ئاماژەیە بایجونۆیانی سەرکردەی مەغۆلی لە کاتی لەشکرکێشیی هۆلاکۆ بۆ بەغدا بەو ڕێگەیەدا بەرەو پێشەوە چوو (رشیدالدین فضل الله: ا_ ١ ٢/ ٣٦٢، ٧٠٧). گومان لەوە نییە ئەو ڕێگەیە کە لە شاری مووسڵ بۆ جەزیرە درێژ بووەتەوە، بە وڵاتی هەکاری تێپەڕیوە، کە جێگەی چەندان هۆزی گەورەی کوردی بووە، لەوانە هۆزی زێباری و سندی (ابن فضل الله العمری: ٢٠١٠، ٣/ ٢٠٥_ ٢٠٧).

ج/ ڕێگەی عیراقی عەرەبی بۆ شام، لکێکی ئەو ڕێگەیە بە بەغداوە گەیشتۆتەوە شاری شنگال، هەرچەندە لە سەردەمی ئیلخانانی مەغۆلی لە سەرەتاوە تا سەردەمی غازان ئەو ڕێگەیە سەخت بووە، غازان لە لەشکرکێشیی دووەمی بۆ شام ئەو ڕێگەی گرتووەتە بەر ( رشیدالدین فضل الله: ب_ ١٣٨٨، ١٣٢_ ١٣٣. ابوالفضل رضوی: ب_ ١٣٨٨، ٢٨).

**شەشەم: ڕێگەی هەرێمی فارس بۆ خووزستان:**

ئەو ڕێگەیە کە بەرەو عیراقی عەجەمی دەکشێ لکێکی دێتەوە بۆ شاری کرمانشا لە ڕێگەکەدا بە هەردوو سەرزەمینی لورستانی بچووک و گەورە تێپەڕ بووە (ابوالفضل رضوی: ب_ ١٣٨٨، ٢٧).

## ٨- ئەنجام

١/ سەرچاوەکانی تۆژینەوەکە له میانەی دەقی مێژوویی و سیاسی و گەشتدا چەند ئاماژەیەکیان به جووله و چالاکیی بازرگانی کردووە، بۆیه زانیاریی پەرت و پچڕپچڕ لەبارەی بازرگانی له کوردستان دەستکەوتوون، که ئاماژەی ئەوەیان پێداوین چالاکی بازرگانیی ناوەخۆ له کوردستان جموجوولی باشی هەبووە، چونکه به چالاکی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و پیشەییەوە بەستراوەتەوە. هەروەها بازرگانیی دەرەکی له کوردستان برەوی هەبووە، چونکه چەندان ڕێگەی بازرگانیی دەرەکیی به کوردستاندا تێپەڕیوە.

٢/ هەر سێ شاری مووسڵ و بەغدا و تەورێز سێ ناوەندی گرنگی بازرگانیی سەردەمی ئیلخانان بوون و ڕاستەوخۆ کاریگەرییان بەسەر شارەکانی کوردستان و بازرگانییەوە هەبووە، ڕێگەکانی نێوان شارەکانی کوردستان ئەو سێ ناوەندەیان بەیەکەوە بەستۆتەوە، بۆیه کوردستان ڕێگەیەکی زۆری بازرگانیی ناوەخۆ و دەرەکی هەبووە، هەروەها گومان لەوە نییه کوردستان له شارەکانی پایتەختی ئیلخانان هەم مەراغه و هەم تەورێز نزیک بووە، هەروەها له سولتانییەش دوور نەبووە، بۆیه تاڕادەیەک کاریگەری له چالاکیی بازرگانی کردووە، چونکه هەرێمەکانی کوردستان له ناوەندە بازرگانییەکان پایتەختەکانی دەوڵەتی مەغۆلی نزیک بوون.

٣/ چەندان شاری کوردی له کوردستان هەم له بازرگانیی ناوەخۆ و هەم دەرەکی چالاک بوون، چونکه له ناوچەی بەرهەمهێنان نزیک بوون و بەسەر ڕێگەی گرنگی بازرگانی بوون، بۆیه بازرگانی گەشەی سەندووە و ئاڵوگۆڕی کاڵا و کەرەسته و بەروبووم له جموجوولدا بووە. لەو شارانه شاری کرمانشا له هەرێمی کوردستان و شاری ئەربل و مووسڵ و ئامەد له هەرێمی دیاربەکر و شاری خوی له ڕۆژئاوای هەرێمی ئازەربایجان و شاری ئەرگیش و خەلات له هەرێمی ئەرمینیا.

**سەرچاوەکان**


- ابن الاثير: عزالدين ابو الحسن علي بن ابي الكرم محمد الشيباني الجزري (ت-٦٣٠هـ/١٢٣٢م): الكامل في التاريخ، دار بيروت للطباعة والنشر، (بيروت: ١٩٨٢م).
- أحمد حمدي: الدولة الخوارزمية والمغول، دار الفكر العربي للنشر، (القاهرة: ١٩٤٩م).
- اشتور، ايلياهو: التاريخ الاقتصادي والاجتماعي للشرق الاوسط في العصور الوسطى، ترجمة: عبدالهادي عبلة، وراجعه: احمد غسان سبانو، دار قتيبة للطباعة والنشر والتوزيع، (دمشق: ١٩٨٥).
- امل محمد حلقها: من تاريخ المغول (الازمات الاقتصادية في عصر الدولة الايلخانية)، عين للدراسات والبحوث الانسانية والاجتماعية، (مصر : ٢٠١٦).
- ابن ايبک الدواداری: ابو بكر بن عبدالله بن ايبک (ت ٧٣٦ هـ/ ١٣٣٦م): كنز الدرر وجامع الغرر، الدرة الزكية في اخبار الدولة التركية، تحقيق اولرخ هارمان، (القاهرة: ١٩٧١م).
- البدليسي: الامير شرفخان بن شمس الدين بن شرفخان الروژكي (ت-١٠١٠هـ/١٦٠١م): شرفنامه، ت: محمد جميل الملا احمد الروزبياني، مؤسسة موكرياني، (اربيل: ٢٠٠١).
- ابن بطوطة: محمد بن عبدالله بن محمد ابراهيم اللواتي الطنجي (ت- ٧٧٩ هـ/١٣٧٧م) : رحلة ابن بطوطة (تحفة النظار في مصر وعجائب الاسفار)، دار بيروت، (بيروت: ١٩٩٧م).
- البغدادي: صفي الدين عبدالمؤمن بن عبدالحق (ت ٧٣٩ هـ/١٣٣٨م): مراصد الاطلاع على اسماء الامكنة والبقاع، تحقيق وتعليق علي محمد البجاوي، دار المعرفة، (بيروت: ١٩٥٥م).
- ابن تغري بردي، جمال الدين أبي المحاسن يوسف بن تغري بردي (ت٨٧٤ هـ/١٤٦٩م): النجوم الزاهرة في ملوک مصر والقاهرة، المؤسسة المصرية العامة للتأليف والترجمة، (القاهرة: ١٩٧٢م).
- جعفرحسين خصباک: العراق في عهد المغول الايلخانيين، مطبعة العاني، (بغداد: ١٩٦٨م).
- الجويني: علاءالدين عطا ملک بن بهاءالدين (٦٨١ ک/١٢٨٢ز): تاريخ جهانگشای، (ليدن:١٩٣٧م).
- ابن حجر العسقلاني، الحافظ شهاب الدين احمد بن علي (ت٨٥٢ هـ/١٤٤٨م): الدرر الكامنة في اعيان المئة الثامنة، مطبعة المدني، (القاهرة: ١٩٦٦م).

- حمدالله مستوفي، حمدالله بن ابي بكر بن محمد بن نصر المستوفي القزويني (ت ٧٥٠هـ/١٣٤٩م): نزهة القلوب، تصحيح و تحشيه: گای لسترنج، انتشارات اساطير، (تهران: ١٣٨٩هـش).
- درويش يوسف هروري: ا_ بلاد هكاري، دراسة سياسية حضارية (٩٤٥_١٣٣٦م)، دار العربية للموسوعات، (بيروت: ٢٠٠٦م).
_ علاقات الدولة المملوكية مع القوى السياسية في كوردستان (٧٠٩_ ٧٤١هـ/ ١٣٠٩_ ١٣٤٠م)، مجلة جامعة نوروز، قبول بالنشر، (دهوك: ٢٠١٨م).
- رشيدالدين فضل الله: رشيد الدين فضل الله بن عماد الدولة بن موفق الدولة الهمداني (ت: ٧١٨هـ/١٣١٨م): ا_ جامع التواريخ.، بكوشش: بهمن كريمى، انتشارات اقبال، (تهران: ١٣٦٢هـش)، چ٢.
_ تاريخ مبارک غازانی (داستان غازان خان)، باهتمام: کارل يان، نشر پرشش، (أصفهان: ١٣٨٨)، چ١.
- زرار صديق توفيق: كردستان في العهد الجلائري، مركز الدراسات الكوردية وحفظ الوثائق، (دهوك: ٢٠٠٩م).
- سبط ابن الجوزي: شمس الدين ابي المظفر يوسف ابن قزاوغلي: (ت: ٦٥٤هـ/ ١٢٥٦م): مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، المجلد الثامن، مطبعة مجلس دائرة المعارف العثمانية، حيدر اباد، (الهند: ١٩٥٢م).
- ابن سعيد المغربي: ابو الحسن علي بن موسى بن سعيد (ت ٦٨٥هـ/١٢٨٦م): كتاب الجغرافيا، تحقيق اسماعيل المغربي، (بيروت ١٩٧٠م).
_ سلمان ميران: أذربيجان في العهد المغولي، رسالة دكتوراه غير منشورة، كلية الاداب/ جامعة الموصل، (الموصل: ٢٠١٥م).
- الشامي: نظام الدين (و- ٨٠٧ هـ/١٤٠٤م): ظفرنامه، با اهتمام: فلكس تاور، المطبعة الامريكية، (بيروت: ١٩٣٧م).
- ابن الشحنة: محب الدين ابي الفضل محمد بن شحنة الحلبي (ت ٨٩١ هـ/١٤٨٦م): الدر المنتخب في تاريخ مملكة حلب، تحقيق يوسف بن اليان سركيس، المطبعة الكاثوليكية، (بيروت ١٩٠٩م).
- ابن شداد، عزالدين محمد بن علي بن ابراهيم (٦٨٤ هـ /١٢٨٥م): الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام و الجزيرة، جزء ٣، تحقيق: يحيى زكريا، وزارة الثقافة، (دمشق: ١٩٩١م).
- شرين بيانى: ا_المغول، التركيبة الدينية والسياسية، المركز الاكاديمى للابحاث، (بيروت: ٢٠١٣م).

_ تاريخ ال جلاير، انتشارات دانشگاه تهران، (تهران: ١٣٤٥هـ.ش).
- شوكت رمضان حجه: العلاقات بين دولة المماليک الأولى و دولة ايلخانية فارس (٦٤٨-٧٣٦هـ/ ١٢٥٠-١٣٣٦م) مؤسسة حمادة للدراسات الجامعية و دار اليازوري، (عمان: ٢٠١١م).
- عباس العزاوي، تأريخ العراق بين الاحتلالين، مطبعة بغداد الحديثة، ( بغداد: ١٩٣٥).
- ابن العبري: ابو الفرج جمال الدين ابن الشماس تاج الدين هارون الملطي (ت ٦٨٥ هـ/١٢٨٦م): ا_ تاريخ الزمان، ترجمة: اسحق ارمله ، دار المشرق، (بيروت :٢٠٠٥م). ط٢.
_ تاريخ مختصر الدول، وقف على طبعه ووضع حواشيه: الاب انطوان صلحاني اليسوعي، دار المشرق، (بيروت ٢٠٠٧م). ط٤.
- السيد الباز العريني: المغول، دار النهضة العربية (بيروت : ١٩٦٨م).
- علاء محمود قداوي: الموصل والجزيرة الفراتية في عهد دولة المغول الايلخانية (٦٥٦_٧٣٥هـ/ ١٢٥٨-١٣٣٥م)، دار غيداء للنشر والتوزيع، (الاردن: ٢٠١٥م).
- العيني: بدرالدين أبو محمود محمد ابن احمد (ت-٨٥٥ هـ/ ١٤٥١م): السيف المهند في سيرة الملک المؤيد، حققه: فهيم محمد شلتوت، الهيئة العامة لقصور الثقافة، (القاهرة: ٢٠٠٣م)
- الغياثي: عبدالله بن فتح الله البغدادي (ت- بعد ٨٩١ هـ/ ١٤٨٦م) التاريخ الغياثي، تحقيق: طارق نافع الحمداني، مطبعة اسعد، (بغداد ١٩٧٥م).
- الصفدي، خليل بن ايبک (ت٧٦٤هـ/١٣٦٣م): اعيان العصر و اعوان النصر، دار الفكر (بيروت: ١٩٩٨م).
- گای لسترنج: جغرافيای تاريخی سرزمين هايی خلافت شرقی، مترجم: محمود عرفان، شركت انتشارات علمی و فرهنگی، (تهران: ١٣٨٣هـ.ش)، چاپ ٦.
أبو الفداء : الملک المؤيد إسماعيل بن علي عمادالدين الأيوبي الشافعي صاحب حماه، (ت- ٧٣٢هـ/١٣٣١م): تقويم البلدان، صححه رينود و البارون ماک كوكين ، دار الطباعة السلطانية ، (باريس: ١٨٤٠م ). اعاد مكتبة المثنى ببغداد طبعه بالاوفسيت.
سيد ابوالفضل رضوی:
أ_ جايگاه بازاريان در اقتصاد و جامعه عصر ايلخانان، پژوهشهای تاريخی (علمی_ پژوهشی، دانشكده ادبيات و علوم انسانی_ دانشگاه اصفهان (أصفهان: ١٣٨٨هـ.ش).

ب_ راههای تجاری در عهد ایلخانی، کتاب ماه تاریخ و جغرافیا، مهر، شماره ١٣٧، (تهران: ١٣٨٨هـ.ش).
- ابن فضل الله العمري، شهاب الدين احمد بن يحيى بن فضل الله (٧٤٩هـ/١٣٤٨م): مسالك الابصار في ممالك الامصار: تحقيق: كامل سلمان الجبوري، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠١٠م).
ابن الفوطي: كمال الدين ابو الفضل عبدالرزاق بن احمد (ت ٧٢٣هـ/١٣٢٣م).
أ_ الحوادث الجامعة و التجارب النافعة في المائة السابعة (المنسوب لابن الفوطي)، تصحيحه و التعليق عليه: مصطفى جواد، المكتبة العربية، (بغداد: ١٣٥١هـ).
ب_ مجمع الاداب في مجمع الالقاب، تحقيق: محمد الكاظم، (طهران ١٤١٦هـ).
القرماني: ابو العباس احمد بن يوسف بن احمد الدمشقي (ت- ١٠١٩ هـ/١٦١٠م): اخبار الدول واثار الاول في التاريخ، عالم الكتب، (بيروت: د.ت).
- القزويني، أبو زكريا محمد بن محمود (ت٦٨٢هـ/١٢٨٣م): اثار البلاد واخبار العباد، دار صادر (بيروت ١٩٦٠م).
- القلقشندي، احمد بن علي (ت ٨٢١هـ/١٤١٨م): صبح الاعشى في صناعة الانشا، شرح وتعليق: محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٨٧م) .
- كاشاني، ابو القاسم عبدالله بن محمد: تاريخ اولجايتو، بكوشش: اهتمام: مهين همبلى، انتشارات علمى و فرهنگى، (تهران: ١٣٨٤هـ ش). چاپ دوم.
- کلاویخو: ( نوێنەری دەوڵەتی ئیسپانی بۆ دەرباری تەیمورلەنگ ساڵی ٨٠٥ ک/١٤٠٣ز): سفرنامه کلاویخو، ترجمه: مسعود رجب نیا، بنگاه ترجمه و نشرکتاب، (تهران: ١٣٣٧هـ ش).
- محمد مفيد ال ياسين: دراسات في تاريخ العراق في العهد الايلخاني (عهد السيطرة المغولية ٦٥٦-٧٣٧هـ) دار غيداء للنشر والتوزيع، (عمان: ٢٠١٠م).
- ماركو بولو (ت: ١٣٢٤): رحلات ماركو بولو، ترجمة: عبدالعزيز توفيق جاويد، الهيئة المصرية العامة للكتاب، (القاهرة: ١٩٧٧م).
- مصطفى احمد النجار: شرفخان البدليسي ومنهجه التاريخي من خلال كتابه شرفنامه، دار سبيريز، مطبعة حاجى هاشم، (اربيل، ٢٠٠٧م).
- المقريزي: تقى الدين احمد بن علي (ت ٨٤٥هـ/١٤٤١م): السلوك لمعرفة دول الملوك، الجزء الثاني، نشر وتحقيق محمد مصطفى زيادة، مطبعة لجنة التاليف والترجمة والنشر، (القاهرة ١٩٤١، ١٩٤٢م)، ١٩٥٨م. الجزء الثالث والرابع، تحقيق سعيد عبدالفتاح عاشور، مطبعة دار الكتب، (١٩٧٠-١٩٧٢م).

- أبن النجار، محب الدين محمد بن محمود بن هبة الله البغدادي (ت٦٤٣هـ/١٢٤٥م): ذيل تاريخ بغداد، ج١٨، دار الكتب العلمية، (بيروت ١٩٩٧م).
- هايدو، ق: تاريخ التجارة في الشرق الأدنى في العصور الوسطى، ترجمة: احمد رضا محمد رضا، راجعه: عزالدين فودة، الهيئة المصرية العامة للكتاب، (القاهرة: ١٩٩٤م).
- هدار سليم صالح الاتروشي: الكرد، الكرد في كتاب الأعلاق الخطيرة لابن شداد، (٦١٣_ ٦٨٤هـ/ ١٢١٥_ ١٢٨٦م)، الاكاديمية الكوردية، (اربيل: ٢٠١٣م).
- ياقوت الحموي، شهاب الدين ابو علي عبدالله ياقوت بن عبدالله (ت ٦٢٦ هـ /١٢٢٨م) : معجم البلدان، دار صادر ودار بيروت للطباعة والنشر، (بيروت: ١٩٥٧م).
- اليونيني: قطب الدين ابوالفتح موسى: (ت: ٧٢٦هـ/ ١٣٢٥م): ذيل مرآة الزمان، المجلد الرابع، مطبعة مجلس دايرة المعارف العثمانية، حيدر اباد، (الهند: ١٩٦١م).



**ملخص البحث**

شهد عصر الدولة الايلخانية المغولية تطورا ملموسا على صعيد الحياة الاقتصادية عموما وكوردستان خصوصا، باعتبار ان حدودها كانت واسعة بما فيه كوردستان التي كانت ايضا تتمتع بحدود ومساحة واسعة، لهذا تطور الجانب الاقتصادي وتم تدعيم ركائزها وتقويتها، لأنه كان لكل مدينة نتاجها ومحاصيلها الخاصة بها، بل استطاعوا تغطية احتياجات باقي المدن، لهذا ليس غريبا ان تشهد عملية التبادل الاقتصادي على صعيد جميع مجالات الانتاج الزراعي بالذات تطورا كبيرا.

ظهر اهتمام الايلخانيين بالجانب الاقتصادي والتجارة، من خلال اصدار اوامر خاصة وفعالة، غازان وهو حفيد هولاكو الذي قام بالكثير من الخطوات من اجل اصلاح وتنظيم الشؤون الاقتصادية وحماية الطرق، لهذا شهدت التجارة الداخلية والخارجية تطورا واضحا، بالاخص في الفتره التي شهدت هذه الدولة فترة السلام والاستقرار وتحسن العلاقات مع البلدان المجاورة، وجدير بالذكر هنا، ان المدن ( تبريز وبغداد والموصل) كان لها تأثير كبير على التجارة والجانب الاقتصادي في كوردستان، خصوصا وان القبائل الكورديه كانت قريبة من مواقع هذه الطرق الاستراتيجية، حيث شهدت مرور الكثير من القوافل التجارية الكبيرة داخل مدن كوردستان.

# Abstract

## The Commerce in Kurdistan in the Ilkhanan Mongol state period (656_736 H/1258-1335 A.D)



**P. Qadir Muhammad Hasan** **Rabeah Fattah Shikh Muhammad**

College of Art, Sallahadin Eebil Universtiy



In the Ilkhanan Mongol state period the commerce generally was an important economic life and also in Kurdistan privately. due to the large border it had and also Kurdistan had in large border too, so that commerce activity was in good situation and developed, because of every city had its own product which it filled the necessity of other cities. So the exchanging of the good and products were developed.

The Ilkhanan Mongol paid much attention on the businessmen and established special orders about it. Holaco's grandson Gazan took some steps to fix and rearrangement of the commerce affairs and protect the ways, which it had seemed local and out commerce had been matured especially at those times that Ilkhanan Mongol had been in peace with neighbor states.

The cities of Tawrez, Baghdad and Mousel had main effect on the situation of commerce in Kurdistan, because they were closed to the center of the city and Kurdish tribes and also it was an importance commerce way which it passed through Kurdistan.

# مەمدوح سەلیم بەگی وانلی

## (١٨٩٣-١٩٧٦)

## ژیانی و چالاکییە سیاسیی و رۆشنبیرییەکانی

**د. کامەران محەمەد حاجی**
بەشی مێژوو- کۆلیژی ئەدەبیات
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

### پێشەکی

لەگەڵ دامەزرانی رێکخراو و کۆمەڵە کوردییەکان لە سەرەتاکانی سەدەی بیستدا، کە دواتر بزاڤی رۆژنامەگەریش هاوتەریب لەگەڵیدا پەرەسەندنی بەخۆوە بینی، ناوی ژمارەیەک لەو گەنجە کوردانەی لە ئەستانبۆڵ دەیانخوێند، درەوشایەوە. ئەوانەی بە پێشەنگانی بزاڤی سیاسی و رۆشنبیری لە مێژووی هاوچەرخی کورد دادەنرێن. مەمدوح سەلیم بەگی وانلی یەکێک بوو لەو کەسانەی کە توانیبووی بە تایبەتمەندی و رێچکەی تایبەتیی خۆیەوە رۆڵێکی بەرچاو لە کاروانی خەباتی سیاسی و بزاڤی رۆشنبیریی کوردیدا، بۆ ماوەی چەند دەیەیەک، بگێڕێت.

هەڵبژاردنی ئەم بابەتە هەر لە سۆنگەی گەورەیی رۆڵی ئەم کەسایەتییەوە دێت کە سالانێک بە پشکداریکردنی و رۆڵی سەرکردایەتییانەی خۆیەوە لە رێکخراو و کۆمەڵە و ئۆرگانە تایبەتییەکانیان، توانیبووی تەکانێک بە بزاڤی سیاسی و رۆشنبیریی کوردی بدات.

لە کاتی ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا رووبەڕووی چەند گرفتێک بووینەوە، گرنگترینیان بریتی بوو لە کەمی زانیاریی بەردەست لەبارەی ئەم کەسایەتییە. بەتایبەتی کە مەمدوح سەلیم خۆی چ یاداشتێکی تایبەت بە ژیانی خۆی لەپاش بەجێ نەماوە. هەروەها تەنانەت لە یاداشتی ژمارەیەک لەو

کەسانەی کە لەوانەیە سالآنێک پێکڕا لەگەڵ ئەم کەسایەتییەدا لەناو ڕێکخراو و کۆمەڵە کوردییەکان و لە ئۆرگانە ڕۆژنامەوانییەکانی زمانحاڵی ئەم ڕێکخراو و کۆمەڵانە کاریان کردبێت، زانیاریی کەم یان هەر دەگمەن بەرچاوان دەکەوێت، هەندێکیشیان لە خستنەڕووی زانیارییەکاندا هێندە ورد نین و پێویستییان بە ساغکردنەوە هەیە. ئەمە جگە لەوەی کە ئەو بێدەنگییەی سالآنێک لەلایەن ئەم کەسایەتییە درێژەی کێشا، وایکردووە زانیاریی دەگمەن و پچڕ پچڕ لەبارەیەوە بەرجەستە بێت.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە پێشەکی و سێ تەوەر و ئەنجام پێکهاتووە. لە تەوەری یەکەمدا تیشک خراوەتە سەر چەند لایەنێکی ژیانی مەمدوح سەلیم بەگ، تاکو پێگەیشتنی و تەواوکردنی خوێندن و هەندێ لایەنی تایبەتیی ژیانی ئەم کەسایەتییە. لە تەوەری دووەمدا، بە ناونیشانی (چالاکییە سیاسییەکانی مەمدوح سەلیم بەگ)، لێرەدا هەوڵماندا‌وە سەرنج بخەینە سەر سەرەتاکانی پەیوەندیی ئەم کەسایەتییە بە کۆمەڵ و ڕێکخراوە کوردییەکان و ڕۆڵی سەرکردایەتییانەی ئەو لە بزاڤی سیاسی و ڕۆشنبیریی کوردیدا. لە تەوەری سێیەمدا، کە ناونیشانی (چالاکییە ڕۆشنبیرییەکانی مەمدوح سەلیم بەگ)ی هەڵگرتووە، لێرەدا باسی جێ پەنجەی ئەم کەسایەتییە و ڕۆڵی لە بزاڤی ڕۆشنبیریی کوردیدا کراوە. لە کۆتاییشدا بە چەند خاڵێک گرنگترین ئەو ئەنجامانە دەخەینە ڕوو کە لەمیانەی ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەکەدا پێی گەیشتووین.

بۆ ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە پشتمان بەچەند سەرچاوەیەک بەستووە، لەم ڕووەوە ئەو گۆڤارانەی کە مەمدوح سەلیم بابەت یان وتاری خۆی تیایاندا بڵاو کردبۆوە گرنگیی خۆیان هەبوو. بەتایبەت چەند ژمارەیەکی گۆڤاری (ژین)ی ئەستانبۆڵ (١٩١٨-١٩١٩)، گۆڤاری (کوردستان)ی ئەستانبۆڵ (١٩١٩-١٩٢٠)، گۆڤاری (دیاری کوردستان)ی بەغدا (١٩٢٥-١٩٢٦) و گۆڤاری (هاوار)ی شام (١٩٣٢-١٩٤٣). هەروەها گۆڤاری (ڕۆژنامەڤانی)یش وەکو سەرچاوەیەکی پڕ بایەخ و گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد)یش لە چەند شوێنێکدا پشتیان پێ بەستراوە. ئەمانە یادداشتەکانیش وەکو کتێبی (في سبیل کردستان) قەدری

جەمیل پاشا (زنار سلۆپی) و کتێبی (حیاتي ککوردي)ی نورەدین زازا و...هتد، گرنگیی خۆیان هەبوو. هەروەها ئەو ساغکردنەوە و توێژینەوانەی لەبارەی کۆمەڵە و رێکخراو و ئۆرگانە رۆژنامەوانییەکاندا ئەنجامدراون کە سەردەمانێک مەمدوح سەلیم کاری تێدا کردوون گرنگیی خۆیان هەبوو، لە نێویاندا (جەمعییەتی تەعالی کوردستان)ی ئیسماعیل گوێڵداش، (جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان ١٩١٢-١٩٢٢)ی مالمیسانژ، (رۆژی کورد)ی عەبدوڵڵا زەنگەنە، (کۆمەڵە و رێکخراوە کوردییەکان ١٩١٨-١٩٣٣)ی نەجاتی عەبدوڵڵا، (خویبون و ثورة آگری)ی رۆهات الاکوم و (جمعیة خویبون و وقائع ثورة ارارات ١٩٣٠)ی کۆنێ رەش و...هتد.

لە کۆتاییدا، پێمان وایە کە ئەم لێکۆڵینەوەیەمان بێ کەم و کوڕی نییە، بەڵام هیوادارین لە رێگەیەوە تیشکێکمان خستبێتە سەر هەندێ لایەنی شاراوەی ژیانی ئەم کەسایەتییە و هاندەرێکیش بێت بۆ لێکۆڵینەوە لە ژیانی چەندین کەسانی تری ئەو سەردەمە، ئەوانەی تاکو ئێستا وەکو پێویست ئاوڕیان لێ نەدراوەتەوە.

## ١. ژیان و پێگەیشتنی مەمدوح سەلیم بەگ:

ناوی تەواوی مەمدوح کوڕی جەمیل بەگ کوڕی تۆفیق بەگە، بە (مەمدوح سەلیم بەگ) ناسراوە و ناوی نهێنیشی (ئەسکەندەر بەگ) بوو. لەساڵی (١٨٩٣)[1] لە شاری وان لە دایک بووە (Konê Reş, 2014, R 261)، دایکی ناوی هاجەرە بوو[2]. وا پێدەچێت هەر لە شاری وان دەستی بە خوێندن کردبێ و دواتریش وەکو زۆرینەی منداڵانی بنەماڵە ناسراوەکانی کوردی ئەو سەردەمە چووبێتە ئەستانە و لەوێ خوێندنی تەواو کردبێت. هەندێک سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە مەمدوح سەلیم (فەلسەفە) و (سیاسەت)ی خوێندووە (رۆهات الاکوم، ٢٠٠٠، ٢٧× ؛ الصویرکي، ٢٠٠٥، ص٧٢٤ ؛ گوێڵداش، ٢٠١١، ل٩١؛ Konê Reş, 2014, R261). ناوبراو بەر لە بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهان تێکەڵ بە سیاسەت و کاروانی رۆشنبیری بووە. لە ساڵی ١٩١٣دا وەکو ئەفسەر لە "**هەیئەتی ئەرکانی سوپای عوسمانی**" خزمەتی سەربازی ئەنجامداوە (الصویرکي، ٢٠٠٥، ص٧٢٤). بەم هۆیەوە لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهاندا، رۆژانێک

لەگەڵ قەدری جەمیل پاشا[٣] لە بەرەی ئەرزەڕۆمدا بەیەکەوە بوون (زنار سلوپی، ١٩٩٧، ص٥٣ ؛ Uzun, 1989, R111 ).

مەمدوح سەلیم وەکو زۆربەی سەرکردە دیارەکانی تری کورد، بەهۆی جەنگەوە ماوەیەک لە خەباتی سیاسی و رۆشنبیری دابڕاوە. لە سەروبەندی بەکۆتاهاتنی جەنگدا جارێکی تر خزاوەتە ناو کار و چالاکیی سیاسی و رۆشنبیری. بەم هۆیەوە دوای گەیشتنی تورکە کەمالییەکان بە دەسەڵات و دامەزراندنی کۆماری تورکیا لە ساڵی (١٩٢٣)دا، ناوبراو ئەستانەی بەرەو پەناهەندەیی بەجێهێشتووە. سەرەتا بەرەو میسر، پاشان رووی کردۆتە وڵاتی شام و لە چەند شارێکی وەکو ئەنتاکیێ، بەیروت، حەسەکە و دەرعا و...هتد ژیانی بەسەر بردووە. دوا وێستگەی ژیانیشی شاری دیمەشق (شام) بوو (کۆنێ رەش، ٢٠٠٥، ص٦١).

مەمدوح سەلیم لەماوەی ژیانیدا دووچاری نەهامەتیی زۆر بۆتەوە. وەکو پەناهەندەیی و دوورکەوتنەوە لە کەس و کار و خۆشەویستانی، هەروەها تەنانەت لەرووی سۆزداریشەوە بەئامانجی خۆی نەگەیشتووە، لەم رووەوە سەرچاوەیەک ئاماژە بەوە دەکات کە مەمدوح سەلیم لە سەرەتاکانی ساڵی (١٩٢٧)دا، ئەوکاتەی لەشاری ئەنتاکیێ بووە، کچێکی بە رەگەز چەرکەسی بەناوی (فەریحە) خواستووە، بەڵام بەهۆی پابەندبوونی بە ئەرکی سیاسی و بەرپرسیارێتی نەتەوەیی، دوای دوورکەوتنەوەی و پەیوەندیکردنی بەهەڤاڵانی تری لە سەروبەندی دامەزراندنی کۆمەڵەی (خۆیبوون) و بەرپابوونی شۆڕشی (ئاگری)[٤]دا، لە دەستگیرانەکەی دابڕاوە. بەم هۆیەوە، هەروەها بەبیانووی گەیشتنی هەواڵی کوژرانی مەمدوح سەلیم لە (ئاگری)، دەستگیرانەکەی شوو بە پیاوێکی بەڕەگەز چەرکەسی بەناوی (ئەدیب ئەسوار) دەکات و دەچنە ئوردن. هەرچەندە مەمدوح سەلیم چ لە رێگای دایک و باوکی (فەریحە)ی دەسگیرانی، یا بەهاوکاریی (رەوشەن خانم)[٥]ی خێزانی جەلادەت بەدرخان[٦]، پەیوەندی بە دەسگیرانەکەیەوە دەکات، تاکو لە مێردەکەی جیابێتەوە و شوو بەو بکاتەوە، بەڵام لەمەشدا بێ ئومێد دەبێت. تەنانەت بە هۆی چالاکییە سیاسییەکانییەوە، لەلایەن دەسەڵاتدارە

فەرەنسییەکانەوە لە ئەنتاکێ، لە کارەکەیدا، کە بریتی بووە لە گوتنەوەی زمانی فەرەنسی، لایدەدەن و دوور دەخرێتەوە (زنكى، ٢٠٠١، ص١٩ ؛ Uzun, 1989 R184) . ئینجا وەکو (پشکنەری پەروەردەیی) لە حەسەکە دەست بەکار دەبێت، بەڵام بەهۆی بەردەوامییەکەی لە جموجۆڵ و کاری سیاسیدا بۆ شاری دەرعای دەگوازنەوە (الصويركي، ٢٠٠٥، ص٧٢٥)و لەوێ وەکو بەڕێوەبەر لە قوتابخانەی (ئەکادیمیای ئەیوب شێخانی) کاری خۆی ئەنجام دەدات (زەنگی، "رۆژنامەڤانی"گۆڤار، هەولێر، ژمارە (٥)، ئابی ٢٠٠١، ل٣٣٤). وا پێدەچێت مەمدوح سەلیم جارێکی تر بۆ ئەنتاکێ گەڕابێتەوە، هەر وەکو یەکێک لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکات کە لەم شارەدا بۆ یەکەم جار لەگەڵ (قەدری جان[٧]) ئاشنایەتی پەیدا دەکەن، بەڵام دوای یەکلاییکردنەوەی کێشەی سنوور لەنێوان تورکیا و دەسەڵاتدارانی فەرەنسا لە سوریا، لە ساڵی ١٩٣٩، ئەم شارە خرایە سەر وڵاتی تورکیا، دیسان مەمدوح سەلیم شارەکەی بەجێهێشتبوو (Uzun, 1989, R186_187). دوا جار لە دیمەشق (شام) نیشتەجێ دەبێت و وەکو بەڕێوەبەری پەروەردە (مدير المعارف) لە هەردوو پارێزگای حەسەکە و دەرعا کاری کردووە (كۆنێ رەش، ٢٠٠٥، ص٦١).

ئەوانەی لە نزیکەوە مەمدوح سەلیمیان بینیبوو، وەکو مرۆڤێکی سادە و بێ فیز و پیاوێکی نەتەوە پەروەر و "**مرۆڤێکی رەسەن**" وەسفی دەکەن. لەم بارەیەوە سینەم خانمی[٨] کچی جەلادەت بەدرخان لە وەسفی ناوبراودا دەڵێ:"...**ئەو پیاوەم وەکو شەخسیەتێکی رێک و پێک و زۆر بەڕێز دەبینی، شەخسییەتێک (جەنتلمان)، زۆر دەهاتە ماڵی ئێمە...ئەوان لەناو خانوویەکی زۆر بچووک دادەنیشتن کە لایقی ئەو نەبوو. بەڵام مەمدوح سەلیم گوێی لەم شتانە نەبوو، تا بڵێ من لەناو حەپسێک دانیشتووم. تەکەبور و ئەو شتانەی نەبوو. ئەوە نیشانەی مرۆڤی ئەسیڵ بوو**" (سینەم خانم، چاو پێکەوتن، ٢٠١٧). مەسعود محەمەد کە لە ساڵی (١٩٧١)دا بە ئەرکی کۆڕی زانیاری کورد لە عێراق سەردانی شامی کردبوو، مەمدوح سەلیمی بینیبوو. لەبارەیەوە دەڵێ:"... **مەمدوح سەلیم کە پیرێکی پێست تەڕ، چاوگەشی هەشتا ساڵی بوو (رەنگە نەختێک کەمتر) بەگوتەی خۆیەوە لە دەمێکی دوورەوە هەستی بەو جۆرە**

**بووژانەوەیە نەکردبوو لـە دڵ و نەفـەس و مجێـزی خـواردن و خواردنەوەشـدا. مەمدوح سەلیم لە تێکۆشەرانی کوردی تورکیا بوو، لەترسی مەرگ رای کردبوو بۆ سوریە و ژیانێکی قەلەندەرانەی رادەبوارد...من ویستم کۆڕ کتێبخانەکەی لێ بکرێـت هـەم بـۆ پاراسـتنی کتێـب و نووسـراوی کـە تێیـدا هـەبوو هـەم بـۆ حەسانەوەی ئەویش تا لە کۆتایی ژیانیدا بەنرخی کتێبخانەکەی گوزەران بکات. بەڵام هەوڵەکەم بێسـوود بـوو**" ( محەمـەد، ٢٠٠٩، ل٤٥٧-٤٥٨). ئـەم وشـانەی دوایـی سەبارەت بە مەمدوح سەلیم ئەوە دەگەیەنن کە ناوبراو لەگەڵ ئـەوەی کەسـێکی نـەدار و بەتەمـەن بـووە، کـەچی لەگـەڵ ئەوەشـدا کەسـێکی چـالاک بـووە و ئامادەباشیی زۆری بۆ هاوکاریکردنی ئەدیب دۆستانی نەتەوەکەی هەبووە و لـەم رووەوە درێخی نەکردووە.

مەمدوح سەلیم پیاوێک بـوو جێـی متمانـە و بـاوەڕی سـەرکردەکانی تـری بزاڤی کوردی بووە. بەتایبەت بۆ ئەوانەی رۆژانێک لەترسـی سـیخوڕ و پیـاوانی سەر بە رژێمی ئەو کاتەی سوریا پـەنایان بـۆ بردبـوو. نـوورەدین زازا[٩] وەکـو سەرکردەیەکی کوردی دیاری ئەو سەردەمە، کاتێک لە سـاڵی (١٩٦٣) گـەڕابۆوە شام، رووی لە ماڵی ئەو کردبوو و (١٠) رۆژان لە ماڵیان مابۆوە. هـەروەک لـە یاداشتتەکانیدا نووسیویەتی:"**...لە گەڕان بە دوای پەناگەیەک لەلای کەسێک کە متمانەی پێ بکەم، دوای بیرکردنەوەیەکی قووڵ هاتە خەیاڵم بـۆ چوونـە ئـەو ماڵەی کە زۆرترین (ئەمان)ی تێدایە، ئەوە ماڵی ئوستادی خانەنشین مەمدوح سەلیمە، یەکێک لە تێکۆشەرە دێرینەکانی بزاڤی نەتەوەیی کورد...**" ( زازا، ٢٠٠٨، ص٢٣٢). بـەم جـۆرە کەسـایەتی مەمـدوح سـەلیم ببـووە جێگـای سـەرنجی سیاسەتمەداران و سەرکردە کوردەکانی ئەو سەردەمە. ئەدیبێکی تری کورد لـە بارەی مەمدوح سەلیمەوە نووسیویەتی:"**... سەرۆکە تازەکانی تەڤگەری کوردی دێن و سەردانی دەکەن. گەلێک رێکخستنی جڤاکی و سیاسی ئەو بۆ کۆبوونەوە و کۆنفرانسان دەبەن. ئەمە بـۆ ئـەو کـەیف خۆشـی و سـەرفرازی بـوو، ئەمـە قەدرگرتن بوو، بەڵام درەنگ بوو**" (Uzun , 1989 , R209 ).

مەمدوح سەلیم لە سەرووی تەمەنی حەفتا ساڵییەوە هاوسـەرگیری لەگـەڵ ئافرەتێکی بێوەژندا بەناوی (ویلدان خانم) ئەنجامدا، کـە بـە رەگـەز چەرکەسـی

بوو. وەکو گوتراوە ئەم هاوسەرگیرییەی لەسەر داوا و زۆرلێکردنی دۆست و برادەرەکانی وەکو قەدری جەمیل پاشا و خوشکەکەی بووە کە ئەو کاتە لە ئەستانە دادەنیشت (Uzun, 1989, R199-203). بەپێی یادداشتەکانی نوورەدین زازا بێت، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە مەمدوح سەلیم لە ساڵی (١٩٦٣) ژنی هێناوە، چونکە وەکو ناوبراو لە یادداشتەکانیدا نووسیویەتی بەم زووانە ژنی هێناوە و بەخۆی و خێزانەکەی و خەسووی بەیەکەوە لە خانوویەکدا دەژیان کە دەکەوتە خوار گەڕەکی موهاجرین. هەروەها وا پێدەچێت کتێبخانەکەی لە خانوویەکی تری بچووکدا بووبێت لە ناوچەیەکی بەرزایی هەمان گەڕەکدا (نورالدین زازا، ٢٠٠٨، ص٢٣٢). منداڵیشیان نەبووە (Uzun , 1989 , R197 ؛ Konê ReŞ , 2014 , R265).

سەبارەت بە هەندێ لایەنی ژیانی تایبەتیی مەمدوح سەلیم، وەکو یەکێک لە سەرچاوەکان لەسەرزاری یەکێک لەوانەی مەمدوح سەلیمیان بینیبوو، ئاماژەی بۆ دەکات ئەوەیە کە داخی لە چەند شتێک خواردووە و وەکو خەمێکی گەورە لە دڵیدا ماوەتەوە. یەکێکیان ئەوە بووە کە بەگوێی باوکی نەکردبوو کاتێک داوای ئەوەی لێ کردبوو (پزیشکی) بخوێنێ. دووەمیشیان بریتی بووە لەوەی بەهۆی بارودۆخی تایبەتەوە، وەکو باسمان کرد، نەیتوانی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کچە چەرکەسییەدا ئەنجام بدات کە خۆشی ویستبوو. سێیەمیشیان ئەوە بوو کە چووبووە ناو سیاسەتەوە (Konê Reş , 2014 , R266).

شایانی باسە لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا، مەمدوح سەلیم رووبەڕووی بارودۆخێکی ئابووری خراپ ببۆوە و تەندروستیشی بەرەو خراپی چووبوو (ReŞan , 2008, R98) و لە گەڕەکی (المهاجرین)ی دیمەشق (شام)دا و لەگەڵ هاوسەرەکەی، لە خانووی ماڵە مامێکی بەناوی (نیزامەددین کبار) ژیانی بەسەر بردبوو، تاکو لەساڵی (١٩٧٦)دا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی شێخ خالیدی نەقشبەندی لە گەڕەکی تاخا کوردان (حي الاکراد)، لە نزیک گۆڕی دۆستە دێرینەکانی، قەدری و ئەکرەم جەمیل پاشا[١٠] و قەدری جان و لە رۆخ گۆڕی جەلادەت بەدرخان بە خاک سپێردرا (کۆنێ رەش، ٢٠٠٥، ص٦١ ؛ Konê ReŞ , 2014 , R266). لەرۆژی ناشتنی تەرمەکەیدا بە مەبەستی دابینکردنی خەرجیی گۆڕ و

گواستنەوەی تەرمەکەی کوردەکانی گەڕەک و دۆستانی پارەیان کۆکردبۆوە. لەکاتی ناشتنیشیدا ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی ئامادە ببوون، وەکو گوتراوە کە سەد کەسێک دەبوون ( Konê ReŞ , 2014 , R266 ).

سەبارەت بە ڕۆژ و مانگی کۆچی دواییکردنی مەمدوح سەلیم زانیارییەکی تەواو ورد و چەسپاو نییە، تەنانەت یەکێک لەو کەسانەی کە لە ڕێوڕەسمی ناشتنیدا لەوێ ئامادە ببوو تەنها باسی ساڵەکە دەکات و گوتوویەتی ڕۆژ و مانگەکەم بە بیر نایەتەوە (Konê ReŞ , 2014 , R266). سەرچاوەیەکی تر ئاماژە بە پایزی ساڵی (١٩٧٦) دەکات، بێ ئەوەی هیچ زانیاریمان لەسەر ڕۆژ و مانگەکە بداتە دەست (Uzun , 1989 , R213). بەڵام بەپێی بەڵگەیەک کە بریتییە لە نامەیەکی نووسراو و ڕۆژی (١٩٧٦/٨/٢٢)ی لەسەر تۆمارکراوە، لەلایەن ڕەوشەن خانمی خێزانی جەلادەت بەدرخانەوە بۆ مەسعود محەمەدی جێگری سەرۆکی ئەوکاتەی (کۆڕی زانیاری کورد) ڕەوانەکراوە، دواتر لە یەکێک لە ژمارەکانی گۆڤاری کۆڕی زانیارییەوە بڵاوکراوەتەوە، باسی ڕاگەیاندنی کۆچی دوایی مەمدوح سەلیم دەکات تا ئەوانیش بڵاوی بکەنەوە. لە بەشێکی ڕاگەیاندنی پرسەنامەکەدا هاتووە"... **وەفا و یادپارێزی پێویستی دەکرد دەست و پێوەندی کۆڕ لەم ژمارەیەدا زامی پەترۆبەستەیان هەڵبدەنەوە و ئەمجارە ئەو هەواڵە جەرگ بڕە بە هەموو گەلی کورد ڕابگەیەنن و پرسە و سەرەخۆشی لە هەموویان بکەن**" (کۆڕی زانیاری کورد "گۆڤار"، بەغدا، بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧، ل٤٣٥). کەواتە بەپێی ئەم زانیارییانەی سەرەوە بێت وا پێدەچێت مەمدوح سەلیم لەمانگی ئابی ساڵی (١٩٧٦) کۆچی دوایی کردبێت، بەڵام ڕوون نییە بە دیاریکراوی لە چ ڕۆژێکدا بووە، ئایا نامەکە لەهەمان ئەو ڕۆژەدا نووسراوە کە مەمدوح سەلیم تیایدا کۆچی دوایی کرد، کە (٢٢)ی ئابە، یاخود دواتر نووسراوە.

شایانی باسە بەپێی ئەو زانیارییانەی لە یادداشتێکدا بەردەست کەوتوون بە دیاردەکەوێت کە خێزانەکەی مەمدوح سەلیم لە ساڵی ١٩٨٠دا لە ژیان مابووە، چونکە خاوەنی یادداشتەکە ئاماژە بەوە دەکات لە پایزی ساڵی (١٩٨٠)دا لەگەڵ کچێکی قەدری جانی شاعیردا سەردانی ماڵەکەیانی کردبوو و چاویان پێی کەوتبوو (حەیدەری، ٢٠١٣، ل٢١٤).

## ٢. چالاکییە سیاسییەکانی مەمدوح سەلیم بەگ:

مەمدوح سەلیم لە بواری سیاسەت و چالاکیی ڕێکخراوەییدا ڕۆڵێکی دیار و سەرکردایەتیی بینیبوو. یەکەم ئاماژەیەک بۆ ڕۆڵی ئەم کەسایەتییە و کارکردنی لە چوارچێوەی کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردییەکاندا بۆ ساڵی (١٩١٢) دەگەڕێتەوە. ئەوەبوو لەم ساڵەدا کۆمەڵەیەک بەناوی (هێڤی)[11] لەلایەن ژمارەیەک لە قوتابیانی پەیمانگای کشتوکاڵی (خلق آلي) لە ئەستانە دامەزرا. سەرچاوەکان زانیاری و بۆچوونی جیاواز لەبارەی ڕۆڵی مەمدوح سەلیم لە سەرەتاکانی دامەزراندنی کۆمەڵەکە دەخەنە ڕوو. قەدری جەمیل پاشا کە یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی (هێڤی)، لە یادداشتەکانی خۆیدا ئاماژە بە خۆی و ناوی چەند کەسایەتییەکی تر دەکات کە هەستاون بە نووسینەوەی پێڕەوی ناوخۆیی کۆمەڵەکە و ڕاگەیاندنی لەساڵی (١٩١٢)دا. لێرەشدا هیچ ئاماژەیەک بەناوی مەمدوح سەلیم، وەکو دامەزرێنەر، ناکات، بەڵام دواتر ئاماژە بەوە دەکات کە **"لە ڕۆژگارە یەکەمینەکاندا هەریەک لە ئەکرەم جەمیل پاشا و مەمدوح سەلیم بوونە ئەندامی (هێڤی) و بەردەوام لەگەڵ ئێمەدا گفتوگۆیان دەکرد و ئەوان لە پشکدارە پێشەنگەکان بوون لە چالاکییەکانی کۆمەڵەکەدا"** (سلوپی، ١٩٩٧، ص٣٨-٣٩). کەواتە، بەپێی زانیارییەکانی قەدری جەمیل پاشا بێت مەمدوح سەلیم یەکێک نەبووە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی (هێڤی)، بەڵکو دواتر، کە ماوەکەی دیاری نەکراوە، ناوبراو پەیوەندی پێیانەوە کردبێت و وەکو ئەندام لە چالاکییەکانی کۆمەڵەکەدا بەشداری کردبێت.

شایانی باسە، هەر لەسەر بنەمای زانیارییەکانی سەرەوە، ژمارەیەک لە مێژوونووس و توێژەران لەباسی دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی (هێڤی)دا، تەنها وەکو ئەندامێک یان ئەندامێکی دیار و چالاک ئاماژە بە ناوی مەمدوح سەلیم دەکەن، واتا وەکو دامەزرێنەری کۆمەڵەکە ناوی ناهێنن (شریف، ١٩٨٩، ص١٨٩ ؛ جەلیلی جەلیل، ٢٠٠٠، ل٧٤؛ Bozarslan 2001, R27 ؛ توفیق، ٢٠٠٤، ص ١٨٨ ؛ مالمیسانژ، ٢٠٠٨، ل١٠١). تەنانەت هەیانە ئەو بۆچوون و زانیارییانەش ڕەتدەکاتەوە کە باسی ڕۆڵی مەمدوح سەلیم وەکو یەکێک لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەکە دەکەن (مالمیسانژ، ٢٠٠٨، ل١٠١). ئەمە لە کاتێکدا مەمدوح سەلیم خۆی لە ژمارە (٧)ی گۆڤاری (دیاری

کوردستان)[١٢] دا و لە بابەتێکیدا کە بە زمانی تورکی و بەناوونیشانی: راستکردنەوەیەک بە ئامادەبوونی مێژوو ((تاريخ حضورنده بر تصحيح)) بڵاوی کردبۆوە، ناوبراو خۆی وەکو یەکێک لە **"دامەزرێنەرانی"** کۆمەڵەی (هێڤی) وەسف کردبوو (کورد وانی، دیاری کوردستان"گۆڤار"، بەغدا، ژمارە (٧)، ١٩٢٥، ل٤٠). چەند نووسەرێکی تریش مەمدوح سەلیم بە دامەزرێنەری کۆمەڵەکە هەژمار دەکەن ( Uzun , 1989 , R213 ؛ زەنگەنە، ڕۆژنامەڤانی"گۆڤار"، ژمارە (٦-٧)، پایز –زستانی ٢٠٠١-٢٠٠٢، ل١٨٤). لەسەر ئەو بنەمایانە پێمان وایە دەبێ مەمدوح سەلیم یەکێک بووبێت لە ئەندامانی دامەزرێنەری کۆمەڵەی (هێڤی)، نەوەک دواتر بووبێتە ئەندام، وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا. ڕێشی تێناچێ ئەم کەسایەتییە بە بێ بنەما و لەخۆڕا قسەیەکی وا بکات، ئەمە جگە لەوەی کە هیچ کامێک لە کەسانی دامەزرێنەری (هێڤی) یان ئەوانەی دواتر بوونەتە ئەندام لە کۆمەڵەکە، ئەم قسەیەی مەمدوح سەلیمیان کە لە ساڵی (١٩٢٥) بڵاوی کردبۆوە، ڕەت نەکردۆتەوە، تاکو ببێتە بەڵگەیەک لەم بارەوە.

سەبارەت بە پلە و پۆستی مەمدوح سەلیم لەناو کۆمەڵەی (هێڤی)دا، یەکێک لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکات کە لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەکەوە ناوبراو سکرتێری کۆمەڵەکە بووبێت (خەزنەدار، ٢٠١٦، ل٧١)، بەڵام بەپێی ئەو زانیارییانەی لەبەر دەستدان، ئەوە روون بۆتەوە کە یەکەم سکرتێری (هێڤی) تاکو بەستنی یەکەمین کۆنگرەی کۆمەڵەکە لە (١٩١٣/٧/٢٧) کە ساڵڕۆژی دامەزراندنی (هێڤی)یە، عومەر جەمیل پاشا بووە، لەو کاتە بەدواوە مەمدوح سەلیم وەکو دووەم سکرتێری گشتی کۆمەڵەکە کارەکانی خۆی بەڕێوە بردووە (Bozarslan, 2001 , R27 ؛ زەنگەنە، ٢٠٠٥، ل٣٥؛ مالمیسانژ، ٢٠٠٨، ل١٠١). هەر لەمیانەی کۆبوونەوەکەدا مەمدوح سەلیم وەکو**"سکرتێری گشتی کۆمەڵە"** وتارێکی پێشکەش کردووە و تیایدا رەخنەی توندی ئاڕاستەی سەرکردەکانی کورد کردبوو، لەبارەی کەمتەرخەمییان لە بەرانبەر پرسە نەتەوەییەکاندا. هەر لێرەدا ناوبراو لەدژی هەڵوێستی یەکێک لە ئەندامانی ئامادەبووی کۆنگرەکە وەستابۆوە، کاتێک ئەو ئەندامە باسی ئەوەی

کردبوو کە نابێ قوتابی تـوخنی سیاسـەت بکـەوێت. بـۆ پشـت ئەسـتوورکردنی قسەکانی خۆشـی، مەمـدوح سـەلیم داسـتانی (مەم و زین)ی کردبـووە بەڵگـە و روونیشی کردبۆوە کە ئەحمەدی خانی داوای سەربەخۆیی کوردانی کردبوو. ئـەم قسانەشی لەلایـەن ئەنـدامانی تـری کۆمەڵەکـەوە پشـتگیری لـێ کرابـوو (سلوپی، ١٩٩٧، ص٥٠ ؛ مالمیسانژ، ٢٠٠٧، ل٢٠ ). ئەم هەڵوێستەی مەمدوح سەلیم ئەوەمان بـۆ دەسـەلمێنێت کـە ئەنـدامانی کۆمەڵـەی هێڤـی، بـە سکرتێرەکەشـیانەوە، ویستبوویان کۆمەڵەکە وەکو ئامرازێک بۆ سیاسەتکردن و لە پێنـاو بەرژەوەنـدی نەتەوەیی کورد بەکاربهێنن. لەم بوارەشدا مەمدوح سـەلیم پێشـەنگ بـووە. لـەم بارەیـەوە یـەکێک لـە ئەنـدامانی (هێڤی) باسـی ئـەوە دەکـات کـە چالاکییـەکانی کۆمەڵەکە رۆڵی هەبوو لە چەکەرەکردنی بیری نەتەوایەتی لـەلای کـورد، هۆشـی نەتەوایـەتی کـوردی چەنـد هـەنگاوێک بـەرەو پێشـەوە بـرد. هـەر بۆیـە دەسـەڵاتدارانی تـورک شـێوازی کـار و چـالاکی ئەنـدامانی کۆمەڵەکـەیان بـە دەرچوون لە یاسا هەژمار کردبوو. تەنانەت داوایان لێکردبوون لە بـەردەم دادگـا ئامادەبن (سلوپی، ١٩٩٧، ص٤٧، ٥٠).

شایانی باسە، هەر لە بابەتەکەی مەمدوح سەلیمدا کە لـە گۆڤاری (دیـاری کوردسـتان)دا بـڵاوی کردبـۆوە، نـاوبراو رووی راسـتەقینەی گۆڤارەکـەمان بـۆ ئاشـکرا دەکـات. لێـرەدا مەمـدوح سـەلیم بانگەشـەی یـەکێک لـە گۆڤارەکـان بەناوی (نیر ئیست) Near East ، کە دواتر وەکو بابەتێکی وەرگێڕدراو بۆ سـەر زمـانی عـەرەبی لـە (دیاری کوردسـتان) بڵاوکرابـۆوە، رەتدەکاتـەوە. چونکـە گۆڤارەکـە (رۆژی کـورد) [١٣]ی زمانحـاڵی کۆمەڵـەی (هێڤـی) بـە"**ئاسـەوار و ئـامراز**"ێکـی دەسـت دەسـەڵاتدارانی تـورک لەقەڵەمـدابوو. لـەم بـارەوە مەمـدوح سـەلیم نووسـیویەتی:"**راسـتگۆیی پەیامبـەرانی هێڤـی بـۆ رزگـارکردنی میللـەت بەرامبەر بە چەندین هێرشی سەبرشکێنی ناوبەناو بۆ لەناوبردنیان، گەلێک جار خۆڕاگر بووە. کورەی تورکایەتی لە رێگەی جۆراوجۆر و جیاجیاوە هەوڵی داوە گەرمایی لاوانی خاوەن بیروبـاوەڕ بـەرەو خـۆی رابکێشـێ و چەنـدەها بـەڵێنی گەورەی بۆ ئەو مەبەستە راگەیاندووە و کردە و کۆششێکی زۆری بۆ شکاندنی ورەی پۆڵایینی هێڤی کردووە**" (مالمیسانژ، ٢٠٠٨، ل٤٣١-٤٣٥). لە بابەتێکی تریشـیدا

کە لە بنەڕەتدا بریتی بووە لە وتارێکی یەکێک لـە ئەنـدامانی (هێڤی) و مەمـدوح سـەلیم وەکـو خـۆی و بەناوونیشـانی (مێژوویەک، هەسـتانەوەیەک)[١٤] لـە گۆڤـاری (ژین)[١٥]دا بـڵاوی کردۆتـەوە، لەمیانەیـدا خـاوەنی وتارەکـە لـەبارەی دامەزرێنەرانی (هیڤی) نووسیویەتی:"...**ئەوان ئاگایان لە ڕووداوەکانی دەوروبـەر بـوو. تێگەیشـتبوون لـەوەی کـە نەتـەوەکانی تـر، بـە چ شـێوەیەک لـە ڕێـی شارسـتانی و گەشەسـەندندا پـێش دەکـەون. تاقـە ڕێـی ڕزگـاریی نەتـەوەی کوردیشیان لە هۆشیاری و پێشخستنی لاوەکاندا بینیبـوو. ئـەوان دەیانویست کوردەکان لە دنیای تاریکیی سەدان ساڵە دەربهێـنن و...ئاڵاهـەڵگرانی هێڤـی، بڕوایان بەوە هێنابوو کە مانەوەی ڕێکخراوەکەیان مەسەلەی شەرەف و مانەوەی نەتەوەکەیانە**" (گوێڵداش، ٢٠١١، ل٤٧٨).

سەبارەت بە ڕۆڵی مەمدوح سەلیم لەگۆڤاری (ڕۆژی کورد)ی زمانحـاڵی کۆمەڵـەی (هێڤی)، هەنـدێک سـەرچاوە باسـی ئـەوە دەکـەن کـە نـاوبراو وەکـو نووسـەری بەشـە تورکییەکـەی گۆڤارەکـە کـاری کردبێـت (سلوپی، ١٩٩٧، ص٤٧ ؛ عـەلیاوەیی، ٢٠٠٤، ل٢٠٥)، بـەڵام دوای لێکۆڵینـەوەی زیـاتر لەسـەر گۆڤارەکـە و بڵاوکردنەوەی هەر چوار ژمارەکەی، بەدیارکەوت کە هـیچ بابـەتێکی مەمـدوح لـە گۆڤارەکـە بڵاونەکراوەتەوە (زەنگەنـە، ڕۆژی کـورد، ٢٠٠٥ )، بۆیـە لەگـەڵ ئـەو بۆچوونەداین کە پێی وایە مەمدوح سـەلیم لەگـەڵ چەنـد ڕۆژنامەنووسـێکی تـردا بەشە تورکییەکـەی گۆڤارەکـەیان بـەڕێوە بردووە (عوبێـد، ڕۆژنامـەڤانی"گۆڤـار"، ژ(٣)، کانونی یەکەمی ٢٠٠٠، ل٢٠٣ )، نەوەک نووسـەر، وەکـو پێشـتر ئامـاژەی پێدرابوو.

سەروبەندی بەکۆتاییهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی، بـۆ کـورد، سـەرەتای دەرکەوتنی قۆناغێکی نوێ بوو سەبارەت بە ژیـانی ڕێکخراوەیـی بـە شـێوەیەکی تایبەتی و، بزاڤی ڕزگاریخوازییەکەی بە شێوەیەکی گشـتی. ئەمـەش دوای ئـەوە هـات کـە ژمارەیـەک کۆمەڵـە و ڕێکخسـتن و پـارتی سیاسـی، بـە قۆسـتنەوەی هەلومەرجی گونجاوی دوای جەنگ، بـە تایبـەتی لـە ناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی، دامەزران.

لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩١٨) کۆمەڵەیەکی کوردی بەناوی کۆمەڵەی تەعالی کوردستان (کردستان تعالی جمعیتی)[١٦] لە ئەستانە دامەزرا. شێخ عەبدولقادری نەهری[١٧]سەرۆک و ئەمین عالی بەدرخان[١٨] جێگری سەرۆکی کۆمەڵەکە بوون. مەمدوح سەلیمیش وەکو یەکێک لە ئەندامە دیارەکانی کۆمەڵەکە (Bozarslan, 2001, R29 ؛ صابر، ٢٠٠١، ص١٦٤-١٦٥ ؛ تەتەر، ٢٠٠٢، ل١٥٠-١٥١)، درێژەی بە خەباتی سیاسیی خۆی دا. ئەم کۆمەڵەیە درێخی نەکرد لەوەی لە ڕێگای بەرزکردنەوەی یادداشتەوە دەنگی کورد سەبارەت بە گەیشتن بە خواستەکانی بە بەرپرسانی پایەبەرزی هاوپەیمانان و کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس بگەیەنێت (عەبدوڵڵا، ٢٠٠٧، ل٦٠، ٦٧-٦٩). هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا بەڵگەنامە فەرمییە فڕەنسی و بریتانییەکان ئاماژە بە هەبوونی کۆمەڵەیەکی تر بەناونیشانی (پارتی دیموکراتی کورد) دەکەن لەم کاتانەدا، بەپێی زانیارییەکانی ناو ئەو بەڵگەنامانە ئەوە روون دەبێتەوە کە مەمدوح سەلیم وەکو سکرتێری گشتی پارتەکە ناوی هاتووە و بە واژۆی ناوبراو و ژمارەیەکی تر لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پارتەکە، دوو یادداشتیان داوەتە کۆمیساری باڵای بریتانی لە ئەستانبۆڵ. لە یادداشتەکاندا ئاماژە بە رۆڵی بریتانیا لە چەسپاندنی مافی گەلانی ژێر دەستە و بەپشتبەستن بە بنەماکانی وێڵسن (١٩١٣-١٩٢١)ی سەرۆکی ئەوکاتەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کراوە، لەبارەی مافی چارەنووسی گەلانی ژێردەستە، تاکو بکرێ کوردیش ئامانجەکانی خۆی لە مافی چارەنووسی نەتەوەیی تا ئاستی"**سەربەخۆیی**" بۆ دەستەبەر بێت (ئەبوبەکر، ٢٠١٢، ل٢٥٢-٢٥٩؛ عەبدوڵڵا، ٢٠٠٨، ل٧٠-٧٨).

شایانی باسە لە سەرچاوەیەکی تردا (پارتی دیموکراتی کورد) بە (کۆمەڵی دیموکراتی کوردستان)ناوی هاتووە. ئەم سەرچاوەیە لەم بارەیەوە نووسیویەتی: بە سەرکردایەتی گەنجان و رۆشنبیرانی کورد تێدەکۆشا، مەمدوح سەلیمیش بە یەکێک لە پیاوە ناسراوەکانی کۆمەڵەکە وەسف دەکات (شاوەیس، رۆشنبیری نوێ "گۆڤار"، بەغدا، ژمارە (٩)، ١٩٦٠، ل٢٧)، بەڵام لەبەرئەوەی ناوی کۆمەڵەکە لە بەڵگە فەرمییەکاندا بە (پارتی دیموکراتی کورد) ناوی هاتووە بۆیە پێمان وایە کە دەبێ هەر ئەوە ناوی بووبێت، نەوەک (کۆمەڵی دیموکراتی کوردستان).

توێژەرێــک وای بــۆ دەچــێ کــە (پارتی دیمــوکراتی کــورد) روویــەکی تری (کۆمەڵــەی تــەعالی کوردســتان) بێـت و نوێنەرایـەتی تـوێژێکی رادیکـال و رۆشنبیری کردبێت کە ئامانجیان بەدیهێنانی سەربەخۆیی کوردستان بووە (تەتەر، ٢٠٠٢، ل١٧٠). بۆیە کـار و چالاکییـەکانی سـنووردار بـوون. بەڵگـەش لـەم بـارەوە ئەوەیە کە لە تەموزی ساڵی (١٩١٩)دا شـاندێکی (کۆمەڵەی تـەعالی کوردسـتان) بەناوی (دیموکراتخوازانی کورد)ەوە، نەوەک (پارتی دیموکراتی کـورد) سـەردانی کۆمیساری باڵای ئەمریکایان لـە ئەسـتانبوڵ کردبـوو. ئەنـدامانی شـاندەکە، کـە مەمدوح سەلیمیشـیان لەگەڵـدا بـووە، یاداشـتێکیان لـەبارەی پرسـی کوردسـتان پێشکەش بـە کۆمیسـار کردبـوو (ژیـن " گۆڤـار"، اسـتانبول، عـدد (٢٣)، اغسـتوس ١٣٣٥، ص١-٢). هەر لەسەر ئەو بنەمایە، نووسەر و رۆژنامەنووسێکی تر گومـانی خـۆی لە بارەی ئەم پرسە دەردەبڕێت و پرسیاری ئەوە دەکات کـە"**ئایـا هـیچ حزبێـک بەناوی (حزبی دیموکراتی کوردی) هەبووە؟ یان هەر ئەو شاندە بووە کە بەناوی (دیموکراتی خوازانی کورد) بوونە و سەردانی ئەو شوێنەیان کردووە و لەلایەن راپۆرتنووسەکانی ئینگلیز و دواتر لە بەڵگەنامەکانیان بەحزب خوێندراوەتەوە**" (زەنگەنە، رۆژنامەڤانی"گۆڤار"، ژمارە (٦-٧)، پایز-زستانی٢٠٠١-٢٠٠٢، ل١٨٤).

هەروەها لە ئاداری ساڵی (١٩٢٠)یشـدا مەمـدوح سـەلیم بـەناوی سـکرتێری گشتی (پارتی دیموکراتی کورد) لەگەڵ چەند کەسایەتی و کۆمەڵـە و گرووپێکـی تردا تەلەگراف (برووسکە)یان بۆ لوید جۆرج (١٨٦٣-١٩٤٥)ی سـەرۆک وەزیرانـی بریتانیا بەرز کردبۆوە. لە برووسکەکەدا دڵخۆشیی خۆیان دەربڕیبوو لە بەرانبەر ئەوەی کـە نـاوبراو لـە ئەنجومـەنی لـۆردانی بریتانیـا پرسـی"**رزگـاربوونی گـەلی کورد**"ی وروژاندبوو (ئەبوبەکر، ٢٠١٢، ل٢٨١). بەم جـۆرە وەکـو بـەدیار دەکـەوێت، مەمدوح سەلیم لەگەڵ هاوڕێکانی تریـدا، هەمیشـە لـە بەرزکردنـەوەی یاداشـت و برووسـکە نـاردن بـۆ نوێنـەرانی وڵاتـانی زلهێـز، لـە پێنـاو گەیانـدنی خواسـت و ئامانجەکانی گەلی کورد درێخییان نەکردبوو.

بە پشتبەستن بەو زانیارییانەی کەوا مەمدوح سەلیم لە دووتوێی بابـەت و وتارەکانیدا خستبوویە روو، هەڵوێستە نەتەوەیییەکانیمان لەم قۆناغەدا بۆ روون دەبێتـەوە. بەتایبـەتی لـەو وتارانـەی لـە رۆژنامـەی (ژین)دا بـڵاوی دەکردنـەوە.

چونکە پرسی"**کوردایەتی**"کە ئامانج لێی ئازادی و رزگاری نەتـەوەی کـوردە، لـە ژمارەکانی گۆڤاری (ژین)دا بەرجەستە ببـوو(بۆزئارسـلان، رۆژنامـەڤانی"گۆڤـار"، هـەولێر، پایز-زستانی ٢٠٠١-٢٠٠٢، ل٢٢٠ ). مەمدوح سەلیم لەوە تێگەیشتبوو هەلومەرجی گشتی دوای جـەنگی یەکـەمی جیهـان بەگۆڕانکارییـەوە هاتۆتـە پێشـەوە، بۆیـە ئـەوە دەخوازێت کورد"**بەڕێوەبەرایەتییەک**"ی تایبـەت بـەخۆی هـەبێت. لـە یـەکێک لـە وتارەکانیدا بەناونیشـانی (گفتوگۆیەک لـە یانەیـەکی کـوردی)، کـە لەیـەکێک لـە ژمارەکانی گۆڤاری (ژین) بـڵاوی کردۆتـەوە، نووسـیویەتی:"...**دەمانـەوێت ئـەوە بڵێین کە کوردەکان دەیانـەوێت وەک نەتەوەیـەک بـژین و بـەرگری لـە بـوونی خۆیان بکەن و ژیانێکی بەختەوەر بۆ خۆیان دابـین بکـەن و لـەژێر دەسـەڵاتی بەڕێوەبەرایەتییەکدا بن کە بەگوێرەی حاڵەتی رۆحی و باری دەروونـی خۆیـان بێت...پێویستە ئەو مافانەی کەوا بۆ نەتەوە و گەلانی دراوسێ دابین دەکرێت، بە کوردەکانیش بدرێت...کورد دەیەوێت وەک مـافێکی سـەرەتایی، بـە زمـانی خۆی باس لە ئازار و مەینەتەکانی خۆی بکات و هاوزمانەکانی خۆی، برینەکانی بپێچنـەوە و لـەژێر دەسـەڵاتی خۆیـدا شـەریعەت و یاسـا و رێسـاکانی خـۆی دابنێت...**" ( گوێڵداش، ٢٠١١، ل٤٧٢).

مەمـدوح سـەلیم دانـی بـەوە دانـابوو کـە نەتـەوەی کـورد لـە جیهـانی پێشکەوتووی شارستانییەتدا بەجێماوە. بۆیە ئەو پێداگری لەسەر دەستگرتن بە ئـامرازە پێشـکەوتووەکانی سـەردەم دەکـرد. لـەم بـارەوە لـە بابـەتێکی تریـدا بەناوونیشـــانی (دوو بەرهـــەمی پـــڕ خێـــر: جەمعییـــەتی تـــەعالی ژنـــانی کورد_جەمعییەتی هێڤیی تەلەبـەی کـورد)[19]، نووسـیویەتی: "**ئەگـەر بمانـەوێ دەنگی خۆمان بگەیەنینە جیهانی شارستانی، پێویستە هەموو پێشکەوتنەکانی زانست و تەکنەلۆژیا لە ئەوروپا و ئەمریکا وەربگرین و تایبەتمەندییە باشەکانی ئەوان (ئەوانەی لەگەڵ تایبەتمەندییـە نەتەوەییـەکانی ئێمـەدا دەگـونجێن) بـۆ خۆمان وەربگرین و شتیان لێوە فێرببین**" (گوێڵداش، ٢٠١١، ل٤٨٥). مەمـدوح سـەلیم لە نووسینەکانی خۆیدا جەختی لەسەر بوونی جۆرێک لە "**رێکخستن**" بـۆ کـورد کربـــۆوە کـــە گشـــتگیر و فریـــادڕەس بێـــت. لـــە وتـــارێکی تریـــدا بـــە ناونیشانی (هاوار=امداد) ( سلیم بکی، ژین "گۆڤار"، استانبول، عدد (١٩)، مایس١٣٣٥، ر١-٤)،

لەبارەی پێویستی هەبوونی کۆمەڵەیەکی وا نووسیویەتی:"...**ئەو دایکەی کە چارەیەکی لێ وەدەست بێ ڕێکخستنە، ڕێکخستنێکی ئەوها کە بەهێز و بە خەبات و تێکۆشان پەروەردە بکرێت بە واتایەکی دیکە ڕێکخستنێکی جڤاکی کە لەناو هەر نەتەوەیەکی شارستانی هەیە، ڕێکخستنێکی ئەوها کە لە کاتی شەڕدا و لە کاتی ئاشتیشدا وەک ڕێنیشاندەرێک و ڕزگارکەرێک بتوانێ خۆی بگەیەنێتە هەر گۆشەیەکی نادیاری کوردستان، ڕێکخستنێکی وا کە بتوانێ لە تاریکیدا ببێتە ڕووناکی و لە کاتی دەربەدەربووندا چرای ژیان هەڵکات...**" (بۆزئارسلان، ڕۆژنامەڤانی"گۆڤار"، هەولێر، پایز-زستانی٢٠٠١-٢٠٠٢، ل٢٤٩).

مەمدوح سەلیم لە نووسینەکانی خۆیدا ژنیشی فەرامۆش نەکردووە. ئەو جەختی لەسەر هەماهەنگیی نێوان پیاو و ژن لە پرسی تێکۆشان و خەباتدا کردۆتەوە. لە بابەتی خانمی کورد ((کورد خانمی))دا (سلیم بكی، ژین "گۆڤار"، استانبول،، عدد (١٤)، مارت١٣٣٥، ص٦-١٠)، پێداگری لەسەر ئەم پرسە کردووە و نووسیویەتی:" ...**ئەو نەتەوانەی کەڵک لە توانای تاکەکانی ناو کۆمەڵگای خۆیان وەردەگرن، با هیچ کات لە شکستهێنان نەترسن. گۆڕانکارییەکان لە دنیای ئەمڕۆماندا خێران، لەو گۆڕانکارییانەشدا، ئەو کۆمەڵگایانەی کە ژنان شان بەشانی پیاوان، بەشداری تێکۆشانە کۆمەڵایەتییەکان ناکەن، تووشی خراپە دەبن... بۆ ئەوەی ببنە کەسی باش لە بنەماڵەدا، پێویستە وڵاتپارێزی و نیشتمانپەروەری فێری منداڵان و براکانمان بکەن**" (گوێڵداش، ٢٠١١، ل٤٨٤-٤٨٥).

دوای سەرهەڵدانی ناکۆکی لە نێوان ئەندامانی سەرکردایەتی (کۆمەڵەی تەعالی کوردستان)، مەمدوح سەلیم لەگەڵ ئەو باڵەدا بوو کە بە "**سەربەخۆیی خوازەکان**" ناسرابوون و ئەمین عالی بەدرخان سەرۆکایەتی دەکردن (ئیسماعیل گوێڵداش، ٢٠١١، ل٣٣٥-٣٤٥ ). وا پێدەچێت ناکۆکییەکان لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩١٩) و سەرەتاکانی ساڵی (١٩٢٠) زیاتر پەرەی سەندبێت و ئەنجامەکەشی بریتی بوو لە دەرکەوتنی یەکەم لێکترازان لە ریزەکانی کۆمەڵەکە و جیابوونەوەی ژمارەیەک لە ئەندامەکانی، کە بریتی بوون لە (نجم الدین حوسێن، مەمدوح سەلیم، کەمال فەوزی و بابان زادە عەزیز بەگ). ئەمانە دواتر کۆمەڵەیەکیان بەناوی (فیرقەی میللەتی کورد) (سلوپی، ١٩٩٧، ص٧١ ؛ گوێڵداش،

٢٠١١، ل٤٧٨ ؛ مالمیسانژ، ٢٠٠٨، ل٤٣٧)، یاخود (پارتی نەتەوەی کورد) (شێرکۆ، ١٩٩٢، ل٥٢) دامەزراند. جێی ئاماژە پێدانە کە چالاکییەکانی ئەم کۆمەڵەیەی دوایی بەرچاو نین، بۆیە دوور نییە ئەمەشیان کۆمەڵەیەکی نافەرمی بووبێت.

ناکۆکی و دژە بۆچوونەکان لە نێوان ئەندامانی (کۆمەڵەی تەعالی کوردستان) درێژەیان کێشا، لە ئەنجامدا لێکترازانێکی تری لێ کەوتەوە. ئەوەبوو ئەمین عالی بەدرخان لەگەڵ ژمارەیەک لە هاوبیرانی" **سەربەخۆیی خوازەکان**"، لە (٢٠ی نیسانی١٩٢٠)دا (عەلی تەتەر، ٢٠٠٢، ل١٨١) کۆمەڵەیەکی تازەیان بەناوی (کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کورد)[٢٠] دامەزراند. جارێکی تر ناوی مەمدوح سەلیم لە ریزی دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەیە دەبینرێت. ئەمە لە کاتێکدا کۆمەڵەی (فیرقەی میللەتی کورد)یش لەپاڵ (کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کورد)دا درێژەی بە چالاکییەکانی خۆی دابوو و هەماهەنگیشیان لەگەڵ یەکتریدا هەبووە. کۆمەڵەکەی دوایی لەرووی چالاکی و فراوانیی بنکەی جەماوەریدا بە پێش کۆمەڵەکانی تر کەوتبوو(گوێڵداش، ٢٠١١، ل٣٤٦-٣٥٣). هەروەها بە ئامانجی خستنەرووی بەرنامەی کارەکەی و دەستەبەرکردنی پشتگیریی بریتانیا بۆ پرسی کورد و داخوازییەکانی، لە (٦ی ئایاری ١٩٢٠)دا بە واژۆی مەمدوح سەلیم وەکو سکرتێری کۆمەڵە، یاداشتێکیان بۆ (کۆمیساری باڵای بریتانی) لە ئەستانبۆڵ ناردبوو. لە یاداشتەکەدا و لە ریزبەندی ناوەکاندا ناوی مەمدوح سەلیم هەشتەمینیانە و بە" **مەمدوح سەلیم بەگ (وان) نووسەری (ژین)**" وەسف کراوە. لە (١٧ی حوزەیرانی ١٩٢٠)یشدا، یاداشتێکی دیکەیان بە واژۆی ئەمین عالی بەدرخان وەکو سەرۆک و مەمدوح سەلیم وەکو سکرتێری کۆمەڵەکە بۆ سەرۆک وێڵسن بەرز کردبۆوە. کە تیایدا بە پشتبەستن بە چواردە بەندەکەی وێڵسن، داوای پشتگیرییان بۆ دامەزراندنی"**کوردستانێکی سەربەخۆی یەکگرتوو**" لەو وڵاتە کردبوو(عەبدوڵڵا، ٢٠٠٨، ل١٣٢-١٣٣، ١٤٥-١٤٨). ئەم بەڵگانەی دوایی بە تەواوەتی دەیسەلمێنن کە مەمدوح سەلیم لەم قۆناغەی خەباتی سیاسیدا لەسەر ئەو ئاراستەیە جێگیر بووە کە بەدیهێنانی سەربەخۆیی بۆ کوردستان ئامانجی لەپێشینەیان بووە. لە پێناو بەدیهێنانی ئەو ئامانجەشیاندا، وەکو پێشوو، لە گەیاندنی دەنگی کورد بە بەرپرسانی باڵا و وڵاتانی زلهێز، کەمتەرخەم نەبوون.

هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، دوای گەیشتنی تورکە کەمالییەکان بە دەسەلات، ژمارەیەکی بەرچاو لە سەرکردەکانی کورد روویان لە ژیانی پەناهەندەیی کرد. مەمدوح سەلیمیش یەکێک بوو لەوانەی ئەم ئاراستەیەی هەڵبژارد. لێرە بەدواوە تاکو دەوروبەری ساڵی (١٩٢٧)، سەرچاوەکان شتێکی ئەوتۆ لە بارەی جموجۆڵ و چالاکییەکانی مەمدوح سەلیم نادرکێنن. سەرچاوەیەک باسی خۆتێکەڵکردنی مەمدوح سەلیم بە رێکخراوی (ئازادی)[٢١] دەکات، بەڵام بێ ئەوەی هیچ وردەکارییەک لەم بارەیەوە بخاتە روو (الصويركي، ٢٠٠٥، ص٧٢٤). هەروەها هەندێک سەرچاوە باسی بەشداریکردنی مەمدوح سەلیم لە راپەڕینی (شێخ سەعیدی پیران) [٢٢] لە ساڵی (١٩٢٥) دەکەن (دەرسیمی، ٢٠٠١، ل٢١٧؛ محمد، کۆڕی زانیاری کورد "گۆڤار"، بەغدا، بەرگی پێنجەم، ١٩٧٢ ،ل٥١٢). بەڵام جگە لە چەند وشەیەک لەم بارەیەوە، زانیاریی ئەوتۆ بەدەستەوە نادەن. بۆیە پێمان وایە ئەم هێندە زانیارییە بۆ ساغکردنەوەی پرسی رۆڵی مەمدوح لە راپەڕینەکە بەس نییە و سەرچاوەکانی تایبەت بەم ماوەیە و خودی راپەڕینەکە، ئەم زانیارییانە پشتڕاست ناکەنەوە.

دوای دامرکانەوەی راپەڕینەکەی ساڵی (١٩٢٥)، پرسی خۆ رێکخستنەوە و هەماهەنگیکردن لە نێوان سەرکردە رۆشنبیر و کەسایەتییە کۆمەڵایەتییەکان، بەتایبەت لەلای ئەوانەی پەناهەندەی وڵاتی شام ببوون، بووە جێگای تاوتوێکردن و گرنگی پێدان. سەرچاوەکان بە رەهایی و بەبێ دوودڵی لەم رووەوە باسی مەمدوح سەلیم دەکەن، بەوەی کە یەکەم کەس بووە لەنێو سەرکردەکاندا درکی بە پێویستی چارەسەرکردنی دۆزی کورد کردبوو. ئەوەبوو دەستی کرد بە پەیوەندیکردن بە کەسایەتییە کوردەکان تاکو هاوکاری یەکتری بکەن لەپێناو دامەزراندنی رێکخراوێکی نوێی گشتگیر و تۆکمە کە هەموو پارت و کۆمەڵە کوردییە ناکارا و بێهێزەکان لەخۆیدا کۆبکاتەوە. هەروەها مەمدوح سەلیم لە رێگای پەیوەندییە تایبەتییەکانی خۆیەوە لەگەڵ ئەرمەنەکاندا، توانی هاوکاریی ئەوانیش دەستەبەر بکات. دەرەنجامی هەموو ئەم هەوڵانەشی بریتی بوو لە کۆبوونەوەیەکی بەرفراوانی سەرکردەکان و رێککەوتنیان لە سەر دیاریکردنی شوێن و کاتی دیاریکراو بۆ دامەزراندنی رێکخراوەکە. لە میانەی

کۆبوونەوەیەکی تردا کە لە (٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧) لە هاوینەهەواری (بحمدون) لە لوبنان بەڕێوە چوو بڕیار لەسەر دامەزراندنی کۆمەڵەی (خۆیبوون) درا. ئامانجی کۆمەڵەکەش بریتی بوو لە "**دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد لە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی تورکیا**" (آلاکوم، ٢٠٠٠، ص١٠-١٥). تەنانەت لەپێناو کەمکردنەوەی کاردانەوە و هەستیاریی ئەرمەنەکان لە بەرانبەر ئامانج و داخوازییە نەتەوەییەکانی کورد، مەمدوح سەلیم لەڕێگەی دۆستایەتیی خۆی و بەهێزیی توانا دیپلۆماسییەکانییەوە، توانیبووی بە هاوکاری ژمارەیەک ئەندامی تری خۆیبوون لەگەڵ ئەرمەنەکان ڕێککەوتنێک واژۆ بکەن (مەزهەر، ٢٠٠١، ل٤٩٨-٤٩٩ ؛ آلاکوم، ٢٠٠٠، ص ١٨ ؛ زەنگەنە، ڕۆژنامەڤانی"گۆڤار"، ژمارە (٦-٧)، پایز-زستانی٢٠٠١-٢٠٠٢، ل ١٨٦).

شایانی باسە لە یەکەم لێژنەی مەرکەزی (خۆیبوون)دا، ناوی مەمدوح سەلیم لە دووەم ناو و لەدوای ناوی جەلادەت بەدرخاندا، وەکو ئەندام هاتووە (آلاکوم، ٢٠٠٠، ص١٨). یەکێک لە چالاکییە دیپلۆماسییەکانی مەمدوح سەلیم لەناو (خۆیبوون)دا بریتی بوو لە ناردنی یاداشتێکدا بە واژۆی خەلیل رامی بەدرخان وەکو یاریدەدەری سەرۆک و مەمدوح سەلیم وەکو سکرتێری گشتی (خۆیبوون)، بۆ کۆمەڵەی گەلان (عصبة الامم)و تیایدا خواستەکانی کوردیان خستبووە ڕوو (زەنگەنە، ڕۆژنامەڤانی"گۆڤار"، ژمارە (٦-٧)، پایز-زستانی٢٠٠١-٢٠٠٢، ل١٨٦). هاوکات لەگەڵ دامەزراندنی خۆیبوونیشدا پرسی ئەنجامدانی شۆڕشێک تاو و توێ دەکرێت، ئەویش شۆڕشی ئاگری (ئەرارات)ە. ڕۆڵی مەمدوح سەلیم لە شۆڕشەکە شتێکی بەرچاوە. تەنانەت وەکو چۆن دەکرێ بە ئەندازیاری دامەزراندنی (خۆیبوون) دابنرێت، لە هەمان کاتیشدا ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە لێکۆڵینەوە لە ئیمکانیاتی بەرپاکردنی شۆڕشەکە لە ناوچەی (ئاگری) و دیاریکردنی سەرکردەی دیاری شۆڕشەکە، کە (ئیحسان نوری پاشا) بوو( Uzun , 1989 , R119-128).

دوای نوشوستهێنانی شۆڕشی (ئاگری) و دەرکەوتنی دیاردەی لێکترازان لە ناو کۆمەڵەی (خۆیبوون)دا، مەمدوح سەلیم لە ڕیزی پێشەوەی ئەو ئەندامانە بوو کە وەکو"**هێزی ڕکابەر**" لە ناو خۆیبووندا لە پێناو پارێزگاریکردن لە یەکێتی

ناو کۆمەڵەکە و مانەوەیدا کۆششیان دەکرد. لەم بارەیەوە گوتراوە کە:"**ئەوانە کۆششیان دەکرد لەپێناو پارێزگاریکردن لە یەکگرتوویی. ئەوان لە پشت کۆششەکانیاندا مەرامی هیچ دەسەڵات و پلە و پایە و هەژموونێکیان نەبوو**"(آلاکوم، ٢٠٠٠، ص٧٧). لەم رووەوە سەرچاوەکان ئاماژە بە نامەیەکی مەمدوح سەلیم دەکەن، کە لە ساڵی (١٩٣٤)دا لە (ئەنتاکێ)وە بۆ جەلادەت بەدرخانی ناردبوو. لە نامەکەیدا رەخنەی توندی لە (دکتۆر شوکری محەمەد سەگبان)[٢٣] گرتبوو، چونکە ناوبراو لە کتێبێکدا کە لە ساڵی (١٩٣٣) و بە ناونیشانی (پرسی کورد)و بە زمانی فرەنسی بڵاوی کردبۆوە، وەکو توێژەرێک دەڵێ:" **خەتێکی راست و چەپ بەسەر مێژووی (٣٧) ساڵەی خەباتی کوردایەتی خۆی دادەهێنێ...زۆربەی راستییە مێژووییەکانیشی ئاوەژۆ کردۆتەوە هەر تەنها بۆ ئەوەی کەمالیستەکان ببەخشن و بگەڕێتەوە بۆ تورکیا**" (سەگبان، ٢٠١٣، ل٢٨).
مەمدوح سەلیم جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە بەتوندی دژی لێکترازانەکانی ناو (خۆیبوون) دەوەستێتەوە (آلاکوم، ٢٠٠٠، ص٧٦). هەروەها نووسیویەتی: "**ناشێ بەتەواوی هۆش و ئاوەزییەوە نوسیبێ و بڵاوی کردبێتەوە. دکتۆر [شوکری محەمەد سەگبان] دەڵێ لە سیاسەت و سیاسەتکاری دەکشێمەوە، بەڵام ئەمە کشانەوە نییە، خۆکوژییە... لەخۆ و لە برادەرانی هاوسەنگەر بەدەست دوژمنەوەدان بەو لاوە دەبێ چی دیکە بێ؟**" ( سەگبان، ٢٠١٣، ل٣٠).

تەنانەت ئەم هەڵوێستانەی مەمدوح سەلیم ببوونە هۆی ئەوەی لە بەشەکانی تری کوردستانەوە متمانەی پێ بکرێت و لە پێناو بەدەستهێنانی هەماهەنگی و هاوکاری لە نێوان سەرکردەکانی بزاڤی رزگاریخوازی کورددا، هەوڵی پەیوەندی پێوەکردنی بدرێت. لەم رووەوە (رەفیق حلمی)[٢٤] جەختی لەسەر پێویستی پەیوەندیکردنی نوێنەرانی (حزبی هیوا)[٢٥] بە مەمدوح سەلیم دەکردەوە (آلاکوم، ٢٠٠٠، ص٧٦). لەوانەیە هەر ئەمەش وایکردبێت ئەم کەسایەتییە لەلایەن نەیارانەوە بەوردی چاودێری کرابێ. وەکو سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن، بەهۆی چالاکییە کاراکانی لقی (ئەنتاکێ)ی کۆمەڵەکەوە، جارێکیان لەلایەن تورکەکانەوە بە لێدان هێرشیان کردبووە سەر مەمدوح سەلیم و ئازاریان دابوو (حصاف، ٢٠١٧ ص٣٣٨).

فرەنسـییەکانیش لەلایـەن خۆیانـەوە لـە چـاودێریکردنی چالاکییـەکانی (خۆیبوون) و ئەندامە کاراکـانی درێخییـان نـەکردبوو. هـەروەکو لـە یـەکێک لـە بەڵگەنامە فرەنسییەکاندا هاتووە، ئەوان بەوردی لە بارەی لقـەکانی خۆیبـوون و پێزانینی ئەندامەکانیان کۆڵیوەتەوە. بۆ نموونە لە یەکێک لە بەڵگەنامەکاندا کـە لە بنەڕەتدا بریتییـە لـە راپۆرتێـک لـەلایـەن دەزگاکـانی هـەواڵگری فرەنسـییەوە ئامادەکراوە، ناوی مەمدوح سەلیم لـە ریـزی ئـەو کەسـانە دانـراوە کـە سـەر بـە لقی (حـــەڵـــەب)ی کۆمەڵـــەی (خۆیبوون)ن (ســەگبان، ٢٠١٣، ل٣٠ ؛ غورغــاس، ٢٠١٣، ص١٦٧). لە بەڵگەنامەیەکی تریشدا کە زیـاتر لـەبارەی جموجۆڵـەکانی جـەلادەت بەدرخانەوە نووسراوە، دیسان ئاماژە بـە مەمـدوح سـەلیم کـراوە کـە ئـەو کاتـە لە (ئەنتاکیێ) بووە و لەگەڵ جەلادەتدا چاویـان بەیـەکتر کـەوتبوو (عەبدوڵڵا، ٢٠٠٧، ل١٧٩). هەر لە ئەنتاکێدا لەلایـەن فرەنسـییەکانەوە بانگهێشـتی دادگـا کـراوە و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کراوە. لێرەشدا مەمدوح سـەلیم بـە جورئەتـەوە لەبـەردەم فەرماندەی هێـزە سـەربازییە فرەنسـییەکان لە (ئـەنتاکیێ) بـەرگری دەکـات و لـە میانەی قسەکانیدا دەڵێ: **"وڵاتـی ئێمـە پارچـە بـووە، هـەموو شـتێک لـە ئێمـە قەدەغـە کـراوە، خـەڵکی ئێمـە لـەژێر ئەزیـەت و زوڵمێکـی سەرسـوڕهێنەری مەزندایە...ئەگەر ئێوە، بەڵێ ئێوە لـە بـارودۆخێکی ئـەوهادا بوونایـە چیتـان دەکـرد؟"**. وا پێـدەچێت هـەر لـەو ماوەیەشـدا لە (ئـەنتاکیێ) دوورخرابێتـەوە و لە (دیمەشــق) نیشــتەجێ بووبێــت (Uzun , 1989 , R119-128). تەنانــەت بریتانییـەکانیش لـە عێراقـەوە لـە رێگـای بـەکرێگیراوانی خۆیانـەوە چـاودێری جموجۆڵـەکانی ئەندامـەکانی کۆمەڵـەی خۆیبوونیـان کردبـوو. لـە یـەکێک لـە بەڵگەکاندا ئەوە روون دەبێتەوە کە مەمدوح سەلیم یەکێک بـووە لـەو کەسـانەی چـاودێری کرابــوو (مەزهــەر، ٢٠٠١، ل٢٨٩-٢٩٧). هــەروەها لــە راپــۆرتێکی تــری بەکرێگیراوانی بریتانیدا کە لە ساڵی (١٩٣٠) ئامادەکراوە، نـاوی مەمـدوح سـەلیم لـە نێـوان نـاوی ئـەو کەسـانەدایە کـە وەکـو ئەنـدام لـە خۆیبوونـدا ماونەتـەوە (غورغاس، ٢٠١٣، ص١٧١).

شایانی باسە بەپێی ئاماژەی سەرچاوەیەک، دەبێ مەمدوح سەلیم یـەکێک بووبێت لە دامەزرێنەرانی (یانەی کوردستان) لە گەڕەکی (تاخا کوردان) لە شـام،

ئەو یانەیەی کە وەکو دەگوترێ لە رواڵەتدا وەرزشی بووە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا سیاسی بووە. دواتر بەهۆی چالاکییەکانییەوە لەلایەن دەسەڵاتدارانی فڕەنسی لە سوریا داخراوە(حصاف، ٢٠١٧ ص٣٤٣). لە ساڵی (١٩٣٨)شدا، کاتێک سەرکردایەتی (خۆیبوون) تازە کرایەوە، دیسان مەمدوح سەلیم لە نێو ئەندامانی سەرکردایەتییەکەدا جێگای خۆی گرتبوو (احمد، ٢٠٠٠، ص٨٥ ؛ حصاف، ٢٠١٧ ص٣٣٨)، بەڵام لێرە بەدواوە زانیارییەکان لە بارەی چالاکییەکانی خۆیبوون بەگشتی و مەمدوح سەلیم بەتایبەتی کەمتر دەبن یان بەرەو ئەوە دەچن نەمێنن تاکو هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەکە لە ساڵی (١٩٤٦)دا. دیارە ئەمەش هۆکاری خۆی هەبووە، هۆکارەکانیش هەندێکیان خودی و هەندێکیشیان بابەتی بوون. هۆکارە خودییەکان ئەوانەن کە پەیوەندییان بە بارودۆخی ناوخۆی خۆیبوون هەبوو، گرنگترینیشیان بریتی بوو لەو ناکۆکی و ململانێ ناتەندروستانەی لە نێوان سەرکردە دیارەکانی خۆیبوونەوە لەئارا دابوو، کە دواتر بووە هۆی دەرکەوتنی دیاردەی لێکترازان لە ریزەکانی (خۆیبوون)دا، بەتایبەت دوای دامرکانەوەی شۆڕشی ئاگری و راپەڕینەکەی (دەرسیم) (آلاکوم، ٢٠٠٠، ص٨٦). ئەمە جگە لەوەی کە هەندێ لە ئەندامانی بەرچاوی خۆیبوون، بۆ نموونە مەمدوح سەلیم، زانیاری لەبارەی خۆیبوونەوە نەدرکاندووە، بەتایبەت وەکو دەگوترێ:" **...نەپرژاوەتە سەر زۆر لایەنی گرنگ و رەنگە نهێنی ژیانی، بەتایبەتی درێژە کێشانی، ساڵەهای ساڵی بێ دەنگی مەمدوح سەلیم دڵتەزێنە**" (زەنگەنە، رۆژنامەڤانی"گۆڤار"، ژمارە (٦-٧)، پایز-زستانی٢٠٠١-٢٠٠٢، ل ١٨٦). هۆکارە بابەتییەکانیش پەیوەندییان هەبوو بەو گۆڕانکاری و هەلومەرجە هەرێمی و نێو دەوڵەتییەی کە لە ئەنجامی جەنگی دووەمی جیهان (١٩٣٩-١٩٤٥) هاتنە پێشەوە، وەکو گۆڕانی تەرازووی هێز لە جیهان و ناوچەکە و دەرکەوتنی دوو جەمسەری جیهانی و کشانەوەی هێزەکانی فڕەنسا لە سوریا و رووخانی کۆماری مەهاباد (آلاکوم، ٢٠٠٠، ص٨٤-٨٦).

سینەم خانم، کە مەمدوح سەلیم لەگەڵ باوکی ئەودا دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی بوون، وای بۆ دەچێ دوورکەوتنەوەی هەندێک لە دۆستە نزیکەکانی مەمدوح سەلیم لە سیاسەت، بەتایبەت جەلادەت بەدرخان، لەگەڵ ئەو ناکۆکی و ململانێیەی لەنێوان ئەندامانی خۆیبووندا لەئارا دابوو و کە دواتر بووە هۆی

پەرتەوازەبوونی ریزەکانی کۆمەڵەکە، ئەوانە ببوونە هۆی دوورکەوتنەوەی مەمدوح سەلیم لە سیاسەت (سینەم خانم، چاو پێکەوتن، ٢٠١٧). پێمان وایە لەم رووەوە ناوبراو تاڕادەیەکی باش راستییەکەی پێکاوە، بەتایبەت وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، مەمدوح سەلیم یەکێک بوو لەوانەی تا دوا ساتەکانی مانەوەی خۆیبوون پێداگرییان لەسەر پارێزگاریکردن لە یەکڕیزیی ناو (خۆیبوون) کردبوو. دەرکەوتنی زنجیرەیەک لە لێکترازان لەناو کۆمەڵەکەدا، بۆ مەمدوح سەلیم، وەکو کارەساتێکی گەورە وابووە. عیزەددین مستەفا رەسوڵ، کاتی خۆی وەکو سکرتێری کۆمەڵەی قوتابیانی کورد لە زانکۆی دیمەشق هەڵبژێردرا بوو، باسی ئەوەی کردووە کە ئەوان لە ناوەڕاستەکانی پەنجاکاندا وەکو قوتابی زانکۆ چاویان بە کەسایەتییە نەتەوەییە کوردەکان دەکەوت. یەکێک لەوان مەمدوح سەلیم بووە، وەکو ناوبراو لەوەسفیدا گوتوویەتی:"**لە هەموویان کاریگەرتر بوو**" (میراني، ٢٠٠٩، ص٣٨-٣٩).

## ٣. چالاکییە رۆشنبیرییەکانی مەمدوح سەلیم بەگ:

چالاکییە رۆشنبیرییە کاراکانی مەمدوح سەلیم لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیدا دەستپێدەکات. بەتایبەت لەو کاتەوەی دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی بابەت و وتارەکانی لە گۆڤارەکانی (ژین)، (کوردستان) [٢٦]، (دیاری کوردستان) و (هاوار)دا. هەروەها وەکو بەدیاردەکەوێت بەهۆی گیرانی (هەمزە موکسی) [٢٧]ی بەڕێوەبەری بەرپرسی یەکەمی گۆڤارەکە، لە ژمارە (٢١) تاکو ژمارە (٢٥)ی (ژین)، مەمدوح سەلیم ئەرکی بەرپرسیی گۆڤارەکەی لەئەستۆ گرت. ئەو نووسینانەی مەمدوح سەلیم بڵاوی کردوونەتەوە سەرجەمیان بە زمانی تورکین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا"...**وای دەردەخەن کە ئەو توانایەکی زۆر و پشوویەکی درێژی رۆژنامەنووسیی هەبووە**" ( زەنگەنە، رۆژنامەڤانی"گۆڤار"، ژمارە (٦-٧)، پایز-زستانی٢٠٠١-٢٠٠٢، ل١٨٣). ئەمە لە کاتێکدایە کە مەمدوح سەلیم زمانەکانی کوردی، تورکی، فارسی، یۆنانی، فرەنسی و عارەبی (الصویرکي، ٢٠٠٥، ص٧٢٤)و ئەرمەنی (آلاکوم، ٢٠٠٠، ص٢٧ ) زانیبوو.

لە یەکەمین بابەتی خۆیدا، بەناونیشانی خانمی کورد، مەمدوح سەلیم تیشکی خستۆتە سەر زۆر پرسی لایەنی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای کوردەواریدا. سەبارەت بە ژنی کورد، مەمدوح سەلیم لە بەشێکی وتارەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات کە پێویستە داب و نەریتە باوەکانی ناو کۆمەڵگای کوردەواری لەگەڵ یاسا و رێسا هەنووکەییەکان بگونجێندرێن و پێش بخرێن،"...**ئەو کاتە دەبینین رۆڵەی ئەو ژنە رەوشت بەرزانە، بە چ شێوەیەک بنەمای گەشەسەندنی ئەم نیشتمانە دادەنێن**". ناوبراو جەخت لەسەر پێویستیی خوێندن و وەرگرتنی زانست و زانیاری لای ژنانی کورد دەکاتەوە، لەم رووەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەر محەمەد (د.خ) دەهێنێتەوە کە ناوەرۆکەکەی باسی ئەوە دەکات پێویستە هەموو پیاو و ژنێکی موسڵمان بەدوای زانست و زانیاریدا بگەرێن و وەری بگرن. هەر لەم وتارەیدا باسی دامەزراندنی کۆمەڵەی تەعالی ژنانی کورد ( (کورد قادینلری تعالی جمعیتی))[٢٨] دەکات وەکو کۆمەڵەیەکی تایبەت بە ژنان کە لە ئەستانە دامەزراوە (گوێڵداش، ٢٠١١، ل٤٨٥-٤٨٦). لەبارەی مافی ژنانەوە مەمدوح سەلیم لە بەشێکی تری وتارەکەیدا نووسیویەتی:"... **ئەرکی پیاوان و زانایانی ئایینی ئەوە نییە کە مافە ئایینییەکان زەوت بکەن، بەڵکو ئەرکیان ئەوەیە کە ئەو مافانە بە گوێرەی سەردەم فراوانتر بکەن و رێگر نەبن لەوەی کە دووبارە دابرێژرێنەوە**" (مالمیسانژ، ٢٠٠٨، ل١٧٧).

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، مەمدوح سەلیم، بەردەوام پێداگری کردووە لەسەر وەرگرتنی بنەماکانی پێشکەوتن و خۆگونجاندن لەگەڵ شارستانێتی سەردەم. ئەو پێی وابووە کە کورد دەتوانێت بیرۆکەی تازە قبوڵ بکات و ئایینیش رێگری لەمە ناکات. لەم رووەوە رەخنەی توندی لەو کەسانە گرتووە کە دەیانویست بەناوی ئایینەوە رێگە لە پێشکەوتن و گەشەسەندنی شارستانێتی بگرن. لە بابەتێکی خۆیدا بەناونیشانی رەوتە پێشکەوتنخوازەکانی کورد ( (کردلرە ترقی جریانلری)) کە لە گۆڤاری (ژین)[٢٩]دا بڵاوی کردۆتەوە و نزیکەی (٩) لاپەڕە لەخۆ دەگرێت، ئەم مەبەستەی مەمدوح سەلیممان بۆ روون دەبێتەوە. لە بەشێکی نووسینەکەیدا هاتووە: " **من کەسانێکم بینی باسی دین دەکەن و پێیان وایە ئەوانەی بۆینباخ دەبەستن و سمێڵیان دەتاشن، گاور و**

**نامسڵمانن، بەڵام هەر ئەو کەسانە بیست و چوار سەعات لە مەیخانەکانـدان و بـەبێ هـیچ دوودڵییـەک رەنجـی شـانی هـەزاران کەسـی رەنجـدەر و بێچـارە دەخۆن...ئەو کەسانە دەیانەوێت زانست بۆ ئەوە بەکاربهێنن کە ماڵ و کیسەی میللەتی بێچارە و بێ تاوانی پـێ بۆخۆیـان تـاڵان بکەن...کەسانێکیشـم بینـی باسی پێشکەوتنخوازی دەکەن و خەڵک بە مێروو و سیسرک ناو دەبەن پێیـان سووک نییە قسە لەگەڵ حەماڵێکی نەتەوەی خۆیاندا بکەن. ئەوان پێیان وایە نکـووڵیکردن لـە نەریتـە نەتەوەییـەکان و سـووکایەتیکردن بـە هاونـەژادەکانی خۆیان، نیشانەی گەشەسەندن و پێشکەوتنخوزازییە"** ( گوێڵداش، ٢٠١١، ل١٤٨-١٤٩).

ئەم چەند دێرەی رابردوو ئەوە دەسەلمێنن مەمدوح سەلیم توانیبووی درک بـەو هەموو ئیشکالییاتانە بکـات کـە لـەناو کۆمەڵگـەی کـوردەواری و چـین و تـوێژە جیاوازەکاندا هەبوون و رۆڵیان هـەبووە لـە دروسـتکردنی بەربەسـت لـە بـەردەم هـەنگاونان بـۆ وەرگرتنـی شارسـتانێتی و هۆکارەکـانی پێشـکەوتن. لـە هـەمان کاتیشدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە ناوبراو لە نێـوان ئـەو دوو ئاراسـتەیەی کـە ئاماژەی پێدابوو، لەسەر هێڵێکی تایبەت بە خۆی کە جۆرێک لە میانڕەوی تێـدا بەدی دەکرێت، هەنگاوەکانی خۆی هەڵێناوە.

مەمــدوح ســەلیم لــە نووســینەکانیدا کرێکــارانی کوردیشــی فــەرامۆش نـەکردووە. لـە ژمـارە (٢٥)ی گۆڤـاری (ژین)دا بابـەتێکی نزیکـەی دوو لاپـەڕەیی بەناوونیشــانی باســێکی نەتــەوەیی-کۆمەڵایــەتی: کرێکــارانی کــورد لــە ئەستانبۆڵ ( (ملي اجتماعي مباحث: استانبولندە کورد عملەسی)) بـۆ قسـەکردن لەبارەی کرێکارانی کورد لە ئەسـتانە تـەرخان کـردووە. شـایانی باسـە کـە ئـەم بابەتە بە واژۆی (م. س) بڵاو کراوەتەوە (م.س، "ژین"، استانبول، عدد (٢٥)، ٢ تشرین اول ١٣٣٥، ص١-٣)، پێمان وایـە دەبـێ ئەمـە واژۆی مەمـدوح سـەلیم بێـت کـە بـە کورتکراوەیی ناوی خـۆی و بـاوکی تۆمـارکردووە. هـەروەها نـاوبراو لـەو کاتـەدا بەرێوەبـەری بەرپرسـی گۆڤارەکـە بـووە و بابەتەکـەش لـە لاپـەڕەی یەکـەم و دووەمدا بڵاوکراوەتەوە، بۆیە دیسان ئەمە ئەو رایەمان پتەو دەکات کە بابەتەکە هی مەمدوح سەلیمە.

بۆنە نەتەوەییەکانیش لە نووسینەکانی مەمدوح سەلیمدا جێی خۆیان کردۆتەوە، ئەوەتا لە دوو بابەتی جیاوازدا، کە یەکەمیان بەناونیشانی پرسی دیاریکردنی رۆژە تایبەتەکان ((ایام مخصوصە مزی تثبیت مسئلەسی)) (سلیم بکی، ژین " گۆڤار"، استانبول، عدد (١٦)، ١٠نیسان١٣٣٥، ص٥-٨) و دووەمیشیان بەناونیشانی رۆژی کاوەی تایبەتی ٣١ی ئاب ((کاوه یوم مخصوصی–٣١ تاباخ (اغستوس) )) (سلیم بکی، "ژین"گۆڤار، استانبول ، عدد (٢٥)، ٢تشرین اول ١٣٣٥، ص٣-٤) مەمدوح سەلیم تیشکی خستۆتە سەر ئەم پرسە. تەنانەت لە دیاریکردنی رۆژی (٣١)ی ئاب بە رۆژی نەتەوەیی کاوە، نەوەک ٢١ی ئادار کە بە (نەورۆز)ی سەری ساڵ ناسراوە، لەگەڵ نووسەرێکی تری ژیندا کە هەمان پرسی وروژاندووە (بدلیسی، ژین "گۆڤار"، استانبول، عدد (١)، ٧تشرین اول١٣٣٥، ص٧–١١)، ئەوەمان پێ دەڵێن کە دەکرێ قسەی زیاتر لەسەر ئەم رۆژانە بکرێت و لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە ئەنجام بدرێت. لە بەشێکی نووسینەکەیدا لە بارەی پێویستی دیاریکردنی رۆژ و بۆنە تایبەتییەکان نووسیویەتی: **"ئێمە گوتمان ژیاندنەوەی رۆژە تایبەتەکان هەقی مەیە و وەزیفەی ئێمەیە، ئەو هەقەی کە مێژوو بە ئێمەی داوە، بۆ ئەوەی ئێمە لەم مافە مەفاداربین و ئەو وەزیفە پێکبێنین، پێویستە کە رۆژە تایبەتییە جۆر بەجۆرەکانمان دیار بکرێن"**، هەروەها لە شوێنێکی تریشدا باسی گەورەیی رۆژی تایبەتی کاوە (٣١ی ئاب) دەکات و نووسیویەتی:" **شوێنێکی بزاڤی کاوە لە دژی دەهاک، لەدیرۆکی کورداندا ئەوەندە مەزنە کە ناکرێ واز لە دووبارەکردنەوەی بێنین،...کاوە لە دژی دەهاکی زاڵمدا، کە یەکێک لە زاڵمە گەورەکانی جیهان بووە، رێچکەیەکی شارستانی مێرخاسی کێشاوە کە هەموو نەوەکانی داهاتوو پەسنی دەکەن**" (بۆزئارسلان، "رۆژنامەڤانی"گۆڤار، هەولێر، ژمارە (٦-٧)، پایز-زستانی٢٠٠١-٢٠٠٢، ل٢٤٢-٢٤٥). شایانی باسە هەر لە بابەتی (رۆژی تایبەتی کاوە ...)دا، مەمدوح سەلیم ئاماژەی بە سازدانی ئاهەنگێک کردووە لەژێر سەرپەرشتی کۆمەڵەی کورد بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاری و وەشانان ( (کورد تعمیم معارف و نشریات جمعیتی))[٣٠] بەرێوە چووە و خەڵکێکی زۆریش ئامادە بوونە (سلیم بکی، ژین "گۆڤار"، استانبول، عدد (٢٥)، ٢تشرین اول١٣٣٥، ص٤).

مەمدوح سەلیم بەتەنگ ئەوەوە بووە پڕوپاگەندە و هەواڵی نادروستی ناو ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە ڕاست بکاتەوە. لەم ڕووەوە درێخی نەکردووە و بە پشتبەستن بە بەڵگە و خستنەڕووی ڕاستییە مێژووییەکان، قسەی خۆی هەبووە. لە بابەتێکیدا کە لە گۆڤاری (کوردستان)ی ئەستانە و بەناونیشانی (تیشک خستنە سەر ڕاستییەک) [31] بڵاوی کردۆتەوە، تیایدا ڕەخنەی توندی لە نووسەری وتارێک گرتووە کە لە یەکێک لە گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە بەناوی (علمدار)ەوە بڵاوکرابۆوە، لە وتارەکەیدا باسی کوشت و کوشتاری ئەرمەنەکان کرابوو، بەجۆرێک سەبارەت بە کورد و شاری (وان) ڕاستییە مێژووییەکان شێوێنرابوون. مەمدوح سەلیم لە بەشێکی وتارەکەیدا نووسیویەتی:"... **ئەگەر مەسەلەکە خەسڵەتی شەخسی بێ، یان لەبەر ئاوات و ئامانجی میللی بێ، پەروەراندنی هەستی دوژمنانە بەرامبەر کەسێک یان میللەتێک، لە بۆشایی دەروونی ئێمەدا جێی نابێتەوە. هەروەها لە تاوانبارکردن، یان سەرکوێرکردنی چەند کەسێک یان کۆمەڵێک، کە لە هەر سوود و قازانجێکی ڕەوشتی و مرۆڤدۆستی بەدوورن هەرگیز خۆشنوود و کەیفخۆش نابین. هەر هەوڵێکی میللەتپەروەرانەش کە لە دەستمان بێ دەیدەین. تەنها لە ڕێگەی خزمەتکردن بەڕاستی و مرۆڤدۆستیدا دەبێ...با گشت لایەک لەمە دڵنیابن**" (سلیم بەگی، کوردستان "گۆڤار"، استانبول، ژمارە (٨)، ٢٩ی مایسی ١٣٣٥).

بەرهەم و شاکاری زانا و شاعیرانیش لە نووسینەکانی مەمدوح سەلیمدا گرنگییان پێدراوە. ئەوەتا بە بۆنەی لەچاپدانی (مەم و زین)ی شاکاری گەورەی ئەحمەدی خانی (١٦٥٠-١٧٠٧)، بابەتێکی تری بەناوونیشانی (( (مم و زین)ك طبعي مناسبتيله)) بڵاوکردۆتەوە. تیایدا ئاماژە بە گرنگیی ئەم هەنگاوەی (کۆمەڵەی کورد بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاری و وەشانان) دەکات کە بەم کارە هەستاوە (سلیم بکی، ژین "گۆڤار"، استانبول، عدد (١٦)، ١٠نیسان١٣٣٥، ص٤). لە بابەتێکی تریشیدا، کە هەر لە گۆڤاری (ژین)دا و بەناونیشانی گفتوگۆیەک لە یانەیەکی کوردی ((کورد قلوبندە بر مصاحبە)) بڵاوی کردۆتەوە ( (سلیم بکی، ژین "گۆڤار"، استانبول،، عدد (٢١)، ١٨حوزیران ١٣٣٥، ص٦-٧)، مەمدوح سەلیم لەسەر زاری یەکێک لەو ئەندامانەی لە کۆنفرانسێکدا کە لە بارەگای (کۆمەڵەی تەعالی کوردستان) سازکرابوو و

تیشکی خستۆتە سەر دامەزراندنی (کۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی کورد)[٣٢] و (کۆمەڵەی کورد بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاری و وەشانان) و (کۆمەڵەی هێڤی)، کە لەدوای کودەتاکەی ئیتیحاد و تەرەقی لە (٢٣ی تەموزی ١٩٠٨) دامەزران. ئینجا دێتە سەر باسی (شەریف پاشا)[٣٣] و نوێنەرایەتیکردنی ئەم کەسایەتییە لە بری کورد لە کۆنفرانسی ئاشتیی پاریس (١٩١٩) و پێدانی یاداشتی تایبەت بە داواکارییەکانی کورد بە وڵاتە زلهێزەکان. هەروەها لەم بابەتەیدا، مەمدوح سەلیم بە وردی شرۆڤەی قسەکانی ئەو ئەندامەی پێشوو دەکات و تیایدا تێبینیی خۆی و سەرنجەکانی دەردەبڕێت. لێرەدا جەخت لەسەر داننان بە مافەکانی کورد بەپێی بنەماکانی (وێڵسن) دەکاتەوە و لە بەشێکی قسەکانی خۆیدا نووسیویەتی: "...**مادام نەتەوەی کورد توانیویە تا رۆژی ئەمڕۆ پایەدار بێت و بە داب و نەریت و زمانی خۆیەوە بمێنێتەوە، ئیتر پێویستی بەوە دەکرد بوترێت: (بەڵێ) نەتەوەی کوردیش**" (گوێڵداش، ٢٠١١، ل٤٧٣). هەر لەدرێژەی قسەکانیدا، مەمدوح سەلیم پرسێکی گرنگی تری وروژاندووە، ئەویش پرسی راگواستنی کوردەکانە، کە لەلایەن تورکە ئیتیحادییەکانەوە راگوێزرابوون. لەم رووەوە ئەو رەخنە لە دەسەڵاتدارانی عوسمانی دەگرێت کە نەیتوانیوە ئەم گرفتە چارەسەر بکات و کوردەکان بۆ زێدی خۆیان بگوازێتەوە (گوێڵداش، ٢٠١١، ل٤٧٤).

شایانی باسە، لە ساڵی (١٩٢٥)دا مەمدوح سەلیم چووبووە بەغدا و ماوەیەک لەم شارەدا بەمیوانی لەلای (د. شوکری محەمەد سەگبان) مابۆوە. لەو ماوەیەدا دوو بابەتی لە گۆڤاری (دیاری کوردستان) بڵاو کردەوە. یەکەمیان بەناوونیشانی (راستکردنەوەیەک بە ئامادەبوونی مێژوو) بوو کە بەئیمزای (کورد وانی) بڵاوی کردبۆوە (کورد وانی، دیاری کوردستان"گۆڤار"، بەغدا، ژ(٩)، ١٩٢٥، ل٤٠-٤٣)، لێرەدا دیسان ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە ئەم کەسایەتییە کەمتەرخەمی نەکردووە بۆ بەدواداچوونی ئەو پرسانەی کە بە نادروستی لە رۆژنامەکاندا وروژێندرابوون. ئەو بابەتەی لە بنەڕەتدا وەڵامدانەوەیەک بوو بۆ ئەو بابەتەی لە گۆڤاری (نیر ئیست) بڵاوکرابۆوە و تیایدا کۆمەڵەی (هێڤی) و (رۆژی کورد)یان بە ئامرازی دەستی عوسمانییەکان ناوزەد کردبوو. وەکو پێشتر

ئاماژەمان پێدابوو، لە وتارەکەیدا مەمدوح سەلیم ئەو تۆمەتانە رەتدەکاتەوە و مامەڵەی خراپی تورکە ئیتیحادییەکان بەرامبەر بە بەرپرسانی (هێڤی) و (رۆژی کورد) دەکاتە بەڵگەی حاشا هەڵنەگر لەسەر ئەستۆپاکییان. هەروەها کاریگەری و شوێنەواری بیر و بۆچوونەکانی (هێڤی) بەسەر کۆمەڵە و رێکخراوە کوردییەکانی دواتر دەکاتە بەڵگە بۆ پشت ئەستوورکردنی قسەکانی. لە بارەی (رۆژی کورد)یشەوە نووسیویەتی: "...**نووسینەکانی رۆژی کورد زۆر دیار و ئاشکران و هانی کورد دەدەن وەک هەموو میللەتانی دیکەی جیهان بەرەو سەرکەوتن و بەرزی بڕوات. رۆژی کورد لە رووی خۆبەستنەوە بە بیروڕای بیانییەوە، تا ئێستا پیتێکی نەنووسیوە، پێویستە زۆر بە ئینسافەوە بیر بکەینەوە کە رۆژی کورد لە هەرە مرۆ تۆقێنترین رۆژانی حوکمی حکومەتی پێشوودا یەک چرکە دوودڵ نەبووە و بوێری و ئازایەتییەکی پیشان داوە کە یەزدان پەسندی کردوون**" (مالمیسانژ، ٢٠٠٨، ل٤٣٠-٤٣٩). دووەم بابەتی مەمدوح سەلیم کە لە گۆڤارەکە بڵاوکراوەتەوە ناوونیشانی لە پێویستییەکانی ژیانمان: مێژووی نەتەوەیی-جوگرافیای نەتەوەیی"**حیاتی احتیاجلر مزدن: ملي تاريخ- ملي جوغرافيا**"ی هەڵگرتووە (کورد وانی، دیاری کوردستان"گۆڤار"، بەغدا، ژ٩، ١٩٢٥، ل٢٥-٣٢).

چالاکییەکانی مەمدوح سەلیم لەبارەی کاری رۆژنامەگەری لەنێوان ساڵی (١٩٢٥) تاکو ساڵی (١٩٣٢)، واتە تاکو بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (هاوار)، لەبەرچاوان ون دەبن. ئەوەبوو ئەمجارەیان لە بەرگێکی شاعیرانەدا بەدیارکەوتەوە، ئەوکاتەی سێ بابەتی شیعریی خۆی لەسەر شێوەی عەرووزی عەرەبی لە گۆڤارەکە بڵاوکردەوە (زەنگەنە، "رۆژنامەڤانی"گۆڤار، هەولێر، ژمارە (٥)، ٢٠٠١، ل٢٣٤). بابەتی یەکەمی بەناوونیشانی (بکاء و بکاء و بکاء) بوو بە واژۆی (الوانی) بڵاوکردۆتەوە. شایانی باسە ئەم بابەتە شیعرییەی مەمدوح سەلیم لەشێوەی (لاواندنەوە)و بۆ کەسێک هۆنراوەتەوە کە بە (شەوقی) ناوی دەبات. پێمان وایە دەبێ ئەمەیان بە بۆنەی کۆچی دواییکردنی ئەحمەد شەوقی (١٨٦٨-١٩٣٢) شاعیرەوە هۆنرابێتەوە. بەڵگەشمان لەم بارەوە بریتییە لەوەی کە هەر لەم ساڵەدا ئەحمەد شەوقی کۆچی دوایی کردووە. هەروەها لە

ناوەڕۆکی دێڕێکی شیعرەکەیدا بەڕوونی ئاماژە بەوە دەکات کە ناوبراو بۆ هەمیشە"**میری شیعر** "ە لە ڕۆژهەڵاتدا، وەکو دەزانین ئەحمەد شەوقی بە (میری شاعیران) ناسراوە. ئەمە جگە لەوەی لە ناوەڕۆکی دێڕێکی تردا ئاماژە بەوە دەکات کە ناوبراو، واتا شەوقی، بە نەژاد کوردە و ئەمەشی لە باوکی خۆیەوە گوێبیست بووە. ئەمەی خوارەوە نموونەی چەند دێڕێکی هۆنراوەکەیە:

"**ئەوەم لەبیر نەچووە کە باسی ژیانی خۆت دەکرد**

**شانازیت بە نەژادی بەرزی خۆت دەکرد**

**بەگوێی خۆم لە باوکم بیست کە دەیگوت**

**بنەچەم کوردە و لەناو عارەبان پێگەیشتووم...**"

هەروەها دەڵێ:

"**لەسەرخۆبە شەوقی کەفتەکار مەبە**

**بنوو ئازیزم خاترجەم و بەختەوەر**

**وا لەسەر چۆکن شێرانێک بۆ نیشتمان**

**بە چرنووکەکانیان ئاسکە کێوییان بەرزکردۆتەوە...**" (الوانی، هاوار" گۆڤار"، دمشق، ژ(١٣)، کانون الاول ١٩٣٢، ص ٦).

دووەم بابەتی شیعریی مەمدوح سەلیم کە لە گۆڤاری (هاوار)دا بڵاوبۆتەوە، بابەتێکی نیشتمان پەروەرییە و بەناونیشانی (حب الوطن من الايمان)ە. لە بەشێکیدا ڕووی گلەیی کردۆتە هاونەژادەکانی خۆیی و نووسیویەتی:

"**میللەتان هەمووی بوونەتە خاوەن وڵاتی خۆیان**

**لەنێو جیهانیان، کەچی ئێوە فریا نەکەوتن**

**نە وڵاتتان هەیە و نە نەتەوە**

**لەنێو میللەتان نەناسراون و هەڵنەکشان**

**خوا دەزانێت ئێوە شێری مەیدانن**

**بەڵام ئێوە زمانی لۆژیکتان نییە...**

**نەزانی کوێری کردوون و پەرتەوازەی کردوون**

**هەر بۆیەش زۆربەتان نەدار و مەراییکارن**

**کورد لە خاکی جەزیرە زۆربەیان**

**ریسواکار و دوژمنی یەکترن و پەرتەوازەن**
**لە خاکی تورکان و لە باشووریشدا هەر وان**
**هەردەم قەلەڕەشی ناکۆکیی دەقیرێنێ**
**هەرچی لێرەشە لە صالحییەی (جلق)**
**ئیرەیی و رق و ئینجا نەزانیی باڵی کێشاوە..."** (الکردي الواني، هاوار" گۆڤار"، دمشق، ژ(١٧)، ادار١٩٣٣، ل٤)

سێیەم بابەتی شیعریی مەمدوح سەلیم بە ناونیشانی (الطیر والوتر والشعر)ە، کە تیادا رەخنە لە هاونەژادەکانی خۆی دەگرێت لەسەر ئەوەی دەست بە زانستەوە ناگرن و ناکۆکی و ئیرەیییان لە نێواندا بڵاوبۆتەوە، ئەو نووسیویەتی:

**"پەیمانم پێبدە پەیمانی ئازادیخوازانە قەرزە**
**لەسەری دەقەکانیش لەسەر ئەمە کۆکن...**
**بە زانست ئینجا هونەر و پێشکەوتن**
**بە دڵکاری و کۆششکردن لە هەموو شوێنێک**
**هەرچی کەسی خاو و تەمەڵە و ئەندامێکی**
**پەککەوتووە بە بەسەرچوونی رۆژگار باش دەبێت**
**دەسا گوێ بگرە ئەی تاکی کورد گوێ بگرە**
**لە قسەیەک وەک شمشێرە لە زەبر و زەنگی**
**ئەگەر بەرەو فێربوون و زانست هەنگاو نەنێی**
**دەڵێین یاخوا داڕزێ دەستەکانت دەستەکانت داڕزێ"** (الکردي الواني، هاوار" گۆڤار "، دمشق، ژ(٢٠)، ١٩٣٣، ل١٣).

لێرە بەدواوە نووسینی وتار و بابەتەکانی مەمدوح سەلیم تاکو کۆچی دواییکردنیشی چیتر بە بەرچاوان ناکەون. هەرچەندە ئاماژایەک هەیە لەبارەی ئەوەی کە مەمدوح سەلیم لە ساڵی (١٩٣٨)دا وتاری بەزمانی فرەنسی لەبارەی کورد بڵاو کردبێتەوە (عوبێد، رۆژنامەڤانی"گۆڤار"، ژ(٣)، کانونی یەکەمی ٢٠٠٠، ل٢٠٤)، بەڵام تا ئێستا ئەمە ساغ نەبۆتەوە. هەروەها مێژوونووسێکی تریش باسی ئەوەی کردووە کە مەمدوح سەلیم لە سووریادا **"ژمارەیەک کار و چالاکی فیکری**

**و ئەدەبی و سیاسی ئەنجامداوە و وتارەکانیشی لە گۆڤاری (المعرفة)ی زمانحاڵی مامۆستایانی سوریا بڵاوکردەوە**" (الصویرکی، ٢٠٠٥، ص٧٢٥)، بەڵام هیچ ئاماژەیەکی بە بابەت و ژمارەی گۆڤارەکە و ساڵەکەی نەکردووە. جێی باسە، بەپێی ئەو زانیارییانەی لەبەردەستاندان، ئاماژە هەیە لەبارەی هاوکاریکردنی مادییانەی گۆڤاری (هاوار) لەلایەن مەمدوح سەلیم و کەسانی ترەوە. لەم رووەوە گۆڤارەکە لە ژمارەیەکیدا وتارێکی بڵاوکردۆتەوە. لە وتارەکەدا سوپاسی ئەو کەسانە کراوە کە بە پارە هاوکاریی گۆڤارەکەیان کردووە، هاوکات لیستێک بەناوی ئەو کەسانە و بڕی پارە بەخشراوەکانیش خراوەتە روو. وەکو بەدیار دەکەوێ لە لیستەکەدا ناوی مەمدوح سەلیم لە ریزبەندی بیستەمدا و بە بەخشینی (١٠) لیرەی سووری، بەرچاو دەکەوێت(Hawar , Hejmar 43 , 1942 ,R8 ؛ میرانی، ٢٠٠٩، ص٢٧-٢٨). هاوکات لە دەستنووسێکی دەفتەرەکەی جەلادەت بەدرخاندا، کە لەلایەن (رەوشەن خانم)ی خێزانییەوە بە توێژەرێک درابوو، ناوی ئابۆنەدارەکانی گۆڤاری هاوار خراوەتە روو. لێرەدا ناوی مەمدوح سەلیم وەکو تەنها کەسێکی دانیشتووی (دەرعا) کە هاوکاری گۆڤارەکەی کردبێت، بە بەرچاوان دەکەوێ (زەنگی، "رۆژنامەڤانی"گۆڤار، هەولێر، ژ(٥)، هاوینی٢٠٠١ ، ل٣٣٤).

زانیارییەکان لەبارەی مەمدوح سەلیم، لە چلەکان، پەنجاکان و شەستەکان، دەگمەنن. عیزەدین مستەفا رەسوڵ لە یادداشتەکانی خۆیدا باسی لەوە کردووە کاتێک لەنێوان ساڵانی (١٩٥٦-١٩٥٨) لە شام بووە، بەرنامەیەکیان بۆ بەشە کوردییەکەی ئێستگەی قاهیرەی سەر بە (کۆماری عەرەبی یەکگرتوو) ئامادە کردبوو. بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیشیان لە بەرنامەکەیاندا، سوودیان لە مەمدوح سەلیم و چەند کەسێکی تر بینیبوو. تاکو دواتر شریتێکی باشی بۆ رادیۆی بەغدا تۆمار کردبوو، کە دەنگی مەمدوح سەلیم و زۆربەی کوردە ناسراوەکانی ئەو کاتەی دانیشتووی شامی تێدابووە (رەسوڵ، ٢٠٠٦، ل١٨٢-١٨٣). هەروەها لە یەکێک لە ئاهەنگەکانی جەژنی (نەورۆز)دا کە (کۆمەڵەی قوتابیانی کورد لە زانکۆی دیمەشق) لە (٢١ی ئاداری ١٩٥٨) لە یەکێک لە چاپخانەکانی شام سازی کردبوو، مەمدوح سەلیم و چەند کەسایەتییەکی تری شارەکە ئامادەی ئاهەنگەکە ببوون (میراني، ٢٠٠٩، ص٢٧-٢٨).

مەمدوح سەلیم گرنگیی زۆری بە کتێب و کتێبخانە دابوو. ئەو کەسانەی کە کەم تا زۆر مەمدوح سەلیمیان بینیوە و سەریان لە کتێبخانەکەی داوە، گەواهی لەسەر ئەمە دەدەن. مێژوونووس و رۆژهەڵاتناسی هۆڵەندی (مارتن ڤان برۆنسن) باسی ئەوەی کردووە کە لە ساڵی (١٩٥٥)دا، ئەو کاتەی لە شام میوانی جەلادەت بەدرخان بووە، مەمدوح سەلیمی ناسیوە، لە ماڵەکەیدا کتێبخانەیەکی گەورە و ئاوەدانی بینیوە. نووسەرێکی تریش کە مەمدوح سەلیمی لە پێش کۆچی دواییکردنی بینیبوو، باسی ئەوەی کردووە کە مەمدوح سەلیم کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی هەبووە. بەهۆی خراپیی گوزەرانییەوە ناچاربووە بۆ فرۆشتنی بیخاتە روو (آلاكوم، ٢٠٠٠، ص١٢٣ (الهامش رقم ١٠)، ص ١٢٧ الهامش رقم(٧٠)). مێژوونووسی کورد کەمال مەزهەر، ئەمیش باسی ئەوەی کردووە کە بۆ نووسینی کتێبی (كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى) سوودی لەو زانیارییانە وەرگرتووە کە مەمدوح سەلیم و ژمارەیەکی تر لەوانەی ئاگاداری رووداوە گەرمەکانی چەند دەیەیەکی سەدەی بیست بوون، پێی داون(احمد، ١٩٨٤، ص١٤). وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، کاتی خۆی لە ساڵی (١٩٧١)دا مەسعود محەمەد، مەمدوح سەلیمی بینیبوو. لە یاداشتەکانیدا باسی ئەوەی کردووە کە مەمدوح سەلیم بەزۆری لە کتێبخانەکەی رادەبوارد. لێرەدا هەرچی شتێکی باسی کوردی تێدا بووبێ و دەستی کەوتبێ پارێزراو بوو. لە بارەیەوە نووسیویەتی: "**.... بە پەرۆشەوە دەیگوت کە مردم ئەو هەموو سەرچاوانەی بە خوێنی دڵ پەیدام کردوون پەرت و بڵاو دەبن**". بەڵام وەکو باسمان کرد، هەوڵەکانی مەسعود محەمەد لە پێناو کڕینی کتێبخانەکەی مەمدوح سەلیم لەلایەن کۆڕی زانیاری کوردەوە، بێ ئەنجام بوو. لە دوای مردنیشی، وەکو دەڵێ:"...**کتێبەکانی بوونە قاوت و رەشەبا**" ( محەمەد، ٢٠٠٩، ل٤٥٨). هەروەها کاتی خۆی بە مەبەستی دامەزراندنی کتێبخانەیەکی تایبەت بە (کۆڕی زانیاری کورد)، توانرابوو سوود لە کتێبخانەکەی مەمدوح سەلیم و کەسانی تر ببینرێت (مەزهەر، کۆڕی زانیاری کورد"گۆڤار"، بەغدا، بەرگی یەکەم/بەشی یەکەم، ١٩٧٣، ل٣٤١-٣٤٢). بەپێی بەڵگەنامەیەکیش کە مێژووی (١٩٧٢/١/٥)ی لەسەر تۆمارکراوە، بریتییە لە دەقی نامەیەکی سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد بۆ رەوشەن خانمی

کچـی جـەلادەت نێـردراوە، کـە ئەوکاتـە ئـەرکی کۆکردنـەوەی کتێـب و دەستنووسـەکانی بـۆ کـۆڕ پـێ سـپێردرابوو، تیایـدا ئاگـاداری ئەمـەی دواییـی کراوەتەوە لەبارەی سەردانیکردنی (کەمال مەزهەر)ی ئەمینداری گشـتی کـۆڕ بـۆ شـام لـە کۆتاییـەکانی مـانگی کـانوونی دووەمـدا، بـۆ مەبەسـتی وەرگرتنـی کتێبخانەکەی مەمـدوح سـەلیم و گواسـتنەوەی بـۆ بەغـدا (بدرخان، ٢٠٠٩، ص٢٦٤)، بەڵام وا دیارە ئەمە رووی نەداوە. هـەروەها نووسـەر و مامۆسـتایەکی زانکـۆ لـە سـاڵی (١٩٨٠) سـەردانی ماڵەکـەیانی کردبـوو، لـە یاداشـتەکانیدا نووسیویەتی:"**دەمزانی کە کتێبخانەیەکی باشی هەیە...بەڵام بەداخەوە زۆربەی کتێبخانە و نامە و دەستنووسەکانی مەمدوح سەلیم لەلایەن پارتەکانی باکووری کوردستان دەستی بەسەردا گیرابوو**" ( حەیدەری، ٢٠١٣، ل٢١٤).

دەکـرێ بڵێـین کـە پـەردە هـەڵماڵین لەسـەر نهێنییـەکانی ژیـانی ئـەم کەسایەتییە هەوڵی زیاتری پێویستە. هەروەها سەرنەکەوتنی هەوڵـەکانی کـۆڕی زانیاری کورد لە وەرگرتنـی کتێبخانەکـەی مەمـدوح سـەلیم، بووە هـۆی ئـەوەی زەخیرەیەکی گەورەی زانیاری لەسەر ئەم کەسایەتییە و کتێب و دەستنووسێکی زۆریش بفەوتێن. بێ گومان ئەمـەش بۆتـە هـۆی ئـەوەی خوێنـەران و تـوێژەران لێی بەهرەمەند نەبن.

لە کۆتاییدا ئەوە ماوە بڵێین کـە کەسـانێک لەوانـەی کـاتی خـۆی قوتـابی مەمدوح سەلیم بوون، وەکو کەسانی بیریار و زانـا لـە تورکیـادا پێگەیشـتن، لـە باسـی نـاوبراودا زۆر بـە ستایشـەوە وەسـفی دەکـەن. یـەکێک لەوانـە بـەناوی (جەمیل مەریج) گوتوویەتی:"مەمدوح سەلیم مەکتەبلییەکی بە ئـەورووپاییی بـوو ئاشـقە مەشـرووتەی دووەمە...فەرەنسـی و ئەرمـەنییانیی دەزانـی، کوردیشـی دەزانی...پیـاوێکی زۆر روختـە سـەختەگیر و جیـددی بـوو، لەسـەر ئـەوەی جارێکیان مەرەکەبم بەسەر دەفتـەری ئینشـاکەمدا رشـتبوو، زۆری لـە نمرەکـانم داشکاندبوو، خۆشی لەپشـت سـاردی و کەمتەرخـەمی نـەدەهات، لەمـەڕ رێـک و راستیی دێڕان و وردەکاریی خۆشنووس، خۆ رەنگ نەبوو هەڵەیـەکی چکۆڵـەمان کردبا، لەسەر ئەوان شتان قوتابی پێ سەرکۆنە دەکرد و زۆریـش لـەو شـتانەدا سـەختگیر بـوو". قوتابییـەکی تریشـی بەناوی (کـەمال سـوێلکەر) لـە بارەیـەوە

دەڵێ:"**مەمدوح سەلیم، مامۆستای ئەدەبیات، پیاوێکی سەختگیر و جیددی مەزەب، فراوانبین و بەکار بوو**" (زەنگەنە، رۆژنامەڤانی"گۆڤار"، ژمارە (٦-٧)، پایز-زستانی ٢٠٠١-٢٠٠٢، ل١٨٦-١٨٧). ئەمانەش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن کە سەرەڕای هەموو ئەو نەهامەتییانەی مەمدوح سەلیم دووچاریان هاتبوو، کەچی لە ژیانی خۆیدا کەسێکی پێداگر و جیددی بووە و بەردەوام هەوڵی راستکردنەوەی ئەو زانیارییانەی داوە کە بە هەڵە یان ئەنقەست شێوێنرابوون. لەم رووەوە وتار و بابەتەکانی کە لە گۆڤارەکاندا بڵاوی دەکردنەوە ئامرازێکی کاریگەر بوون بە دەستییەوە.

## ئەنجام

لە کۆتایی نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشتین:

١- هەر چەندە بیروڕاکان سەبارەت بە رۆڵی مەمدوح سەلیم لە دامەزراندنی کۆمەڵەی (هێڤی) و بڵاوکردنەوەی وتار و بابەتەکانی لە گۆڤاری (رۆژی کورد) جیاوازن، کەچی گەیشتینە ئەوەی کە ناوبراو یەکێک بووبێت لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری هێڤی، وەکو بەرپرسی کارگێڕیی بەشی تورکی لە (رۆژی کورد)یشدا کاری کردووە، بەبێ ئەوەی هیچ بابەتێکی تیادا بڵاوبکاتەوە.

٢- وەکو زۆربەی سەرکردە و کەسایەتییەکانی تر، لەگەڵ بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهان، زانیارییەکان سەبارەت بە مەمدوح سەلیم کەمتر و بگرە دەگمەن دەبن، ئەمەش بەهۆی پەیوەندی کردنیانەوە بوو بە ریزەکانی سوپاوە. بەتایبەت کە بەرپابوونی جەنگەکە بووە هۆی راگرتنی کار و چالاکی کۆمەڵە و رێکخراوە کوردییەکان و ئۆرگانە رۆژنامەوانییەکانیان.

٣- لەگەڵ بەکۆتاییهاتنی جەنگ و دامەزراندنی کۆمەڵە و رێکخراوە سیاسی و کولتوورییە کوردییەکان، وەکو (کۆمەڵەی تەعالی کوردستان) و (تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کورد) و ئەوانی تر، جارێکی تر مەمدوح سەلیم وەکو ئەندامی کارا و یەکێک لە دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵە و رێکخراوانە و بەڕێوەبردن و بڵاوکردنەوەی بابەتەکانی خۆی لە ئۆرگانە رۆژنامەوانییەکانی ئەو ماوەیە، وەکو (ژین) و (کوردستان) و (دیاری لاوان)، رۆڵی کارا و بەرچاوی خۆی بینی.

٤- دوای دامەزرانی کۆماری تورکیا و پیادەکردنی سیاسەتێکی شۆڤینییانە لەلایەن دەسەڵاتدارانی دەوڵەتە تازەکەوە، مەمدوح سەلیم هاوتای ژمارەیەکی بەرچاو لە سەرکردەکانی تری کورد، پەناهەندەی سوریا بوون. لێرەوە قۆناغێکی تری خەباتی سیاسی و بزاڤی رۆشنبیری لە ژیانی ئەم کەسایەتییە دەستی پێکرد. دامەزراندنی کۆمەڵەی (خۆیبوون) و بەشداریکردن لە راپەڕینی (ئاگری) و بڵاوکردنەوەی بابەتەکانی لە گۆڤاری (هاوار) جارێکی تر رۆڵی ئەم کەسایەتییەمان لە بزاڤی سیاسی و رۆشنبیریی کوردی ئەو ماوەیە بۆ دەسەلمێنن.

٥- هەرچەندە زانیارییەکان لەبارەی ئەم کەسایەتییە کەمن، کەچی بۆمان بەدیارکەوت کە ئەوانەی مەمدوح سەلیمیان بینیبوو، وەکو کەسێکی رۆشنبیر و کەسایەتییەکی سیاسیی خۆڕاگر لەسەر بیروباوەڕەکانی، وەسفی دەکەن. وەکو ئەوەی کە هەمیشە لە پێناو یەکڕیزیی ناو کۆمەڵە و رێکخراوە کوردییەکان هەوڵەکانی خۆی تەرخان کردبوو.

٦- بەردەوامبوونی ناکۆکی و ململانێکانی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەی (خۆیبوون) و ئەو لێکترازانانەی لە ریزەکانیدا روویدا، بوونە هۆی دوورکەوتنەوەی مەمدوح سەلیم لە کاری سیاسی و رێکخراوەیی، بە تایبەت لەدوای هەڵوەشانەوەی (خۆیبوون) لە ساڵی (١٩٤٦)دا.

٧- سەربارى چەشتنی نەهامەتییەکانی ژیانی پەناهەندەیی و ئاوارەیی، مەمدوح سەلیم لە رووی سۆزداری و ژیانی کۆمەڵایەتیشەوە دەردەسەریی زۆری بینیوە، وەکو لەدەستدانی دەستگیرانەکەی و هاوسەرگیریکردنی لە تەمەنی پیریدا و نەبوونی منداڵ و...هتد.

٨- نەنووسینەوەی یادداشتەکانی خۆی، لەگەڵ فەرامۆشکردنی رۆڵی بەرچاوی ئەم کەسایەتییە لە یادداشتی ژمارەیەک لەو کەسایەتییانەی رۆژانێک لەگەڵ مەمدوح سەلیمدا لە ریزەکانی کۆمەڵە و رێکخراوە کوردییەکان کاریان دەکرد، ئەمانە بەسەریەکەوە بوونەتە هۆی ئەوەی زانیاری لەبارەی مەمدوح سەلیم دەگمەن بێت و زانیاری لە بارەی ساڵانێک لە ژیانی ئەم کەسایەتییە بەرجەستە نەبێت.

## پەراوێزەکان:

[١] لەڕاستیدا ساڵی لەدایکبوونی مەمدوح سەلیم لە سەرچاوەکاندا ڕای جیاوازی لەسەرە، بۆ نموونە بڕوانە: الاكوم، روهات، خويبون و ثورة اگری، مراجعة: شكور مصطفى، الطبعة الاولى، مطبعة اوفسيت هولير، اربيل، ١٩٩٩ ص٢٧؛ الصويركى، محمد علي ، معجم اعلام الكرد في التاريخ الاسلامي والعصر الحديث في كردستان و خارجها، مطبعة مؤسسة حمدي للطبع والنشر، السليمانية، ٢٠٠٥، ص٧٢٤ ؛ Konê ReŞ, Ji Stêrên Welatê Qedexe, çapxana Parêzgeha Duhokê, Duhok, 2014, R261؛

بەڵام دوای دەستکەوتنی بەڵگانامەیەک کە بریتی بوو لە گەواهینامەی پەناهەندەیی ناوبراو لە بەیروت و مێژووی ( ٢٧/٣/ ١٩٣٣)ی لەسەر تۆمار کراوە، تیایدا ساڵی لەدایکبوونی بە (١٨٩٣) تۆمارکراوە. هەر لەسەر ئەم بنەمایە پێمان وایە ئەم مێژووە لەوانەی تر دروستترە. وێنەی دەقاودەقی بەڵگەنامەکە لەلای (د.جمشید حەیدەری) پارێزراوە.

[٢] بڕوانە هەمان بەڵگەنامەی گەواهینامەی پەناهەندەیی مەمدوح سەلیم لە بەیروت.

[٣] کوڕی فوئاد بەگ کوڕی جەمیل پاشایە، لە ساڵی (١٨٩٢) لە ئامەد (دیار بەکر) لە دایک بووە، ناوی خواستراوی (زنار سلوپی)یە، چونکە باپیرانی لە سەردەمانێکی زووەوە لە ناوچەی سلۆپییەوە روویان کردبووە ئامەد. ناوبراو بە یەکێک لە پێشەنگانی بزاڤی رزگاریخوازی کورد دادەنرێت و رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە ژمارەیەک لەو کۆمەڵە و رێکخراوە کوردییانەی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا دامەزران. لە ساڵی (١٩٧٣) لە شام کۆچی دوایی کردووە. بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ژیانی ناوبراو، بڕوانە: (زنار سلوبي)، قدري جميل باشا، مسالة كردستان (٦٠ عاما من النضال المسلح للشعب الكردي ضد العبودية)، الطبعة الثانية، بيروت،١٩٩٧، ص٨ و مابعدها.

[٤] بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی کۆمەڵەی خۆیبوون و شۆڕشی ئاگری بڕوانە ئەم سەرچاوانە: روهات الاكوم، المصدر السابق ؛ کۆنێ ڕەش، جمعية خويبون ١٩٢٧ و وقائع ثورة آرارات ١٩٣٠، تقديم و مراجعة: عبدالفتاح البوتاني، الطبعة الاولى، مطبعة خەبات، دهوك، ٢٠٠٠.

[٥] کچی ساڵح بەدرخانە، لە (١١ی تەموزی ١٩٠٩) لە شاری (قەیساری) لەدایک بووە. ماوەیەک لە ئەستانبۆڵ و دواتریش لەگەڵ خێزانەکەیدا رووەکەنە شام. ناوبراو بڕوانامەی مامۆستایەتی لە (خانەی مامۆستایان) بەدەست هێناوە. ماوەیەک وەکو مامۆستا و بەڕێوەبەر کاری کردووە. لە ساڵی (١٩٣٤)دا لە (کۆمەڵەی یەکێتی ئافرەتانی سوریا) بۆتە ئەندام و لە چەند کۆڕ و کۆنفرانسێکدا بەشداری کردووە. لە ساڵی (١٩٣٥)دا بۆ جاری دووەمی شوو بە جەلادەت بەدرخان کردووە و دوو منداڵی بە ناوەکانی (سینەم) و (جمشید) لێ بووە. لە (١ی حوزەیرانی ١٩٩٢)دا لە شاری (بانیاس) کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەشی لە گۆڕستانی شێخ خالیدی لە شام

نێژراوە. چەند بەرهەمێکی چاپکراو و چاپنەکراوی لە پاش بەجێماوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: بدرخان، روشن، الاعمال الكاملة ١٩٠٩-٢٠٠٩)، مطبعة هيڤي، دهوك، ٢٠٠٩، ص٣٠-٣٧. مالميسانژ، بدرخانيو جزيرة بوتان و محاضر اجتماعات الجمعية العائلية البدرخانية، ترجمة: شكور مصطفى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ١٩٩٨، ص١٨١-١٩١.

[٦] کوڕی ئەمین عالی بەدرخانە، لە (٢٦ی نیسانی١٨٩٣) لە ئەستانە لەدایک بووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەو شارە تەواو کردووە. دواتر پەناهەندەی ئەڵمانیا دەبێت و درێژە بە خوێندن دەدات. لەساڵی (١٩٢٥) روو دەکاتە قاهیرە و پاشان بەرەو سووریا دەچێت و رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە دامەزراندنی کۆمەڵەی (خۆیبون) لە ساڵی (١٩٢٧)دا. دوای ئەوەش بەشداری لە راپەڕینی (ئاگری)دا کرد. پاشان دەستی بەچالاکیی رۆژنامەوانی کرد و دوو گۆڤاری بە ناوەکانی (هاوار) و (روناهی) دەرچوواند. لە (١٥ی تەمووزی ١٩٥١) لە شام کۆچی دوایی کرد. بڕوانە: مالمیسانژ، رۆژانە نووسینەکانی جەلادەت عالی بەدرخان١٩٢٢_١٩٢٥، وەرگێڕانی: ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠١٦، ٥_١٤ ؛ بەدرخان، جەلادەت عالی، لەبارەی کێشەی کوردەوە سەبارەت بە یاسای دوورخستنەوە و بڵاوەپێکردنی کوردان، وەرگێڕانی: زریان رۆژهەڵاتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٥_٦.

[٧] ناوی تەواوی (عەبدولقادر عەزیز جان)ە، لە ساڵی (١٩١١) لە شارۆچکەی (دریک) لە ماردین لەدایک بووە. لە هەڕەتی گەنجێتیدا روو لە پەناهەندەیی دەکات و لە سووریا نیشتەجێ دەبێت. ناوبراو (خانەی مامۆستایانی کشتوکاڵی)ی تەواو کردووە. ماوەیەک وەک مامۆستا و دواتر وەکو بەڕێوەبەر و فەرمانبەری پەروەردە لەچەند شارێکی سوریا کاری کردووە. لە چەند گۆڤارێکی ئەو سەردەمە بابەتی شیعری و وتار و چیرۆکی بڵاوکردۆتەوە. لە (٩ی ئابی١٩٧٢) کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ خالیدی نەقشبەندی لە گەڕەکی تاخا کوردان لە شام نێژراوە. بڕوانە: زنکی، دلاور، الكاتب الكردي قدري جان١٩١١-١٩٧٢ ( قصص و مقالات، شعر، ترجمة)، الطبعة الاولى، اربيل، ٢٠٠١، ص١٥-١٩.

[٨] ناوبراو کچی جەلادەت کوڕی ئەمین عالی بەدرخانە. لە (٢١ی ئاداری١٩٣٥) لە گەڕەکی (المهاجرين) لە شام لەدایک بووە، ئێستا لە شارۆچکەی (عەنکاوە) لە هەولێر دادەنیشێت.

[٩] لە ساڵی (١٩١٩) لە شارۆچکەی (مەعدەن) لە باکوری کوردستان لە دایک بووە. لە بەیروت خوێندنی زانکۆی تەواو کردووە. دواتر بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندنی باڵا رووی لە سویسرا کردووە. لە ساڵی (١٩٥٦)دا بڕوانامەی لە زانستە پەروەردەییەکان وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە سوریا. لە ساڵی (١٩٥٧)دا لەگەڵ ژمارەیەک لە سەرکردە

کوردەکان لە سوریا (پارتی دیموکراتی کوردستان_سوریا) دادەمەزرێنن. چەند جارێک بەهۆی چالاکییە سیاسییەکانییەوە دووچاری راوەدونان و زیندانیکردن و دوورخستنەوە بۆتەوە. تا دواجار رووی کردۆتەوە ئەوروپا و لە سویسرا نیشتەجێ بووە. لە (٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٨) لە سویسرا کۆچی دوایی کردووە.بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم کەسایەتییە بڕوانە: زازا، نورالدین، حیاتي ككوردي، ترجمة: خسرو بوتاني، الطبعة الاولى، مطبعة مؤسسة آراس، اربيل، ٢٠٠٨.

[10] لە ٢٢ی شوباتی ١٨٩١) لە ئامەد لەدایک بووە. خوێندنی خۆی لە ئەستانبۆڵ تەواو کردووە. دامەزرێنەر و ئەندامی ژمارەیەک کۆمەڵە و رێکخراوی کوردی بووە، وەکو (هێڤی)، (تەعالی کوردستان)، (خۆیبوون)...هتد. لەنێوان ساڵانی (١٩٣٩-١٩٤٦) نوێنەری خۆیبوون بووە لە شام. لە ساڵی (١٩٦٢) هاتۆتە باشووری کوردستان، دواتر گەڕاوەتەوە سوریا و لە ساڵی (١٩٦٧) تاکو کۆچی دوایی کردنی لە (٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٤) لە شام نیشتەجێ بووە، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە و بەخاک سپێردراوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

Paşa , Akrem Cemîl , Dîroka Kurdistan bi kurtebirî , çapxane Acco-Leuven , Bruksel, 1995, L341-342.

هەروەها بڕوانە: سەگبان، شوکری محەمەد، کێشەگەلی کەمینە نەتەوەکان، وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپی یەکەم، چاپخانەی موکریانی، هەولێر، ٢٠١٣، ل٨٣ (بیۆگرافیا).

[11] یاخود (جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان)، لە (٢٢ی تەمووزی ١٩١٢)دا لەلایەن ژمارەیەک لە پیاوانی دەستەبژێری کورد لە ئەستانبۆڵ دامەزرا، هەردوو گۆڤاری (رۆژی کورد) و (هەتاوی کورد) یەک لە دوای یەک وەکو زمانحاڵی کۆمەڵەکە دەرچوێنران. لەژێر پاڵەپەستۆی سیاسەتی دژ بە کوردی تورکە ئیتیحادییەکان و بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانەوە لە ساڵی (١٩١٤) کار و چالاکییەکانی راگیرا، بەڵام دوای جەنگ لە قۆناغێکی تازەدا و جارێکی تر دەستی بە چالاکی کردەوە تاکو ساڵی (١٩٢٢) بەردەوام بووە. بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی دامەزرێنەان و لق و کار و چالاکییەکانی ئەم کۆمەڵەیە بڕوانە: مالمیسانژ، جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان ١٩١٢-١٩٢٢، یەکەم رێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد، وەرگێڕانی: زریان رۆژهەڵاتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨.

[12] گۆڤارێکی ئەدەبی، کۆمەڵایەتی، وێنەداری بوو، دوو هەفتە جارێک بەزمانی کوردی و عەرەبی و تورکی لە بەغدا دەردەچوو. خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری بەرپرسی (ساڵح زەکی ساحێبقران) بوو. بەڕێوەبەری کارگێڕیشی (رەشید شەوقی)بوو. لە نێوان (١١ی ئاداری١٩٢٥) تاکو (١١ی مایسی ١٩٢٦) لە دەرچواندن بەردەوام بووە و (١٦) ژمارەی لێ چاپکراوە. بڕوانە: عومەر، فاروق عەلی، رۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا/ بەراییەکان ١٩١٤-١٩٣٩، وەرگێڕانی: کارێزی، تاریق، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی

پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل١٣٥؛ زەنگەنە، عەبدوڵڵا، و رەفیق ساڵح ئەحمەد، رابەری رۆژنامەنووسیی کوردی، گۆڤاری رۆژنامەڤانی، ژ:١١-١٢، ساڵی چوارەم، ٢٠٠٣، ل١٠٢-١٠٣.

(١٣) گۆڤارێکی مانگانە بوو، بە رێنووسی عەرەبی و بە زمانی کوردی و تورکی لە ئەستانبۆڵ ئەستانبۆڵ دەردەچوو. خاوەنی ئیمتیازی (عەبدولکەریم حاجی عەبدوڵڵای کەرکووکی زادە) بوو. ئەم گۆڤارە تەنها چوار ژمارەی لێ دەرچووە، یەکەمیان لە (٦ی حوزەیرانی ١٩١٣) و چوارەمیشیان لە (٣٠ی ئابی ١٩١٣) دەرچوێنراوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: زەنگەنە، عەبدوڵڵا، رۆژی کورد١٩١٣ ئەستەمووڵ، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥.

(١٤) بڕوانە: ژین"گۆڤار، استانبول، عدد (٢٤)، ایلول١٣٣٥، ر٤-٦.

(١٥) گۆڤارێکی ئایینی، ئەدەبی، کۆمەڵایەتی و ئابووری بوو، بە رێنووسی عەرەبی و بە هەردوو زمانەکانی کوردی (زاراوەی کرمانجیی باکوور و باشوور) و تورکی دەردەچوو. سەرەتا (٢٥) ژمارەی لێ دەرچوێنراوە. ژمارە یەکی لە (٧ی تشرینی دووەمی ١٩١٨) و ژمارە (٢٥)یشی لە (٢ی تشرینی یەکەمی١٩١٩) دەرچووە. بەڕێوەبەری بەرپرسی یەکەمی گۆڤارەکە لە ژمارە (١_٢٠) هەمزە بەگی مۆکسی بووە. بەڕێوەبەری بەرپرسی دووەمیشی لە ژمارە (٢٠_٢٥) مەمدوح سەلیم بەگ بووە. شایانی باسە دوای بەدواداچوون ئەوە بەردیارکەوت کە رۆژنامەیەک هەر بە ناوی (ژین) لە ساڵی (١٩٢٠) دەرچوێنراوە. تەنها یەک ژمارەی، کە ژمارە (٣٦)ە بەر دەست کەوتووە و مێژووی (٢١ی حوزەیرانی١٩٢٠)ی لەسەر تۆمار کراوە و خاوەنی رۆژنامەکە مەمدوح سەلیم بووە. تاکو ئێستا ساغ نەبۆتەوە کە ئەم ژمارەیەی رۆژنامەی (ژین) تەواوکەری گۆڤارەکەیە یان رۆژنامەیەکی تری سەربەخۆیە. بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی بڕوانە:

Bozarslan , M. Emîn , Jîn, Kovara kurdî_Turkî , 1918_1919, çaoxana perwerde , Hewler , 2001

هەروەها-بڕوانە: زەنگەنە، عەبدوڵڵا و رەفیق ساڵح، رابەری رۆژنامەنووسیی کوردی، "رۆژنامەڤانی"گۆڤار، هەولێر، ژمارە (١١-١٢)، ساڵی چوارەم (٢٠٠٣)، ل٩٦_٩٨) ؛ زەنگەنە، عەبدوڵڵا، (ژین) کۆڤاری سەردەمی سەرەتای راچەنینەکانی کورد، "رۆژنامەڤانی"گۆڤار، هەولێر، ژمارە (٦_٧)، ساڵی دووەم، پایز _ زستانی (٢٠٠٣)، ل١٧٥ و دواتر.

(١٦) بۆ زانیاری لەبارەی ئەم کۆمەڵەیە سەبارەت بە مێژووی دامەزرانی و دامەزرێنەرەکانی و بەرنامەی کارەکانی و...هتد، بڕوانە: گوێڵداش، ئیسماعیل، جەمعییەتی تەعالیی کوردستان، وەرگێڕانی: زریان رۆژهەڵاتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠١.

(١٧) کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵا کوڕی سەید تەهای نەهرییە، لە ساڵی (١٨٥١) لەدایک بووە. بەشداری شۆڕشەکەی (١٨٨٠_-١٨٨١)ی کرد و لەگەڵ باوکیدا بۆ حیجاز

دوورخرابوونــەوە. لــە ســاڵی (١٩٠٨) گەڕایــەوە ئەســتانبۆڵ و ماوەیــەک ســیناتۆری شــاری (وان) بــوو. دوای دامرکاندنــەوەی راپەڕینەکــەی ســاڵی ١٩٢٥ (راپــەڕینی شــێخ سەعیدی پیران)، سەید عەبدولقادر لەگەڵ چەندانی دیکەدا بەتۆمەتی پشکداریکردنیان لە راپەڕینەکە لە سێدارە دەدرێن. بڕوانە: عەبدوڵڵا، نەجاتی، کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردییەکان ١٩١٨_١٩٣٣ لە بەڵگەنامەکانی هەردوو وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا و فرەنسادا، بەرگی یەکەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٣٢٤ (بیۆگرافیا).

(١٨) کوڕی میر بەدرخانی میری بۆتانە، لە ساڵی (١٨٥١) لەدایک بووە. کۆلێژی مافناسی لە ئەستانبۆڵ تەواو کردووە. ماوەیەک وەکو پشکنەری دادوەری لە ئەدەنە و سلانیک کاری کردووە. دواتر بە تۆمەتی کوژرانی (ڕەزوان پاشا)ی سەرۆک شارەوانی ئەستانبۆڵ لە ســاڵی (١٩٠٦) دەگیرێــت و بۆ (عــەککا) لــە فەلەســتین دووردەخرێتــەوە. دوای کۆدێتاکەی (١٩٠٨) لەگەڵ سەید عەبدولقادر و چەند کەسێکی تر (کۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی کورد) دادەمەزرێنن. ناوبراو لە دامەزراندنی (کۆمەڵەی تەعالی کوردستان) و (تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کورد) بوو. بە یەکێک لە سەربەخۆییخواز و کەسە رادیکالەکان دادەنرێت لەو ماوەیەدا. لە ساڵی (١٩٢٦) لە میسر کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: مالمیسانژ، المصدر السابق، ص١٠٨_١١٣ ؛ هروری، صلاح محمد سليم، الاسرة البدرخانية (نشاطها السياسي و الثقافي خلال١٩٠٠—١٩٥٠، الطبعة الاولى، دار سبيريز للطباعة و النشر، دهوك، ٢٠٠٤، ص٤١ و مابعدها.

(١٩) بۆ زانیاری لە بارەی ئەم بابەتە، بڕوانە: ژین " گۆڤار"، استانبول، عدد (٢٠)، ٤ حزیران ١٣٣٥، ل٣-١٠.

(٢٠) بۆ زانیاری لەبارەی ئەم کۆمەڵەیە سەبارەت بە مێژووی دامەزرانی و دامەزرێنەرەکانی و بەرنامەی کارەکانی و...هتد، بڕوانە: گوێڵداش، ئیسماعیل، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤٥ و دواتر.

(٢١) ڕێکخراوێکی کوردیی نهێنی بوو، لە ساڵی (١٩٢١)دا و لە شاری ئەرزەڕۆم بەسەرۆکایەتی خالید بەگی جبرانلی دامەزرا. دواتر بە (جڤاتا خووەسەریا کورد) ناسرا. لقی لە شار و شــارۆچکەکانی کوردســتان هــەبوو. لەداڕشــتنی پلانــی بــەرپاکردنی راپەڕینەکــەی ساڵی (١٩٢٥) رۆڵی بەرچاوی هەبوو. ئامانجی ئەم ڕێکخراوە بریتی بوو لە رزگارکردنی کورد لە جەور و ستەمی حوکمەتی تورکی و دەستەبەرکردنی ئازادی و پێشخستنی وڵات و بەدەستهێنانی پشتگیریی وڵاتانی زلهێز. بڕوانە: صابر، سروه اسعد، كوردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل ١٩١٤_١٩٢٦ (دراسة تاريخية سياسية وثائقية)، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١، ص٢٥٩-٢٦٣ ؛ تەتەر، عەلی، بزاڤا سیاسی ل کوردستانێ ١٩٠٨_١٩٢٧، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٣١_٢٤٨.

[٢٢] ناوی تەواوی شێخ سەعید کوڕی شێخ مەحمود کوڕی شێخ عەلی (سەپتی)یە. لەساڵی ١٨٦٥ لە دێی (پالۆ)ی سەربە شارەدێی (ئەرگەنی) لە دیاربەکر لە دایک بووە. یەکێک بوو لە ڕابەرانی تەریقەتی نەقشبەندی. زانستەکانی (الانوار، المحرر، النحو، الصرف، المعاني، الارشاد، البیان، البدیع و العقائد)ی خوێندووە. زمانەکانی عەرەبی و تورکی و فارسی بەباشی زانیوە. ڕۆڵی سەرکردایەتی بینی لە ڕاپەڕینەکەی ساڵی (١٩٢٥)دا، کە دواتر بە تۆمەتی بەشداریکردنی لە ڕاپەڕینەکە لە (٣٠ی ئایاری ١٩٢٥) لەگەڵ ژمارەیەک لە سەرکردە کوردەکان لە شاری دیاربەکر لە سێدارە دران. احمد، کمال مظهر، انتفاضة ١٩٢٥ في کردستان ترکیا (دراسة تحلیلیة)، الطبعة الاولی، بیروت،٢٠٠١ ؛ حەسرەتیان، م.ا، ڕاپەڕینی کوردان ١٩٢٥، وەرگێڕانی: جەلال دەباغ، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٦.

[٢٣] ناوی تەواوی محەمەد شوکری سەگبان کوڕی محەمەد ئاغایە، لە ساڵی (١٨٨١) لە (پاقرمادەن)ی سەر بە دیار بەکر لەدایک بووە. خوێندنی پزیشکی لە ئەوروپا تەواو کردووە. لە ساڵی (١٩٠٨) گەڕاوەتەوە ئەستانبۆڵ و لە کۆلێژی پزیشکی وانەی دەگوتەوە. ئەندامی (کۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی کورد) و هاریکارێکی باشی کۆمەڵەی (هێڤی) بووە. هەروەها یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی (کۆمەڵەی تەعالی کوردستان) و (کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کورد) و کۆمەڵەی (خۆیبوون). ماوەیەک لە پەناهەندەییدا ژیانی بەسەر برد. لە ساڵی (١٩٣٧)دا و لە خولی حەوتەمی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا لە (شوبات_حوزەیرانی ١٩٣٧) وەکو نوێنەری لیوای هەولێر هەڵبژێردراوە. لە ساڵی (١٩٣٩)دا و بەهۆی نووسینی کتێبەکەی بە ناونیشانی (پرسی کورد کێشەگەلی کەمینە نەتەوەکان) ڕێگای پێدرا بگەڕێتەوە تورکیا و وەکو پزیشک دەستی بەکار کردەوە. لە (٨ی ئایاری١٩٦٠) لە ئەستانبۆڵ کۆچی دوایی کرد. چەند بەرهەمێکی چاپکراوی لە پاش بە جێماوە. بڕوانە: : سەگبان، شوکری محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩_٣٤.

[٢٤] ناوی تەواوی ڕەفیق کوڕی سالح ئەفەندی ئامان کوڕی عەبدوڵڵا ئەفەندییە، لە ساڵی (١٨٩٨) لە شاری کەرکووک لەدایک بووە. لە ئەستانبۆڵ کۆلێژی ئەندازیاری تەواوکردووە. سەرەتای کاری ڕێکخراوەیی ناوبراو بە ئەندامبوونی لە کۆمەڵەی (هێڤی) دەستی پێکرد، هەر لە ژێر کاریگەریی ئەو کۆمەڵەیەشدا بوو هەستی نەتەوەیی و هەستی بەرپرسیارێتی لە بەرامبەر نیشتمان و نەتەوەکەی لەلا گەڵاڵە بوو. لە ساڵی (١٩٤٠)دا وەکو سەرۆکی (حزبی هیوا) دەستی بەکارکرد. لە ماوەی ژیانیدا چەندین پۆستی سیاسی و ئیداری وەرگرتووە، بە تایبەت لە بواری پەروەردە و فێرکردندا. لە دوا ڕۆژگارەکانی ژیانیدا وەکو موفەتیشی پسپۆڕ لە وەزارەتی مەعاریفی عێراقی دەست بەکاربوو، تاکو لە (٤ی ئابی١٩٦٠) کۆچی دوایی کرد. چەند بەرهەمێکی ئەدەبی و مێژوویی چاپکراو و چاپنەکراوی لەپاش بەجێماوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: صابر،

شاخوان، رفيق حلمي (دراسة تاريخية في نشاطه السياسي و الثقافي)، مطبعة شڤان، السليمانية، ٢٠٠٧.

[٢٥] پارتێکی سیاسی کوردی بوو، لە ساڵی (١٩٣٩)دا دوای گۆڕینی ناوی کۆمەڵەی (دارکەر) کە لە ساڵی (١٩٣٧) دامەزرابوو، لەلایەن ژمارەیەک لە رۆشنبیران و کەسایەتییە سیاسییەکان لە کەرکوک دامەزرا. رۆڵێکی بەرچاوی بینی لە بووژاندنەوەی بواری رۆشنبیری و بزاڤی سیاسی لە کوردستان بەگشتی و لە باشووری کوردستان بە تایبەتی. هەروەها لە هەوڵدان بۆ گەیاندنی داواکاری و ئامانجەکانی کورد بە دەسەڵاتدارانی عێراقی و نوێنەرانی وڵاتانی زلهێز درێخی نەکرد. دوای سەرهەڵدانی چەندین ململانێ و ناکۆکی لە ناو ریزەکانی (هیوا)دا، دوا جار لە ساڵی (١٩٤٥)دا هەڵوەشایەوە. بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل١٠٥-١٤٤.

[٢٦] گۆڤارێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، زانستی هەفتانە بوو، بە زمانی تورکی و کوردی (زاراوەی کرمانجی باکوور و باشوور لە ئەستانبۆڵ دەردەچوو. خاوەنی ئیمتیازی (محەمەد میهری) بوو، سەرنووسەرەکەشی (محەمەد شەفیق ئەرواسی زادە) بوو. ئەم گۆڤارە (١٩) ژمارەی دەرچوێنراوە. ژمارە یەکی لە (٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩١٩ و دوا ژمارەشی لە (٢٧ی ئاداری١٩٢٠) بڵاوکراوەتەوە. زەنگەنە و رەفیق ساڵح، "رۆژنامەڤانی" گۆڤار، ژمارە (١١_١٢)، ساڵی چوارەم-٢٠٠٢، ل٩٧ ؛ بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: پیربال، فەرهاد، گۆڤاری کوردستان ١٩١٩_١٩٢٠ ئەستانبۆڵ، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨.

[٢٧] یەکێک بوو لە پێشەنگانی بواری بزاڤی سیاسی و رۆشنبیری کوردی. ساڵی لەدایک بوونی دیار نییە. یەکەم بەڕێوەبەری بەرپرسی گۆڤاری (ژین)ی ئەستانبۆڵ بووە، لە ژمارە (٩-٢٠) گۆڤارەکەی بەڕێوەبردووە. بەهۆی چالاکییە سیاسی و رۆشنبیرییەکانییەوە لەلایەن دەسەڵاتدارانی تورکەوە دوو جار زیندانی کراوە. بەشداری لە راپەڕینەکەی (شێخ سەعیدی پیران) کردووە. دواتر پەناهەندەی رۆژئاوای کوردستان دەبێت و دەبێتە ئەندامی کۆمەڵەی (خۆیبوون). چەند بابەتێکی لە گۆڤارەکانی (کوردستان) و (هاوار) بڵاوکردۆتەوە. لە (٥ی نیسانی ١٩٥٨) کۆچی دوایی کردووە. زەنگەنە، "رۆژنامەڤانی" گۆڤار، ژمارە (٦_٧)، پایز-زستانی٢٠٠١-٢٠٠٢، ل١٨٢-١٨٣ ؛ عوبێد، "رۆژنامەڤانی"گۆڤار، هەولێر، ژمارە (٣)، کانونی یەکەمی٢٠٠٠، ل٢٠٣.

[٢٨] رێکخراوێکی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری تایبەت بە ژنان بوو، لە ساڵی (١٩١٩) لە ئەستانبۆڵ دامەزرێنرا. ئەم کۆمەڵەیە لە بنەڕەتدا سەر بە (کۆمەڵەی تەعالی کوردستان) بوو. (ئەنجوم یامولکی) یەکێک لە دیارترین ئەندامەکانی بوو. ئامانجی کۆمەڵەکە بریتی بوو لە پێشخستن و پێگەیاندنی ئافرەتی کورد بە بیروباوەڕی سەردەمیانە و دۆزینەوە و رەخساندنی هەلی کارکردن بۆ هەتیوان و بێوەژنانی کورد و بڵاوکردنەوەی

ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب و دامەزرانی کتێبخانە و سازکردنی کۆنفرانس و...هتد. بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئامانج و پێڕەی ناوخۆ و لایەنەکانی تری ئەم کۆمەڵەیە، بڕوانە: شـریف، عبدالستار طاهر، الجمعیات والمنظمات والاحزاب الکردیة في نصف قرن ١٩٠٨_١٩٥٨، الطبعة الاولی، دار الحریة للطباعة، بغداد، ١٩٨٩، ص٤٧–٥٢ ؛ گوێڵداش، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٥_١٤٠.

(٢٩) ممدوح سلیم بکی، کردلرە ترقی جریانلری، ، ژین" گۆڤار"، استانبول، عدد (١٧)، برنجی سنه، ٢٦ حزیران ١٣٣٥، ل١_٩..

(٣٠) کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیری بوو، لە ساڵی (١٩١٩) لە ئەستانبۆڵ دامەزراوە. لە بنەڕەتدا سەر بە (کۆمەڵەی تەعالی کوردستان) بوو. بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی بەرنامەی کۆمەڵەکە و ئامانجەکانی، بڕوانە: ژین " گۆڤار"، استانبول، عدد (١٠)، ٢ی شوباتی١٣٣٥ ؛ گوێڵداش، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣٧-٤٣٨.

(٣١) دەقی وەرگێڕدراوی ئەم بابەتەمان لەلای مامۆستا عەبدوڵڵا زەنگەنە دەسکەوت.

(٣٢) کۆمەڵەیەکی سیاسی و ڕۆشنبیریی کوردی بوو، لە ساڵی (١٩٠٨) لە ئەستانبۆڵ و لەلایەن ژمارەیەک لە سەرکردە و دەستەبژێرانی کوردی ئەو سەردەمە دامەزرێنرا. سەرۆکی کۆمەڵەکە (سەید عەبدولقادری نەهری) و جێگرەکەشی (ئەمین عالی بەدرخان) بوو. ئەم کۆمەڵەیە چەندین لق و یانەی تایبەت بەخۆی هەبوو کە لە شارو شارۆچکە کوردییەکانی کوردستان و هەندێ ناوچەی تری دەرەوەی کوردستان دامەزرێنرابوون. هەروەها کۆمەڵەکە ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی تایبەت بەخۆی بەناوی (ڕۆژنامەی تەعاون و تەرەقی کورد) دەردەکرد کە تەنها (٩) ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە. بڕوانە: مالمیسانژ، جەمعییەتی تەعاون و تەرەقی کورد و ڕۆژنامەکەی : وەرگێڕانی: زریان ڕۆژهەڵاتی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٢١ و دواتر ؛ عەلیاوەیی، عەبدوڵڵا، کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهان (لێکۆڵینەوەیەکە لە بواری مێژووی سیاسیدا)، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل١٩٧_٢٠١.

(٣٣) کوڕی سەعید پاشا کوڕی حوسێن پاشای خەندانە. لە بنەڕەتدا خەڵکی سلێمانین، دواتر چوونەتە ئەستانبۆڵ و لێرەدا و لە ساڵی (١٨٦٥) شەریف پاشا لەدایک بووە. سەرەتا لە ئەستانبۆڵ دەستی بە خوێندن کردووە، دواتر چۆتە پاریس، خوێندنی سەربازی تەواوکردووە و پلە بە پلە تاکو (ژەنەراڵ) بەرزبۆتەوە. ماوەیەک لە دەرباری دەوڵەتی عوسمانی وەکو راوێژکار، دواتر وەکو پاشکۆی سەربازی لە (برۆکسل) و پاریس کاری کردووە. لەنێوان ساڵانی (١٨٩٨-١٩٠٨)دا وەکو وەزیری ڕێپێدراوی عوسمانی لە ستۆکهۆڵم کاری کردووە. لە ساڵی (١٩١٩) دا وەکو نوێنەری کورد، بۆ گەیاندنی داواکاری و ئامانجەکانی کورد لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس، دەستنیشان کرا. لە

بواری رۆژنامەوانی و کاری رێکخراوەییدا کەسێکی چالاک بووە. لە (٢٢ی کانونی یەکەمی ١٩٥١)دا لە ئیتالیا کۆچی دوایی کرد. بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ژیانی و چالاکییە سیاسی و رۆشنبیرییەکانی، بڕوانە: حسن، صالح محمد (عزت بادي)، شريف پاشا حياته ودوره السياسي ١٨٦٥_١٩٥١)، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٥.

## لیستی سەرچاوەکان


**یەکەم/ بەڵگەنامەی بڵاونەکراوە:**

١- گەواهینامەی پەناهەندەیی مەمدوح سەلیم لە لوبنان بە مێژووی ( ٢٧/ ٣/ ١٩٣٣)، لەلای جەمشید حەیدەری پارێزراوە.

**دووەم/ کتێبە بەڵگەنامەییەکان:**

٢- عەبدوڵڵا، نەجاتی، کۆمەڵە و رێکخراوە کوردییەکان ١٩١٨-١٩٣٣ لە بەڵگەنامەکانی هەردوو وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا و فەرەنسادا، بەرگی یەکەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨.

٣- ئەبوبەکر، ئەحمەد عوسمان، کێشەی کورد لە سەردەمی ئاشتیدا دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، وەرگێڕانی: جەمال گردەسۆری، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠١٢.

**سێیەم/ یادداشتەکان:**

**أ- بەزمانی کوردی:**

٤- حەیدەری، جەمشید، لاپەڕەی بیرەوەرییەکانم ١٩٦٦-١٩٩١، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئازادی، هەولێر، ٢٠١٣.

٥- رەسوڵ، عیزەدین مستەفا، بەشێک لە یاداشتەکانم، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، دەزگای حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٦- مالمیسانژ، رۆژانە نووسینەکانی جەلادەت عالی بەدرخان ١٩٢٢_١٩٢٥، وەرگێڕانی: ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠١٦.

٧- محەمەد، مەسعود، گەشتی ژیاتم، چاپی سێیەم، کۆیێ - کوردستان، ٢٠٠٩.

**ب- بەزمانی عەرەبی:**

٨- زازا، نورالدين، حياتي ككوردي، ترجمة: خسرو بوتاني، الطبعة الاولى، مؤسسة آراس، اربيل، ٢٠٠٨.

٩- (زنار سلوبي)، قدري جميل، مسالة كردستان (٦٠ عاما من النضال المسلح للشعب الكردي ضد العبودية)، الطبعة الثانية، بيروت ١٩٩٧.

**چوارەم/چاوپێکەوتن:**

١٠- بەدرخان، سینەم خانم، ٢١ی کانوونی دووەمی ٢٠١٧ (تۆمارکراو).

**پێنجەم/ کتێب:**

أ- بەزمانی کوردی:

ب- بە رێنووسی عەرەبی:


١١-پیربالّ، فەرهاد، گۆڤاری کوردستان ١٩١٩_١٩٢٠ ئەستانبۆڵ، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨.

١٢- تەتەر، عەلی، بزاڤا سیاسی ل کوردستانێ ١٩٠٨_١٩٢٧، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر، ٢٠٠٧.

١٣- جەلیلی، جەلیل، بووژانەوەی رۆشنبیری و نەتەوەیی کورد (کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم- سەرەتای سەدەی بیستەم، وەرگێڕانی: سدیق سالّح، چاپخانەی هەواڵ، سلێمانی، ٢٠٠٠.

١٤- حەسرەتیان، م. ا، راپەڕینی کوردان ١٩٢٥، وەرگێڕانی: جەلال دەباغ، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٦.

١٥- خەزنەدار، جەمال، لە بابەت مێژووی رۆژنامەگەری کوردییەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٦.

١٦- دەرسیمی، نوری، دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا، وەگێڕانی: د. ئەحمەد فەتاح دزەیی، چاپی یەکەم، وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

١٧- زەنگەنە، عەبدوڵلا ، رۆژی کورد ١٩١٣ ئەستەموولّ، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥.

١٨- سالّح، رەفیق، گۆڤاری دیاری کوردستان ١٩٢٥-١٩٢٦، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١.

١٩- سەگبان، شوکری محەمەد، کێشەگەلی کەمینە نەتەوەکان، وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵلا، چاپی یەکەم، چاپخانەی موکریانی، هەولێر، ٢٠١٣.

٢٠- شێرکۆ، بلەچ، کێشەی مێژینە و ئێستای کورد، وەرگێڕانی: محەمەد حەمە باقی، چاپی سێیەم، کوردستانی عێراق، ١٩٩٢.

٢١- عەلیاوەیی، عەبدوڵلا، کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهان (لێکۆڵینەوەیەکە لە بواری مێژووی سیاسیدا)، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٢٢- عومەر، فاروق عەلی، رۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا/ بەراییەکان ١٩١٤-١٩٣٩، وەرگێڕانی: تاریق کارێزی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

٢٣- گوێڵداش، ئیسماعیل، جەمعییەتی تەعالیی کوردستان، وەرگێڕانی: زریان رۆژهەلاتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠١.

٢٤- مالمیسانژ، پێگەی کەمال فەوزی بتلیسی لە رێکخراوەکانی کورددا، وەرگێڕانی: زریان رۆژهەلاتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧.

٢٥- مالمیساژ، جەمعییەتی تەعاون و تەرەقی کورد و ڕۆژنامەکەی : وەرگێڕانی: زریان رۆژهەلاتی، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧

٢٦- مالمیسانژ، جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان ١٩١٢-١٩٢٢، یەکەم رێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد، وەرگێرانی: زریان رۆژهەلاتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧.
٢٧- مەزهەر، کەمال، چەند لاپەرەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

- **بە رێنووسی لاتینی:**

28- Bozarslan ,M. Emîn ,Jîn ,Kovara kurdî_Turkî ,1918_1919 , çapxana perwerde , Hewler ,2001.
29- PaŞa , Akrem Cemîl , Dîroka Kurdistan bi kurtebirî ,çapxane Acco- Leuven , Bruksel,1995. .
30- Konê ReŞ,Ji Stêrên Welatê Qedexe, çapxana Parêzgeha Duhokê, Duhok, 2014.
31- ReŞan, Nevin Gungor , Navdarên Kurd ,Istanbul , 2008.
32 -Uzun , Mehmed ,Siya Evînê (Roman) ,Stockholm , 1989.

**ت– بەزمانی عەرەبی:**

٣٣– احمد، كمال مظهر، انتفاضة ١٩٢٥ في كردستان تركيا (دراسة تحليلية)، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠٠١.
٣٤– احمد، كمال مظهر، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة: محمد الملا عبدالكريم، دار أفاق عربيه للطباعة و النشر، بغداد، ١٩٨٤.
٣٥– احمد، محمد ملا، جمعية خويبون والعلاقات الكردية–الارمنية، الطبعة الاولى، رابطة كاوا للثقافة الكردية، بيروت، ٢٠٠٠.
٣٦– الاكوم، روهات، خويبون و ثورة آگرى، مراجعة: شكور مصطفى، الطبعة الاولى، مطبعة اوفسيت هولير، اربيل، ١٩٩٩.
٣٧– بدرخان، روشن، الاعمال الكاملة ( ١٩٠٩–٢٠٠٩)، مطبعة هيڤى، دهوك، ٢٠٠٩ .
٣٨– حسن، صالح محمد (عزت بادي)، شريف پاشا حياته و دوره السياسي ١٨٦٥_١٩٥١)، الطبعة الاولي، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٥.
٣٩– حصاف، اسماعيل محمد، تاريخ كردستان سوريا المعاصر، الجزء الاول، مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل، ٢٠١٧.
٤٠– زنكى، دلاور، الكاتب الكردي قدري جان ١٩١١–١٩٧٢ ( قصص و مقالات، شعر، ترجمة)، الطبعة الاولى، اربيل، ٢٠٠١.
٤١– شريف، عبدالستار طاهر، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨_١٩٥٨، الطبعة الاولى، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٩.
٤٢– صابر، سروه اسعد، كوردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل١٩١٤_١٩٢٦(دراسة تاريخية سياسية وثائقية)، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١.

٤٣- صابر، شاخوان ، رفيق حلمي (دراسة تاريخية في نشاطه السياسي والثقافي)، مطبعة شڤان، السليمانية، ٢٠٠٧.
٤٤- الصويركى، محمد علي ، معجم اعلام الكرد في التاريخ الاسلامي والعصر الحديث في كردستان وخارجها، مطبعة مؤسسة حمدي للطبع والنشر، السليمانية، ٢٠٠٥.
٤٥- غورغاس، جوردي، الحركة الكردية التركية في المنفى، ترجمة: جورج البطل، دار آراس للطباعة، اربيل، ٢٠١٣.
٤٦- كۆنێ رەش، جمعية خويبون ١٩٢٧ و وقائع ثورة آرارات ١٩٣٠، تقديم و مراجعة: عبدالفتاح البوتاني، الطبعة الاولى، مطبعة خەبات، دهوك، ٢٠٠٠.
٤٧- مالميسانژ، بدرخانيو جزيرة بوتان ومحاضرات اجتماعات الجمعية العائلية البدرخانية، ترجمة: شكور مصطفى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ١٩٩٨.
٤٨- ميراني، محمد صالح، الحركة القومية الكوردية في كوردستان - سوريا ١٩٤٦-١٩٧٠، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٤.
٤٩- ميراني، محمد صالح، الحياة الحزبية السرية في كوردستان سوريا ١٨٩٨-٢٠٠٨ (رصد وثائقي لمسيرة اكثر من قرن من تطور الوعي القومي في الجزء الجنوب الغربي من كوردستان) دراسة تاريخية - سياسية، مركز الدراسات الكوردية وحفظ الوثائق، دهوك، ٢٠٠٩.
٥٠- هروري، صلاح محمد سليم، الاسرة البدرخانية (نشاطها السياسي والثقافي خلال١٩٠٠-١٩٥٠، الطبعة الاولى، دار سبيريز للطباعة والنشر، دهوك، ٢٠٠٤.

**شەشەم/ گۆڤارەکان:**

٥١- زەنگی، دلاوەرێ، بەشداربووانی ئابۆنەکانی گۆڤاری (هاوار)، رۆژنامەڤانی"گۆڤار"، هەولێر، ژمارە (٥)، ساڵی دووەم، ئابی٢٠٠١.
٥٢- زەنگەنە، عەبدوڵڵا، (ژین) کۆڤاری سەردەمی سەرەتای راچەنینەکانی کورد، رۆژنامەڤانی"گۆڤار"، هەولێر، ژمارە (٦_٧)، ساڵی دووەم، پایز _ زستانی (٢٠٠٣) .
٥٣- زەنگەنە، عەبدوڵڵا، تیشکێک بۆ سەر...، رۆژنامەڤانی"گۆڤار" ، هەولێر، ژمارە (٥)، ساڵی دووەم، ئابی ٢٠٠١.
٥٤- زەنگەنە، عەبدوڵڵا و رەفیق ساڵح ئەحمەد، رابەری رۆژنامەنووسیی کوردی، رۆژنامەڤانی"گۆڤار"، هەولێر، ژ:١١-_١٢، ساڵی چوارەم، ٢٠٠٣.
٥٥- سلیم بەگی، تیشک خستنە سەر چەند راستییەک، کوردستان "گۆڤار"، استانبول، ژمارە (٨)، ٢٩ی مایسی ١٣٣٥.
٥٦- شاویس، اسماعیل حقی، (مێژووی نەتەوەکەت) خەباتی گەلی کورد لە رۆژەکانی جەنگی گێتی یەکەمیندا لە دەرەوە و ناوەوەی کوردستان، رۆژی نوێ "گۆڤار "، بەغدا، ژمارە (٩)، ساڵی یەکەم، کانوونی یەکەمی٢٠٠٠.
٥٧- عوبێد، ئازاد، فەرهەنگی رۆژنامەنووسانی کۆچ کردووی کورد، رۆژنامەڤانی"گۆڤار"، هەولێر ، ژمارە (٣)، کانونی یەکەمی٢٠٠٠ .

٥٨- کۆڕی زانیاری کورد، کۆچی دوایی سێ شۆڕە سوار، کۆڕی زانیاری کورد" گۆڤار"، بەغدا، بەرگی سێیەم، ١٩٧٢.
٥٩- کوردێ بدلیسی، ئەفسانا دەهاک، ژین "گۆڤار"، استانبول، عدد (١)، ٧ تشرین اول ١٣٣٥.
٦٠- الکردي الواني، حب الوطن من الایمان، هاوار " کۆڤار "، شام، هژمار (١٧)، ساڵ (١)، ٦ ادار١٩٣٣.
٦١- الکردي الواني، الطیر والوتر والشعر، "هاوار"کۆڤار، شام، هژمار (٢٠)، ساڵ (١)، ٨ گلان ١٩٣٣.
٦٢- کورد واني، تاریخ حضورندە بر تصحیح، "دیاری کوردستان" گۆڤار، بەغدا، ژمارە (٧)، ١٩٢٥.
٦٣- کورد واني، حیاتی احتیاجلر مزدن: ملي تاریخ - ملي جوغرافیا، دیاری کوردستان"گۆڤار"، بەغدا، ژ٩، ١٩٢٥.
٦٤- محمد، مسعود، ممدوح سلیم: ربع قرن من النضال الکردي الدؤوب، کۆڕی زانیاری کورد " گۆڤار "، بەغدا، بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧.
٦٥- مەزهەر، کەمال، کۆڕی زانیاری کورد"گۆڤار"، بەغدا، بەرگی یەکەم/بەشی یەکەم، ١٩٧٣.
٦٦- م. س، استانبولندە کورد عملەسی، ژین" گۆڤار"، استانبول، عدد (٢٥)، برنجی سنە، ٣ تشرین اول ١٣٣٥.
٦٧- م.س، کاوە یوم مخصوصی_٣١ تاباخ (اغستوس)، ژین" گۆڤار"، استانبول، عدد (٢٥)، برنجی سنە، ٣ تشرین اول ١٣٣٥.
٦٨- ممدوح سلیم بکی، کردلرە ترقی جریانلری، ، ژین" گۆڤار"، استانبول، عدد (١٧)، برنجی سنە، ٢٦ حزیران ١٣٣٥.
٦٩- ممدوح سلیم بکی، ایام مخصوصە مزی تثبیت مسئلەسی، ژین" گۆڤار"، استانبول، عدد (١٦)، برنجی سنە، ١٠نیسان ١٣٣٥.
٧٠- ممدوح سلیم بکی، (مم و زین)ک طبعي مناسبتیلە)، ژین" گۆڤار"، استانبول، عدد (١٦)، برنجی سنە، ١٠نیسان ١٣٣٥.
٧١- ممدوح سلیم بکی، (هەوار!...)_ امداد !...، ژین" گۆڤار"، استانبول، عدد (١٩)، برنجی سنە، ٢٢ مایس١٣٣٥.
٧٢- ممدوح سلیم بکی، کورد قلوپندە برمصاحبە، ژین" گۆڤار"، استانبول، عدد (٢١)، برنجی سنە، ١٨ حزیران ١٣٣٥.
٧٣- ممدوح سلیم بکی، ایکی اثر مبرور: کورد قادینلری تعالی جمعیتی / کورد طلبە هیوی جمعیتی ، ژین" گۆڤار"، استانبول، عدد (٢٠)، برنجی سنە، ٤ حزیران ١٣٣٥.
٧٤-وانلي: م. ج. سلیم بکی، کورد خانمی، ژین" گۆڤار"، استانبول، عدد (١٤)، برنجی سنە....
٧٥- الواني، بکاء و بکاء و بکاء، هاوار " کۆڤار "، شام، هژمار (١٣)، ساڵ (١)، ١٤ی چلەیی بری١٩٣٣.

## ملخص البحث
## ممدوح سليم بيك الوانلي ١٨٩٣– ١٩٧٦
## حياته ونشاطاته السياسية والثقافية

**د. كامران محمد حاجي**

قسم التأريخ–كلية الاداب–جامعة صلاح الدين–اربيل

منذ بدايات القرن العشرين وتزامنا مع تاسيس عدد من المنظمات والجمعيات الكوردية، بدأت أسماء بعض الشخصيات الكوردية تظهر حيث قاموا بدورهم الرائد في مجال الحركة السياسية والثقافية الكوردية. كان ممدوح سليم بيك الوانلي أحد هذه الشخصيات، حيث بدا بدوره الفعال سواء كان في تاسيس هذه الجمعيات أو ادارة المجلات التي تعتبر لسان حالها. وبسبب دور هذه الشخصية في مجال الحركة السياسية والثقافية الكوردية خلال عقود في القرن الماضي، قمنا باختيار هذا الموضوع.

هذه الدراسة التي تحمل عنوان (ممدوح سليم بيك الوانلي ١٨٩٣– ١٩٧٦/ حياته ونشاطاته السياسية والثقافية)، تتكون من مقدمة و ثلاثة مباحث رئيسية بالاضافة الى النتائج. المبحث الاول من الدراسة يحمل عنوان (حياة ونشأة ممدوح سليم بيك)، وفيه تطرقنا الى بعض الجوانب والمحطات المهمة من حياة هذه الشخصية، كنشأته وتحصيلاته الدراسية ومن ثم عرض بعض الجوانب الخاصة من حياته. المبحث الثاني والذي يحمل عنوان (نشاطات ممدوح سليم بيك السياسية)، حاولنا فيه تسليط الضوء على دوره القيادي في تاسيس عدد من الجمعيات والاحزاب الكوردية ودوره الفعال في مجال الحركة السياسية الكوردية. اما المبحث الثالث والذي يحمل عنوان (نشاطات ممدوح سليم بيك الثقافية)، فقد خصص لدراسة دور هذه الشخصية في ادارة بعض الصحف والمجلات وكتاباته القيمة فيها. وفي الختام لخصنا أهم ما توصل اليه البحث في نقاط موجزة.

# Abstract

## Memdouh Selim Beg Wanly (1893-1976)

**Dr.kamaran Muhammad Haji**
Salahaddin University-Erbil-College of Arts/History Dep.

Since the beginning of the twentieth century , coinciding with the establishment of a number of Kurdish organizations and associations, the names of some Kurdish figures began to appear as they played a leading role in the field of the Kurdish political and cultural movement. Memdouh Selim Beg Wanli was one of these figures, and he appeared to be an active actor, whether in the establishment of these associations or in the management of magazines those are considered their spokesmen. And because of the role of this figure in the field of Kurdish political and cultural movement in decades in the last century, we chose this topic.

This study, titled Memdouh Selim Beg Wanly (1893-1976), consists of three main topics in addition to the results. The first part of the study is entitled (Life and the Origins of Memdouh Selim beg), in which we touched upon some important aspects and stations of the life of this personality, as its origin and its educational achievements, and then presented some special aspects of his life. The second topic, entitled (Memdouh Selim beg political activities), in which we tried to shed light on his leadership role in establishing a number of Kurdish associations and parties and his active role in the field of Kurdish political movement. The third topic, entitled (Memdouh Selim beg Cultural Activities), talked about the role of this character in the management of some newspapers and his valuable writings. In conclusion, we summarized the main findings of the research in brief points.

# هەڵوێستی محەمەد ئینجە بەیرەقدار بەرامبەر بە میرنشینیی سۆران

**د. ئامانج ئەحمەد مستەفا**
زانکۆی سۆران/ فاکەڵتی ئاداب

**پێشەکی**

هەرچەندە میرنشینیی سۆران مێژووەکەی زۆر کۆنترە لە مێژووی دەسەڵاتدارییەتی میر محەمەدی ڕەواندزی (١٨١٣-١٨٣٦) ناسراو بە میری کۆرە، بەڵام هەرگیز ئەو هێز و دەسەڵاتەی نەبووە کە لە سەردەمی ئەودا میرنشینەکە بەخۆیەوەی بینیوە، توانی سنووری دەسەڵاتەکەی هێندە فراوان بکات کە ببێتە مەترسی بۆ هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی و زلهێزەکانیش. دواتر دەوڵەتی عوسمانی بڕیاریدا میرنشینەکان بگەڕێنێتەوە سەر دەسەڵاتی ناوەندی و بۆ ئەو مەبەستەش (محەمەد ئینجە بە یرەقدار) والیی موسڵی ڕاسپارد بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە کە سیاسەتێکی زۆر توندو تیژی دەرهەق بە میرنشینیی سۆران ئەنجامدا و توانی لە ماوەیەکی کەمدا میرنشینیی سۆران لە ناو ببات.

بایەخ و ئامانجی توێژینەوەکە بریتییە لە خستنەڕووی زانیاریی دروست لەسەر هەڵوێستی (محەمەد ئینجە بەیرەقدار) بەرامبەر بە میرنشینی سۆران. توێژینەوەکە دوو تەوەری سەرەکی لە خۆ دەگرێت، یەکەمیان پوختەیەکە لە مێژووی میرنشینیی سۆران،کە تیایدا باس لەکورتەیەکی مێژووی میرنشینیی سۆران و سەردەمی دەسەڵاتداریەتی (میری کۆرە) لەو میرنشینەدا و فراوانخوازییەکانی کراوە. تەوەری دووەمیشیان باس لە هەڵوێستی محەمەد ئینجە بەیرەقدار بەرامبەر میرنشینیی سۆران و هەڵوێستی دەرەکی بەرامبەر بە فراوانخوازییەکانی محەمەد پاشا و ڕۆڵی بەیرەقدار لە لەناوبردنی میرنشینەکە کراوە و

لەگەڵ هۆکارەکانی لەناوچوونی دەسەڵاتی میری کۆرە و لەشکرکێشیی عوسمانییەکان بۆ سەر میرنشینەکە .

بۆ نووسینی ئەم توێژینەوەیە سوود لە سەرچاوەی زۆری جۆراوجۆر بینراوە کە بەشێکیان بەڵگەنامەی بڵاونەکراوەن لە ئەرشیفی عوسمانی پارێزراون و سوودی زۆریان هەبووە بە تایبەتی لە ئاشکراکردنی هەوڵەکانی والییەکانی عوسمانی بۆ لەناوبردنی میرنشینە کوردییەکان و هەوڵی بەیرەقدار بۆ لەناوبردنی میرنشینیی سۆران.. لە گەڵ پشتبەستن بە کۆمەڵێک بەڵگەنامەی بڵاوکراوە کە لە پەرتووکی (کورد و بەرخودانەکان) سینان هاکان، ئەمە جگە لەوەی زۆر سوود لە گەشتنامەکانی فرێزەر و بۆژۆلا وەرگیراوە. هەروەها پەرتووکی (شەرەف نامە) ی شەرەف خانی بەدلیسی و (الأيزدية)ی صديق الدملوجي و (چەند لایەنێکی مێژوویی و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابووریی کوردستان لە سەردەمی عوسمانیدا) کە داندراوی د. سەعدی عوسمان هەرووتی)یە.. لەگەڵ دەیان پەرتووکی تر کە پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە، چەند گۆڤارێکیش بەکار هاتووە کە لە لیستی سەرچاوە و پەراوێزەکاندا ئاماژەیان پێکراوە

**تەوەری یەکەم**

**پوختەیەک لەبارەی میرنشینیی سۆران**

میرنشینیی سۆران یەکێکە لە دەسەڵاتە خۆجێییەکانی کورد، شوێنێکی گرنگی لە مێژووی کوردا هەیە، لە سەرەتای دامەزراندنەکەوە لە بنەماڵەیەکی کۆن و بەهێزی کوردستان بوون، کە توانییان دەسەڵاتی خۆیان بچەسپێنن و بەهێزی بکەن و سنووری خۆیان فراوان بکەن و ڕۆڵێکی گرنگیان هەبێت لە هاوسەنگی سیاسی و سەربازی لە ناوچەکەدا، واتە کاریگەری لەسەر ڕووداوەکان هەبێت (بەدلیسی، ١٣٨٤: ٣٣٦-٣٣٧). کە لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا زۆر جار بە حکومەتی میرنشینی سۆران ناوی هاتووە (عبدالسلام، ٢٠١٢: ٢٤٥) بەتایبەتی لە

سەدەی (١٦) کە جگە لە هاودیان و باڵەکان و ڕەواندز توانییان هەریر و شەقڵاوەش بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. لە سەردەمی شا عەلی هەریریان کردە مەڵبەندی میرنشینەکە بەڵام تووشی هێرشی بابانەکان دەبێت و دەکوژرێت. پاشان کوڕەکەی میر سەید دەسەڵات وەردەگرێت و تۆڵەی باوکی دەکاتەوە بابانەکان لە ناوچەی میرنشینیی سۆران دەردەکات.

میرنشینیی سۆران پاش شەڕی چاڵدێران لە (١٥١٤) و سەرکەوتنی عوسمانییەکان بەسەر سەفەوییەکان لایەنگریی خۆیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند، کە ئەمەش کاریگەری لەسەر بەهێزبوون و فراوانبوونی سنووری دەسەڵاتیان دەبێت بەتایبەت لە سەردەمی میر بەگی میرنشینی سۆران کە توانی هەولێر و کەرکووکیش بخاتە سەر میرنشینەکە (هەرووتی، ٢٠١٣: ٥٠)، سەرەڕای لایەنگرییان بۆ دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام زۆر جار عوسمانییەکان بەپێی بارودۆخەکە و بەرژەوەندیی خۆیان ڕەفتاری دوژمنکارانەیان پەیڕەو دەکرد، هەوڵی لەناوبردنیان دەدا هەروەک لەسەردەمی سوڵتان سولێمان قانونی کە عیزەدین شێری میرنشینی سۆران لە ساڵی ١٥٣٥ لەسێدارەی دا بە تۆمەتی هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ سەفەوییەکان کە ناوچەکانی میرنشینیی سۆرانیش دەخاتە ژێر دەسەڵاتی حەسەن بەگی داسنی (زەکی، ٢٠٠٦: ٢٧٧).

میرنشینیی سۆران بەهێز دەبێت لە سەردەمی سلێمان پاشای کوڕی قولی بەگ کە وەک کەسێکی بەهێز و کاریگەر توانی لەشکری میرنشینی سۆران بەهێز بکات و بەشداری شەڕەکانی عوسمانی بکات دژی سەفەوییەکان ساڵی ١٥٧٧ یارمەتییان بدات بۆیە بەهۆی خزمەتەکانی بۆ دەوڵەت ڕێزی لێ دەنێت دیاری بۆ دەنێرێت (عبدالسلام، ٢٠١٢: ٢٥٠-٢٥١).

لەدوای ئەویش عەلی بەگی کوڕی دەسەڵات وەردەگرێت و بۆ ماوەیەک فەرمانڕەوایەتی دەکات (بدلیسی، ١٣٨٤: ٣٤٨-٣٩) لەدوای خۆشی

ئۆغز بەگ دەسەڵات وەردەگرێت و توانی سنووری میرنشینەکەی فراوان بکات و مەڵبەندی میرنشینەکەی لە خەلیفان بگوازێتەوە بۆ ڕەواندز (زەکی، ٢٠٠٦، ١٢٧)، پاشان ئەحمەد بەگی کوڕی دەسەڵات وەردەگرێت (١٦٩٥- ١٧٥٦) ئەویش توانی سنووری دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات لەدوای ئەویش ئۆغز بەگی دووەم (١٧٥٦-١٧٦٨) دەسەڵات وەردەگرێت گرنگی بە ئاوەدانکردنەوە و بازرگانی و کشتوکاڵی داوە پاشان مستەفا پاشا لە ساڵی (١٧٦٨) دەبێتە فەرمانڕەوای میرنشینیی سۆران تا هاتنی کوڕەکەی میر محەمەد (سمایل، ٢٠٠٨: ١٤ -١٥).

میر محەمەد، کوڕی مستەفا بەگی کوڕی ئۆغز بەگی کوڕی ئەحمەد بەگە (زەکی، ٢٠٠٥: ٨٩). پێش ئەوەی دەسەڵاتی میرنشینی سۆران وەربگرێت، لە سەردەمی باوکی لە هەندێک لە ناوچەکانی میرنشینی سۆران دەسەلاتدار بووە. دواتر دەسەڵاتی هەموو میرنشینیی سۆرانی وەرگرت (حوزنی، ٢٠٠٨: ٢٦). دوای وەرگرتنی دەسەڵاتی لە (١٨١٣) (زەکی، ٢٠٠٦: ٥٢) دەستی کرد بە چاکسازی بۆ ئەوەی لەسەر شێوازێکی نوێ میرنشینیی سۆران وەک وڵاتێکی سەربەخۆ دوور لە دەسەڵاتی عوسمانی پێش بخات (قەفتان، ٢٠٠٩: ٢٢٦). وەک دامەزراندنی ئەنجوومەنی سەروەری کە خۆی سەرۆکی بوو ڕەسول بەگی برای جێگری بووە، ئەم ئەنجوومەنە دابەشی چەند لێژنەیەک دەبوون، هەریەکەیان تایبەت بوو بە کاروبارێکی وڵات (عەلیاوی، ٢٠٠٤: ٢٦) و هەموو هەفتەیەک کۆدەبوونەوە (نبز، ٢٠٠٣: ١١٨). بۆ ئەم مەبەستەش پێویستی بە سوپایەکی بەهێز و گەورە هەبوو، بۆ بەرگری و چەسپاندنی دەسەڵاتی میرنشینی سۆران و سەرکەوتن بەسەر کۆسپەکانی بۆیە داوای لە کارسازان کرد یارمەتی بنیاتنانی سوپایەکی بەهێز بدەن لە ڕووی چەک و تەقەمەنییەوە کارگەیەکی لە ڕەواندز دروست کردووە (جەلیل و ئەوانیتر، ٢٠١٥: ١٩) کارسازی زیرەک و لێهاتوو وەستا ڕەجەبی لە ورمێ هێنا (سەجادی، ٢٠٠٥: ٦٥-٦٦)و کارخانەیەکی لە کاولۆکان دامەزراند بۆ

دروستکردنی کەرستەی جەنگی وەک شمشێر و تفەنگ و لوولە تۆپ (جەلیل و ئەوانیتر، ٢٠١٥: ١٩-٢٠) کە نزیکەی ٢٢٢ لوولە تۆپی بەرهەم هێنا (سەجادی، ٢٠٠٥: ٦٦)و ڕەواندزی کردە بنکەی بەرهەمهێنانی چەک و تەقەمەنی. هەروەها گرنگی بە دروستکردنی قەڵا و شوورەی سەربازی دا (ئەسفەهانی، ٢٠٠٩: ٣٧)، تەنانەت خەلکی دەنارده چیاکان بۆ ئەوەی کەرستەی خاوی پیشەسازیی چەک و تەقەمەنی لە ئاسن و مس بەدەست بهێنێت (سەجادی، ٢٠٠٥: ٦٥-٦٦). بەمەش توانی سوپایەکی بەهێز دروست بکات کە ژمارەی سەربازەکانی لەوە نەدەچوو کە هی میرنشینێک بێت بەڵکو لە هی نیمچە دەوڵەتێک دەچوو کە نیازی گەورەبوونی هەبێت (قەفتان، ٢٠٠٦: ٦٤). لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک سەرچاوە ژمارەی سەربازەکانی میر محەمەد بە ٥٠ هەزار دەخەمڵێنن (الدملوجي، ٢٠١٠: ٥٦٧). سوپایەکی ڕێکخراو لەسەر شێوازێکی نوێ تەنانەت جلوبەرگی پیادە و سوار لەیەکتر جیاواز بوون (جەلیل و ئەوانیتر، ٢٠١٥: ٢٠). لە ڕووی چەکیش جیاوازییان هەبووە، پیادەکان تفەنگ و خەنجەر و سوارەکانیش ڕم و خەنجەریان بەکار هێناوە (فرەیزەر. ١٩٩٨: ٣٢). ئەم پێشکەوتنەی سوپا ڕەنگدانەوەی لەسەر بوارەکانی تری ژیان هەبوو وەک پێشکەوتنی بازرگانی بەهۆی پاراستن و سەلامەتی کاروانە بازرگانییەکان لە ڕێگای دروستکردنی قەڵای چاودێریی پاراستنی کاروانەکان لە دزی و جەردەیی (البوتاني، ١٩٩٠: ١٥٥).

پاش ئەوەی محەمەد پاشای میرنشینی سۆران سوپایەکی بەهێز و گەورەی دامەزراند ویستی سنووری دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات (قەفتان، ٢٠٠٩: ٦٤-٦٥)، بۆ ئەمەش دەبوایە سەرەتا کۆسپەکانی سەر ڕێگای فراوانخوازیی خۆی لەناو ببات، لەوانە عەبدوڵڵا ئاغای خەزنەدار کە لە سەردەمی باوکیشیدا خەزنەدار بوو لە سێدارەی دا، بەهۆی بوونی پەیوەندی لەگەڵ مامەکانی محەمەد پاشا کە کێشەی لەگەڵ هەبوون (الگوراني، ٢٠١٢: ١٤٠). پاشان توانی مامەکانی خۆی کە تەمەر خان و یەحیا بەگ بوون لەناو ببات (ڕۆحانی، ٢٠١٣: ٣٦٢). بەمەش توانی ناوچەکانی

دەوروبەری ڕەواندز بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و توانی بەسەر کۆسپەکانی ناوخۆدا زاڵ بێت (جەلیل و ئەوانیتر، ٢٠١٥: ١٩). ئەمەش ڕێگای بەردەمی واڵا کرد بۆ ئەوەی فراوانخوازیی خۆی بکات، بەتایبەت لە ناوچەی بابان کە موڵکێکی زۆریان لە ژێر دەسەڵاتدا هەبوو دەربهێنێت (ریچ، ٢٠١٢: ١٥٩).

دیارە بارودۆخی عێراق لە سەردەمی داود پاشا (١٨١٧-١٨٣١ز) یارمەتیدەر بوو بۆ هەوڵەکانی میری میرنشینی سۆران، چونکە نزیکبوونەوەی میرانی بابان لە ئێران وای کرد کە داود پاشا والی بەغدا نەرمی بەرامبەر فراوانخوازیی محەمەد پاشای ڕەواندز بنوێنێت و ئەویش ناوچەیەکی زۆر بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی (بەرزنجی، ٢٠٠٤: ١١٩)، پێشڕەوییەکانی محەمەد پاشا بەردەوام بوون، تەنانەت سنووری عێراقی تێپەڕاند بەهۆی نالەباری بارودۆخی ئێران و شەڕەکانی ڕوسیا ساڵی ١٨٢٦ توانی هەندێک ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی (جەلیل و ئەوانیتر، ٢٠١٥: ٢١).

فراوانخوازییەکانی میرنشینی سۆران بەردەوام بوو بە تایبەت لەو کاتەی کە بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی دوچاری شڵەژان هات بەتایبەتی شکستەکانی بەرامبەر بە شۆڕشی یۆنان (١٨٢١-١٨٣١ز)، شەڕ لە بەرامبەر ڕووسیا (١٨٢٨-١٨٢٩ز) و فراوانخوازییەکانی محەمەد عەلی پاشا لە وڵاتی شام (١٨٣١-١٨٣٣ز) (حاجی، ٢٠٠٧: ١٣١)، تەنانەت لە سەردەمی عەلی ڕەزاش سەرەتا نەتوانرا ڕێگری لێ بکرێت و نازناوی پاشای وەرگرت (هاکان، ٢٠١٢: ٨٣). ئەمەش وایکرد زیاتر بیر لە فراوانخوازی بکاتەوە. بەپێی بەڵگەنامەیەکی میسری کە دەڵێت: پاشای ڕەواندز نەخشەی دەست بەسەرگرتنی هەموو عێراق بە بەغدایشەوە داناوە (نوار، ١٩٦٨: ١٩٥). بۆیە بڕیاری دەستبەسەرداگرتنی بادینانیشیدا بەتایبەت کە بارودۆخی ناوخۆی بادینان شڵەژابوو بەهۆی ناکۆکی و ململانێی لەسەر دەسەڵات لە نێوان میرەکانی بادینان خۆیاندا.

بەڵام کاتێک سیاسەتێکی خراپی بەرامبەر بە خەڵکی بادینان بەکار دەهێنا، خەڵکی بادینانیش لە نامەیەکدا کە بۆ عوسمانییەکانیان ناردووە داوای چارەسەر دەکەن کە ناتوانن بەرگەی ئەم کارانە بگرن کە چۆن ژن و منداڵەکانی بردبوون و لە ڕەواندز بفرۆشن (دۆسکی، ٢٠١٥: ١٣٥-١٣٦) بۆیە گرتنی بادینان و ناوچەی ئێزیدییەکان نەخشەی فراوانخوازیی محەمەد پاشای ڕەواندز بووە، ئەم نەخشەیە زۆر بەرفراوان بوو، تەنانەت مەترسی بۆ سەر موسڵیش هەبوو، هەروەک لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانی کە لە ٣ی کانوونی دووەمی ١٨٣٦دا هاتووە (دوای ئەوەی لە لایەن والیی موسڵ ١٠ کەس بەهۆی خراپەکاری دەرکراون موتەسەریفی ڕەواندز ئەو ١٠ کەسەی بردۆتە لای خۆی، ئەمەش مەترسییە هەروەک چۆن دەستی بەسەر ئامێدی و هەولێریش داگرتووە پلانی هەیە دەست بەسەر موسڵیشدا بگرێت، بۆیە موتەسەریفی موسڵ سەعید پاشا پەشیمان بۆتەوە لە دوورخستنەوەی ئەو ١٠ کەسانە و داوای کردووە بگەڕێنەوە بۆ موسڵ) (عادل، ساڵ نییە: ٣٠). ئەمانە مەترسی فراوانخوازییەکانی محەمەد پاشای ڕەواندز بوون بۆ سەر موسڵ کە بەپێی هەندێک سەرچاوە ئەمە نەخشەیەک بوو لەنێوان محەمەد پاشای میرنشینی سۆران و محەمەد عەلی میسر کە گوایە نامەگۆڕینەوە هەبووە لە نێوانیان دژی بەرژەوەندیی عوسمانی (حوزنی، ٢٠٠٧: ٤٧-٤٨).

بەڵام بەپێی بەڵگەنامەکانی میسری، عێراق لە نەخشەی دەوڵەتی محەمەد عەلیدا نەبووە، بەهۆی زۆریی تێچوون و زۆریی بەڕێوەبردن و دووریی عێراق لە میسر، سەرەڕای ترسی بەریتانیا بەهۆی هەبوونی بەرژەوەندییەکانی لە عێراق داواتە تەنها هانی خەڵکی عێراقی بدەن دژی عوسمانییەکان بۆ ئەوەی سەرقاڵیان بکەن بەشداری شەڕ نەکەن دژی میسر (غازی، ٢٠١٦: ٣١، ٢٦١، ٢٣٩). واتە بەپێی لێکدانەوەکان بەڵگەنامەکانی میسری هیچ پەیوەندییەکی لە نێوان محەمەد پاشای ڕەواندز و محەمەد عەلی میسری نەبووە، بەڵکو تەنها چاودێریکردنی فراوانخوازییەکانی محەمەد پاشای ڕەواندزە لە ناوچەکە، بۆ ئەوەی

بتوانێت لەشکری عوسمانی لە ناوچەکەدا سەرقاڵ بکات بە فراوانخوازییەکانی میری میرنشینیی سۆران هەر لە ناوچەی بادینان نەوەستا بەڵکو هێرشی کردە سەر ناوچەی بۆتان، جزیرە، ماردین و نەسیبینی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی (نوار، ١٩٨٦: ١٩٥)، بەم شێوەیە محەمەد پاشا توانی چاکسازی بکات و دەسەڵاتێکی بەهێز لە ڕووی ئابووری و سیاسی و کارگێڕی دروست بکات و سوپایەکی بەهێز لەسەر شێوازێکی نوێ بە هەموو پێداویستییەکانی سەربازییەوە دروست بکات. هەروەها هەوڵی دا ئارامی بۆ خەڵکی ناوچەکە دابین بکات و سنوورەکانی خۆی بپارێزێت و سوود وەربگرێت لە بارودۆخی گشتی ناوچەکە و سنووری دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات، ناوچەی زۆری خستە سەر میرنشینیی سۆران و کە ئەمەش هەوڵێک بوو بۆ هێنانەدیی ئامانجەکەی لە دروستکردنی دەسەڵاتێکی بەهێزی سەربەخۆیی کوردی بەڵام ئەم کارانەی بەپێی سیاسەتی گشتیی عوسمانی کاردەکاتە سەر بەرژەوەندییەکان و وەکو مەترسی و هەڕەشەیەک لە ناوچەکە لە قەڵەمی دەدەن و بەتایبەتی بۆ سەر ویلایەتی موسڵ بۆیە پیلانی لەناوبردنی میرنشینیی سۆران و لێدانی محەمەد پاشای ڕەواندز دادەڕێژن بە هاوکاریی دەوڵەتە زلهێزەکان بۆ ئەوەی میرنشینیی سۆران لەناو ببەن. چونکە بەرژەوەندیی دەوڵەتە زلهێزەکانی ئەوکات بەتایبەتی بەریتانیا لەگەڵ پاراستن و مانەوەی دەوڵەتی عوسمانی بووە بە لاوازی (ئەسکەندەر، ٢٠٠٩: ٢٥٢-٢٥٣).

## تەوەری دووەم

## هەڵوێستی محەمەد ئینجە بەیرەقدار بەرامبەر بە میرنشینیی سۆران و فراوانخوازییەکانی محەمەد پاشای ڕەواندز

فراوانخوازییەکانی محەمەد پاشا بووە هۆی ئەوەی کە بەرژەوەندیی سیاسی و ئابووریی دەوڵەتە زلهێزەکان بکەوێتە مەترسییەوە، ئەمەش وای کرد هەڵوێستیان هەبێت بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی دژی دەسەڵاتە خۆجێییەکان، چونکە مەترسی بۆ سەقامگیری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەبوو بەتایبەت کە ئەوروپییەکان فشاریان خستە سەر عوسمانییەکان بۆ لەناوبردنیان چونکە ڕێگر بوون لە گەیشتنیان بە بازاڕەکانی ئەم ناوچانە نەخاسمە بەریتانیا کە ساڵانی (١٨٢٥ـ ١٨٥٥) ڕادەی بازرگانی لە ناوچەکە زیادی کردبوو کە ئەو ماوەیەش ساڵانی لەناوچوونی میرنشینە کوردییەکان بوو (ئەسکەندەر، ٢٠٠٩: ٢٢٩). کە ئەمەش لە بەرژەوەندیی دەوڵەتی عوسمانی بە شێوەیەکی گشتی و ویلایەتی موسڵ بەتایبەتی دەبێت؛ چونکە ماوەیەکی زۆر بوو بەیرەقدار دەیویست بەهەر ڕێگایەک بێت بتوانێت بەسەر میرنشینیی سۆران زاڵ بێت.

سەرەڕای ململانێ لە نێوان ڕووسیا و بەریتانیا لەسەر بەرژەوەندییەکانیان لە دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام دەوڵەتێکی عوسمانی لاوازیان پێ باشتر بوو لە میرنشینێکی کوردی بەهێز کە دژی بەرژەوەندییەکانیان بێت (ئەسکەندەر، ٢٠٠٩: ٢٢٧–٢٢٨). بۆیە فراوانخوازییەکانی میرنشینی سۆران و بەهێزبوونی، گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە حیسابی بۆ بکرێت. هەر ئەمەش وای کرد کە دەوڵەتە ئەوروپییەکان تووشی سەرسامی بکەن و هەست بەو مەترسییە بکەن، بەتایبەت بەریتانیا سیاسەتێکی گشتگیری هەبوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە نابێت دەسەڵاتێکی تر جێگای عوسمانییەکان بگرێتەوە و بەرژەوەندییەکانیان بخاتە مەترسییەوە. نەوەکو ڕووسیا، دەست بخاتە کاروباری ناوچەکە و کێشەیەکی سیاسی دروست بکات (حاجی، ٢٠٠٧:

١٣٤). بۆیە بەریتانیا بە ئاشکرا دژایەتیی خۆی بۆ محەمەد پاشا ڕاگەیاند لە ڕێگای ریشارد وود کە کونسوڵی بەریتانیا بوو لە حەڵەب (ئەسکەندەر، ٢٠٠٩: ٢٦٤). هەروەها کونسوڵەکانی لە بەغدا و باڵوێزی لە ئەستەنبۆڵ هەوڵیان دەدا سەرکردە کوردەکان ساردبکەنەوە بۆ ئەوەی لە پشتگیریکردنی محەمەد پاشای ڕەواندز، سەرباری نزیکبوونەوەی ئێران و دەوڵەتی عوسمانی دژی میرنشینی سۆران (عەلی، ٢٠١٠: ١٩-٢٠) هەروەها بەریتانیا ڕۆڵی هەبوو لە کوشتنی محەمەد پاشا (جویدة، ٢٠١٣: ١٦٧).

بێجگە لە بەریتانیا، ڕوسیاش یارمەتی دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی دەدا بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتە خۆجێییەکان و پاراستنی بەرژەوەندەییەکانی خۆی و ململانێ لەگەڵ بەریتانیا (حاجی، ٢٠٠٧: ١٣٧). ئەم ململانێیە و فشار خستنە سەر دەوڵەتی عوسمانی وای کرد لە ئێران نزیک بێتەوە دژی محەمەد پاشای ڕەواندوز. بەتایبەت ئێران دوژمنایەتی هەبووە بەرامبەری لەکاتی هێرشی میرنشینی سۆران بۆ سەر هەندێک ناوچەی ئێران (قەفتان، ٢٠٠٦: ٧٠)، کاتێک هێزی ئێران لە سلێمانی بوو دوژمنایەتی خۆی بۆ میرنشینی سۆران ڕاگەیاندبوو (فرەیزەر، ١٩٩٨: ٤٨)، وەکە محەمەد پاشا هێرشی کردەسەر لاهیجان لە ئێران بارودۆخی ئێران خراپ بوو بەڵام کە محەمەد شای ئێران (١٨٣٤-١٨٤٨ز) هاتە سەر دەسەڵات، ڕێکەوت لەگەڵ میرنشینی سۆران بۆ ئەوەی بکشێتەوە و وەک فشارێک دژی عوسمانی بەکاری بهێنێت، بەڵام بەریتانیا لە ترسی هاتنی لەشکری ڕووسیا لە ڕێگەی ئێران بۆ عێراق یارمەتی دەوڵەتی عوسمانیدا (لازاریف، ٢٠١٥: ١٩٤-١٩٥).

سەرەڕای ئەوەی باس لە پەیوەندیی نێوان محەمەد پاشا و دەسەڵاتدارانی ئێران دەکرێت واتە پەیوەندیی نهێنی لە نێوانیان هەبووە (ئەسکەندەر، ٢٠٠٩: ٢٧٤-٢٧٥). بەڵام بەرژەوەندیی زلهێزەکان وای کرد ئێران و دەوڵەتی عوسمانی لەیەکتر نزیک بکەنەوە دژی میرنشینی سۆران، بۆ لەناوبردنی میرنشینی سۆران هاوکاری یەکتر بکەن. کاتێک ئێران

لەشکرێکی ١٠ هەزار سەربازی دەنێرێتە سەر سنووری لەگەڵ عێراق بۆ لێدانی لایەنگرانی میرنشینی سۆران کە نەخشەیەکی ئینگلیز و ڕووسیا بوو بۆ لەناوبردنی قەوارە سەربەخۆیەکەی میرنشینی سۆران لە ناوچەکە، سەرەڕای ئەوەی ئێران نەیدەویست میرنشینێکی بەهێز وەک میرنشینی سۆرانی دراوسێی بێت (لازاریف، ٢٠١٥: ١٩٨).

بەڵگەنامەکانی عوسمانی دووپاتی هاوکاریی ئێران دەکاتەوە، چونکە پێشتر لەشکری ئێران لە ناوچەکانی سلێمانی هەبووە بەهۆی نزیکییان لە بابانەکان، بۆیە لەشکریان لە عێراق کشاندەوە کە یارمەتیدەری عوسمانی بوو بۆ لەناوبردنی میرنشینی سۆران. ئەوەتا عەلی ڕەزا پاشا والیی بەغدا (١٨٣١-١٨٤٢ز) لە نامەیەکدا بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەنووسێت کێشەی سلێمانی لەگەڵ ئێران لەلایەن بەیرەقدار والیی شارەزوور چارەسەر کراوە (هاکان، ٢٠١٢: ٨٤-٨٨). ئەمەش ڕۆڵی بەیرەقدار بەدیار دەخات لە دژی میرنشینی سۆران کە توانی کێشەی ئێران چارەسەر بکات بۆ ئەوەی ڕێگا خۆشکەر بێت بۆ لەناوبردنی میرنشنیی سۆران و تەنانەت ئێران یارمەتیدەریش بێت بۆ لێدانی محەمەد پاشای ڕەواندز.

ئەم گەلەکۆمەکیە لەسەر میرنشینیی سۆران هەبوو لەناو دەوڵەتە زلهێزەکان، یارمەتی لەناوچوونی میرنشینیی سۆرانیان دا. لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا لە ١٢ی نیسانی ١٨٣٧دا هاتووە کە نامەیەکی وڵاتی نەمسایە بۆ دەوڵەتی عوسمانی کە تێدا خۆشحاڵی ئەو وڵاتە دەردەخات سەبارەت بە سەرکەوتنەکانی هێزەکانی عوسمانی بەسەر میرنشینیی سۆران. "بەپێی نووسراوی باڵوێزی نەمسا و پاڵپشتی ناوبراو باش وەکیلی نەمسا بەبۆنەی سەرنەکەوتن و شکانی بەگی ڕەواندوز نامەیەکی بۆ نوێنەری نەمسا لە ئەستەنبۆڵ ناردووە هەروەها پارێزگاری بلگراد کە لەلایەن ئیمپراتۆری نەمسا قبوڵ کراوە بەپێی ڕاپۆرتی پارێزگاری بلگراد کە پێشکەشی نوێنەری نەمسا کراوە، پارێزگاری نەمسا عەلی ڕەزا پاشای والی بەغدای داوەت کردووە بە

ناوی ئیمپراتۆریەتی نەمسا لایەنگر و پاڵپشتی لە پاشا کردووە و پاشاش بەو هەڵوێستەی ئیمپراتۆر خۆشحاڵی خۆی نیشانداوە" (عادل، ساڵ نییە: ٣٣) واتە ئاگاداری هێرشی عوسمانی بوونە بۆ سەر میرنشینیی سۆران، ئەو شەڕەی لە ڕەواندوز ڕوویداوە و بەهۆی ئەو بەرگرییەی کە لە لایەن سوپاوە کراوە شازادە میتەرنیخ لە ئاداری ١٨٣٨ نامەیەکی بۆ نوێنەری نەمسا لە ئەستەنبۆڵ ناردووە، دواتر نامەکە پێشکەشی وەزارەتی دەرەوە کراوە ئەم نووسراوە لەلایەن دەوڵەت وەرگیراوە (عادل، ساڵ نییە: ٣٤). واتە دەوڵەتە زلهێزەکان یارمەتی دەوڵەتی عوسمانییان دابوو بۆ لەناوبردنی میرنشینیی سۆران هەروەها نەخشەیەکی نێودەوڵەتی بۆ دژی دەسەڵاتە خۆجێییەکان و لەوانەش میرنشینیی سۆران هەبووە بەتایبەت بەریتانیا یارمەتی عوسمانی دا دژی کورد، چونکە بەریتانیا دەیویست پارێزگاری لە دەوڵەتی عوسمانی بکات لەبەر ئەوەی لەناوچوونی دەوڵەتی عوسمانی لە بەرژەوەندیی ڕووسیا دەبوو کە دەیویست بگاتە خاکی عوسمانی. واتە بەریتانیا محەمەد پاشای بە مەترسی دادەنا لەسەر تێکچوونی هاوسەنگیی هێز لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (عەلی، ٢٠١٠: ٤٩). هەروەها فەرەنساش ویستی یارمەتی دەوڵەتی عوسمانی بدات بۆ لەناوبردنی میرنشینیی سۆران، بەتایبەتی کاتێک محەمەد پاشای ڕەواندز هێرشی کردە سەر مەسیحییەکان لە ئەلقوش لە ساڵی ١٨٣٥، فەرەنساش لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆی لە ژێر پەردەی پاراستنی مەسیحییەکان لەم ڕێگەیەوە دەست بخاتە ناو کاروباری ئەم وڵاتەوە و داوا لە دەوڵەتی عوسمانی بکات محەمەد پاشای ڕەواندز دەستگیر بکات و هەوڵ بدات بۆ لێدانی میرنشینیی سۆران (عەلی، ٢٠١٣: ٢٩). کەواتە بەریتانیا و ڕووسیاو فەرەنسا و دەوڵەتی قاجاری و عوسمانییەکان هاوڕا بوون بۆ لە ناوبردنی میرنشینیی سۆران (مەدەنی، ٢٠٠٩: ٢٦).

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا بەرژەوەندییەکی نێودەوڵەتی دروست بوو، کە وەکو مەترسی و هەڕەشەیەک سەیری میرنشینیی

سۆران دەکرا، ئەمەش ڕێگای خۆشکرد بۆ دەوڵەتی عوسمانی کە بڕیاری لەناوبردنی میرنشینیی سۆران بدات و کۆتایی بە دەسەڵاتی محەمەد پاشا بهێنێت.

بارودۆخی نێودەوڵەتی کە باسمان کرد یارمەتیدەرێکی باش بوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی کە بڕیاری هێرشکردنە سەر میرنشینیی سۆران بدات و محەمەد پاشای ڕەواندز لەناو ببات. هەروەک چۆن سنووریان بۆ فراوانخوازییەکانی محەمەد عەلی پاشای میسر دانا و (ڕێکەوتنی کوتاهیە)[1] یان پێ مۆرکرد لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، ئەمەش دەستی دەوڵەتی عوسمانی والاکرد بۆ لێدانی دەسەلاتە خۆجێییەکان (ئەسکەندەر، ٢٠٠٩: ٢٧٠). بەتایبەت لە سەردەمی دەسەڵاتی سوڵتان مەحمودی دووەم (١٨٠٧ـ ١٨٣٩) کە بڕیاری چەسپاندنی دەسەڵاتی ناوەند و لەناوبردنی دەسەڵاتە خۆجێیەکانی دا بەتایبەت لە عێراق و لەناوبردنی داود پاشا لە ساڵی ١٨٣١ و جەلیلییەکان لە ساڵی ١٨٣٤ کە ئەمانە هەموو هەنگاوی چەسپاندنی دەسەڵاتی ناوەند بوون (عەلی، ساڵ نییە، ١٨٠-١٨٣) هۆکاری چەسپاندنی دەسەڵاتی ناوەند لە کوردستان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە مەترسی دەسەڵاتی ڕووسیا و ئێران لە دەوڵەتی عوسمانی بەدوور بخەن کە سنووریان نزیکە لەم دوو دەوڵەتە ڕکابەرەی عوسمانی، هەروەها لەناوبردنی شۆڕش و ڕاپەڕینە کوردییەکان کە خەریکە دژی سەرکردەی میرنشینەکان دەکرێت سەرەڕای ئەوەی بتوانێت لایەنی ئابووری و سەربازیی کوردستان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و باج و سەرانەیەکی زیاتر بخاتە سەر خەڵکەکە و دەست بگرێت بەسەر خێر و بێری کوردستان لە ڕووی کشتوکاڵەوە و سیاسەتی سەربازیی زۆرەملێ جێبەجێ بکات مستەفا ڕەشید پاشا نەخشەی لەناوبردنی دەسەڵاتە خۆجێییەکانی جێبەجێ کرد لە کوردستان بۆ ئەم کارەش عەلی ڕەزا پاشای والیی بەغدا و بەیرەقداری والیی موسڵ یارمەتییان دا (هەرووتی، ٢٠٠٨: ١٨٠-١٨٣). پێشتر عەلی ڕەزا والیی بەغدا بەهۆی ڕاپەڕینەکانی وەهابییەکان[2] لە عەرەبستانی سعودیە نەیتوانی ڕێگری لە

فراوانخوازییەکانی محەمەد پاشای ڕەواندوز بکات تەنانەت نازناوی پاشایەتیشی پێ بەخشی بەمەش سنووری دەسەڵاتی فراوانکرد هەروەک پێشتر باسمان کرد و چەندین ناوچەی لە بابان و بادینان و بۆتان کەوتە دەست (هاکان، ٢٠١٢: ٨٣).

ئەم فراوانخوازییانە بوونە مەترسی بۆسەر بەرژەوەندەییەکانی عوسمانی، بەتایبەت کە ئەوان دەیانویست عێراق بکەنە بنکەیەک دژی میسر. میرنشینیی سۆرانیش ببووە مەترسی لە پێش هێزەکانی عوسمانی (نوار، ١٠٣:١٩٦٨). ئەمانە هۆکار بوون بۆ ئەوەی عوسمانییەکان لەسەر ئاستی دەوڵەت بڕیاری لەناوبردنی میرنشینیی سۆران بدەن و هێرش بکەنە سەر ڕەواندز (بۆرکای، ٢٠٠٨: ٣٦٨).

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کەوا هێزە دەرەکییەکان ڕۆڵیان هەبووە لە لەناوچوونی میرنشینیی سۆران، دەوڵەتی عوسمانیش لەم بارەیەوە ڕۆڵێکی دیاری هەبووە لە ناشیرین کردنی وێنەی میرنشینیی سۆران و میرەکەی محەمەد پاشا لەبەر چاوی ئەو دەوڵەتانە، بۆیە هەموو ئەو دەوڵەتانە لەسەر ئەوە کۆک بوون کە کۆتایی بە میرنشینیی سۆران بهێنن.

سەرەڕای ئەو هۆکارانەی کە باسمان کردن، کۆمەڵە هۆکارێکی ناوەخۆش هەبووە بۆ لەناوچوونی میرنشینیی سۆران، کە هەموو ئەمانە یارمەتی عوسمانیدا کە ئاسانتر بەسەری زاڵ بن. بەتایبەتی کەسایەتی میر هەرچەندە هەوڵی داوە ژیانی خەڵک باش بکات و دەسەڵاتێکی سەربەخۆ دروست بکات، بەڵام فریزەر دەڵێت" **محەمەد پاشای ڕەواندز لەهەمان کاتدا کەسێکی خۆ سەپێن بووە لە سزادان و کوشتن سڵی نەکردۆتەوە هەرچی هاتۆتە سەر ڕێگای واتە کۆسپ بووە بۆ ئامانجەکەی لەناوی دەبرد**"(فریزەر، ١٩٩٨: ٣٤). لونگریک دەڵێت" **محەمەد پاشای ڕەواندز زیاتر کەسێکی ترسێنەر بووە لەوەی کە کەسێکی خۆشەویست بێت و هەندێک خەڵک حەزیان لە چارەی نەبووەو دەیانویست لەناو بچێت**"(لورینک، بدون سنة: ٣٤٣). کاوس

قەفتانیش دەڵێت"**محەمەد پاشا لە کاتی فراوانخوازییەکانی سنووری میرنشینی سۆران لە ناوچەکانی بابان، بۆتان، ئەردەلان و بادینان خەلکێکی زۆری کوشت و تالان و وێرانکارییەکی زۆری بەجێ هێشت، ئەو کوشتارە زۆرەی بەرامبەر ئێزدییەکان کردی بەمەش خەلک چاوەڕێی تۆلە و لەناوچوونی محەمەد پاشایان دەکرد**"(قەفتان، ٢٠٠٦: ٦٤). هەروەک خەڵکی بادینان لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانی گلەیی زۆر لە سیاسەتی توندی محەمەد پاشای ڕەواندز دەکەن بەرامبەر خەڵکی هەژاری (دۆسکی، ٢٠١٥: ١٣٧).

سەرەڕای ئەو هەموو فراوانخوازی و شەڕکردنە کە لەسەر شانی خەڵک بوو قوربانی زۆریان دا و باری سەرشانی خەڵکی زیاتر قورس کرد، چونکە خەڵک هەژار و برسی بوو کە تەواوی ڕۆژ کاریان دەکرد بۆ دەستکەوتنی نان کە ئەویش زۆر زەحمەت بوو (بۆرکای، ٢٠٠٨: ٣٢٧). سەرەڕای وەرگرتنی باج لە هەندێک ناوچە، کە باری سەرشانی خەڵکی قورستر کرد. لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا کە لە ٩ی حوزەیرانی ١٨٣٥دا هاتووە کە "بەندەکانی والیی شەهرەزوور مەدحەت پاشا دوای گەڕانەوەیان لە ماردین لە کەرکووک نیشتەجێ بوونە، لەگەڵ عەساکری مەنسوورە و سەربازەکانی تر لە کەرکووک ماونەتەوە لە دانیشتوانی ڕەواندز محەمەد پاشا خۆی کە موتەسەریفی ڕەواندزیشە بە بیانووی سەربازییەوە لە خەڵکی کەرکووک زەخیرە و پارەی لە خەڵکی هەژار و دەستکورت کۆ کردۆتەوە هەروەها عەساکری مەنسوورەی تووشی جۆرەها دەردەسەری کردووە، پێچەوانەی ئەوەی دەوڵەت نووسیویەتی ئەنجامی دەدات. ڕۆژانە بە پارە کۆکردنەوە ئاسایش و ئەمنیەتی هەموو خەڵکی تێکداوە ئەم کارەشی بۆ مەبەست و سوودی خۆی ئەنجام دەدات) (عادل، ساڵ نییە: ٣٦). ئەمانە هۆکار بوون بۆ ئەوەی خەڵکی سۆزیان بەرامبەر بە میر محەمەد کەم بێتەوە لەکاتی هێرشی عوسمانی بۆ سەر ڕەواندوز بەڵگەنامەکانی عوسمانیش ئەمە دووپات دەکەنەوە کە (میر محەمەد دوژمنی زۆری بۆ پەیدا بوو بەهۆی کاری

فراوانخوازییەکانی بەمەش خاڵێکی ئەرێنی بوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی لەکاتی هێرشکردن" (هاکان، ٢٠١٢: ٨٤). لەو بەڵگەنامەیەدا عوسمانییەکان محەمەد پاشای ڕەواندز تاوانبار دەکەن بە تێکدانی ئاسایشی ناوچەکە و چونکە کارەکانی محەمەد پاشا لە بەرژەوەندیی دەوڵەتی عوسمانیدا نییە.

ئەمانە هەموو هۆکار بوون کە ڕێگە خۆش بکەن بۆ ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی بڕیاری کۆتایی بەرامبەر بە میرنشینیی سۆران بدات. کاتێک ڕەشید پاشای والیی سیواس وەڵامی خەڵکی بادینان دەداتەوە بەوەی سوڵتانی عوسمانی هەرگیز ڕازی نابێت محەمەد پاشای ڕەواندز و لەگەڵ ئەوەی والیی بەغداش ڕازی نابێت، بۆیە سوڵتانی عوسمانی ژمارەیەکی زۆر لە سەربازی ڕەوانە کردووە بۆ محەمەد پاشای ڕەواندز، بۆ ئەوەی ئاسایش بۆ ناوچەکە بگەڕێتەوە (هاکان، ٢٠١٢: ٨٦). ئەمانە دەستپێکی لێدانی دەسەڵاتی محەمەد پاشای ڕەواندز بوو، واتە بڕیاری لێدانی میرنشینیی سۆران دەرچوو. لەگەڵ ئەوەش دانانی محەمەد ئینجە بەیرەقدار نیشانەیەکی تر بوو لە مووسڵ بۆ لێدانی میرنشینیی سۆران و دەسەڵاتە کوردییەکان. بەگشتی بەیرەقدار کەسێکی زیرەک و بەتوانا بووە لە ڕووی سەربازی و هونەری شەڕکردن (گیست، ٢٠١٢: ١٩٣). کاتێک عەلی ڕەزا بڕیاریدا بەیرەقدار لە شارەزوور بگوازێتەوە بۆ مووسڵ بۆ چەسپاندنی سیاسەتی ناوەند، بەیرەقداریش یەکەم والیی عوسمانی بوو کاری کرد بۆ چەسپاندنی ئەم سیاسەتە (احمد، ١٩١٨: ٣٠٥).

بەیرەقدار دوژمنێکی سەرسەختی کورد بوو، هەموو هەوڵێکی ئەو والییە لەناوبردنی میرنشینە کوردییەکان بوو (لوتینک، ساڵ نییە: ٣٤٠)، چونکە بەیرەقدار کاتێک دەسەڵات وەردەگرێت، بیر لەوە دەکاتەوە کە سەرکەوتوو نابێت تا دەسەڵاتی میرنشینە کوردییەکان لەناو نەبات، بە تایبەت مەترسی میرنشینیی سۆران لەسەر بەرژەوەندیی عوسمانی لە ناوچەکە کە وەکو کۆسپ وابوو، لە ڕێگای چەسپاندنی سیاسەتی

ناوەند و تەنانەت کاریگەریشی لەسەر دەسەڵات و سیاسەتی بەیرەقدار لە مووسڵ هەبوو. بۆیە هەر لە کاتی وەرگرتنی دەسەڵات لە مووسڵ سیاسەتی لەناوبردنی میرنشینیی سۆرانی پەیڕەو کردووە (نوار، ١٩٦٨: ١٠٤)، چونکە ناردنی بەیرەقدار بۆ مووسڵ هۆکارێک بوو بۆ لەناوبردنی میرنشینیی سۆران، لە نامەیەکی عەلی ڕەزا پاشای والیی بەغدا بۆ دەوڵەتی عوسمانی نێردراوە کە تێدا هاتووە محەمەد ئینجە بەیرەقداری ناردووە بۆ مووسڵ بۆ ئەوەی کێشەی ڕەواندز چارەسەر بکات، توانا و بەهێزیی بەیرەقدار وادەکات عەلی ڕەزا دڵنیا بێت کە دەتوانێت ئەم کارە بە سەرکەوتوویی جێبەجێ بکات (هاکان، ٢٠١٢: ٨٨).

کاتێک هێزەکانی میری ڕەواندز محەمەد پاشا دەبنە مەترسی لە دواوە بۆ سەر هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی دژی فراوانخوازیی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی لە شام و بەشێک لە ئەنادۆڵ، شام و عێراق. بەمەش دەسەڵاتی عوسمانی سەرکردایەتییێکی هاوبەشیان لە مەلاتیە بەسەرکردایەتی بەیرەقدار دروست کردووە بۆ لەناوبردنی میرنشینیی سۆران لە کوردستان) (غازی، ٢٠١٦: ١٧١). بۆیە بەیرەقدار لە ماوەی فەرمانڕەوایی خۆی لە مووسڵ زۆر جار هەوڵی لەناوبردنی میرنشینیی سۆران و محەمەد پاشای ڕەواندزی داوە تەنانەت هێرشی کردۆتە سەر بەڵام سەرکەوتوو نەبووە (حوزنی، ٢٠٠٧: ٦٤) و (عەلی، ٢٠١٢: ٦٤)، تا ئەو کاتەی لەشکری عوسمانییەکان بە سەرکردایەتی ڕەشید پاشا ئامادەکرا بەهاوکاری و هەماهەنگی لەگەڵ هەریەک لە عەلی ڕەزا والیی بەغدا و محەمەد ئینجە بەیرەقدار والیی موسڵ (صائغ، ١٩٢٧: ٣١٢).

هەرچەندە سەرەتا عەلی ڕەزا پاشا ناڕازی دەبێت بەرامبەر بەوەی ڕەشید پاشا سەرکردایەتی سوپای عوسمانی بکات بۆ لەناوبردنی میرنشینیی سۆران، چونکە ئەمە بە دەست تێوەردان دادەنێت لە کاروباری عێراق (هاکان، ٢٠١٢: ٨٨). بەڵام لە ژێر چاودێریی ڕەشید پاشا بە واژووی عەلی رەزا پاشا والیی بەغدا لەسەر مەسەلەی ڕەواندز

دووبارە ڕەزامەندی دراوە یەک لیوای عەسکەری ڕەوانەی ڕەواندز بکرێتەوە تا بتوانرێت بەپەلە ئەم ناوچەیە کۆنترۆڵ بکرێتەوە و ئەو مەسەلەیە دابخرێت (عادل، ساڵ نییە: ٣٨). لە بەڵگەنامەیەکی تری عوسمانیدا کە لە ١٠ی حوزەیرانی ١٨٣٦دا هاتووە دەڵێت: "بەپێی نووسراوێک کە لە لایەن والیی بەغدا عەلی ڕەزا پاشا نووسراوە ڕەوانەی ئەستەنبوڵ کراوە، تێدا هاتووە والیی سیواس ڕەشید پاشا لەگەڵ سوپایەکەی کە پیادە و سوارە لە مووسڵ نزیک بۆتەوە لەگەڵ والیی مووسڵ محەمەد پاشا بەیەکەوە ئامادەکاری دەکەن بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر ڕەواندز. هەروەها ڕەشید پاشا بە نیازە لە ڕێگەی کەرکووکەوە ڕوو بکاتە ڕەواندز تا بتوانێت ڕەواندز لە ڕووی ئاسایش و ئەمنیەتەوە جێگیر بکەن" (عادل، ساڵ نییە: ٣٨).

هەرچۆنێک بێت ئەمە چارەسەر کرا، چونکە بڕیاری دەوڵەتی عوسمانی دەرچوو بۆ لێدانی میرنشینیی سۆران و لەناوبردنی محەمەد پاشای ڕەواندز، بۆیە دەبێت هەماهەنگی و یارمەتی هەبێت لەنێوان عەلی رەزا و بەیرەقدار و رەشید پاشا هەروەکو لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا لە ئاداری ١٨٣٧دا هاتووە"لە نێوان والیی بەغدا عەلی ڕەزا پاشا و والیی سیواس رەشید پاشا پەیوەندی و هەواڵ گۆڕینەوە هەبوو لە بارەی رەواندزەوە، بەپێی ئەو نووسراوەی پێشکەش کراوە بۆ کۆنترۆڵکردنی رەواندز لە نزیکترین شوێن هێز هاتووە و نێردراوە بۆ ئاڵتون کۆپری[٣] سەر بە میرنشینیی ڕەواندز ئەو شوێنە لە ڕووی ئەمنی و ئاسایشەوە سەقامگیرکراوە (عادل، ساڵ نییە: ٣٨)". بۆیە رەشید پاشا و لەشکرەکەی ساڵی ١٨٣٦ سەرەتا هێرش دەکاتە سەر ناوچەکانی سەر بە جزیرە لەوێش بۆ ناوچەکانی تر و دەیویست جزیرە لەژێر دەسەڵاتی میری میرنشینیی سۆران دەربهێنرێت. ئەم لەشکرکێشییە ماوەیەک بەهۆی زستان ڕاگیرا. بەڵام جارێکی تر بەرەو جزیرە هاتن و دەستیان بەسەرداگرت، بڕیار درا کە کاتی بەئەنجام گەیاندنی کاری ڕەواندزە (هاکان، ٢٠١٢: ٨٩-٩١).

بڕیاردرا لەشکری ڕەشید پاشا بەیارمەتی عەلی ڕەزا والیی بەغدا لەگەڵ والیی مووسڵ لەو شوێنە دەست پێبکات کە دەچوونە ناو دڵی میرنشینیی سۆران. بە لێدانی ناوچەکانی دەوروبەر بەمەش هێرش کرایە سەر ئێزیدییەکان لەسەر ڕێگای نەسیبین[٤] و ماردین[٥] کە نەخشە ڕێگای لەناوبردنی میرنشینیی سۆران بوو (نوار، ١٩٦٨: ١٠٤-١٠٥). هێزەکانی ڕەشید پاشا لە جزیرە بەرەو زاخۆ ناوچەی بادینان و مووسڵ هاتن لەگەڵ هێزی بەیرەقدار بەرەو ڕەواندز بەڕێکەوتن (زەکی، ٢٠٠٥: ٩١). هەروەک لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا هاتووە کە لیوای پیادە و لیوای سوارە لە لایەن والیی سیواس رەشید پاشا نێردران کە فەرمان دەرچووە کە ئەم دوو لیوایە یەکەم جار دەچنە بەغدا و لەوێشەوە ڕوو دەکەنە ڕەواندز، بەڵام ئەم سەربازانە تووشی ناخۆشی و ماندوو بوون دێن، بۆیە هەر لە دیاربەکرەوە ڕوو دەکەنە ڕەواندز، چونکە ڕەشید پاشا لە مووسڵ نزیکە و ئەو لیوایە ڕادەستی محەمەد پاشای والیی موسڵ بەیرەقدار دەکرێت و لەوێشەوە روو دەکەنە کەرکووک و دوایی بۆ ڕەواندز، بەڵام هەواڵ هاتووە لە مووسڵ تەنیا لیوای پیادە گەیشتۆتە مووسڵ دوای ٢٤ ڕۆژ ڕووی کردۆتە کەرکووک ئەمەش جارێکی تر ڕۆڵی بەیرەقدار بەدیار دەخات لە هەڵمەتی لەناوبردنی میرنشینیی سۆران کە ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە لە هێرشکردنە سەر ڕەواندز (عادل، ساڵ نییە: ٣٩). لەو لاشەوە عەلی ڕەزا بەرەو ئاڵتون کۆپری هات و هەولێریشی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی (نوار، ١٩٦٨: ١٠٧). بەڵگەنامەیەکی عوسمانی لە تەمموزی ١٨٣٦ باسی قەڵای ئاڵتون کۆپری دەکات و دەڵێت"قەلای ئاڵتون کۆپری کە سەر بە دەسەڵاتی ڕەواندز لە دەستی هێزەکانی محەمەد پاشای ڕەواندزدان، بۆیە دەوڵەت ٢٠ هەزار سەربازی بۆ کۆنترۆڵکردنەوەی ئەو شوێنە ناردووە دوای دوو ڕۆژ ئەو شوێنە کۆنترۆل کراوەتەوە، دواتر ئەو هێزە ڕوو دەکاتە سەنجەقەکانی هەولێر و کۆیسنجەق و هەریر تا ئەو ناوچانەش کۆنترۆڵ بکرێنەوە" (عادل، ساڵ نییە: ٣٩).

سەرەڕای ئەوەی لە بەڵگەنامەیەکی تر باسی خۆبەدەستەوەدانی ئاڵتون کۆپری دەکرێت، دەوڵەت بەسەرکردایەتی رەشید پاشای والیی سیواس ٢٠ هەزار سەربازی بۆ کۆنترۆڵکردنەوەی ئەو شوێنە ناردووە دوای دوو ڕۆژ و هەژدە کاتژمێر شەڕ کردن تفەنگچییەکانی قەڵای کۆپری هاتوونەتە خوارەوە و خۆیان بەدەستەوە داوە، ئەو شوێنە کۆنترۆڵ کراوەتەوە، لەدوای ئەوە ئەو هێزە بەتەمایە ڕوو بکاتە سەنجەقی هەولێر و لەوێشەوە بۆ کویسنجەق و هەریر و ڕەواندز تا ئەو ناوچانەش کۆنترۆڵ بکاتەوە) (عادل، ساڵ نییە: ٤٠).

بەم شێوەیە هێرش بۆ سەر میرنشینیی سۆران دەستی پێکرد. هەروەک لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانی لە ساڵی ١٨٣٧دا هاتووە والیی بەغدا عەلی ڕەزا پاشا نووسراوێک لەبارەی مەسەلەی ڕەواندز ڕەوانەی دەوڵەت دەکات کە دەست کراوە بە هێرشی سەر ڕەواندز و دەستبەکاربوون بۆ کۆنترۆڵکردنەوەی بە هاوکاری و هەماهەنگی لەگەڵ بەیرەقداری والیی مووسڵ (عادل، ساڵ نییە: ٤٠). ئەم هێزانە لە هەریر بەیەک گەیشتن و بارەگای هێزی عوسمانی بۆ هێرشی سەر ڕەواندز هەر لەو شوێنە دانرا بە سەرپەرشتی ڕەشید پاشا و بە یارمەتی عەلی ڕەزا پاشا و محەمەد ئینجە بەیرەقدار، بەڵام بەهۆی سەختیی سروشتی و هەڵکەوتەی جوگرافیای ڕەواندز ئەم هێرشکردنە تا ڕادەیەک زەحمەت بوو بۆیە لە ڕێگەی هێرشەکانیش لەو ماوەیەدا بێ سوود بوون بەرامبەر بە لەشکری میرنشینیی سۆران (زەکی، ٢٠٠٥: ٩١). ئەمەش ئەوە دەردەخات کە میرنشینیی سۆران بەرگری کردووە و شەڕیشی کردووە لەگەڵ سوپای عوسمانی هەروەکو لە بەڵگەنامەی عوسمانیش دەردەکەوێت (عادل، ساڵ نییە: ٤٠). بۆیە ڕەشید پاشا ڕێگەی تری بەکار هێنا چونکە زانی کە محەمەد پاشای ڕەواندز خاوەن هێزێکی سەربازی بەهێز و چەک و تەقەمەنییەکی زۆرە، هەروەها سروشتی ناوچەکە سەرکەوتنی ڕەشید پاشا زۆر زەحمەت دەکات بۆیە لەڕێگەی ئابلۆقەدانی ڕەواندز کە ئازووقە و ئاوی لەسەر خەڵک قەدەغە کردن و

ئەمەش بارودۆخەکەی زۆر نالەبار کرد. بەهۆی برسییەتی و تێنوویەتی خەڵک نەیانتوانی تا سەر بەرگری بکەن و ناچار خۆیان بەدەستەوە بدەن، لێرەدا بیروڕای جیاواز هەیە سەبارەت بە کەوتنی میرنشینیی سۆران، بەڵام هەندێک سەرچاوە باسی ئەوەدەکەن کە خیانەت لە محەمەد پاشای ڕەواندز کراوە ناچاری کردووە کە خۆی بەدەستەوە بدات (جەلیل، ٢٠١٥: ٢٢)، سەرەڕای ئەوەی ڕەسول بەگی برای باسی خیانەت دەکات گوایە عوسمانییەکان نەیاندەویست بە شەڕ کۆتایی بەم کارە بهێنن بۆیە لە ڕێگای گفتوگۆ محەمەد پاشای ڕەواندز چووە لای ڕەشید پاشا و بەڵام دەستگیر کرا و ڕەوانەی ئەستەنبوڵ کرا (عەلیاوەیی، ٢٠٠٤: ١٩٩).

هەندێک سەرچاوەی تر باسی مەلای خەتێ دەکەن کە هۆکاری ڕاستەوخۆی کەوتنی میرنشینیی سۆران بووە، هەروەها خۆ بەدەستەوەدانی محەمەد پاشا بەوەی ڕەشید پاشا نامەی بۆ ناردووە کە فتوا دەربکات هەرچی لە دژی لەشکری عوسمانی شەڕ بکات دەرچوونە لە ئیسلام (زەکی، ٢٠٠٦: ٢٨٣)، بۆیە ئەمە بە کاریگەر دادەنێن لەسەر ساردکردنەوەی لەشکری میرنشینیی سۆران دژی عوسمانییەکان (جالیاند، ٢٠١٢: ٤٧) ڕاستە پیاوانی ئایینی ڕۆڵێکی سەرەکییان لە کۆمەڵگادا هەبووە کاریگەر بوونە لەسەر خەڵک، بەڵام مەلای خەتێ فتوای لە پێناو بەرژەوەندیی خەڵک دەرکردووە و بەپێی پرس و ڕاوێژی میر ئەم کارەی کردووە، واتە بە ئاگاداری میر محەمەد پاشای ڕەواندز فتوای دەرکردووە (مزووری، ٢٠٠٩: ٢٩) هەندێک سەرچاوە باسی دەکەن کە مەلای خەتێ تاکە هۆکار نەبووە بۆ کەوتنی میرنشینیی سۆران محەمەد پاشا خۆی کەسێکی پابەند بووە بە شەریعەتی ئیسلامی بۆیە شەڕکردن لەگەڵ لەشکری عوسمانییەکان لەلای ئەویش دەرچوونە لە یاساکانی ئیسلام (عەلی، ٢٠١٠: ٧٤).

لەڕاستیدا لەناوچوونی میرنشینیی سۆران هەروەکو (پۆژۆلا) باسی دەکات کارێکی بڕیار لەسەر دراوی عوسمانی بوو کە چۆن

لەشکرێکی ٤٠ هەزار سەربازی دەوری ڕەواندزی گرتووە و ئابڵوقەی داوە محەمەد پاشای ڕەواندزیش زانی ڕزگاری نابێت و ناتوانێت بەرامبەر بەم لەشکرە گەورەیە سەربکەوێت بۆیە خۆی دا بەدەستەوە (پۆژۆلا، ٢٠٠٩: ٥٢). بەمەش کۆتایی بە دەسەڵاتی محەمەد پاشا هات و نەخشەیەکی عوسمانی بە یارمەتی ئینگلیز بوو بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی خۆیان یارمەتی دەوڵەتی عوسمانیدا بۆ لەناوبردنی میرنشینیی سۆران.

بەمەش محەمەد پاشای ڕەواندز دوای خۆ بەدەستەوەدانی ڕەوانەی ئەستەنبۆڵ کرا، ڕەسول بەگی برای باسی دەکات محەمەد پاشا لەگەڵ پێنج کەس ڕەوانەی ئەستەنبۆڵ کرا، هەرچەند بڕیاری بەخشین و لێخۆشبوون بۆ محەمەد پاشا دەرچوو کە بگەڕێتەوە بۆ کوردستان و بکرێتە دەسەڵاتدار بەڵام لە کاتی گەڕانەوەیدا چارەنووسی نادیار دەبێت (زەکی، ٢٠٠٦: ٢٨٣). بەڵگەنامەیەکی عوسمانی باسی لێبووردنی محەمەد پاشا دەکات و دەڵێت لێبووردنی باڵا بۆ محەمەد پاشا دەرکراوە پلەی فەریقی لە لای سوڵتانی عوسمانی پێدرا کە بگەڕێتەوە بۆ کوردستان بکرێتە دەسەڵاتدار لەو ناوچانەی کە لە ژێر دەستیدا بوون بەڵام عەلی ڕەزا ڕازی نەبوو کەوتە کارکردن بۆ ئەوەی ڕێگە نەدرێت بگەڕێتەوە بۆ کوردستان چونکە بەمەترسی دادەنێت لەسەر دەسەڵاتی خۆی لە بەغدا و دەسەڵاتی بەیرەقدار لە ویلایەتی مووسڵ. عەلی ڕەزا دەورێکی باڵای هەبوو لە نەگەڕانەوەی محەمەد پاشا بۆ کوردستان و هەوڵەکانیشی سەرکەوتوو بوو لە ڕازیکردنی کاربەدەستانی عوسمانی بۆ ڕێگریکردن لە محەمەد پاشای ڕەواندز. هەروەک لە بەڵگەنامەی عوسمانیدا هاتووە لەسەر داوای عەلی ڕەزا والیی سیواس لە ٣ی حوزەیرانی ١٨٣٧ فەرمانێک دەرچوو بۆ مانەوەی محەمەد پاشا لە ئاماسیە دواتر بگوازرێتەوە بۆ ڕۆملێ (هاکان، ٢٠١٢: ٩٧). بۆیە دەوڵەتی عوسمانی بڕیاریدا بە گواستنەوەی میر محەمەد پاشای ڕەواندز بۆ ئەماسیە لەوێ نیشتەجێ بکرێت. لە (١٨٣٧/٦/١٢) (میر محەمەد) گەیشتە ئەماسیە و نیشتەجێکرا (هاکان، ٢٠١٢: ٩٧). دواتر علی

پاشا والیی بەغدا بەهاوکاری والیی سیواس توانی دەرسەعادەت رازی بکات لە ڕێگای ئەنادۆڵ میری رەواندوز بگرێت و رەوانەی ناوچەیەکی دووری وەک رۆملێ بکرێت کە دەکەوێتە باشووری هەرێمی بەلقانەوە دواتر لە یەکێک لە گەڕەکەکانی ڕۆملێ نیشتەجێ کراوە (عادل، ساڵ نییە: ٤٢).

بەم شێوەیە دەسەڵاتی محەمەد پاشا کۆتایی هات بە چارەنووسێکی نادیار. هەرچەندە بەڵگەنامەیەکی عوسمانی ساڵی ١٨٣٨ محەمەد پاشا بە کۆچکردوو ناو دەبات (عادل، ساڵ نییە: ٤٢). هەروەها لە بەڵگەنامەیەکی میسریش باس دەکات میری ڕەواندز لە ٢٦ی ئاداری ١٨٣٨ لە کاتی گەڕانەوە لە ئەستەنبۆڵ لە ڕێگادا دەکوژرێت (غازی، ٢٠١٦ک ١٩١). زۆر لە سەرچاوەکانیش باسی ئەوە دەکەن کە محەمەد پاشا لەکاتی گەڕانەوەی لە ئەستەنبۆڵ لەساڵی ١٨٣٧ دەکوژرێت (سەجادی، ٢٠٠٥: ٦٨). (دەبلیو ئاڕ های) باس دەکات و دەڵێت محەمەد پاشای ڕەواندز ساڵی ١٨٣٨ کوژراوە (های، ٢٠١٠: ١٨٧) دەسەڵاتی محەمەد پاشا کۆتایی هات بەڵام میرنشینیی سۆران کۆتایی نەهات. لەم بارەیەوە ڕۆڵی بەیرەقدار بەڕوونی دەردەکەوێت لە کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی محەمەد پاشای ڕەواندز کە یارمەتی لەشکری عوسمانیدا لە کاتی هێرشی بۆ سەر ڕەواندز و هەروەها مووسڵی وەکو بنکەیەکی سەرەکی بەکار هێنا بۆ ئەم هێرشە.

دوای گەڕانەوەی میر محەمەد، چەندین پێشهاتە و ڕووداوی جۆراوجۆر روویاندا، وەکو تاڵانی عوسمانییەکان لە شارەکان و پەرتەوازەیی لەشکری میرنشینەکە و وێرانکردنی کارگەکان و بوونی ئاژاوە لەناو بنەماڵەی دەسەلاتدار و نەبوونی کەسێکی بەتوانا وەک (میر محەمەد) بۆ شوێن گرتنەوە و کە جێگای متمانەی خەڵکی ناوچەکە بێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمنان، هەرچەندە (ڕەسول بەگ) برای میر محەمەد دیاریکرا بە جێنشین بەڵام نەیتوانی میرنشینەکە لەو دۆخە ناهەموارە رزگاربکات. میرنشینیی سۆران و بەشێکی فراوانی کوردستان کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی (نبز،٢٠٠٣: ١٦٨).

**ئەنجام:**

- بەسوود وەرگرتن لە ڕەوشی خراپی عێراق لە سەردەمی داود پاشا، تێکچوونی بارودۆخی سیاسی و سەربازی هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی وەک شۆڕشی یۆنان و شەڕی لەگەڵ ڕووسیا و فراوانخوازییەکانی محەمەد عەلی پاشا والیی میسر. دەرفەتێکی زێڕینی دایە میری محەمەدی ڕواندزی بۆ ئەنجامدانی فراوانخوازییەکانی.
- دەوڵەتی عوسمانی محەمەد ئینجە بەیرەقداری والیی مووسڵ، کە ئەزموونێکی هەبوو لە سەرکوتکردن و دامرکاندنەوەی دەنگی ناڕەزایەتی، دەستنیشان کرد بۆ گەڕاندنەوەی میرنشینە کوردییەکان بۆ ژێر دەسەڵاتی ناوەندی.
- محەمەد ئینجە بەیرەقدار دوژمنێکی سەرسەختی میرنشینە کوردییەکان بوو بە گشتی و میرنشینی سۆران بە تایبەتی، چونکە سیاسەتێکی زۆر توندوتیژی هەبوو بەرامبەریان.
- بەیرەقدار سەرکەوتوو بوو لە پیادەکردنی سیاسەتەکەی کە ئەویش لەناوبردنی دەسەڵاتە خۆجێییەکان و گەڕاندنەوەیان بۆ ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی دەوڵەتی عوسمانی.
- بۆ لێدانی میرنشینە کوردییەکان هاوکارییەکی باش هەبوو لە نێوان والییەکانی بەغدا و سێواس و والیی مووسڵ بەیرەقدار. بەڵگەنامە عوسمانییەکان ئاماژە بە ئەوە دەکەن کە لە سەرەتادا ئاسان نەبوو بەسەر سوپای میرنشینیی سۆران زاڵ بن، بۆیە کەوتنە بەکارهێنانی جۆرەها ڕێگا بۆ زاڵبوون بەسەریاندا.
- هێرشکردنە سەر میرنشینیی سۆران کارێکی بڕیار لەسەردراوی دەوڵەتی عوسمانی بوو کە ئینگلیز ڕۆڵێکی دیاری هەبوو لە داڕشتنی نەخشەکەی و کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی میر محەمەدی ڕواندزی.
- سەرەڕای ململانێ لە نێوان ڕووسیا و بەریتانیا لەسەر بەرژەوەندییەکانیان لە دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام دەوڵەتێکی عوسمانی لاوازیان پێ باشتر بوو لە میرنشینێکی کوردی بەهێز کە دژی بەرژەوەندییەکانیان بێت.

**پەراوێزەکان**

[١] ڕێکەوتنی کۆتاهیە: ئەو ڕێکەوتنە بوو کە لەنێوان عوسمانییەکان و هێزەکانی میسر مۆرکرا (١٨٨٣) لە ژێر فشاری دەوڵەتانی ڕووسیا و بەریتانیا و فەرەنسا بۆ ئەوەی شەڕ ڕابگرن لە نێوان عوسمانی و هێزەکانی میسر، بەتایبەتی پاش سەرکەوتنەکانی ئیبراهیم پاشای سەرکردەی هێزەکانی میسر لە شام. بۆزانیاریی زیاتر بڕوانە: صالح کولن، م.س، ص ٢٨٠.

[٢] ڕاپەڕینی وەهابییەکان جووڵانەوەیەکی ئایینی بوو لە سەدەی هەژدە و نۆزدە لەسەر دەستی محەمەد کوڕی عبدالوهاب (١٧٠٣ز) کە لەشاری عەینەی باکووری ریاض سەری هەڵدا" ئەم بزووتنەوەیە داوای چاکسازیی ئایینی دەکرد بەیەکتا پەرستیی خودا و وازهێنانی لە (بدعة) پاش ئەوەی ئەم بیرۆکەیە لە تەواوی نیمچە دوورگەی عەرەبی بڵاوبووەوە (لە ساڵی ١٨١٨ز لەلایەن محەمەد علی پادشای میسر کۆتایی پێهات. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: محمد عبدالله عوده وابراهیم یاسین خطیب" تاریخ العرب الحدیث" الاهلیة للنشر والتوزیع"، ص١٢٨- ١٣٤.

[٣] ئاڵتون کۆپری: شارۆچکەیەکە لە لیوای شارەزووری ویلایەتی مووسڵ لەسەر ڕێگای بەغدا- مووسڵە، بە دووری ٤٢کم دەکەوێتە باکووری خۆرئاوای کەرکووک، دەکەوێتە باشووری خۆرهەڵاتی مووسڵ بە دووری ١٠٠کم. بۆزانیاریی زیاتر بڕوانە: شمس الدین سامی، س. پ، ل ٥٣.

[٤] نەسیبین: قەزایەک بوو لە باشووری لیوای ماردین، لە باکوور بە میدیات و لە خۆرهەڵاتیش بە قەزای جزیرە و لە باشووریش بە سنوورەکانی ویلایەتی مووسڵ و میرنشینە سەربەخۆکان بەستراوەتەوە. دانیشتوانەکەی بە زۆری کوردن. بۆزانیاریی زیاتر بڕوانە: شمس الدین سامی، س. پ، ل٣١٨.

[٥] ماردین: شارۆچکەیەکە ناوەندی لیوای ماردین بوو، بە دووری ٩٠کم دەکەوێتە باشووری خۆرهەڵاتی دیاربەکر. بۆزانیاریی زیاتر بڕوانە: شمس الدین سامی، س. پ، ل ٢٨٣.

**لیستی سەرچاوەکان**

**سەرچاوە کوردییەکان:**


- بدلیسی، شەرەفخانی (١٣٨٤). شەرەفنامە، و: مامۆستا هەژار، چ ٨، پەخشانگای پانیز، تهران.
- بۆرکای،کەمال (٢٠٠٨). کوردو کوردستان لە سەردەمی باستانەوە تا کۆتایی جەنگی یە کە می جیهانی،و: عەلی فە تحی،چابخانە ی منارە، هە ولیر.
- بەرزنجی، ئەحمەد سەید عەلی (٢٠٠٤). محەمەد پاشای ڕەواندوز، چاپخانەی شڤان، سلێمانی .

- پۆژۆلا (٢٠٠٩). گەشتنامەی پۆژۆلا بۆ کوردستان ساڵی ١٨٣٧، و: نەجاتی عەبدوڵلا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.
- جەلیل، جەلیلی و ئەوانی تر (٢٠١٥). شۆڕشەکانی کورد لە سەردەمی نوێدا، و: بهادین جەلال مستەفا، چ٣، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.
- حاجی، کامەران محەمەد (٢٠٠٧). کوردستان لە بازنەی کێشەی ڕۆژهەڵاتدا ١٨٠٠-١٩٠٠، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر.
- حوزنی، حوسێن (٢٠٠٧). سەرجەم بەرهەمی، مێژووی میرانی سۆران، بەرگی ١، کۆکردنەوە و لەچاپدانی دەزگای ئاراس، هەولێر.
- الدملوجي، صديق (٢٠١٠). الايزيدية،ط ٢.
- دۆسکی، تەحسین ئیبراهیم (٢٠١٥). سێریا خەلکێ بهدینا ژ هیرشا میری کۆرا د دوکۆمینتکا دیرۆکیدا،گۆڤارا (دیرۆک)، ژ(٧)،دهۆک.
- ڕۆحانی، بابەشێخ مەردۆخ (٢٠١٣). مێژووی ناودارانی ماڵە میران و خونکاران، بەرگی دووەم، هەولێر.
- ریچ، کلودیوس جیمس (٢٠١٢) گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و: محەمەد حەمە باقی، چ ٥، چاپخانەی خانی، دهۆک.
- زەکی،محەمەد ئەمین (٢٠٠٥). سەرجەم بەرهەمی ئەمین زەکی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی.
- زەکی، محەمەد ئەمین (٢٠٠٦). خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان لە زۆر قەدیمەوە تا ئیمرۆ، بەرگی ٤، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.
- سەجادی، عەلائەدین (٢٠٠٥). شۆڕشەکانی کورد و کۆماری عیراق، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەتڵەس، تاران.
- عادل، کاروان محەمەد (ساڵ نییە). هەڵوێستی والی موسڵ محەمەد ئینجە بێرەقدار بەرامبەر میرنشین و قەوارە کوردییەکان (١٨٣٤-١٨٤٣)، فاکەڵتی ئاداب، زانکۆی سۆران.
- عەلی، عوسمان (٢٠١٠). چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد، و: کامەران جەمال بابانزادە، ب١، چاپخانەی ڕێی نوێ، هەولێر.
- عەلی، عوسمان (٢٠١٣). کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیا، و: کامەران جەمال بابانزادە، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.
- عەلیاوەیی، عەبدوڵلا (٢٠٠٤). کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، چ٣، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.

- فرەیزەر، جیمس بیلی (١٩٩٨). گەشتەکەی فرەیزەر بۆ کوردستان و میزۆپۆتامیا ١٨٣٤، و: ئومێد ئاشنا، چاپخانەی تیشک، هەولێر.
- قەفتان،کاوس (٢٠٠٦). چەند لێکۆڵینەوەیەک لە مێژووی میرنشینی بابان، سۆران، بۆتان، چ٢، چاپخانەی ئۆفسیتی ڕاز، سلێمانی.
- قەفتان، ساڵح (٢٠٠٩). سێ لێکۆڵینەوەی مێژوویی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی .
- گیست،جون س (٢٠١٢). ژیان ل ناڤ کورداندا، میژوویا ئیزیدیان، و: داود خەتاری، چابخانەی هاوار، دهوک.
- لازاریف (٢٠١٥) مێژووی کوردستان، و: هۆشیار عبدالله سەنگاوی، چاپی ٦، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر.
- مزوری، مەمدوح (٢٠٠٩). بنەماڵەی بەناوبانگی ڕەواندز، چاپی دووەم، چاپخانەی جندیان – هەولێر.
- مەدەنی، حسین (٢٠٠٩). کوردستان لە ستراتیژیەتی دەوڵەتان، بەرگی١، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر.
- هاکان، سینان (٢٠١٢). کورد و بەرخودانەکانی لە بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی عوسمانیدا ١٨١٧–١٨٦٧، و: بەکر شوانی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولیر.
- های، دەبلیو ئاڕ (٢٠١٠). دوو ساڵ لە کوردستان، و: لقمان باپیر، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر.
- هەروتی، سەعدی عوسمان (٢٠١٣). چەند لایەنێکی مێژووی، ڕامیاری، کۆمەلایەتی و ئابووریی کوردستان لە سەردەمی عوسمانیدا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.
- ئەسفەهانی، عەبدلرەزاق (٢٠٠٩). گەشتنامەی ئەسفەهانی بۆ ناوچەکانی شنۆ و ورمێ و ڕەواندوز، و: ئاوات دەوڵەت، چاپخانە و دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی.
- ئەسکەندەر، سەعد بەشیر (٢٠٠٩). سەرهەڵدان و رووخانی سیستەمی میرنشینی لە کوردستان، و: جەوهەر کرمانج، چاپی دووەم، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی.


**سەرچاوە عەرەبییەکان:**


- احمد، ابراهيم خليل (١٩١٨) الحياة الثقافية و الحياة الفكرية في الموصل ابان عهد العثماني ٩٢٢–١٣٣٦.
- البوتاني، عبدالفتاح علي يحيى (١٩٩٠). تنظيمات امير محمد باشا العسكرية والإدارية والاقتصادية في امارة سوران، مجلة كاروان، ع (٨٧)، اربيل.

- جاليناد، جيرارد (٢٠١٢). شعب بدون وطن الكرد والكردستان، ت: عبدالسلام النقشبندي، اربيل.
- جويدة، وديع (٢٠١٣). الحركة القومية الكردية نشأتها و تطورها، مطبعة اراس، اربيل.
- زكي، محمد امين (٢٠٠٦). مشاهير الكرد و كردستان في العهد الإسلامي، ت: سانحة زكي بك، ج١، ط٢، دمشق.
- سمايل، عثمان عبدالرحمن (٢٠٠٩). إمارة سوران من بداية القرن الثامن عشر حتى عام ١٨٣٦م، رسالة ماجستير لكلية الاداب قسم التاريخ، جامعة صلاح الدين- اربيل.
- صائغ، سليمان (١٩٢٧). تاريخ الموصل، ج١، المطبعة السلفية،القاهرة.
- عبدالسلام، عماد (٢٠١٢). دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث و حضاراتهم، ط١، دار الزمان للطباعة والنشر والتوزيع، دمشق.
- علي، علي شاكر (بدون سنة) نظام الحكم والادارة والجيش التشكيلات الادارية العثمانية ٩٢٢-١٣٣٦ه/ ١٥١٦-١٩١٨م.
- غازي، علي عفيفي علي (٢٠١٦). الجزيرة العربية والعراق في استراتيجية محمد على، مطبعة الرافدين، بيروت.
- الگوراني، علي سيدو (٢٠١٢). من عمان الى العمادية او جولة في كردستان الجنوبية، ط٢، مطبعة اراس، اربيل.
- لونگريک، ستيفن هيمسلی (بدون سنة). اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ت: جعفر الخياط، ط ٥، الرافدين للطباعة و النشر.
- نبز،جمال (٢٠٠٣). الامير الكردي مير محمد الرواندوزي الملقب مير كورة، ترجمة: فخرى سلاحشور، ط٢، مطبعة وزرارة التربية،اربيل.
- نوار، عبدالعزيز سليمان (١٩٦٨). تاريخ العراق الحديث من نهاية حكم داود باشا الى نهاية حكم مدحت باشا، قاهرة.
- هروتي، سعدي عوسمان (٢٠٠٨). كردستان والامبراطورية العثمانية، مطبعة خاني، دهوک.

## ملخص البحث

**د. آمانج احمد مصطفى**
**كلية الاداب — جامعة سوران**

مع أن تأريخ إمارة سوران أقدم كثيرا من تاريخ تسلم الأمير محمد الرواندوزي المعروف ب ( ميري كورة ) للسلطة لم تعرف الأمارة بأسها وقوتها الا في عصره حيث استطاع ان يوسع حدود سلطاته مما شكل خطرا على الدولة العثمانية وكذلك على الأيرانيين ومصالح الدول العظمى مما حدا بسلطات الدولة العثمانية بأتخاذ قرار لأعادة هذه الأمارة الى السلطة المركزية ومن أجل هذا اسندت المهمة الى واحد من أكثر الولاة كفاءة وتشددا ألا وهو ( محمد ئينجة بيرقدار ١٨٣٤ ــ ١٨٤٣ ) الذي تميز بتطبيق سياسة التشدد ضد الإمارات الكوردية عامة وامارة سوران بشكل خاص حيث قاد وبنفسه الحملات العسكرية عليها لمرات عديدة الى حين سقوطها.

أهمية الموضوع: اظهار موقف محمد ئينجه بيرقدار تجاه امارة سوران والخطوات التي اتبعها بشكل مفصل حيث أن أهميته تكمن في عدم وجود بحث أكاديمي مستقل حول موقف هذه الشخصية من هذه الأمارة التي لعبت دورا كبيرا خلال فترة حكم الأمير محمد الرواندوزي .

يتكون البحث من مبحثين:

المبحث الأول يتضمن ملخصا تاريخيا عن أمارة سوران والأطوار التي مرت بها الى تسلم الأمير محمد الرواندوزي السلطة ومن ثم يتحدث عن الأطماع التوسعية لهذا الأمير والاساليب التي اتبعها في سبيل تطبيق سياسته التي أحدثت شرخا كبيرا في علاقاته الأقليمية خاصة مع الدولة العثمانية كذلك تذمرا داخليا من قبل بعض الطوائف. أما المبحث الثاني: فيركز على موقف بيرقدار والي الموصل تجاه امارة سوران والخطوات التي اتبعها في تطبيق سياسته المتشددة تجاه هذه الأمارة من ضمنها تحريك القطاعات العسكرية كذلك يبحث في الأساليب التي أدت الى تطبيق هذه السياسة من قبله أضافة الى الأسباب الداخلية والخارجية التي أدت الى سقوط أمارة سوران على يد الدولة العثمانية. لكتابة هذا البحث كان الاعتماد على مصادر مختلفة وخاصة الوثائق حيث أعتمد على عدد من الوثائق غير المنشورة من أرشيف الدولة العثمانية أذ كانت لتلك الوثائق أهمية كبيرة أضافة الى بعض الوثائق المنشورة والكتب المؤلفة في هذا المجال. وفي الختام تضمن البحث أهم النتائج أضافة الى ملخص للبحث باللغتين العربيـــة والانجليزية .

## Abstract

**Dr. Amanj Ahmed Mustapha**
University of Soran / college of Arts

Ottoman Empire assigned some qualified and expert ruler in order to perform their policy and bind Kurdish Emirates directly to Istanbul in the first half of 19th century. One of these ruler was (Mohammed Enje Bairaghdar 1834-1843) who generally had a tough attitude and position toward Kurdish Emirates, especially Soran Emirate, which had been attacked under his leadership for several times. Due to the importance of the topic and lack of an academic research, the current research has been devoted to investigate the position of the mentioned figure, therefore the research entitled; “The position (status) of Mohammed Enja Bairaghdar toward Soran Emirate”.

The research consists of two main parts, each of them sheds light on some significant perspective of Bairaghdar’s policy. The first part explains a summary of Soran Emirate history and Meer Mohammed Rawanduzi’s (also, well known as Meeri Kora), willingness to expand his territory, the second part mentions Barighadar’s positions, who was the ruler of Musil, toward Soran Emirate, also sheds light on Ottoman military attack and destroying the Soran Emirate. At the end of the research, a conclusion and a summary has been presented in both Arabic and English languages, also appendixes and references are followed.

# هزر و باوەرییێن زەرادەشتی

**د.عەبدولڕەحمان مزووری**
ئەندامێ كاراێ ئەكادیمیا كوردی

هەتا ئەم بگەهینە راستییا هزر و باوەرێن دینێ[1] زەرادەشتی، پێدڤییە ئەم هنەک ل سەر هزر و باوەرێن دینیێن ملەتێن هندوئیرانی، بەری هاتنا زەرادەشتی راوەستین. زەرادەشت پشتی هاتی، چ گهوڕینێن دینی کرینە؟ چەوا ل ئێکانیا ئاهورامەزدا نێڕییە؟ ئەمیشەسپێنتان، ئاگر، ڕێزگرتنا ژنێ، دوئالی Dualisim، گووری و قوربانی، بەحەشت و دوژەهـ.. وگەلەک ئالیێن دنێن دینێ زەرادەشتی بێنە رووهنکرن، باشترە ئەم گوتارا خو ل سەر ڤان مژاران پارڤەکەین:

**بیروباوەرێن دینیێن هندوئیرانیان بەری زەرادەشت**

بەری ١٥٠٠ سالان ب.ز، خێلێن هندوئیرانی بویەرێن خورستی و بابکالکێن خو دپەرستن. بویەرێن خورستی وەک: روژێ، هەیڤێ، ئەردی، ئاڤێ، ستێرا، ئاگری و بای ... دپەرستن و دگوتێ دیڤا Divä، دائێڤا Däevä ب ئانکویا: خودێ (شیرکلائی، ١٣٩٠ش، ٨٢). پەیڤا دائێڤا، دائێڤاس Däeväs, Däevä ب سەنسکریتی، ئەوێ روهن و گەشە (بویس، ٢٠١٠، ب٢٣)، رووناهییە.

هەر خێلەکا هندوئیرانی یان هوزەکێ، خودێیەکێ خویێ تایبەت هەبوو دپەرست، دا بەرەڤانیێ ژهوزێ بەرامبەر هێزێن دی، بکەت. وەک یەهوە Yahweh خودێ ئیسرائیلییان، ئارمانجا وی تنێ پاراستنا هەر دوازدە خێلێن/هوزێن جوهیا بو (آشتیانی، ١٣٦٨ش، ب١١٩)

ملەتێن هندوئیرانی سەبارا روودانێن مێژوویی، هزرێن چیڤانوکی، خودا و فریشتان، زمانی و شونواران... گەلەک نێزی هەڤبوون، مینا نێزیکییا ملەتێن کەڤنێن جێرمانی، ئەوێن ل ژووریا رووبارێن دانووب



**ئەکولەرێ ئەلمان H.Oldenbert مەلەڤانێ دینێ ڤیدی**

و راین هەتا ژووریا سکەندەناڤیا، دچاخێن ناڤەراستدا، دژیان (Irmscher, 1987, p. 188). رەهێن هەڤپشکێن دینێ زەرادەشتی و دینێ برەهماییBrahmä ، دگەهنە سەردەمێن خێلێن کوچەرێن هندوئیرانی بەری ٣٠٠٠ سالان ب.ز. تایبەتی مژارێن وەک رێزگرتنا خودا ئەردی و ئەسمانی، بابکالک پەرستنێ، تیتالێن ئاگری، بابەتێن ل سەر ئاخرەتێ... رەهێن وان دهەردوو دینادا گەلەک کەڤنارن (بویس، ١٣٨٧ش، ب١٠٤)

ژ خودا هەڤپشکێن نێڤبەرا مللەتێن هندوئیرانیدا وەک میترا Mithrä ل جەم هندیان، مێهر Meher ل جەم ئیرانیان. ئاگنی Ägni ل جەم هندیان، ئاتەر/ Ätar ئاگر ل جەم ئیرانیان. ئاسورا Äsurä ل جەم هندیان، ئاهورا Ähurä ل جەم ئیرانیان، ڤایو Väyu خوداوەندێ بای ل جەم هەردوویان، کو ل ئەسمانی دژیت. ئیندرا Indrä خوداوەندا شەڕی ل جەم هندیان دیسان ل ئەسمانی دژیت (بار، ١٣٨٦ش، ب٦٥ - ٦٦). ڤارونا Värunä دریگڤیدادا زێرەڤانیێ ل قانونا مادی و مەعنەویا جیهانێ دکەت، ب هاریکاریا رووناهیا خو، تارییا نەپەنیا ناهێلیت، بڕیارێن وێ ناهێنە زڤڕاندن، ئەوژی ناهێتە شکەستن و بێهێزکرن (Oldenberg, 1917, p. 180-181) .

ئاتەر/ Äter ئاگر بەری زەمانێ زەرادەشت، ل جەم هندوئیرانیا دهاتە پەرستن. خوداوەندەکێ ئەسمانی بو، ب دارێن هشک وبێهن خوش، روونێ بێهن خوش دهاتەهلکرن و خوشکرن. دیسان بو سەربۆڕ و هێڤکرنا (فەحصا) گونەهکاران دهاتە بکارئینان. ئاهورا Ähurä


ڤەكۆلەرا ئنگليز M.Boyce
دينێ زەرادەشتی

ل جـەم هندیان ئاسورا Äsurä، بەری زەرادەشت خودێ‌یەک مەزن و خودان هێز و شـیانبوو. ناسـەتیا Näsatyä وئاشـڤینا Äshvinäژی، ل جـەم هندوئیرانیان، دو خودایێن ناڤدێربوون، هەسپ سواربوون. هەردووان نەساخ ساخدکرن، ل هەمی جیهانێ بەرپرسێن تەناهیێ وکەسکاتیێ بوون (بار، ١٣٨٦ش، ب٦٨ - ٧١).

## كودەتـايا (ئينقيلابا) زەرادەشت

مە د خالا بووریدا گەلەک خودێ و خوداوەندێن هەڤپشک دنێڤبەرا هوز و خێلێن هندوئیرانیدا دیتن. د پەرتووکا ریگڤیدا Rigvedäدا، گرووپێ خوداوەندێن دائێڤا Däevä وەک خوداوەندێن ئەسمانی، قەنج و چاک هاتیە. گرووپێ خوداوەندێن ئاسورا (Äsurä کو هەر ئاهورا Ähurä یە) وەک خوداوەندێن بەد، خراب و شەڕوکە.. هاتیە (Oldenberg, 1917, p. 159).

زەرادەشت بەروڤاژی هزرا هندیان دریگڤیدادا، دائێڤا Däevä خودێ قەنج، راست و ئەسمانی کرە دێو Devil، خرابی، بەدی و شەڕ... دانێ. ئاهورا (کو هەر ئاسورایێ) بەد، خراب و شەڕوکە .. بو، کرە خودێ ئێکانە The only God یێ ئەفرێنەرێ چاک و دلوڤان (بار، ١٣٨٦ش، ب٨٤. زنر، ١٣٧٥ش، ب٨٨). زەرادەشت خاسیەتێن گەلەک خوداوەندێن دنژی دانە ئاهورامەزدا. ئاهورامەزدا ڤوهومەنە Vohumana خودانێ هزرا قەنجە، ئەشاڤەهیشتە Ashävahishta باشترین راستییە، خشەتراڤەرییە Khshathrävarya فەروەریا بژارەیە، سپێنتا ئارمەئیتییە Spentä-ärmaiti پەرستڤانێ پیروزە، هورڤەتاتە Hurvatät هەمییە و کاملە، ئامەرەتاتە Ämaratät زێندی و نەمرە (کریستنسن، ١٣٨٨ش، ب٤٧. بار، ١٣٨٦ش، ب٨٦). ب تەمامی وەکو (رەحمانێ)

دەڤەرا یەمامە، خودێ مەسلەمە ئەلحەنەفی. پشتی (مەسلەمە) شکەستی، پێغەمبەرێ ئیسلامێ (رەحمان) کرە خاسیەتەکێ (الله) خودێ هەلبژارتیێ ئیسلامێ. ناڤێ وی بو: الله الرحمن الرحيم (کدر، ۲۰۱۳، ب۱۲۳. الحلاق، ۲۰۰۹، ب۳۱، ۹٦)

مە ناڤێ خودێ زەرادەشتی ئاهورامەزدا ئانی. ئاهورامەزدا یان مەزدائاهورا هەردوو ئێکن. مەزدا Mazdä ژ دوو لڤا پێکهاتیە، مەز: کورتکرنا مەزنە، ئەڤرو ژی دکوردیدا (مەزن) مایە. دا: ئانکو دان و بەخشین، هەر دکوردیدا مایە. مەزدا: ئانکو خودێ مەزن و بەخشندە (پورداود، ۱۳۳٦ش، ب۱۳ ـ ۱٤، ۱۳٦. شاهرخ، ۱۳۸۰ش، ب٥٥. آشتیانی، ۱۳٦۸ش، ب۱۲۲). مەزدا وەک مەزنترین خودێ، بەری سەردەمێ ئاڤێستا ژی (۱٥۰۰ب.ز) دناڤ خێلێن هندوئیرانیدا بەرز دهاتە راگرتن و پەرستن. ب هـزرا ڤەکولەر کریستنسن Christensen مەزداپەرستی ژ زەرادەشتیێ کەڤنترە (شیرکلائی، ۱۳۹۰ش، ب۹۸)

مەگو ئاهورا هەر ئاسورایە. ئاسورا Äsurä ژپەیڤا ئاسو äsu یاسەنسکریتی هاتیە ب ئانکویا: جان، روح. ئاسورا: جان ئەفرێنەرە، ئەوێ جانی ددە ( Creator of the Spirit آشتیانی، ۱۳٦۸ش، ب۱۲٤)

د دینێ زەرادەشتیدا ئاهورامەزدا رووناهیە، رووناهیا رووناهیانە، نورولئەنوارە Light of lights، هەمی رووناهیێن گەردوونی/کەونی ژووی دزێن و بەلاڤدبن (شیرکلائی، ۱۳۹۰ش، ب۹۹). د قورئانا پیروزدا (الله نور السماوات والارض). حافظ شیرازی (۱۳۸۹ ز مرییە) دبێژێ، دکاڤلێن پەرستگەهێن زەرادەشتیدا، رووناهیا خودێ دبینم:

**در خرابـات مغــان نور خـدا می بینم**
**این عجب بین که چه نوری در کجا می بینم**

(حافظ، ۱۳۷٤ش، ب۲۸۸)

دکەڤرنکراندییێن شاهێن هەخامەنشی، داریوشێ ئێکێ (٥۲۱ ـ ٤۸٦ ب.ز) و خشایارشایێ ئێکێدا (٤۸٦ ـ ٤٦٥ ب.ز)، ئاهورامەزدا خودێ مەزنە، ژ گش خودێ یێن دن مەزنترە. ئەوی ئەرد، ئەسمان، مروڤ و


ا. تفضلي مەلەڤانێ زمانێ پەهلەوی

جانەوەر چێکرینە، شادی و کامیرانی بو مروڤی داینە (کریستنسن، ١٣٨٨ش، ب٦٢)

ل گوورڕ ژێدەران گەلەک خێلێن هندوئیرانی، ل سەر هزرا خویا بەرێ مان. دائێڤا Däevä ل نک وان، هەر خودێ پاقژ، قەنج و راست ما (بار، ١٣٨٦ش، ب٨٥). بەرئەقل ئێزدییێن کورد ژوان خێلان بوون، ژوان کەسابوون، ل سەر هزرا خویا کەڤنارا هندی مان، لەوان بوونە دائێڤایەسنا و پاشی داسنی.

د سەسالیا پێنجێ بەری زاینیدا، مێژووڤانێ گریکی هیرودوتس Herodotus نڤێسیە: بت پەرستی، ئاڤاکرنا پەرستگەها و پێشکێشکرنا گووری و قوربانیان .. ل جەم فارسان تونە. ئەوێ بتان دپەرێسیت، پەرستگەها بو ئاڤا دکەت و قوربانیان ژێرا پێشکێشدکەت.. ل جەم وان کەسەکێ خشیمە !(Herodotus, 1961, Band: 1, p. 110).

### ئەمیشە سپێنتان Amesha Spenta

د ئاڤێستادا ئەمیشە amesha جاویدان و نەمرە، سپێنتە spenta پاک و پیروزە، پێکڤە: پیروزێن نەمرن (Holy Immortal بهرامی، ٢٠٠٠، ب١٥٣، ١٤٧٦). ئەڤە (حەفت) فریشتەنە/مەلائیکەتن ئاهورامەزدا یێن داین و چێکرین، دا ب فەرمانا وی کاروبارێن ئەردی ومروڤان رێڤە ببەن. هنەکان کرینە (شەش)! یاراست (حەفتن) چمکی هژمارا (حەفت) د دینێ زەرادەشتیدا، هژمارەکا پیروزە. ژ پارڤەکرنا هەیڤانە ل سەر (حەفت) روژان، ئانکو ژ (حەفت) روژێن حەفتیێ هاتیە (Wundt, 1913, p. 303). هەر (حەفت) ئەڤەنە:

ڤوهومەنە Vohumana فریشتێ هزرا قەنج و باش، ئەشاڤەهیشتە Ashävahishta فریشتێ راستیێ، خشەترەڤەئیرییە Khshathravairya

فریشتێ فەروەریـا بژارە، سـپێنتائارمەئیتی Spentä-ärmaiti فریشتێ سوود و مفایێ، هەئورڤەتـات Haurvatät فریشتێ کەمـال و سـاخلەمیێ، ئەمێرێتـات Ameretät فریشتێ تم زێندی ونەمر، سـپێنتامەئینیو Spentämainyo فریشـتێ ئەقلێ پاقژ وپیروز .Dhalla, 1938, p. 40-62 (وحیدی، ١٣٥٩ش، ب٣١)

هنەکان شـەش فریشتێن بەراهیێ نڤێسینە، ناڤێ ئاهورامەزدا ئەفرێنەرێ وانژی دگەل هژمارتیە، دا ببنە حەفت (بویس، ١٣٨٧ش، ب١٢٧. والی، ١٣٧٩ش، ب١٠٠)

**بەحشت و دوژەهـ**

پەیڤا بەحشت دئاڤیستادا وەهیشتا ئەهو Vahistä Ahu ب ئانکویا: بهاترین ژیان هاتیە. پێکڤە: بەهشتە، بەحشتە (پورداود، ١٣٥٦ش، جـ١ ب١٦٥). نهو د زمانێ کوردی و فارسیدا (ئەهو) ب ئانکویا: ژینێ وژیانێ نەمایە، تنێ وەهیشتا مایە، بویە: بەهشت و بەحشت.
پەیڤا دوژەهـ د ئاڤێستادا ئەچیشا ئەهو Achisha Ahu ب ئانکویا: ژیانا تونە، ژیانا پویچ و چنە هاتیە (شاهرخ، ١٣٨٠ش، ب٨٧). پێکڤە: دوژەهە.

زەرادەشت ئێکەمین پێغەمبەرە گوتی: دێ دادگەهـا مروڤی پشتی مرنێ هێتەکرن و باسی بەحشت و دوژەهێ کری. پشتی رزگاربوونـا جووهیـان ژ ئێخسیرکرنـا بابل Babylonian captivity سالا ٥٣٨ ب.ز، زانیارییێن سەبارا بەحشتێ و دوژەهێ، کەتنە د تەوراتـا جووهیـادا (بویس، ٢٠١٠، ب٤١ .Guillemin, 1973, p. 87) . ئاشکەرایە رزگاربوونا جووهیان ژئێخسیرکرنا بابل، ل سەر دەستێ کوروشێ ئێکێ یێ ئەخمینی (٥٥٩ - ٥٢٩ ب.ز) بوو. جووهی ڤەگەڕیانە جهێن خو ل فەلەستینێ، ژ نو پەرستگەها سلێمان Solomon`s Temple ئاڤاکرەڤە (Douglas, 1975, p. 1246).

ب هزرا زەرادەشتیان جانێ مروڤی (گیانێ مروڤی)، پشتی مرنێ (سێ) روژ و شەڤان ل تەنشتا لەشێ مری دمینە، پشتی سێ روژان دێ بەنە جهێ کێشانا کارێن و ییێن قەنج وخراب. جانێ مری دێ چیتە


ژ. ئاموزگار شەرەزایا زمانێن کەڤنێن ئیرانی

سەر پرا چینڤاتێ (Chinvät پرا سیراتێ دئیسلامێدا). پرا ناڤبری بو گونەهکاران وەکو دەڤێ شیری تیژدبیت، بو بێگونەهان پان، بەرین و بەرفرەهـ دبیت (مهر، ١٣٧٥ش، ب٩٨، ١٠١)

سەبارا چارەنڤیسێ جانی (روحێ) پشتی مرنێ، د پەرتووکا پەهلەویدا مینوی خرد Minüye xradدا هاتیە: ڤایویێ (بایێ) چاک Vayu i Veh دگەل ڤایویێ (بایێ) بەد/خراب Vayu i Vattar بەرپسیارن ژ دەربازکرنا جانێن مریان ل سەر پرا چینڤات (سیراتێ). ڤایویێ چاک جانێن باش و چاکان دبەتە بەحشتێ، ڤایویێ خراب جانێن خراب و گونەهکاران دبەتە دوژەهێ (تفضلی، ١٣٧٩ش، ب٢٤)

دەمێ (جانێ) باشەکی ژپرا چینڤات Chinvät دەربازدبیت، زەریەکا شەنگ و شەپال و رووگەش دهێتە بەراهیا وی و دبێژتێ: ئەز زەری نینم، ئەز کارێن تەیێن رەند و جوانم، ئەوێن تە ل وێ دونیایێ کرین. دیسان پیرهەڤیەکا چرچ و کرێت دهێتە بەراهیا گونەهکاری و دبێژتێ: ئەز کارێن تەیێن پیس و دوژینم، ئەوێن تە ل وێ دونیایێ کرین (اسماعیل، ٢٠٠٣، ب٦٢ ـ ٦٣)

دوژەهـ Daozhah جهەکێ نەخوشێ بێهن گەنییە، جهێ نالین وهەوارێن بەدکارایە، تارییە، سارە و قەرسییە، ب سەهمە، تژی دێو و جانەوەرێن بڤەیە. ڤەهیشتا (Vahishtä بەهشت) جهەکێ خوشێ دلڤەکەرە، ئاڤ و کەسکاتیا بێ تخوب و دەرە، روژ چ جارا لێ ئاڤا نابیت (شیرکلائی، ١٣٩٠ش، ب١٠٤. مهر، ١٣٧٥ش، ١٠١)

**دووئالی Dualisim**

ب هزرا زەرادەشتی جیهانا مادی دووئالییە (Dualists دووتاییە)

أ. سـپێنتەمەئینیو Spenta-mainyu بنەتـاریێ هەمـی باشـیێ، قەنجییێ و رووناهییێیە. سەروکێ ئەمیشەسپەندانە و ئەفرێنەرێ وانە، هێزا ئاهورامەزدایە کو ئەم دموڤکێن بووریدا، ل سەر ئاخڤتین.

ب. ئەنگرەمەئینیو Angra-mainyu بنەتـاریێ هەمی خرابییێ، دوژینییێ وتارییێیە. پەیڤا ئەنگرەمەئینیو ب درێژیا سـالان کورتبوویە، بویە: ئەخرەمینو، ئەهرەمینو، ئەهریمـەن. د کوردیدا دبێژنێ: شـیمە و شـیم. رەهێن وان دگەهنـە پەیڤا ئاڤێستایی ئەئیشیمە Aeshema، ئەئیشمە Aeshma، ب ئانکویا . Luciver, Devil, Satan: پەیڤا (ئەئیشمە) وەک رەنگەکێ شەیتانـان، د یەسنا Yasnä دا ود ڤاندیداد Vändidäd دا، کو دو پشکێن ئاڤێستاییێنە، گەلـەک جاران هاتیـە (پورداود، ١٣٣٦ش، ب ٢٨. رضی، ١٣٧٦ش، ب١١٣٢، ١٢٠٧، ١٢٧٦، ١٢٧٧، ١٥٩٢)

ئەئیشیمە، ئەئیشمە ب درێژیا سـالان بویـە: ئیشمە، شـیمە، شـیم. ناڤێ (ئیشـمە) وەک ناڤەکێ شـەیتانی دپەرتووکـا: الديانـة الزرادشـتية مزديسنادا ژی هاتیـە (اسماعيل، ٢٠٠٣، ب٤٤)

ب هزرا ڤەکولەر جورج دەبلیو کارتـەر G. W. Carter هـزرا دووئالی Dualisim د دینێن ئیبراهیمیدا (جووهیاتی، کریستیانی، ئیسـلامێ)دا، ژ هـزرا زەرادەشـتی هاتیە وەرگـرتـن.(Carter, 1970, p. 53)

هژمـارا (حەفت) د دینێ زەرادشتیدا و د کەلەپووریێ جیهانیدا، هژمارەکا پیروزە. چەوا (حەفت) ئەمیشەسپەندان بو کارێن خێرێ هەبوون، (حەفت) دێو ژی بو کارێن خراب و هاریکاریا ئەهریمەنی هەنە. ئەڤەنە: ئەکەمەنە Akamana، ئیندرە Indra ، سەئورڤە Saurva، نانهەئیت Nänhaith ، تەئورڤی Taurvi ، زەئیریش Zairish ، تەرومەت Taromat(دادگی، ١٣٦٩ش، ب٣٨. رضی، ١٣٧٦ش، ب١٢٥٦ ـ ١٢٥٧. والی، ١٣٧٩ش، ب٣٩٩ ـ ٣٠٠). ئاشکەرایە د ژێدەرادا جوداهی دناڤێن ڤان دێوادا هەنە.

ئەهریمەن هەبوونا خویا کەتواری (واقعی) نینە، تنێ دهزرا مروڤادا هەیە، د جیهانێدا تونە. هەتا نەشێت ئێک برِیار ژی بەرامبەر ڤیانا ئاهورامەزدا بدەت (مهر، ١٣٦٠ش، ب٢٠ ـ ٢٢. صفا، ١٩٨٩، ب٥). هەبوونا


ڤەکولەرێ ئنگلیز E.Browne ب کنجێن فارسی

ئەهریمەنی وەک هزر، دەمکییە (وەختییە)، ل داویێ ژلایێ ئاهورامەزداڤە دێ هێتە پووچکرن و ژناڤبرن و جیهان هەتاهەتایێ دێ کەڤیتە بن رووناهیا خێرێ (بویس، ٢٠١٠، ب٣٢)

### ئاتەر/ Ätar ئاگر

د سەرمەڕا بووری، چەوان ئاتەر/ئاگر ل جەم مللەتێن هندوئیرانی بەری زەرادەشت، وەکو پیروزی و خوداوەند، رێز لێ دهاتەگرتن و دهاتە پەرستن. ئیرانیان دگوتێ ئاتەرÄtar ، هندیان ئاگنی Ägni زەرادەشت د کودەتایا خودا (ئاگر) ژ خوداوەندیێ ئێخست، لووکا وی (پلەیا وی) ئینا خار، لێ هەر پیروز هێلا، نەکرە (دێو!).

زەرادەشتی نە ئاگرپەرێسن، مینا هنەک هزردکەن. ل جەم وان ئاگر جەوهەرێ رووناهییێە، چەڤەنگێ (رەمزێ) ئاهورامەزدایە کو رووناهیا رووناهیانە، لەوان پیروزە (افتخارزادە، ١٣٧٧ش، ب١٨٧). پیروزیا وی مینا پیروزیا خاچێیە ل جەم کریستانیان (الجمیل، ٢٠١١، ب٢٢)، پیروزیا گولا لوتوسە Lotusل جەم هندوسان .Friedrichs, 1990. P. 116 ( باناجی، ١٩٩٦، ب١٧٨)

### نڤێژ و روژی

زەرادەشت ل دەسپێکێ (سێ) نڤێژ: هاڤەن Hävan ژ هەلاتنا روژێ هەتا نیڤرو، رەپیتڤین Rapithvin ژ نیڤرو هەتا دەسپێکا شەڤێ، ئەڤیسروتریم Avisruthrim ژ دەسپێکا شەڤێ هەتا نیڤ شەڤ، ل سەر تاگرێن خو، دانان. پاشی ڤیا ئاهورامەزدا، نەهێتە ژبیرکرن و پتر بێتە پەرستن، (دوو) نڤێژێن دن: ئوزەیرین Uzayrin ژ نێزی سێ دەمژمێران پشتی نیڤرو هەتا دەسپێکا شەڤێ، ئوشەهین Ushahin ژ

نیڤا شەڤێ هەتا هەلاتنا روژێ، زێدەکرن، کرنە (پێنج) نڤێژ (دادگی، ١٣٦٩ش، ب١٠٦. بویس، ١٣٨٧ش، ب١٧٥، دەهمەن: ٧)

روژی د دینێ زەرادەشتیدا تونە. بەلکو ل جەم وان روژی گرتن حەرامە (شیرکلائی، ١٣٩٠ش، ب١١٧). د پەندنامەیا بزورگمێهر Bozorgmeher ، وەزیرێ شاهێ ساسانی ئەنو شیرواندا (٥٣١ ـ ٥٧٩ز)، کو ب پەهلەوی هاتیە نڤیسین، هاتیە: د شەڤ و روژەکێدا، دڤێ مروڤ هەشت دەمژمێرا بو پەرستنا خودێ، هەشتا بو چاندنێ و کارێن ژیانێ، هەشتا ژی بو بێهنڤەدانێ، دانیت (شاهرخ، ١٣٨٠ش، ب٢١٨)

## هەڤژینی و مالبات ئاڤاکرن

ژنا باش ئاهورامەزدا یادای و چێکری، فریشتێن ئەسمانان زێرەڤانێن وێنە (مزداپور، ١٣٩٠ش، ب٢١٥). د دینێ زەرادەشتیدا، ژن تشتەکێ پیروزە، وەک پیروزیا ئاگری، رووناهیێ و ئاڤێستایێ. هەتا ئەڤرو کوردێن باشوورێ روژئاڤایێ کوردستانێ دبێژنە ژنێ: پیرەک کو کورتکرنا پەیڤا: پیروزە. ئەمیشەسپەندان دهنەک ژێدەرادا (شەش) فریشتەنە، مەلائیکەتێن پیروزن. (سێ) ژوان ئانکو نیڤەکا وان ژنن. هەئورڤەتاتHaurvatät فریشتا کەمال وساخلەمیێ، ئەمێرێتاتAmeretät فریشتا تم زێندی و نەمریێ، سپێنتا ئارمەئیتی Spentä-ärmaiti فریشتا ئەقلێ پاقژ و پیروز، ژنن (مهرین، ١٣٦٠ش، ب٣٩)

نابیت ژن بێ رازیبوونا خو شووبکەت، نابیت د شووکرنێدا زۆری لێ بێتەکرن. زەرادەشت دبێژتە بچووکترین کچا خو پوئوروچیستا : Pöuruchistä کچا من هزرا خو بکە، پسیارا ئەقلێ خو بکە، تو دێ بڕیارێ دەی کانێ دێ شوو ب جاماسپ Jämäsp کەسێ هاتیە خاستنا تە، کەی یان نە؟ بڕیار د دەستێ تەدایە (مزداپور، ١٣٧١ش، ب١٢)

کچ پشتی ژیێ ١٥ سالیێ، کوڕ پشتی ژیێ ١٨ سالیێ دشێن مالباتێ ئاڤاکەن، بەری ڤی ژی (ڤی عومری) شووکرن و ژنئانین

کارەکێ نەدجهدایە .(Unvala, 1922, p. 12-13) د ئاڤێستادا گەلەک ژنی تونە، ئێک ژنییا بەربەلاڤە، ژنبەردان تونە، ژن نیڤەکا روحا هەڤژینێ خویە، هەڤژینی هەتاهەتایێیە، جاویدانییە هەتا مرنێیە (وحیدی، ١٣٥٩ش، ب٦٤. باناجی، ١٩٩٦، ب٢١٤). ئەگەر شاهەکی یان میرەکی دوو ـ سێ ژن ئانیبن، نابیتە قانونا[٢] هەمی جڤاکی. نەمازە گەلەک جاران جڤاک نەشیایە قانونێ ل سەر شاهـ ، میران و دەسهەلاتداران.. بسەپینیت.

د زەرادەشتییێدا دەیک، خوشک، کچ، خارزا (خوهەرزا)، برازا، خوها باڤێ، خوها دەیکێ، خوها هەڤژینێ، کچێن ژنا مری هەتا چەند نفشەکا، داییـنا شیر دایە کوڕی... ناهێنە مارەکرن و حەرامە (وحیدی، ١٣٥٩ش، ٦٤)

مێژووڤانێن گریکیێن مینا هیرودوتس Herodotus، پلوتارک Plutarch... ژبەر سێرە و هەلویستێ مێژوویێ گریکان دژی ئیرانێ، شەڕ و لێکدانێن دژوارێن وانێن دژی ئێک کرین، ئەو مێژووڤان پالداینە ژبێبەختی، گونەها مارەکرنا خوشکا، کچا.. دایە پال ئیرانیان و دینێ زەرادەشتی (آذرگشسپ، ١٣٩٠ش، ب٤١ ـ ٤٢)

د مێژوویێدا گەلەک جاران ژنا زەرادەشتییا بویە فەروەر، سەرڤەگێڕ و سەرکێشا دەولەتێ یان دەڤەرەکێ. دیسانیا بویە رێبەرا دینی و جڤاکی.

ئاتوسا Ätosä کابانیا داریوشێ ئێکێ (٥٢١ ـ ٤٨٦ ب.ز) پشتی هەڤژینێ خو، فەروەری وەرگرت، بو دیا جهنشینی ( دیا وەلیعەهدێ) کوڕێ خو خشایارشا. هندییا ساخ و سەرخوبوو، خشایارشا فەرمان ژوێ، ئانکو ژدیا خو، وەردگرتن. فەروەرا راستا ئیمبیراتوریا هەخامەنشی ئەوبوو (بروسیوس،١٣٨٩ش، ب١١)

پوراندوخت Pourandokht کچا شاهێ ساسانی خسرو پەرویز (٥٩٠ ـ ٦٢٧ ز)، فەروەری سالا ٦٣٠ز کەتە دەستی. ل گووڕ ژێدەران سالەک و شەش هەیڤا، فەروەریەکا دادانە (عادل) و سیاسەتەکا ژیر و دووربین رێڤەدبر (ژێدەرێ بەرێ، ب١٧)

مێهرنیگار Mehernigär کچا ئانو شیروانێ ساسانی، ژنەکا زیرەک و هشیار بوو، گەلەک پروژێن چاندنێ و ئاڤەدانیێ ریڤەدبرن. ئەوێ جووگەیەکا (قەناتەکا) ئاڤێ ل باژێرێ (یەزد) ژێریا روژهەلاتێ ئیسفەهان ب ۳۰۰ کیلومەتران، بو چاندنێ و ڤەخارنێ ڤەکر، ناڤێ وێ کرە: جوویا مێهریز (قویمی، ۱۳۵۲ش، ب۲۸). پێنەڤێت بێژین دینێ فەرمیێ ئیمبراتورییێن هەخامەنشیان/ئەخمینیان و ساسانیان، زەرادەشتی بوو.

## گووری و قوربانی

ژ کەڤندا گەلەک مللەتێن خودان پەز، بزن، تەرش و گاڕان... هنەک جانەوەرێن خو دکرنە قوربان. نە ژبەر خاترا خودانان تنێ، بەلکو گەلەک جاران پەرستڤان، پێشنڤێژ و خودا ژی، بو رێورەسمێن ڤەکوشتنا قوربانیان و گووریان، دهاتنە خاندن و داخازکرن (بار، ۱۳۸٦ش، ب۷۸)

هندوئیرانییێن کەڤن ڤەکوشتنا جانەوەران، ب مفا و قازانجا خودایان، خودانان، وەلاتیان و جانەوەران.. دزانی. ب هزرا وان بڤێ رێ، رێیا ڤەکوشتنێ، جانێن جانەوەران دێ شاد و گەشبن، دێ چنە جیهانەکا دیا ڤەنجتر و خوشتر، هیچ مرنەکا دی بو جانەوەران ژ ڤەکوشتنێ باشتر نەدزانی! (بویس، ۱۳۸۷ش، ب۱۳۱). دگەل ڤەکوشتنێ شەرابا هەئومە Haöma ڤەدخار و جانەوەر وەک گووری و قوربانی پێشکێشی خودایان دکرن. زەرادەشت ئەو هەردوو تیتال (هەئومە و قوربانی) حەرامکرن وبەتالکرن (یسنا ۳۲، بەند: ۱۲، ۱٤. یسنا ٤۸، بەند: ۱۰). دگوت: ئاهورامەزدا پێدڤی قوربانیا، خون رێتنێ ونەزرا نینە. نڤێژکرن و رێیا راستا وی گرتن، بو وی بەسن (افتخارزادە، ۱۳۷۷ش، ب۱٦۸). ئەگەر پێوەندییێن مروڤی دگەل ئاهورامەزدا، ل سەر بنەتارێ راستیێ، پاقژیێ و دلسوژیێ برێڤە نەچن، ڤەکوشتنا جانەوەرێن قوربانیان، کارەکێ بێ سوود و بێ مەعنایە (بار، ۱۳۸٦ش، ب۹۰ - ۹۱)

مخابن پشتی مرنا زەرادەشت، تاگرێن وی هەردوو تیتال (هەئومە و قوربانی) جارەکا دی وەکو بەرێ بو ناڤ جڤاکی، زڤراندن (هەرئەو ژێدەر)

## کوتەکی و بکەیفا خۆ (جەبر و ئیختیار)

ئاهورامەزدا گوتە مەرتیە Martya ومەرتیانە[٣] Martyäna هون مروڤن، دەیک و بابێن جیهانیانە، من بلندترین ئەقلێ دایە هنگو، کارێن خو ب ئەقلێ راست و ڤەکری بکەن، هزرا قەنج بکەن، کارێن قەنج بکەن، گوتنا قەنج بێژن، گوهداریا دێوان نەکەن (دادگی، ١٣٦٩ش، ب٨١). د گاتاندا ئاهورامەزدا مروڤ بو هزرکرنێ، بو بڕیاردانێ ل سەر کارێن دکەت، ئازادێ هێلای! ئەوێ خرابیێ بکەت، دێ قەهرێ، ئێشانێ وپەشێمانیێ بینیت. ئەوێ باشیێ بکەت، دێ گەهتە خوشیێ، شادیێ و بەحشتێ (پورداود، ١٣٥٤ش، ب٨٠ ـ ٨٤)

ئانکو فەلسەفا دینێ زەرادەشتی نە کوتەکییە (نە جەبرییە)، بەلکو هەلبژاتن و ئازادییە، هەر کەسەک چێکەرێ پاشەروژا خویە. مروڤ خودانێ ئیرادەیا خویا ئازادە، هەر کارەکێ بکەت تنێ بەرامبەر خودێ ئاهورامەزدا بەرپسیارە (بهار، ١٣٧٥ش، ب٤٣. مهرین، ١٣٦٠ش، ب٤٨). د ئیسلامێدا رێبازێن: ئەشعەری، حەنبەلی، مالکی و شافعی جەبرینە (کوتەکینە)، تنێ موعتەزیلە ئیختیارینە و(بکەیفا خۆ)نە.

## سیدرە و کوشتی

سیدرە و کوشتی هەردوو د ئاڤێستایێدا هاتینە (رضی، ١٣٧٦ش، جـ٣ ب١١٣٧. پورداود، ١٣١٠ش، ب٦٠)

سیدرە Sidra کراسەکێ سپیێ سادەیە ژ لوکەی تێتە چێکرن، دبن جلکاڤە دکەنە بەرخو. سپیێ سادە ئاماژەیە بو پاقژکرنا دلی ژهەر دژوینیەکا هەبیت. سەرێ وی ڤەکریە بێ پستۆیە دبێژنێ گریبان ( Gribän گریڤان). ڤەکریە دا گونەهـ خوتێدا نەگرن و دەرکەڤن. هچک

کورتە و بەریکەکا ب سنگێ ویڤە دوورییە، ب هیڤیا ئەو بەریک ببیتە گەنجا (خزینا) هزرا قەنج، کارێن قەنج، گوتنا قەنج. کچ و کوڕێن زەرادەشتی پشتی ژیێ ١٥ سالیێ، دڤێ ڤێ کراسی بکەنەبەرخو (أوشیدری، ١٣٧١ش، ب٣٢٢)

سیدرە دپەرتووکێن پەهلەویدا دبێژنێ: شەپیک (Shapik، شەبیگ) Shabig فرەوشی، ١٣٥٨ش، ب٥٢٩ .(Mackenzie, 1971, p. 58 .ب هزرا ڤەکولەر هوشەنگ جاماسپ شەپیک و شەبیگ ئێکن، ئانکو کراسێ ب شەڤێ ژی نەئێخن و هەرێ دبەردا. (Jamasp, 1907, p. 209) بەرئەڤل شەپیک Shapik مینا ڤەکولەر (فرەوشی) نڤێسی، ژ شەبیگێ (مەکەنزی) راسترە. ب گروڤێ شەپکێ Shepik کوردی هەر شەپیکێ پەهلەوییە، کراسێ نیڤا ژووریا لەشییە، سیدرە ژی وەتوڤە.

کوشتی Kushti شوتکە، کەمەرەکە ژ ٧٢ داڤێن هریا پاقژا سپی هاتیە ڤەهاندن. ٧٢ داڤ لسەر ٦ رێزان هاتینە پارڤەکرن، هەر رێزەکێ ١٢ داڤ دچنێ. ٧٢ داڤ ئاماژەیە بو ٧٢ هاتێن (فەصلێن) یەسنا ـ پشکا کەڤنارا ئاڤێستایێ. ١٢ داڤ ئاماژەیە بو ١٢ هەیڤێن سالێ، ٦ ئاماژەیە بو ٦ جەژنێن دینی یێن زەرادەشتی. ڤێ شوتکێ یان کەمەرێ (سێ) جارا ل دور پشتا کەسێ زەرادەشتی دزڤڕینن، هەر جارەکێ گرێیەکێ لێ ددەن، دبنە (سێ) گرێ، ئەڤ سێ جارە وسێ گرێیە، ئاماژەنە بو هزرا قەنج، کارێ قەنج و گوتنا قەنج (Modi, 1922, p. 185. Browne, 1977, Vol. 1, p. 99)

هەر کەسەکێ زەرادەشتی، کچ بیت یان کوڕ، پشتی ژیێ ١٥ سالیێ دڤێ کوشتیێ گرێدەت، پاڤێتە پشتا خو.

بەرئەڤل رەهێن شویتکا/شوتکا بەهدینان دگەهنە پەیڤا (کوشتی) یا زەرادەشتی. کوشتی Kushti ب وەرگێڕانێ metathes بویە شوتک Shutik، مینا کێڤژالە بویە کێڤلاژە! یان بەروڤاژی. نەمازە پیروزی، تیتال و شونوارێن زەرادەشتی، هەتا ئەڤرو ل دەڤەرا بەهدینان پڕن، کو مخابن ئەڤ بابەتە نەبەروکا گوتارا مەیە.

**جەژنێن دینی**

(شەش) جەژنێن دینی د زەرادەشتییدا هەنە دبێژنێ: گاهئەنبار Gäh-anbär یان گەهەنبار . Gahanbar ب ئانکویا: گەهێن/دەمێن ئەنبارکرنا قووتی، ئەنبارکرنا گەنمی، جەهی، فێقی وگیای... هەمیان پێوەندی ب چاندنێ، رێنجبەریێ وپەیداکرنا قووتی وهاریکاریا ژاراڤە، هەیە. هەر جەژنەک (پینج) روژان ڤەدکێشێ، تێدا ب تایبەتی روژا داویێ کو شەرگەها جەژنێیە، خێر و دیاری بو هەژار و کێم درامەتان دهاتنە بەخشین. د ژێدەرادا ئەڤ جەژنە بەری زەرادەشت ژی، دناڤ هوزێن هندوئیرانیدا، هەبوون (مهر، ١٣٧٥ش، ب١٨١، گیمن، ١٣٧٥ش، ب١٥٩ ـ ١٦٠)

أ. مەئیدیو زەریم . Maedio-zarem د بهارێدا هەیڤا ئەردیبەهشت (دگولان و جوتاندا/ئەیارێدا) تێتە گێران، روژێن ١٠ ـ ١٥ێ هەیڤێ ڤەدکێشێ، وەختێ دورینا جەهی، گەنمی، نیسک ونوکان... وبێدەرایە.

ب. مەئیدیو شەهیم . Maedio-shahem نیڤا هاڤینێ د هەیڤا تیردا (دخێڤە/خزیرانێ وتیرمەهێدا) تێتەگێران. روژێن ١٠ ـ ١٥ێ هەیڤێ ڤەدکێشێ. دەمێ هەلگرتنا برنجی و گەنموکییە.

ت. پەئیتی شەهیم . Paete-shahem د هەیڤا شەهریوردا (دگلاڤێژێ و کەوچەرینێدا) تێتە گێران. روژێن ٢٥ ـ ٣٠ ێ هەیڤێ ڤەدکێشێ. داویا هاڤینێیە، دەمێ راکرنا دەرامەتێ هاڤینێ وئالفی بو کەوالان .

پ. ئەیاتریم . Ayä-threm د هەیڤا مهردا (کەوچەرینێ وچریا ئێکێدا) تێتە گێران. روژێن ٢٥ ـ ٣٠ ێ هەیڤێ ڤەدکێشێ، دەمێ راکرنا دەرامەتێ هاڤینێ و پاییزێیە.

ج. مەئیدی ئاریم . Maedi-ärem ئانکو نیڤا زڤستانێ. دهەیڤا دەیدا (بەفربارێن ئێکێ و دوێدا) تێتە گێران. روژێن ١٥ ـ ٢٠ ێ هەیڤێ ڤەدکێشێ. جەژنا بێهنڤەدانا جووتیارایە.

ح. هەمەسپەت مەئیدیم . Hamaspath-maedem د داویا هەیڤا ئیسفەند دایە (د رەشـەمەهێ و ئاڤداریدا) تێتە گێڕان. د روژێـن ١٥ ـ ٢٠ ێ هەیڤێ ڤەدکێشـێ. دەمێ جووتـی، کێلان و چاندنـێیە. (رجبی، ١٣٧٥ش، ب١٧، دەهمەنێ نەمرە: ٦. گیمـن، ١٣٧٥ش، ب١٥٨ ـ ١٦١. وحیـدی، ١٣٥٩ش، ب٥٩).

پێدڤییە بێژین زەرادەشتیان گەلەک جەژنێن مللی/نەتەوی ژی هەنە وەک: نەوروزێ، مێهرەجانێ، سەدە، یلدا... کو ناکەڤنە بەروکا گوتارا مە .

### دلوڤانێ جانەوەران

زەرادەشت ل سەردەمێ چاندنێ و ئاکنجیبوونا خێلێن هندوئیرانی هاتیە. لەوان دلوڤانێ جانەوەرێن ب سوود و مفا بوو، پشتەڤانێ چاندنێ و جانەوەر خودانکرنێ بوو. ئەو دبێژێ: کەسێن ئاخڤتنا ئاهورامەزدا سست وەردگرن، خراب ل سەر چارپێیان (جانەوەران) دئاخڤن، چەروانا و زەڤیا وێراندکەن، دکەنە ڤیاپان (بیابان)، کەسێن درەوین و بێ دینن، دوژمنێن منن (یسنا، هات: ٣٢، بەند: ١٠)

سلاڤ ل چارپێیان (جانەوەران)، ئاخڤتنێن خوش بو چارپێیان، سەرکەڤتن بو چارپێیان، چەراخوش بو چارپێیان، کێلان و چاندن بو چارپێیان، ئەو ژبەر پەیداکرنا قوتێ مە تێنە خودانکرن (یسنا، هات: ١٠، بەند: ٢٠). ژ بەر پەیداکرنا قوتێ مە، زەرادەشت گووری و قوربانیێن جانەوەران حەرامکرن. گا، چێل، سە، هەسپ وکروسک (دیکل)... پیروزکرن (پورداود، ١٣٨٠ش، ب٢٠٢، ٢٢٠، ٣١٥).

ژ بیرنەکەین نەهەمی جانەوەر جهێ رێزگرتنێنە. جانەوەرێن بێ مفا و زیانکار، ئەوێن دبێژنێ: خرەفستەر Xrafstar وەک ماران، دووپشکان، مشکان، جوردان، گورگان، کولیان، کێزان، مێشان... دڤێ بێنە ژناڤبرن (رضی، ١٣٨٤ش، ب٦٨. آموزگار، ١٣٧٥ش، ب١٠٤)

**سەربێژک**

ئەڤ خەلەکە باسی هزر، بیر و باوەریێن دینێ زەرادەشتی، دگەل کودەتایا دینیا زەرادەشت دهزر و بیروباوەریێن خێلێن هندوئیرانییێن کەڤندا کری، دکەت. مینا هەلبژارتنا ئاهورامەزدا Ähurämazdä ژ ناڤ خوداییێن دیدا، وەک خودێ ئێکانە، ئو دانانا گەلەک خوداییێن دی، د خانەییێن دێو و درەویناندا. ئاهورامەزدا ئەوێ ئەمیشەسپێنتان Amesha Spenta حەفت فریشتە چێکرین، دا ب فەرمانا وی، کارێن ئەردی و مروڤان رێڤەببەت.

دیسان ئەڤە باسی پیروزیا ئاتەری/ئاگری، ژنێ، سیدرە، کوشتی.. و پیروزیا هنەک باری و جۆتوکێلا وەک گا، چێلا، هەسپا وسا... دکەت.

د زەرادەشتییێدا ئەڤە بو جارا ئێکێیە باسی حسابا پشتی مرنێ، بەحشت و دوژەهێ و پرا چینڤاتێ (سیراتێ).. تێتەکرن. ئەڤ زانیارییە هەمی ژ دینێ زەرادەشتی، پاشی هاتنەناڤ دینێن ئیبراهیمیدا، هاتنەناڤ جوهیاتیێ، کریستانیێ و ئیسلامێدا.

د فەلسەفا زەرادەشتییێدا مروڤ دکارێن خودا سەربەست و ئازادە، نەیێ بندەست و بنزۆرێیە. هەر کارەکێ مروڤ بکەت، تنێ بەرامبەر ئاهورامەزدا یێ بەرپرسە. نابیت جانەوەران بکەنە گووری و قوربانی، خودێ پێدڤی خونرێتنێ نینە، نڤێژو پەرستن بو وی بەسن. مەیا هەئومە Haöma حەرامە. د روژێدا دڤێ (پێنج) نڤێژ، بو خودێ بێنەکرن و(شەش) جەژنێن دینی ژی د سالێدا بێنە گێران.

**دەهمەن**

١- دین: پەیڤەکا کوردییە، د ئاڤێستادا daena ب ئانکویا: دین Riligion هاتیە (بهرامی، ١٣٦٩ش، جـ٢ ب٦٧٧). ژئاڤێستا پەیڤا دین چویە ناڤ زمانێ ئارامی و ژئارامی کەتیە ناڤ زمانێ عەرەبی.

٢- قانون: ژپەیڤا یونانی Cänon, Känun هاتیە. یاسا ژ پەیڤا یاساغ/یاساق Yäsag, Yäsäqیا مەغولی هاتیە. یاساغ درست ئەو قانون بوون ئەوێن جەنگیزخان بو لەشکەرێ خویێ خونرێژ دانایبن. یونانی خودان قانون، زانست و باژێرڤانی بوون. گورگێن جەنگیزخانی و قانون کوجا مەرحەبا؟ لەورا من پەیڤا (یاسا) هەژی گوتارا خو نەدیت. ع. م

٣- د ئەسلدا: مەشیە و مەشیانە ناڤێن پەهلەوییێن وانە. مەرتیە و مەرتیانە مینا د ئاڤێستادا هاتین، دەیک و باڤێن ئێکێ یێن مروڤانە، مینا ئادەمی و حەوایێ دهزرا سامیاندا. هەردوو پەیڤ ئانکویا: ئەوێ دمریت! دگەهینن، ئاماژەیە بو نەمانا مروڤان (مهر، ١٣٧٥ش، ب٥٤). دەلیڤەیە بێژین: مەرتیە ومەرتیا ئاڤێستایی، د کوردیدا مایە بوویە: مەرد، مێر. د ناڤخودا مرنێ دهلگرن!

## ژێدەر

**أ- ژێدەرێن عەرەبی:**

١- اسماعيل، نورى، ٢٠٠٣، الديانة الزرادشتية مزديسنا، دار علاء الدين، دمشق.
٢- الحلاق، جمال على، ٢٠٠٩، مسلمة الحنفي ـ قراءة فى تاريخ محرم، منشورات الجمل، بغداد.
٣- باناجى، بهمن سوراجى (الدكتور)، ١٩٩٦، الديانة الزرادشتية، ترجمة: توفيق الحسينى، مطبوعات مكتبة لورين، الحسكة ـ دمشق.
٤- بويس، مارى، ٢٠١٠، تاريخ الزرادشتية من بداياتها حتى القرن العشرين، ترجمها عن الروسية: خليل عبدالرحمن، مطبوعات مركز الدراسات الكوردية ـ كوردولوجى، السليمانية.
٥- الجميل، الخورى ناصر، ٢٠١١، الرموز المسيحية، دكاش برينتينغ هاوس، بيروت.
٦- كدر، جورج، ٢٠١٣، معجم آلهه العرب قبل الاسلام، دار الساقي، بيروت.

**ب. ژێدەرێن فارسی:**

٧- آذرگشسپ، موبد اردشير، ١٣٩٠ش، پاسخگويى به اتهامات، بكوشش: مهرانگيز شهزادى، سازمان انتشارات فروهر، تهران.
٨- آشتيانى، جلال الدين، ١٣٦٨ش، زرتشت ـ مزديسنا وحكومت، انتشارات شركت سهامى، تهران.
٩- آموزگار، ژاله وتفضلى، احمد، ١٣٧٥ش، اسطورهء زندگى زردشت، نشر چشمه، تهران.
١٠- افتخارزاده، محمد رضا (دكتر)، ١٣٧٧ش، ايران ـ آيين وفرهنگ، انتشارات رسالت قلم، تهران.
١١- اوشيدرى، جيهانگير (دكتر)، ١٣٧١ش، دانشنامهء مزديسنا، شركت نشر مركز، تهران.
١٢- بار، كاى وديگران، ١٣٨٦ش، ديانت زرتشتى، ترجمهء: تيمور قادرى، انتشارات فكر روز، تهران.
١٣- بروسيوس، ماريا، ١٣٨٩ش، زنان در ايران باستان، ترجمهء: محمود طلوعى، انتشارات تهران، تهران .
١٤- بهار، مهرداد (دكتر)، ١٣٧٥ش، اديان آسيايى، نشر چشمه، تهران.

١٥- بهرامی، احسـان، ٢٠٠٠، فرهنگ واژەهـای اوسـتائی ـ انگلیسی، نشـر بلـخ، تهران، ٤ جلد.
١٦- بویس، مـری، ١٣٨٧ش، آییـن زرتشـت ـ کهـن روزگـار وقدرت ماندگـارش، ترجمه: ابوالحسن تهامی، موسسـهء انتشـارات نگاه، تهران.
١٧- پورداود، ابراهیـم، ١٣١٠ش، خرده اوسـتا، انتشـارات انجمـن زرتشـتیانی ایرانی، بمبئی.
١٨- پورداود، ابراهیـم، ١٣٥٤ش، گاتـها ـ سرودهـای زرتشـت، انتشـارات دانشـگاه تهـران، تهـران.
١٩- پورداود، ابراهیـم، ١٣٣٦ش، یادداشتهـای گاتهـا، بکوشش: بهرام فرەوشی، انتشـارات انجمـن ایرانشناسی، تهران .
٢٠- پورداود، ابراهیـم، ١٣٥٦ش، یسنا ـ بخشی از نامهء مینوی اوستا، انتشارات دانشگاه تهران، تهران.
٢١- تفضلی، احمد، ١٣٧٩ش، مینوی خرد ـ ترجمهء از متن پهلوی، به کوشش: ژاله ێموزگار، نشر توس، تهران.
٢٢- حافظ، ١٣٧٤ش، دیوان حافظ، به تصحیح: علامه محمد قزوینی د. قاسم غنی، انتشارات اساطیر، تهران.
٢٣- دادگی، فرنبـغ، ١٣٦٩ش، بندهـش ـ ترجمهء از متن پهلوی ، گزارنـده: د.مهـرداد بهـار، انتشـارات توس، تهـران.
٢٤- رجبی، پرویز، ١٣٧٥ش، جشنهای ایرانی، انتشارات فرزین، تهران.
٢٥- رضـی، هاشـم، ١٣٨٩ش، ایران وفرهنگ ایرانی در عصر اوسـتا، انتشارات بهجت، تهران.
٢٦- رضـی، هاشـم، ١٣٨٤ش، زرتشـــت پیامبـــری ایـــران باســـتان، انتشـارات بهجـت، تهـران.
٢٧- رضـی، هاشـم، ١٣٧٦ش، وندیداد ـ ترجمهء از متن اوستائی، انتشارات فکر روز، تهران، ٤ جلد.
٢٨- زنر، آر، سی، ١٣٧٥ش، طلوع وغروب زردشتی گری، ترجمهء: تیمور قادری، انتشارات فکر روز، تهران .
٢٩- شاهرخ، ارباب کیخسرو، ١٣٨٠ش، زرتشت پیامبری که از نو باید شناخت، انتشارات جامی، تهران.

٣٠- شیرکلائی، عزیز الله محمدی، ١٣٩٠ش، ادیان وکیشهای ایران زمین از باستان تا اسلام، انتشارات شلفین، مازندران.
٣١- صفا، ذبیح الله، ١٩٨٩، توحید ایرانی ومسئلهء ثنویت، (مقال)، مجله: ره، شماره: ٢٣.
٣٢- فرەوشی، بهرام، ١٣٥٨ش، فرهنگ زبان پهلوی به فارسی، انتشارات دانشگاه تهران، تهران.
٣٣- قویمی، فخری، ١٣٥٢ش، کارنامهء زنان مشهور ایران قبل از اسلام تا عصر حاضر، انتشارات کتابهای جیبی، تهران.
٣٤- کریستنسن، آرتور، ١٣٨٨ش، مزداپرستی در ایران قدیم، ترجمهء: د. ذبیح الله صفا، انتشارات هیرمند، تهران.
٣٥- گیمن، دوشن، ١٣٧٥ش، دین ایران باستان، ترجمهء: رویا منجم، انتشارات فکر روز، تهران.
٣٦- مزداپور، کتایون، ١٣٧١ش، زن در آیین زرتشتی، انتشارات نوید، زاربروکن، المانیا.
٣٧- مهر، فرهنگ، ١٣٦٠ش، از دین زرتشت چه می دانید؟ انتشارات مرکز زرتشتیان کالیفورنیای جنوبی، لوس انجلس.
٣٨- مهر، فرهنگ، ١٣٧٥ش، دیدی نو از دینی کهن، انتشارات جامی، تهران.
٣٩- مهرین، مهرداد، ١٣٦٠ش، آیین زرتشت ـ تأثیر ونفوذ آن در شرق وغرب، سازمان انتشارات فروهر، تهران.
٤٠- والی، زهرەء، ١٣٧٩ش، هفت در قلمرو تمدن وفرهنگ بشری، انتشارات اساطیر، تهران.
٤١- وحیدی، حسین، ١٣٥٩ش، دین پایهء زرتشتی، سازمان چاپ خواجه، تهران.

**ج- ژێدەرێن ئنگلیزی:**

42. Browne, Edward G., 1977, A Literary History of Persia, Cambridge University Press, London, 5 Volumes.
43. Carter, G. W., 1970, Zoroastrianism and Judaism, AMS Press, New York.
44. Dhalla, Maneckji N., 1938, History of Zoroastrianism, Oxford University Press, London.

45. Douglas, J. D., 1975, The New Bible Dictionary, B. Erdmans Publishing co., Michigan.
46. Guillemin Duchesne, Jacgues, 1973, The Western Rosponse of Zoroaster, Praeger Publisher, London.
47. Jamasp, Hoshang D., 1907, Vendidad-Avesta Text with Pahlavi translation and commentary, Vol. 11, Glossarial Index, Bombay.
48. Mackenzie, D. N., 1971, A Concise Pahlavi Dictionary, Oxford University Press, London.
49. Modi, Jamshedji J.,, 1922, The Religious Ceremonies and Customs of the Parsees, Bombay.
50. Unvala, Maneckji J., 1922, Darab Hormazyars Rivayat, Bombay.

**د- ژێدەرێن ئەلمانی:**

51. Friedrichs, Kurt, 1990, Das Lexikon des Hinduismus, Goldmann Verlag, München.
52. Haag, Herbert,1994, Biblisches Wörterbuch, H. Freiburg Verlag, Breisgau, Germany.
53. Herodotus, 1961, Historien, Übertragen von: Eberhard Richtsteig, Wilhelm Goldmann Verlag, München, 5 Bände.
54. Irmscher, Johannes, Lexikon der Antike, Gondrom Verlag, Bindlach, Germany.
55. Oldenberg, Herman, 1917. Die Religion des Vedas, Verlag von Wilhelm Hertz, Berlin u. Stuttgart.
56. Wundt, Wilhelm, 1913, Elemente der Völker-psychologie, Alfred Kröner Verlag, Leipzig.

## ملخص البحث

## الافكار والمعتقدات الزرادشتية

د. عبد الرحمن مزورى
عضو عامل الاكاديمية الكوردية

تدرسُ هذه الحلقة من الدراسة، العقائد الدينية الزرادشتية، والانقلاب الديني الذي احدثهُ زرادشت في عقائد القبائل الهندوايرانية القديمة. كإختياره الإله آهورامزدا من بين الالهة العديدة المعروفة عندهم، على انه الخالق الاكبر والإله الاوحد. واعتباره الالهه الاخرى مجرَّد عفاريت وكذَّابين.

آهورامزدا الذي خلق اميشه سبنتان Amesha-Spenta الملائكة السبعة الذين يديرون شؤون الارض والخلق بأمره. كما تدرسُ هذه الحلقة فكرتي الجنة وجهنم اللتين أتى بهما الزرادشتية لاول مرَّة، ومنهما انتقلت الى الاديان الإبراهيمية كاليهودية والمسيحية والإسلام. وتعرجُ الدراسة ايضاً الى قدسية النار والمرأة وسيدره Sidra وكوشتى ..Kushti وقدسية بعض الحيوانات الزراعية كالثيران والاحصنة والكلاب... وغيرها.

وتُحلِّل الدراسة اختيار زرادشت لفلسفة الإختيار في سلوك الإنسان والتركيز على حريته، ونبذه الجبرية التي تحرمه من هذه الحرية. وتحريمه تقديم القرابين الحيوانية الى الإله آهورامزدا او الالهة الاخرى لانهم في غنىً عنها، وتحريمه شراب هئومه Haöma المُسكِّر والمصاحب للإحتفالات الدينية. وفرضه خمس صلوات في اليوم على اتباعه في اوقات معينة، والإحتفال بستة اعياد دينية، ناهيك عن الاعياد الوطنية .

**Abstract Summary**

## Thoughts and Believes of Zoroasterians

Dr. Abdul – Rahman Mezuri
Member of Kurdish Academy

This research examines the Zoroastrian religious doctrines and the religious coup that Zoroaster brought about the ancient Indo-Iranian Tribes. Zoroaster chose Ahuramzda (Ähurämazdä) among the many gods familiar to them, as The Greatest Creator and The only God but the other gods are considered mere Devils and Liars.

Ahuramzada, who created Amesha-Spenta, the seven angels who manage the affairs of the earth and creation by His command. This seminar also examines the ideas of paradise and hell, which were brought by Zoroastrianism for the first time, and moved to the Abrahamic religions, such as Judaism, Christianity and Islam. The study also lends itself to the sanctity of fire and women, Sidra and Kushti, and the sanctity of some agricultural animals such as bulls, horses, dogs, etc.

The study analyzes Zoroaster's selection of the Philosophy of Volition (election, free will) in human behavior and focus on his freedom, and his rejection of Fatalism, which deprives him of this freedom. It is forbidden to offer animal as offerings to the god of Ahramazda or other gods because they are indispensable, and forbidden to drink alcoholic beverages Haöma and accompanying religious ceremonies. He imposed five prayers a day on his followers at certain times, and celebrated six religious holidays, as well as many national holidays.

# ڕەوشی سیاسیی دەڤەری بارزان لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئیتیحاد وتەرەقی لەنێوان سالآنی (١٩٠٨ – ١٩١٤)

**م. مستەفا محەمەد کەریم – د. شوان محەمەدئەمین تەها**

بەشی مێژوو- کۆلێژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر

**پێشەکی**

دەڤەری بارزان یەکێکە لە ناوچە سەرەکییەکانی باشووری کوردستان کە تائەمڕۆش سەرەڕای هەموو قۆناغە سەختەکانی مێژوویی کە پێیدا تێپەڕیوە، بەڵام وەک قەڵایەکی پۆڵاین ماوەتەوە و توانیویەتی بەردەوامی بدات بەژیان و چالاکییەکانی، بێگومان ئەم تایبەتمەندییەش لە ناوچەکانی تری کوردستان جیای دەکاتەوە.

مێژووی زیاتر لە سەدەیەکی گەلی کورد، خاوەنی چەندین قارەمانی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەر و مرۆڤ دۆست و ئازادیخواز بووە، خانەوادەی شێخانی بارزان بەشێکی دیار و سەرەکی ئەم مێژوویە بەدرێژایی زیاتر لە یەک سەدە، بێگومان رۆڵی جوامێرانەی نیشتمانی بارزانییەکان کە شوێن و پێگەیەکی دیار و بەرچاویان هەبووە لە دەستپێشخەری گشت جوولانەوەیەکی شۆڕشگێڕی لە سەرجەم پارچەکانی کوردستان، هەروەها سەرقافڵەی هەموو ئەو راپەڕین و شۆڕشە یەک لەدوایەکەکان بوون کە مێژووی پڕ سەروەریی کوردیان نەخشاندووە، لە قۆناغە جیاوازەکانی فەرمانڕەوایەتی وەک "فەرمانڕەوایەتی عوسمانییەکان و سەردەمی پاشایەتی لە عێراق (١٩٢١ – ١٩٥٨) و سەردەمی کۆماری" رۆڵێکی گرنگ و بەرچاویان گێڕاوە لە ژیانی سیاسی لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد لە باشووری کوردستان بەتایبەتی و پارچەکانی دیکە بەگشتی.

نووسینەوەی مێژووی ئەم دەڤەرە لە ساڵانی ١٩٠٨ – ١٩١٤ لە رووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و هـزری، گرنگیدانە بەماوەیەکی گرنگ لە مێژووی کورد لە باشووری کوردستان، کە چەندین گۆڕانکاری و پەرەسەندنی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و هـزری لەخۆ دەگرێت، کە بەساڵی ١٩٠٨ دەستپێکی رێبەرایەتی شێخ عەبدولسەلامی دووەم وەک شێخی تەکیەی بارزان وەک خاڵێکی وەرچەرخان دەست پێدەکات و بە لەسێدارەدانی لەساڵی ١٩١٤ کۆتایی دێت.

ئەم توێژینەوەیە جگە لە پێشەکی لە چوار باس پێکهاتووە، سەبارەت بە باسی یەکەمی توێژینەوەکە تیشک خراوەتە سەر هەوڵ و بیانووەکانی ئیتیحاد و تەرەقی بۆ هێرشکردنە سەر دەڤەری بارزان، باسی دووەم دەرخستنێکە لەبارەی لەشکرکێشیی ئیتیحادییەکان بۆ سەر دەڤەری بارزان، تێیدا تیشک خراوەتە سەر هۆکارەکانی لەشکرکێشییەکە و رەوت و پەرەسەندنەکانی بەتایبەت رۆڵی فازیل پاشا داغستانی لەو هەڵمەتە و بەرئەنجامەکانی لەنێوان ساڵانی ١٩٠٩ – ١٩١٢، پاشان لە باسی سێیەمدا جەخت کراوەتەوە لە رۆڵی پارتی " حوریەت و ئیتیلاف" و گەڕانەوەی ئارامی بۆ ناوچەی بارزان، دوای دوورخستنەوەی ئیتیحادییەکان لە دەسەڵات. هەروەها تیشک خراوەتە سەر دووبارە گەڕانەوەی ئیتیحادییەکان بۆ دەسەڵات و هەڵوێستی دوژمنکارانەیان بەرامبەر بە تەکیەی بارزان و لەگەڵ خستنەڕووی سیاسەتی سلێمان نەزیف بەرامبەر بە شێخی بارزان و لەشکرکێشییەکانی بۆ سەر دەڤەری بارزان، پاشان سەردەمی ئاوارەیی شێخ عەبدولسەلام و هەوڵەکانی بۆ پەیداکردنی پاڵپشتی بۆ دۆزی کورد لە تاراوگە بەتایبەت "رووسیا" لە باسی چوارەم و کۆتایی توێژینەوەکە رۆشنایەتی خراوەتە سەر پیلانی دەستگیرکردنی شێخ و دیاریکردنی هەڵوێستی سلێمان نەزیف بەرامبەر بە شێخی بارزان و لەسێدارەدانی لە ساڵی ١٩١٤.

### ١- هەوڵ و بیانووی ئیتیحادییەکان بۆ شاڵاو بردنە سەر دەڤەری بارزان:

کودەتـای (١٩٠٨)ی کۆمەڵـەی ئیتیحـاد و تـەرەقی کتـوپڕ ڕووی نەداوە، بەڵکو زادەی چەند هەوڵی دەیان ساڵ بە شێوەی خەباتی نهێنی درێژەی کێشا، سەرەتای ساڵی (١٩٠٨) لەبەر چەند هۆکارێک پـڕۆژەی کودەتـای سـەربازییان بۆسـەر سـوڵتان (عەبدولحەمیـدی دووەم) دواخسـت بەهـۆی نەبـوونی هێـزی تەواوی کۆمەڵەکە بۆ کەنار گیرکردنی سوڵتان، هەروەهـا گـرتنەبەری سیاسـەتی نەرمی سوڵتان لەگەڵیان، جگە لەمانەش ئیتیحادییەکان بوێریی تەواویـان نەبـوو بۆ بڵاوکـردنەوەی پڕوپاگەنـدەکانیان دژی سـوڵتان لەنێـو سـەربازەکاندا چـونکە سەربازەکان دۆستایەتییان بـۆ سـوڵتان دەربڕیبـوو (عـەلیاوەیی، ٢٠٠٤، ل١٨٣؛ کۆمەڵێک نووسەر،٢٠١٣، ل٢٨٣).

بۆیە ئیتیحادییەکان بڕیاریـان دا لە (٢٣ی تەممـووزی ١٩٠٨)دا دەسـت بە جووڵانەوەکانیان بکەن، لە هەڵمەتێکدا چەند ئەفسـەرێک لەوانە (نیـازی بەگ و ئەنوەر بەگ) کە ئەندامانی کۆمەڵەبوون بە سـوپاکانیانەوە لە مەکـدۆنیا یـاخی بـــوون (زۆجـــەر، ٢٠٠٩، ل١٥٦)، لە (٢٣ی تەممـــووزی ١٩٠٨) کودەتاکەیـــان سەرکەوتوو بـوو، ئەفسـەرە تورکەکـانی ئەنـدامی کـۆمەڵەی ئیتیحـاد و تەرەقـی سوڵتانیان ناچارکرد بە دووبـارە کـارکردن بە دەسـتووری سـاڵی (١٨٧٦)، هەر لە هەمان ڕۆژدا (مەشرووتیەتی دووەم) ڕاگەیەنـرا، لە (٢٤ی تەممـووزی ١٩٠٨) ئەم هەواڵانە بڵاوبـۆوە لە وڵاتـدا، بەتـایبەت لە ئەسـتەمبووڵ ئاهەنـگ گێـڕان و برایەتییـــان بە خـــۆیەوە بینـــی (ئەرســـلان، ٢٠٠٩،ل٢٦؛ نـــەجاتی عەبـــدوڵڵا، ٢٠٠٧،ل١٠).

هاونیشتمانییان دڵخـۆش بـوون، ئیتیحادییەکـان بەڵێنـی دەسـتەبەرکردنی ئازادی بێ گوێدان بە ئایین و زمان، فەرماندە نیزامییەکانی تورک بەڵێنیـان بە کورد دا کە داننان بە مافی سەربەخۆییان دەنێن (ڤان برۆنسن، ٢٠٠٣، ل٢٦٢)، ئەم گەشـبینییە مـاوەیەکی کـورت بـوو، پەرلەمـان یەکەم دانیشـتنی خـۆی لە (١٧ی کـانوونی یەکەمـی ١٩٠٨) بە ئامـادەیی سـوڵتان ئەنجـام دا و گوتـارێکی تەختی پاشایەتی دا، کەشوهەوایەکی نالەبار دانیشتنەکەی داپۆشیبوو، چـونکە ئیتیحادییەکـــان هەرەســـیان هێنـــابوو لە ڕووبەڕووبـــوونەوەی مەترســـییەکانی

دەرەکی، بەتایبەت بولگاریا کە لە (١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٠٨) سەربەخۆیی ڕاگەیاند، ئیمپراتۆریەتی نەمسا و مەجەر لکاندنی هەریەک لە بۆسنە و هەرسکی ڕاگەیاند (هاوار،٢٠٠٠، ل٤٦٣).

سەرانی کۆمەڵەکە بڕیاریان دا بەرهەڵستییەکی چەکدارانە بۆ لابردنی سوڵتان بۆیە لە سالۆنیک بە خێرا هێرشیان کردە سەر ئەستەمبووڵ لە (٢٤ی نیسانی ١٩٠٩) توانییان بارودۆخ کۆنترۆڵ بکەن حوکمی کاتی ڕابگەینن، بۆیە شێخولئیسلام (محەمەد زیائەدین) ناچارکرا فتوای لابردنی سوڵتان بدات (جوەیدە، ٢٠٠٨، ل٢٢٨).

لە شوێنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، (محەمەد ڕەشاد)ی برای بەناوی سوڵتان محەمەدی پێنجەم (١٩٠٩-١٩١٨) هاتە سەر دەسەڵات (السید، ٢٠١٥،ص٣٣)، بەڵام دەسەڵاتی ڕاستەقینە بەدەست ئیتیحادییەکان بوو، واتە دوای کودەتای (١٣ی نیسانی ١٩٠٩) توانییان جڵەوی سیاسی و سەربازی بگرنە دەست، کەوتنە بڵاوکردنەوەی بیری تۆرانییەت و نەیانتوانی چارەسەری کێشەی نەتەوەیی لە وڵاتدا بکەن، دەستیان کرد بە پەیڕەوکردنی سیاسەتی توندڕەوی و مەرکەزیەت (لازاریف، ١٩٨٩، ل٢٣٤).

دوا بەدوای جێگیربوونی دەسەڵاتی ئیتیحادییەکان گوشارێکی زۆر توند خرایە سەر کورد لە ڕێگای سیاسەتی بە تورککردن و خراپبوونی ڕەوشی ئابووری ئەمەش بووە هۆی دەرکەوتنی شەپۆلێکی ناڕەزایی گەورە لەلایەن کورد لە بەرامبەر سیاسەتی ئیتیحادییەکان و تێکچوونی پەیوەندیی نێوانیان (عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەک، ٢٠١٠، ل١٩٩ ؛ عەلیاوەیی، ٢٠٠٤، ل١٦٢).)، بۆیە کوردەکان کەوتنە چالاکی ئەنجامدان لە دژیان و دروشمی (ئەم خاکە خاکی خۆمانە)و گەڕانەوەی حوکمی ئیسلام و سوڵتانیان بەرزکردەوە، بەتوندترین شێوەش ڕووبەڕووی ئیتیحادییەکان بوونەوە (لازاریف و ئەوانی تر، مێژووی...، ٢٠١٢، ل ل٢٣٣-٢٣٤)، لە ڕێگای ئەنجامدانی چەندین ڕاپەڕین وەک ڕاپەڕینی ئیبراهیم پاشای میللی (١٩٠٨)، هەروەها، بزووتنەوەی شێخ عەبدولسەلام بارزانی (١٩٠٨-١٩١٤) و ڕاپەڕینی مەلا سەلیم بەدلیسی (١٩١٣-١٩١٤) .

شـێخ عەبدولسـەلامی دووەم لە سـەر ڕێچـکەی بـاوکی ڕۆیشـت و بـوو بە چاکسازێکی ئاینی و سـەرکردەیەکی نیشـتمانی (Gunter, 2009, p.1)، قوڕسـایی زیاتری بەناوەندی شێخایەتی بارزاندا دا و چالاکتری کرد لە ڕێگەی نەهێشـتنی موڵکایەتی و دابەشکردنی زەوی بەسەر جووتیاران، ڕەتکـردنەوەی مـارەیی و بە زۆر بەشـوودانی کـچ و ڕێکخسـتنەوەی پەیوەنـدییە کۆمەڵایەتییەکـان لە سـەر بنچینەی یەکسانی و دادپەروەری، هەروەها دروستکردنی مزگەوت بۆ ئەنجامدانی ئەرکە ئاینییەکـان و کردنـی بە ناوەنـدێک بـۆ ژیـانی کـۆمەڵایەتی و ئـاینی و سیاسی، سەرەڕای ئەوانەش لە سەرانسەری بادیناندا زانـای ئـاینی لە سـەنتەری دینی بارزان نزیک کردەوە، لە بەرامبەردا پاداشتی ئەو زانا ئاینییانەی دەکـرد و لە کاروباری شێخایەتیدا لەڕووی کۆمەڵایەتی و سیاسـی و زانسـتی پـرس و ڕای پێدەکردن (جەعفەر،٢٠١٣، ل ١٥٥).

شێخ هەموو کاتێک دەیویست پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەریدا باش بکـات و بەرەو پێشەوەی ببات، هەروەها هەموو کێشەیەک چارەسەر بکات، چونکە شێخ تالبی ئاشتی و تەناهی بووە، دەیزانی کە جەنگ و شـەڕ لە ئەنجامـدا سـوود بە هـیچ کەسـێک ناگەیەنێـت و تەنهـا مـاڵوێرانی دەمێنێـتەوە، بەڵام وادیـارە کە دوژمنانی (بارزان ) هەموو کات دەیانویست ئەم شێخە لەناو ببەن و بە قسـەی شێخ رازی نەبوون کە باسی ئاشتی و دانوستاندن بکـات (مـەلا ئـەیوب، ٢٠٠٧، ل١٣٣).

لەلای خـۆیەوە شـێخ عەبدولسـەلام پەیوەنـدی کـرد بەنـاودارانی دەڤەری بادینـان بـۆ ڕازیکردنیـان بـۆ ئەوەی بۆچـوونی ئەوان وەربگرێـت کە چاکسـازی بکرێـت وە سـەردانی کەسـایەتییەکانی وەک شـێخ بـەهائـەددین نەقشـبەندی خاوەنی تەکیەی بامەڕنی و کەسایەتی شێخ بریڤکانی خاوەنی تەکیەی قـادری و هەموو لایەک هاندەر بوون کە بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی هەبێت لەنـاو کـورددا (فتح الله،٢٠٠٢، ص٦٦ ).

لە بەهـاری ١٩٠٧ ز. شـێخ عەبدولسـەلام ئامـادە بـوو بـۆ مەبەسـتی کۆبـوونەوەیەکی گرنـگ لە مـاڵی شـێخ (نـور محمـد قـادر بریڤکـانی) ڕابەری تەکیەی قادری گەیلانی لە گوندی بریفکاندا بەسترا ژمارەیـەکی زۆر لە گەورە و

سەرۆک هۆزە کوردییەکانیش ئامادەبوون لەم کۆبوونەوەیەدا سەرەتا شێخ نور محمد وەک سەرۆکی کۆنگرە هەڵبژێردرا بەمەش شێخ داوای لێبووردنی کرد کە باری تەندروستی باش نییە بۆیە داوای لە شێخ عەبدولسەلام کرد کە ببێتە سەرۆکی کۆنگرەکە (هاوار،٢٠٠٠، ل٤٨٧).

شێخ عەبدولسەلامیش بە سەرۆکی کۆنگرە هەڵبژێردرا یاداشتەکیان بەرز کردەوە بۆ (باب عالی ) لە ئەستانە یاداشتنامەکە ئەم داواکارییانەی لە خۆ گرتبوو: زمانی کوردی زمانی فەرمی بێت لە ناوچە کوردییەکاندا، قایمقام و بەڕێوەبەرو فەرمانبەرانی دامودەزگاکان لەم جۆرە کەسانە بن کە پسپۆڕن لە زمانی کوردی و شارەزاییان هەیە، ئەحکام بەپێی شەریعەتی ئیسلام بێت و زمانی کوردی زمانی ڕەسمی بێت لە قوتابخانەکاندا (نێروەیی،٢٠١٠، ل ٦٢-٦٣)، هەروەها دامەزراندنی موفتی لە ناوچەکە دەبێت لە سەر مەزهەبی ئیمامی شافعی بێت وە مافی فتوادانی هەبێت و باج بەپێی شەریعەتی ئیسلام لە دانیشتوان وەربگیرێت و باجی بەدەل (بەدەلی عەسکەری) وەکو خۆی بمێنێتەوە بە مەرجێک پارەکە بۆ چاککردنەوەی ڕێگاو بان و کردنەوەی قوتابخانە تەرخان بکرێت (پی رەش، ١٩٨٠، ص٩٩).

ئەم برووسکەیە، کە لە ماڵی شێخ نور محمد نووسراوە پێچەوانەی ئەو کەسانەی کە ئیمزایان لەسەر کردووە و گەرەکیان بووە برووسکەیەکی تەواو ڕەسمی بێت، لە سەر داوای شێخ عەبدولسەلام وێنەی دراوە بە هەر یەک لە "شەریف پاشای کوڕی سەعید پاشای خەندان"، شێخ "عەبدولقادری شەمزینی" و "ئەمین عالی بەدرخان" (الدملوجی، ١٩٥٢، ص٩٦).

ئەم ریفۆرمە پێشنیازکراوانە کە لە ڕێگای یاداشتێک ئاراستەی دەسەڵاتدانی عوسمانی کرا، بەتایبەت کە جەخت لە لایەنی زمان دەکاتەوە، لێدانی زەنگێکی مەترسیدار بوو لە بنگوێی ئیتیحادییەکان (فتح اللە،٢٠٠٢، ص٦٧ ؛ امین، ٢٠١١، ص٦٥)، چونکە زمان بنەمای بنەڕەتی شوناسی نەتەوەیە، بەتێڕوانینی ئەوان بەخشینی ئەم جۆرە مافانە بەگەلانی ژێر دەستە، یەکێتی عوسمانی لاواز دەکات، ئەوکات وڵاتە ئەوروپییەکان دەتوانن بەئاسانی یەک لەدوای یەک قووتیان بدەن، بیانوویان بۆ ئەمەش سەربەخۆیی بولگاریا

یاخود ئەو چارەنووسە بوو کە رووبەڕووی میسر بۆوە، بۆیە دەسەڵاتدارانی عوسمانی یاداشتەکەیان بە سەرەتای جیابوونەوە لەدەوڵەت لەقەڵەم دا (خالد، ٢٠١٢، ل٢٩٧).

گوتاری شێخ عەبدولسەلام گوتارێکی ئاشکرایە و ڕەهەندەکانی دیارە، ئەو یەکەم کەسە کە بەرنامەی بۆ بزووتنەوەی نیشتمانی کوردی نووسیوە و داواکارییەکانیشی تێدا تۆمار کردووە، کە لەپلەی یەکەمدا بەڕەسمی ناسینی زمانی کوردی هاتووە، بەشێوەیەک زمان لە گوتاری شێخ عەبدولسەلام بارزانی پلەی یەکەمی وەرگرتووە، دیارە لەپشت داواکردنی بەڕەسمی ناسینی زمانی کوردییەوە دەلالەتی گەڕان بەدوای شوناسدا دێتە ئاراوە، شوناس بەو واتایەی کە بوونی کورد وەک پێکهاتەیەکی ئیتنیکیی جیاواز و سەربەخۆ لەوانی تر پیشان بدرێت و مافەکانیشی پێبدرێت (عەتا،٢٠٠٧،ل ل ٢٨٩-٢٩٠).

دەسەڵاتی ئەستانە کە چاوی بەم یاداشتنامەیە کەوت ئەوەندەی تر ڕقی هەڵسا و وتی ئەم جۆرە داواکارییانە هی شێخێکی تەریقەت نییە بەڵکو ئەمە تێوەژەندنێکە لە کۆمەڵە کوردییەکانەوە کە دەیانەوێت حکومەتێکی لامەرکەزی بۆ کورد دروست بکەن جگە لەوەش وایان لە بابی عالی گەیاندووە کە شێخ عەبدولسەلام ژێربەژێر لەگەڵ ڕووسیا ڕێک کەوتووە بۆ دروستکردنی حکومەتێکی کوردی، بۆیە هەموو ئەو شتانە بوونە هۆی ئەوەی کە حکومەتی ئەستانە بە هەموو جۆرێک خەشم و قین لە بارزان و بارزانییەکان هەڵبگرێت و خەریکی ئەوە بێت لە ناویان بەرێت (سەجادی، ٢٠٠٥، ل ١٤٨).

دیارە چالاکییە سیاسی و بەرگرییەکانی شێخی بارزان لە مافی کورد، بەتایبەت دوای کودەتای (١٩٠٨) لەگەڵ چەند سەرکردە و شێخی ناوچەکە بە ناردنی داواکاری بۆ ئەنجومەنی نوێنەران لە ئەستەمبووڵ کە جەختی دەکردەوە لە زمان و خوێندنی کوردی و لایەنی ئابووری و چاککردنی ڕێگا و بان، ئەم داواکارییە چاکسازییە بەهەنگاوێکی یاخیبوون و مەترسی لێکدرایەوە لەلایەن ئیتیحادییەکان بۆیە هەوڵیاندا سنوورێک بۆ دەسەڵاتی شێخ دابنێن، بەڵام شێخ عەبدولسەلام لەبەرامبەر هەڕەشەکانیان لە (تشرینی یەکەمی ١٩٠٩) شۆڕشی ڕاگەیاند (کەریم، ٢٠١٣، ل ٢٧٤؛ لازاریف، ١٩٨٩، ل٢٣٨).

## ٢- لەشکرکێشیی ئیتیحادییەکان و بڵێسەی ئاگری شۆڕش لە دەڤەری بارزان:

خەباتی سیاسی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی بریتی بوو لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو شاڵاوە سەربازییەی کە "فەریق محەمەد فازیل پاشا داغستانی" ئەفسەری سەربازی عوسمانی لە کۆتایی ١٩٠٩ و سەرەتای ١٩١٠ کردیە سەر بارزان، پاش ئەوەی ئیتیحادییەکان لە ئاکامی کودەتای ١٩٠٨ دەسەڵاتیان گرتە دەست، داغستانی وەک والیی مووسڵ دانرا، لە تەمموزی ١٩٠٩ والیی مووسڵ بانگهێشتی شێخ عەبدولسەلامی کرد بۆ مووسڵ، بەڵام لەلایەن دۆستانی لە ئاکرێ و مووسڵ ئاگادارکرایەوە کە ئەم بانگهێشتکردنە ڕەتبکاتەوە و ڕوو نەکاتە مووسڵ و ئاگاداری خۆی بێت (ئەبو زێد، ٢٠٠٣، ل١٤٢ ؛ بۆتانی، ١٩٩٨، ل١٢).

شێخ عەبدولسەلام بارزانی ئاگادارکردنەوەی دۆستانی بەهەند وەردەگرێت و بانگهێشتەکەی داغستانی ڕەت دەکاتەوە، دیارە هۆکاری ڕەتکردنەوەکەشی ئاشکرایە کە بەر لەو داواکارییە دەسەڵاتدارانی مووسڵ بەهاوکاری ئاغاکانی ناوچەکە لە بیرە کەپرە هەوڵی تیرۆر کردنیان بۆ دانابوو، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، بۆیە دوای ئەم ڕووداوە زۆر بەهۆشیارییەوە مامەڵەی دەکرد، گەیشتە ئەو بڕوایەی کە بانگهێشتەکەی داغستانیش وەک هەوڵەکانی پێشوو، دوو مەبەستی هەیە یان دەستگیرکردنی یاخود تیرۆرکردنی، هەرچەندە لە داب و نەریتی تەکیەی بارزان و تاکی دەڤەرەکە وا باو بوو کە خۆ ڕادەستکردن کارێکی وا ئاسان نابێت، بەڵکو پەیوەستیان کردبوو بە کەرامەتی مرۆڤ، کە پێویستە گیان و لاشەی بۆ تەرخان بکرێت، دیارە دوای ڕەتکردنەوەی بانگهێشتەکە لەلایەن شێخ عەبدولسەلام بارزانی و نەچوونی بۆ مووسڵ داغستانی لە (ئاکرێ) وە ئاگاداری شێخی کردەوە ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نەبێت و نەچێتە مووسڵ، ئەوا سوپایەک بەرەو بارزان دەنێرێ و تەکیەکەی وێران دەکات (مەلا ئەیوب، ٢٠٠٧، ل ١٤٥؛ ئەبو زێد، ٢٠٠٣، ل١٤٢).

وەڵامی شێخ بۆ هەڕەشەکەی (داغستانی) گوللەیەک بوو لە ناو نامەیەکی پێچراودا کە تیایدا هاتبوو (ژیان لای من هیچ بەهایەکی نییە و مەرگ

نامترسێنیّ لە ئێستاشەوە پەیوەندیم لەگەڵ دەوڵـەتی عوسـمانی دەبێـتە شـەڕو کوشتار، چیت دەویّ بیکە)، دیارە ئەم وەڵامدانەوەی شێخ لەرێگای ئەم نـامەیە کاریگەری گەورەی لەسەر دەروونی داغستانی دروستکرد، لەو بارەیەوە "عەبـاس ئەلعـەزاوی" دەڵێـت: "داغسـتانی پیـاوێکی سـەربازی و پیـاوی شـەڕ و لێـدان و کوشـتار بـووە، نەک پیـاوی نووسـین و قەڵەم" (العـزاوي، ١٩٥٦، ص١٨١). ئەمەش دەرخەری ئەو راسـتییەیە کە شـێخ عەبدولسـەلام چـۆن زیرەکـانە توانیویەتی دەروونی بەرامـبەرەکەی بخـوێنێتەوە کە ئەم کەسـایەتییە تەنهـا بـۆ جەنگ دەشێت نەوەک ئیدارەدانی ویلایەتێک .

دوا بەدوای وەڵامی شێخ عەبدولسەلام بارزانی هێرشـی ئیتیحادییەکـان بـۆ سەر بارزان دەستی پێکرد، ناردنی هێز و لەشکرکێشی بڵێسەی ئاگری راپەڕینی خۆشـکرد، بێگومـان ئەم راپەڕیـنەی تەکـیەی بـارزان وا پێناسـە دەکرێـت و دەناسـرێت کە یەکەمـین رووداوە تـوانی پەردە رابماڵێـت لەسـەر شـۆڤینیەتی فەرمانڕەوایەتی ئیتیحـاد و تەرەقـی، بەوەی کە هەمـوو بەڵێنەکانیـان مـایەپووچ بوون بەرامبەر بە میللەتانی عوسمانی (قفطان،٢٠٠٣، ص ص ٢٠-٢١).

سەبارەت بەڕەوت و پەرەسەندنەکانی جەنگ، نەخشەی شێخ عەبدولسەلام لە رووی سـەربازییەوە تەواو بەرگریکـردن بـوو، بەشـێوەیەک خـۆ قـایمکردن لە چیـای پێـرس و رێگـا و بانەکـان بەمەبەسـتی رێگـا گـرتن لە پێشـڕەوییەکانی سوپای عوسمانی، کە لە ئاکرێوە روویـانکردبووە دینـارتە، تـۆپە ئاگرینەکانیـان لەویّ دامەزراند و سوپای پیادەش بەرەو چیای پێـرس پێشـڕەوییان کـرد، بەڵام لێهاتوویی سـەرکردە سـەربازییەکانی تەکـیەی بـارزان لە سـەرووی هەموویـانەوە "فەقیّ عەبدولرەحمان" توانرا شکست بەسوپای عوسمانی بهێنـدرێت و ناچاریـان بکەن بەپاشەکشە بەئاراستەی دینارتە (ئەبو زێد، ٢٠٠٣، ل١٤٣ ).

هێزەکانی شێخ لە چیای پێرس و دەروازەکانی بەسەر سوپای عوسـمانیدا سەرکەوتن، زیانی گیانی جەنگاوەرانی تەکـیەی بـارزان بریتـی بـوو لە کـوژرانی دوو جەنگاوەر بەناوەکانی " سارم و مامل" لەگەڵ برینداربوونی ساڵح بێرسیاڤی برای ئەحمەد ئاغای بێرسیاڤی، بەڵام لە ریزی عوسمانییەکان ژمـارەیەک دیـل و کوژراویـــان لەدوا بەجێمـــا لەگەڵ برێـــک چەک و تەقەمەنـــی، ســـەرەڕای ئەو

بارودۆخەش شێخ عەبدولسەلام بۆ دەربڕینی نیازپاکی دیلەکانی ئازاد کرد، هەروەها چەکە دەست بەسەرداگراوەکانیشی بەسەر جەنگاوەراندا دابەش کرد، بەڵام لە بەرامبەردا ئەم شکستەی داغستانی لە ڕووی سەربازییەوە بەرامبەر بە تەکیەی بارزان گورزێکی کوشندە بوو لە ناو و ناوبانگی ناوبراو، بۆیە هەموو دەستپێشخەرییەکی ئاشتی ڕەت کردەوە، دەستی کرد بە دووبارە ڕێکخستنەوەی هێزەکەی کە سێ مانگی خایاند، بەمەبەستی هێرشکردنە سەر بارزان، بۆ ئەم مەبەستەش تاکتیکێکی نوێی سەربازی پەیڕەو کرد، کە بریتی بوو لە فرەوانکردنی بەرەکانی جەنگ، بەتایبەت لە بەری ڕۆژهەڵاتی چیای پێرس (پی ڕەش، ١٩٨٠، ص ص ١٠٢ — ١٠٣؛ اسماعیل، ١٩٩٨، ص٤١).

جگە لەمەش گوشاری فەرمی خستە سەر هۆزەکان بۆ بەشداریکردن دژ بە تەکیەی بارزان، بەپێچەوانەوە هەر هۆزێک بەشداری نەکات بەهاریکار و پشتیوانی شێخ عەبدولسەلام هەژمار دەکرێت، ئەمەش وایکرد لەکاتی لەشکرکێشیی ئیتیحادییەکان هیچ سەرۆک هۆزێکی ناوچەکە بەرەنگاری سوپای عوسمانی نەبێتەوە، بەڵکو هەموو قورسایی شەڕەکە کەوتە سەر شانی تەکیەی بارزان، لەو بارەیەوە " کاوس قەفتان" بۆچوونێکی جیاواز دەخاتە ڕوو، پێی وایە سەرەڕای فشاری ئیتحادییەکان بۆ سەر هۆزە کوردییەکان، بەڵام هەندێک سەرۆک هۆز بەتایبەت ئاغا و دەرەبەگەکانی ناوچەکە ئارەزوومەندانە پاڵپشتی حکومەت بوون، بەهیوای گەڕانەوەی هێز و دەسەڵاتیان بۆ ناوچەکە و پەیڕەوکردنی سیستەمی پێشووتریان (بالایی، ٢٠٠٣، ل٣٦ ؛ قفطان،٢٠٠٣، ص٢١).

پاش ئەوەی شێخ عەبدولسەلام بەڕاوێژکردن لەگەڵ سەرکردە سەربازییەکانی گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە ناهاوسەنگی لە تەرازووی هێزدا هەیە، هەروەها نەخشەی حکومەتی عوسمانی بۆ داگیرکردنی سەرتاپای ناوچەکە ئاکامەکەی کاولکاری و مەرگەساتی پتر دەبێت، بۆیە لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە ڕووبەڕووی سوپای عوسمانی نەبنەوە و بەرگری نەکەن، بۆیە سوپای ئیتیحادییەکان لە پەلاماری دووەمدا، توانییان دەست بگرن بەسەر دەڤەری بارزان، دوای ئەوەی شێخ و هاوەڵەکانی لە ناوچەکە دوورکەوتنەوە و ڕوویان

کردە چیاکانی هەکاری بە مەبەستی خۆ ونکردن (ئـەبو زێد، ۲۰۰۳، ل ل۱٤٤-۱٤٥؛ فتح الله، ۲۰۰۲، ص۷۰).

دیارە شێخ عەبدولسەلام سەرەتا پەنای بـردە بەر چیـای "هیـرێ" لەنزیـک بـارزان و چەنـدین مانـگ لەشـوێن گۆڕکێکردنـدا ژیـانی بەسـەر بـرد، چـونکە لەدڵنیاییـدا نەبـوو، پاشـان روو دەکـاتە لای "بنیـامین مـار شـەمعون[1]" لە ناوچەی"تیـاری" لەدەڤەری جـۆلەمێرگ، کە ئەویـش بەوپەڕی ڕێـزەوە مـامەڵەی لەگەڵ شێخ کرد و پەنـاگەی بـۆ ڕێکخسـت (خالـد، ۲۰۱۲، ل ل ۲۹۸ — ۲۹۹ ؛ شێروانی، ۲۰۰۸، ل ۲۳۱ ؛ بارزانی، ۲۰۱۲، ل۲۱).

دەسـەڵاتدارانی عوسـمانی بەتەواوەتـی دەرکیـان بە مەترسـییەکانی شـێخ عەبدولسلام بارزانی کردبوو، بۆیە لەهەموو لایەک هەوڵی کۆکردنەوەی زانیارییان دەدا لەسەر شـێخ، تەنـانەت دوای ئەوەی زانیـاری دەگـاتە والیـی وان کە شـێخ عەبدولسەلام لەلایەن "مار شـەمعون" داڵـدەدراوە، بڕیـاردەدات بەنـاردنی هێزێـک بەمەبەستی دەستگیرکردنی، بەڵام کە سەرکردەی ئەم هێـزە لەسـەر راسـپاردەی والیی وان روو دەکەنە دیوەخانی مار شەمعون، کە ئەوکـات شـێخ عەبدولسـەلام لەوێ بوونی دەبێت، بەڵام ناسراو نابێت لەلایەن سەرکردەی هێزە ڕەوانکراوەکە، مار شەمعون بە ئینجیل سوێند دەخوات کە تۆ چەند شێخ دەبینی منـیش وەک تۆ دەیبینم (قفطان،۲۰۰۳، ص۲۱؛ مەلا ئـەیوب، ۲۰۰۷، ل١٥٦). دیـارە نوانـدنی ئەم رەفتارەی "مار شەمعون" بووە هۆکارێک بۆ رزگارکردنی شێخ عەبدولسەلام، بۆیە "مەسـعود بـارزانی" لە بەرامـبەر ئەو هەڵوێسـتەی نـاوبراو دەڵێـت" ئـێمەی بارزانی منەتبـاری ئەم هەڵوێسـتە پـڕ لە شـانازییەی مـار شـەمعونین" (بـارزانی، ۲۰۱۲، ل۲۱).

بـارودۆخی شـێخ و شـوێنکەوتووانی تـا دەهـات ئـاڵۆز و سـەخت دەبـوو، بەتـایبەت پـاش ئەوەی داغسـتانی نەفیـر عـامی دژی بارزانییەکـان ڕاگەیانـد و دەسـتی کـرد بەسـووتاندن و وێرانکردنـی دێهـاتی دەڤەرەکە بەشـێوەیەک دەسەڵاتداران بەدوای شێخ عەبدولسـلامی دووەم دەگەڕان، هـیچ شـێوازێک نەمـا گوندییەکانی پێ ئازار و ئەشکەنجە نەدەن، بـۆ ئەوەی ناچاریـان بـکەن زانیـاری لەبارەی هەڵسـوکەوت و گەڕان و سووڕانیان بـدەن، لە هەر گوندێکدا پیـاوێکی

شێخ لەلایەن حکومەتەوە دەستگیر بکرایە ئەوە ئەو گوندە خاپوور دەکرا و زۆریش لە رۆڵەکانیان دەخرایە زیندان (شێروانی، ٢٠٠٨، ل ٢٣١ )، لەم نێوەندەشدا ژن و منداڵیش لەو رەشبگیرییە بەدەر نەبوون، تەنانەت " مستەفا بارزانی[٢]" برا بچووکی شێخ کە تەمەنی لە دەوروبەری سێ ساڵاندا بوو لەگەڵ دایکی کەوتنە بەر ئەو هەڵمەتە و لە مووسڵ زیندانی کران بۆ ماوەی سێ ساڵ (گەوهەری، ٢٠١٤، ل١٧ ؛ ابوبکر، ٢٠١٠، ص١٣٣؛ dabrowska, hann, .(2008,P.153

داغستانی بەمەش نەوەستا بەڵکو دەستیکرد بە پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی دیکە کە بریتی بوو لە راسپاردنی ئەفسەرانی کورد لە سوپای عوسمانی بەڕاوەدوونان و دەستگیرکردنی شێخ عەبدولسەلام بارزانی، یەکێک لەو ئەفسەرانە بەناوی " جەمیل عەلی ئەفەندی رەسول ئاغا برای ئیسماعیل حەقی شاوێس" کە فەرمانە سەربازییەکەی جێبەجێ نەکرد، بۆیە لە کارەکەی دوورخرایەوە و لە ئەستانە نیشتەجێ بوو، هەرچەندە ئیتیحادییەکان فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ دەرکرد، بەڵام بەهۆی هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانی، بڕیارەکە جێبەجێ نەبوو (بەرزنجی، ٢٠٠١، ل ل٧٦ – ٧٨).

دوابەدوای ئەم رووداوە ژمارەیەکی زۆر لە چەکدار لە شوێنە دوورەپەڕەکاندا خۆیان حەشاردابوو، چاوەڕوانی فەرمان بوون، پاشان شێخ عەبدولسەلام گەڕایەوە ناوچەی بارزان و پیاوەکانی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە لە وڵاتی ژێری کە کەوتۆتە پشتی چیای شیرین لە باکووری گوندی بارزان لەوێوە پەلامارێکی توند و کتوپڕیان کردە سەر ئەو هێزە تورکەی کە لە ناوچەکەدا دەواریان هەڵدابوو توانییان سەرجەم ناوچەکە پاک بکەنەوە (بارزانی، ٢٠١٢، ل٢١).

هەر لەو بارەیەوە رۆژنامەی " صدی بابل" لە ٣١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٩ بەڕوونی تیشک دەخاتە سەر بارودۆخی دەڤەری بارزان بەگشتی و شێخ و جەنگاوەرەکانی بەشێوەیەکی تایبەت لەدوای پەلاماردانی دووەمی داغستانی و دەنووسێت " ئەوان لەکاتی ئێستادا لە چیاکان خۆیان قایم کردووە، بەتایبەت لەم وەرزەی زستاندا شێخی بارزان لە پەناگەکەی خۆی

هاتۆتەدەر و پیاوەکانی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە بە مەبەستی تۆڵەسەندنەوە لە حکومەت و ئەوانەی دەستیان هەبووە لە بەدیل گرتنی پیاوان و خێزانەکانیان لە مووسڵ، هەروەها بەتوندی و لافاو ئاسا پەلاماری ئەو سەربازانەیان داوە کە کەوتوونەتە لای ئاکرێ، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو سەربازانە چەک و تفاقیان هەبووە، بەڵام شەڕێکی سەختی لەگەڵ کردوون و تێکیانی شکاندوون (احمد، ١٩٧٥، ص٩٠).

پاش ئەم ڕووداوە " سەفوەت بەگ" کە یەکێک بووە لە ئەفسەرەکانی داغستانی، بەبێ ئاگاداری سەرکردەکەی نامەیەک ئاراستەی "ئەستانە" دەکات و راوبۆچوونی خۆی لەمەڕ کێشەی بارزان دەخاتە ڕوو، کە تێیدا جەخت دەکاتەوە لەوەی کە پێویستە شێخی بارزان ببەخشرێت و ڕێگای پێبدرێت بگەڕێتەوە بارەگاکەی لە بارزان، بە مەبەستی گوێڕایەڵبوون بۆ دەسەڵات، بێگومان ئەنجامدانی ئەم کارە لە بەرژەوەندیی دەستوور و ڕێگایەکە بۆ سەرکەوتنی (اسماعیل، ١٩٩٨، ص٤٢).

ناردنی ئەو نامەیە لەلایەن "سەفوەت بەگ" بووە مایەی ناڕەزایەتی توندی داغستانی، بۆیە ناوبراو وەک کاردانەوەیەک بەرامبەر " سەفوەت بەگ" ڕاپۆرتێک ئاراستەی دەسەڵاتدارانی ئەستانە دەکات و تێیدا ناوبراو تۆمەتبار دەکات بەوەرگرتنی بەرتیل لە شێخ عەبدولسەلام بارزانی، هەر ئەمەش وایکرد لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانییەوە سەفوەت بەگ بانگهێشتی ئەستانە بکرێت، بەڵام بەر لە ڕۆیشتنی بەنامەیەک ئاگاداری شێخ دەکاتەوە "کە لە شوێنی خۆی ئارام بگرێت، لەکاتێکیشدا داغستانی هەوڵەکانی چڕبکاتەوە بۆ هێرشکردن ئەوە هیچ پاساوێک نامێنێت تەنها بەرگریکردن نەبێت، منیش لەلای خۆمەوە لە ئەستانە دەسەڵاتداران تێدەگەیەنم کە بەرپرسی ڕاستەقینە لەو کارە خودی داغستانییە" (نیکیتین، ١٩٧٣، ص٢٠ ؛ خالد، ٢٠١٢، ل ٣٠٣).

لەلایەکی دیکەوە دەرکەوتنی شێخ عەبدولسەلام بارزانی و خەباتە چەکدارییەکانی لە گوندی بابسیڤا مەترسییەکی گەورە بوو لەسەر خودی داغستانی، بۆیە لە ساڵی ١٩٠٩ بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر بارەگای شێخ لەو ناوچەیە، بە یاوەری (٤٠٠) سەرباز لە ڕەگەزی داغستانی و کۆمەڵێک لە

چەکدارە هـۆزە کوردییەکـانی وەک " سـورچی و گـۆران و زێبـار و هەرکـی" کە ئامانجی سەرەکی چیای شیرن بوو، لەوێشەوە بۆ لـووتکەی " سـەری بـازێ" کە بەتەواوی دەڕوانێـتە سـەر سـەرجەم گونـدەکانی نـاوچەکە و بەتـایبەت گونـدی "بابسیڤا" کە بارەگای شێخی تێدا بـوو (پـی ڕەش، ١٩٨٠، ص١١٠)، دیـارە بەر لە ئەنجامدانی لەشکرکێشییەکە داغستانی ڕوودەکاتە چەکدارە هۆزە کوردییەکان و دەڵێت: "ئێوە وەک تـورک نـین کە ویژدانیـان نیـیە، باوەڕیـان بە چـوار لیـرە دەفرۆشن، ئێوە پیاوە ئازاکانی هۆزەکانن، هێرش بکەنە سەر ئەم شێخە (شـێخ عەبدولسـەلام بـارزانی) و بیکـوژن و خـۆی و شـوێنکەوتووانی لەنـاوبەرن" (نیکیتین، ١٩٧٣، ص٢٠).

شـێخ دوای ئاگـاداربوونی لە جموجـووڵە سـەربازییەکانی داغسـتانی زۆر هۆشـیارانە پلانـی جەنگـی داڕشـت، ئەویـش پشـت بەسـتن بـوو بەهەڵـکەوتەی جوگرافیای ناوچەکە، کە گەروویەکی تەنـگ دەکەوێـتە نێـوان بـارزان و بابسـیڤا جەنگاوەرەکانی لە هەردوو بەری گەرووەکە جێگیـر کـرد وەک دانـانی بۆسـەیەک بۆ سەربازانی داغستانی، لە هەمان کاتیشدا دەسـتیکرد بە بەرزکـردنەوەی ورەی جەنگاوەرەکانی و پێیانی ڕاگەیاند کە ئـێمە لەنـاو وەرزی زسـتانداین و نـاتوانین ڕوو بکەیـــنە شـــاخەکان، پێویســـتە بەرەنگـــاری بـــارودۆخەکە ببیـــنەوە و بەکەرامەتەوە بمرین (اسماعیل، ١٩٩٨، ص٤٣).

شـیاوی باسـکردنە ئەم جەنـگە لە مێـژووی نـوێی کـورد لە کوردسـتانی باشوور بە جەنگی "سەری بـاز[٣]" ناسـراوە، لەم بـارەیەوە خـاوەن سـەرچاوەی "مهد البشرية "دەڵێت: "لەم جەنگەدا ئەو سەربازانەی کە لە دەوروبەری مووسڵ بوون هەموویان بۆ شەڕ نێردران، کە پێکدەهات لە حەوت فەوجـی نیزامـی سـێ فەوج بەرەو ئەو بۆسـەیە ڕۆیشـتن کە بۆیـان دانرابـوو، هەموویـان بە چەک و کەلوپەل و تۆپەکانیان خۆیان ڕادەست کرد، ترسێکی گەورە کەوتە نێو خەڵکی مووسڵ، کە ترسی ئەوەیان هەبوو شارەکەیان لە دەست بچێت (ویگـرام، ٢٠١٠، ص ص ١٢٢- ١٢٣).

دەرەنجامەکانی جەنگی "سەری باز" ئەگەر نەبووبێتە فاکتەرێکی بنەڕەتـی بۆ ئەوەی بەرپرسانی عوسـمانی هەڵوێسـتی خۆیـان بەرامـبەر شـێخی تەکـیەی

بـارزان بگـۆڕن، ئەوە بێگومـان کـاریگەری گەورەی هەبـوو لەسـەر ئەوەی کە داواکارانی ڕێگە چارەی ئاشتی هان بدات لەسەر ڕای خۆیان سوور بن، هەر بۆ ئەم مەبەسـتەش حکـومەتی عوسـمانی "سـەفوەت بەگ" ی ڕاسـپارد ئەرکـی چاوپێکەوتن و دانوستان لەگەڵ شێخ عەبدولسەلام بارزانی بگرێتە ئەستۆ (پـی رەش، ١٩٨٠، ص١١٨).

## ٣- دەڤەری بارزان لە نێوان بەرداشی پارتی "حورییەت و ئیتیلاف" و ئیتیحادییەکاندا:

بێگومان پەیڕەوکردنی سیاسەتی توندی ئیتیحادییەکان دژ بەگەلانـی ژێـر دەسەڵاتیان، هاوکات بـوو لەگەڵ شکسـتخواردنیان لە سـاڵی ١٩١١ بەرامـبەر بە ئیتالییەکـان و بەناچـاری هێزەکانیـان لە لیبیـا کێشـاوە، ئەمەش بـووە هـۆی زیادبوونی بەرهەڵستی لە پەرلەمان و پەرەسەندنی ململانێ لە نێـوان ئیتیحـادی و ئیتیلافییەکان، بـۆیە ئیتیحادییەکـان لەڕێگـای فەرمـانی سـوڵتانییەوە بڕیـاری هەڵوەشاندنەوەی ئەنجـومەنی نوێنەرانیـان دا لە ١٨ی کـانوونی دووەمـی سـاڵی ١٩١٢، بۆ ئەوەی هەڵبژاردنی نوێ ئەنجام بـدەن، کە ئاکـامەکەی بەسـەرکەوتنی ئیتیحادییەکان تەواو بوو، توانییان زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمان بـۆ خۆیـان دەستەبەر بکەن. (السيد، ٢٠١٥، ص٣٤؛ Lewis, 1961, P.218 ).

هەرچەنـدە ئەم کـارەی ئیتیحادییەکـان لە مێـژووی تورکیـا بەکودەتـای دووەمی ئیتیحادییەکان دادەنرێت، کە بەهەمـوو شـێوەیەک لە هەوڵـدا بـوون کە پـارتی" حـورییەت و ئیتـیلاف" سـەرکوت بـکەن، بەڵام دامەزرانـدنی کـۆمەڵەی سەربازی لە ئایـاری سـاڵی ١٩١٢ بەنـاوی "ئەفسـەرانی ڕزگـارکەر" کە زۆربەیـان ئەلبانی بوون، ناڕەزایەتی و یـاخیبوونی خۆیـان لە روم ئیلـی راگەیانـد و پێیـان وابوو ئەم حکومەتە و پەرلەمانە نوێیەی ئیتیحادییەکان شـەرعی نیـیە و دەبێـت هەڵبژاردنی ئازاد ئەنجام بـدرێت و حکـومەتەکەی "مەحمـود شـەوکەت پاشـا[٤]" هەڵبوەشـێندرێتەوە، ئەویـش لە ڕێکەوتـی ٢١ی تەممـوزی سـاڵی ١٩١٢ بەدەم داواکارییەکانیان هات (عەلی، بزاڤی شێخ، ٢٠٠٣، ل٤٣ ؛Lewis, 1961, P.218 ).

پارتی " حورییەت و ئیتیلاف" لە ئەستانە دەسەڵاتیان کەوتە دەست و ئیتیحادییەکانیان لە دەسەڵات دوورخستەوە، پارتی ناوبراو بەپێچەوانەی ئیتیحاد و تەرەقی خۆیان دوورخستەوە لەنانەوەی باری گرژی لەنێوان گەلانی نێو مەملەکەت و بەژیری و لێزانییەوە کاریان دەکرد بۆ هێنانەکایەی تەبایی لەشوێنی رق و کینە و لێک دوورکەوتنەوە (غولامی، ٢٠٠٤، ل٤٢)، ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر کۆتاییهێنان بەحکومەت و دەسەڵاتیان و هاتنە سەر دەسەڵاتی پارتی "حورییەت و ئیتیلاف"، لەم حکومەتە نوێیەش" نازم پاشا" دەبێتە وەزیری جەنگ و سەفوەت بەگیش دوای خانەنشینبوونی لە پۆستی سەربازی دەبێتە پارێزگاری ئەستانە (شیسمەن، مەلا ئیبراهیم، ٢٠١٤، ل٣٣).

"نازم پاشا" بەر لەوەی کە لەلایەن پارتی" حورییەت و ئیتیلاف" بانگهێشت بکرێتەوە ئەستانە بەمەبەستی پێسپاردنی وەزارەتی جەنگ، والیی بەغدا بوو زۆر زیرەکانە مامەڵەی کرد و وای بینی کە بەرژەوەندییەکان وا دەخوازێت پەردە لەسەر هەموو ئەو تۆمەتانەی درابوونە پاڵ شێخی بارزان لابەرێت و فەرمانی لێبووردن بۆ شێخ و لایەنگرەکانی دەرکرد (سەجادی، ٢٠٠٥، ل١٤٨ ؛ فتح اللە،٢٠٠٢، ص٧٠ )، لەلایەکی دیکەوە "ئەسعەد پاشای دەروزی" فەرماندەی فەیلەقی دوانزە و والیی موسڵ بەوەکالەت داوا لە "باب العالی"دەکات کە مەدالیایەکی مەجیدی لە جۆری سێیەم بە شێخ عەبدولسەلامی دووەم ببەخشرێت وەک پێزانینێک بۆ هاوڕێیەتی و دڵسۆزی (الدملوجي، ١٩٥٢، ص٩٨ ؛ غولامی، ٢٠٠٤، ل٤٤).

دوا بەدوای گۆڕانی هەڵوێستی عوسمانییەکان لە سەردەمی کابینەی حکومەتی "حورییەت و ئیتیلاف" بەرامبەر بەشێخی تەکیەی بارزان، ڕێگای خۆشکرد بۆ لێک نزیکبوونەوە و ئەنجامدانی دانوستان لەنێوان هەردوولا، بۆ ئەم مەبەستەش (سەفوەت بەگ) وەک سەرۆکی شاندی عوسمانی راسپێردرا بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، ناوبراو لە مووسڵ بەڕێکەوت بەرەو بارزان، لە هاوینەهەواری "تاتویک" لەناوەندی چیای شیرین کۆبوونەوەی ئەنجامدا لەگەڵ شێخی بارزان و رایگەیاند کە زەرەر و زیانێکی گەورە بەئێوە گەیشتووە لەسەر

دەستی ئیتیحادییەکان، بۆیە هاتووم ئەم هەڵەیە ڕاست بکەمەوە (بریفکانی، ١٩٥٣، ل ل ١٠، ٤٣ ؛ مەلا ئەیوب، ٢٠٠٧، ل ل١٦٩- ١٧٠ ).

لە ئاکامی وتووێژەکانی هەردوولا، بەتایبەت پاش ئاڵوگۆڕکردنی بۆچوونەکان لەسەر چەند خاڵێک ڕێکەوتن لەوانە، هەموو هەوادار و ئەندامانی بنەماڵەی شێخ کە بە دیل گیراون ئازاد بکرێن، هەروەها قەرەبووکردنەوەی خەڵکی بارزان کە زیانێکی زۆریان پێگەیشتبوو لە ئەنجامی جەنگەکان و ئاواکردنی قوتابخانە و نەخۆشخانە و دامەزراندنی بنکەیەکی ئیداری بنکەی پۆلیس لە دەڤەرەکە، لەگەڵ رادەستکردنەوەی هەموو ئەو کەلوپەلە سەربازییانەی حکومەت کە بارزانییەکان لە ئەنجامی شەڕەکان بەدەستیان کەوتبوو، جگەلەمەش هەموو هێزەکانی عوسمانی پاشەکشە لە ناوچەکە بکەن و تەنها حامییەیەک بمێنێتەوە (بالایی، ٢٠٠٣، ل ل٤١-٤٢ )، هەروەها جەختکردنەوە لەسەر دەرکردن یان گواستنەوەی ئەم کارمەندانەی کە هۆکار بوون بۆ ئەوەی باردۆخەکە ئەم ڕێچکەیە بگرێتەبەر و کارەسات دروست بێت، لە بەرامبەردا دامەزراندنی کارمەندی نوێ و دەستپاک کە زمانی کوردی بزانێت، هەروەها سەپاندنی سزا بەسەر دەرەبەگەکانی کە هاوپەیمانییان لەگەڵ فەرمانبەرە بەرتیل خۆرەکان هەبووە بەمەبەستی ناشیرین کردنی هەڵوێستی شێخی بارزان (پی رەش، ١٩٨٠، ص١١٩).

پاش مۆرکردنی بەڵگەنامەی ئاشتی، ژیان گەڕایەوە باری ئاسایی خۆی دوور لە هەموو رق و تیرۆرێک، بەڵکو سیاسەتێکی ڕەواخواز جێگای گرتەوە، لە هەمان کاتدا پەیوەندییەکانی شێخی بارزان لەگەڵ پارتی "حورییەت و ئیتیلاف" تاڕادەیەک گەرم و گوڕی تێکەوت، کە بارزانییەکان هەستیان کردووە لەگەڵ حکومەتێکی خاوەن ویژدان مامەڵە دەکەن (بەرزنجی، ٢٠٠١، ل٨٠ ؛ بالایی، ٢٠٠٣، ل٤٥).

ماوەی حوکمڕانی پارتی" حورییەت و ئیتیلاف" درێژەی نەکێشا، تا ئەو کاتەی ئیتیحادییەکان لە ٢٣ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩١٣ کودەتایان ئەنجامدا بەسەرۆکایەتی "ئەنور پاشا(٥)"، پاش ئەوە سیاسەتی تیرۆر و دەربەدەرکردن و لەناوبردنی خەڵکی ناتورک دەستی پێکرد (احمد، ١٩٧٥، ص٧٨ ؛ عەلی،

بزاڤی شێخ، ٢٠٠٣، ل٤٣ )، یەکێ لە قوربانییەکان کە بەدەستی "ئەنوەر پاشا" تیرۆر کرا "نازم پاشا"بوو، کە ئەوکات وەزیری جەنگ بوو لە ئەستانە لە کۆڵەکە دیارەکانی پارتی" حورییەت و ئیتیلاف"بوو (شیسمەن، مەلا ئیبراهیم، ٢٠١٤، ل٣٤).

دیارە ئەو سیاسەتە سەرکوتکەرانەیە لەلایەن ئیتیحادییەکان لەدوای کودەتای ساڵی ١٩١٣ ناڕەزایەتییەکی زۆری لە کوردستان دروست کرد، لەو بارەیەوە "کەمال مەزهەر" دەڵێت" بارودۆخ لە کوردستان بەر لە هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهان وەک بورکان وابوو، ئەگەر ئەم جەنگە هەڵنەگیرسابایە تەقینەوەی گەورە و سەرتاسەری بەدەمەوە بوو" (کمال، ٢٠١٣، ص١٣٤).

شیاوی باسکردنە نێوەندگیری بەرپرسانی پارتی" حورییەت و ئیتیلاف" پەیوەندییە بەستەڵەک و ساردوسڕەکەی نێوان شێخی بارزان و بابی عالی بەتین کردبوو، بەڵام سەرکەوتنی ئیتیحاد و تەرەقی لەڕێگای کودەتاکەیان ئەو رەوتەیان تێکدا و جارێکی دیکە ئەم پەیوەندییە رووی لە کزی کرد، بەمەش نەوەستان بۆ نیشاندانی دژایەتی و دوژمنایەتی خۆیان بۆ تەکیەی بارزان، "سلێمان نەزیف[٦]" کە دوژمنایەتییەکی لەمێژینەی لەگەڵ بنەماڵەی بارزانیدا هەبوو، کردیانە والیی مووسڵ (نوری، ٢٠٠٧، ل ل١١١-١١٢).

هەرچەندە تا ئێستا هیچ سەرچاوەیەک ئاماژە بەهۆکاری ئەم دژایەتییەی ناوبراو ناکەن بەرامبەر بە شێخانی بارزان، بەڵام دەکرێت بڵێین سلێمان نەزیف یەکێ بووە لە جەمسەرە دیارەکانی ئیتیحاد و تەرەقی بەشێوەیەک وابەستە بوو بە جێبەجێکردنی پەیڕەو و ئامانجی ئەم کۆمەڵەیە کە دژ بەهەموو گەلانی ژێر دەستەی عوسمانی کاریان دەکرد و هەوڵەکانیان بۆ سێ دروشم بووە ئەویش (سەنترالیەت و تۆرانیەت و تورکاندن)، بێگومان ئەمەش لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی تەکیەی بارزان یەکی نەدەگرتەوە، کە هەردەم لە خەبات بوون بۆ ئەوەی بەئازادی بژین و پارێزگاری لە بوون و ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان بکەن، ئەوەش پێچەوانەی بیرکردنەوەکانی سلێمان نەزیف بوو، هەرچەندە هەریەکە لە میر بەسری و جەرجیس فەتحولڵا ئاماژە بەوە دەکەن کە لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵی ١٩١٨ ناوبراو لەگەڵ عەبدولڵا جەودەت

لە پێشەوەی هەموو داواکارانی بیروڕای سەربەخۆیی کوردستان بووە، ئەمەش بەڕاست نازانرێت، چونکە هیچ سەرچاوەیەک باس لە جموجوولی سیاسیی ناوبراو ناکەن، هەرچەندە بەر لەمردنی بە دوو ساڵ جوولانەوەیەکی گەورەی شۆڕشگێڕی لە ساڵی ١٩٢٥ بە سەرکردایەتی شێخ سەعیدی پیران لەدژی تورکەکان سەرهەڵدەدات.

دیارە ئیتیحادییەکان لە یەکەم هەنگاویان بۆ یەکلاکردنەوەی کارەکانیان لەگەڵ شێخی بارزان، بریتی بوو لە لادان و دوورخستنەوەی " ئەسعەد پاشا دەروزی" لە پۆستەکەی کە ناوبراو دۆستێکی نزیکی شێخ عەبدولسەلامی دووەم بوو، لە شوێنی ئەو " سلێمان نەزیف"یان کردە والیی مووسڵ، بەگوێرەی ڕۆژنامەی "المقطم"ی میسری ئاماژە بەوە دەکات کە "والیی نوێ هەموو هەوڵەکانی بۆ ئەوەیە بزووتنەوەکەی شێخی بارزان لەناوببات (مراد، البوتاني، ٢٠١٥، ص ص٥٥- ٥٦)، چونکە گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە شێخی بارزان توانیویەتی بەرپەرچی هەموو لەشکرکێشییەکانی عوسمانی بداتەوە کە لە پێشوودا بۆی ڕەوانە کراوە (المفتي، algardenia. Com // :http )، بۆ ئەم مەبەستەش والیی نوێ لەلایەن ئیتیحادییەکان تەواوی دەسەڵاتی درایە دەست لە مووسڵ وەک کوشتن و بڕین و زینداینکردن، ناوبراو بەگشتی سیاسەتی دژایەتیکردنی هەموو ڕەگەزە ناتورکەکانی گرتبووە بەر، لەوانەش کوردەکان کە دەیانویست مافەکانی خۆیان دەستەبەر بکەن (سەجادی، ٢٠٠٥، ل ١٤٩ ؛ الدملوجي، ١٩٥٢، ص٩٩ ).

دیارە دەستبەکاربوونی سلێمان نەزیف لەمووسڵ وەک والی، هاوکات بوو لەگەڵ نزیکبوونەوەی حکومەتی ئیتیحادی لە بەرەی ئەڵمانەکان و پێشبینییەکان دەرخەری ئەوە بوون کە لەپاڵ ئەڵمانەکان بچێتە ناو جەنگە چاوەڕوانکراوەکەی جیهان، بۆ دەستەبەرکردنی خەرجییەکانی جەنگیش، دەستیانکرد بەسەپاندنی باجی زیاتر لەسەر گەلانی عوسمانی، سەبارەت بە ناوچەی بارزان وەک بەهانەیەک و تۆڵەکردنەوە لە شێخی بارزان سەپاندنی باجەکە بۆ ٢٥% لە سنووری داواکراو تێپەڕی کرد (قفطان،٢٠٠٣، ص٢٢ ؛ بورکای، ٢٠٠٨، ل٤٩٢).

هەر لەو بارەیەوە حکومەتی ئیتیحادی دەیویست ئامارێک بۆ تۆمارکردنی ناوی گوندەکان و کەسانی عەشیرەتەکان و سەرژمێرییەکی مەڕ و ماڵاتی ئەوێ بکات، شێخی تەکیەی بارزان ڕەخنەی لەو کارە گرت و ڕوونی کردەوە کە ئەوانیش لەو عەشیرەتە "نانیشتەجێ"یانەن کە کەسیان ناچێ بۆ سەربازی وەک عەشیرەتەکانی"جاف" و ئەوانی دیکە، ئەو گوندانەی کە ئێستا ئاوەدانن بەگوێرەی هەلومەرجی وا پێویست دەکات زۆربەی دانیشتوانەکەی کۆچ بکەن بەرەو جێگایەکی دیکە، بەتایبەت لە ڕۆژانی نەهاتی و گرانیدا، ئەو باجانەی ئێستا دەیدەن بە خەزێنە زۆر لەو ڕادەیە زیاترە کە پێویستە بیدەن، بەڵام حکومەتی ئیتیحادی گوێی بەداخوازییە ڕەواکانی ئەوان نەدا (جیاووک، ٢٠٠٩، ل٥٩).

لەو هەلومەرجەدا "سەفوەت بەگ" قایمقامی سەربازی و ئەندامی کارا لە پارتی"حوریەت و ئیتیلاف" لە مووسڵەوە بەنهێنی پەنا دەباتە لای شێخ عەبدولسلام بارزانی، هۆکارەکەشی دەگەڕایەوە بۆ خستنە پاڵی تۆمەتی کوشتنی مەحمود شەوکەت پاشا وەزیری جەنگی ئیتیحادییەکان لەلایەن ناوبراو، ئەمەش بیانوویەکی باش بوو بۆ "سلێمان نەزیف پاشا" کە داوا لە شێخ عەبدولسەلام بارزانی بکات "سەفوەت بەگ" ڕادەستی حکومەت بکات (سەجادی، ٢٠٠٥، ل١٤٩ )، بەڵام شێخ عەبدولسەلام بارزانی داواکەی والیی مووسڵی پەسند نەکرد و ئامادە نەبوو سەفوەت بەگ بەدەستەوە بدات، لەهەمان کاتدا ڕەتیکردەوە باجی زیاد بدات و خەڵکەکەشی بۆ سەربازی زۆرەملێ ڕەوانە بکات، بەڵکو داوای کرد کار بە خاڵەکانی ئەو ڕێکەوتننامەیە بکرێت کە لە هاوینەهەواری "تاتویک" ئەنجام درا (نیکیتین،١٩٧٣، ص٢١ ؛ قفطان،٢٠٠٣، ص٢٢ ).

بیانووی حکومەت و داواکارییەکانی والیی مووسڵ دەرخەری ئەو هەنگاوە مەترسیدارانەی حکومەت بوو، کە دەیویست بەهەر جۆرێک بێت هێرش بکاتە سەر بارزان، بۆیە "سەفوەت بەگ" بەر لەوەی کە بارزان جێ بهێڵێت شێخی ئاگادارکردەوە کە بەهیچ شێوەیەک بەنواندنی نیازپاکیی بەرپرسانی تورک بڕوا نەکات، چونکە ئەوان نە زەمیریان هەیە و نە ئەو پیاوەن کە پشتیان پێ

ببەسترێ و لێیان دڵنیا بێت، هەروەها پێی ڕاگەیاند کە بچێتە رووسیا، چونکە ئەگەر بکەوێتە دەست تورکەکان لەسێدارەی دەدەن (بۆتانی، ١٩٩٨، ل١٧).

دیارە سلێمان نەزیف بەر لەدەستپێکردنی لەشکرکێشی بۆ سەر بارزان، دەستیکرد بەسزادانی قایمقامی ئامێدی، بەبیانووی ناتوانایی لەدابینکردنی ئاسایش لە ناوچەکە، هەروەها " عەبدولعەزیز بەگ" قایمقامی ئاکرێی لە کارەکەی دوورخستەوە لە ساڵی ١٩١٤ پاش ئەوەی زینـدانی کـرد و دەسەڵاتدارانیشی راسپارد کە لەهیچ فەرمانگەیەکی حکومەت سوودی لێ وەرنەگیرێت، لەلایەکی دیکەوە ناوبراو دژی پێدانی خەڵاتە مەجیدییەکەی حکومەت بوو کە پێش بوونی بە والیی مووسڵ پێشکەش بەشێخ عەبدولسەلام بارزانی کرابوو، لەو بارەیەوە دەیگوت " شێخ عەبدولسەلام شایستەی کوشتنە نەوەک پێدانی خەڵات" (مراد، البوتاني، ٢٠١٥، ص ١٥)، بۆ ئەم مەبەستەش لێدوانێکی فەرمی لە ڕۆژنامەی مووسڵ بڵاوکردەوە تێیدا رایگەیاند کە شێخ مافی خەڵات وەرگرتنی نییە چونکە لە دەوڵەت یاخی بووە (بۆتانی، ١٩٩٨، ل١٨).

دوابەدوای ئامادەکارییەکانی حکومەت لە رووی سەربازییەوە، لە ئازاری ساڵی ١٩١٤ لەشکرکێشییەکانی سوپای ئیتیحادی بۆ ناوچەی بارزان دەستی پێکرد، خەڵکی ناوچەکە بە موسڵمان و فەلە و ئاشووری لەژێر سایەی رێبەرایەتی شێخ عەبدولسەلامی دووەم کۆبوونەوە، بەرگریکردنی شۆڕشگێڕان ئەوەندە بەهێز بوو، کە زەرەرو زیانی زۆری بەهێزەکانی حکومەت گەیاند، بەڵام زۆریی ژمارەی هێزەکانی حکومەت و پاڵپشتی کردنی ئاغا و دەرەبەگەکانی ناوچەکە لەلایەک و کەمیی ئازووقە و پێداویستی جەنگی شۆڕشگێڕان لەلایەکی دیکەوە، هاوکێشەی جەنگەکەی بەسوودی ئیتیحادییەکان گۆڕی (قفطان،٢٠٠٣، ص ص٢٢ – ٢٣ ).

سەبارەت بە ڕەوت و پەرەسەندنەکانی شەڕەکە[(٧)]، لەسەر شێخ عەبدولسەلام بارزانی پێویست بوو لە سێ بەرەوە بەرەنگاری سوپای ئیتیحادییەکان بێتەوە، لەوانە بەرەی ئامێدی بۆ بارزان، هەروەها بەرەی ڕەواندوز بۆ مێرگەسوور لەگەڵ بەرەی ئاکرێ بۆ چیای پێرس، بەڵام نەخشەی

سەربازی حکومەت زیاتر جەخت دەکرایەوە لەسەر ئەوەی کە قورسایی شەڕەکە لە مێرگەسوور بێت (مەلا ئەیوب، ٢٠٠٧، ل١٨٢)، دیارە مەبەستی حکومەت لە جەختکردنەوە لە بەرەی مێرگەسوور دەگەڕایەوە بۆ چەند هۆکارێک، لەوانە راکێشانی زۆربەی هێزەکانی بارزان بۆ ئەم بەرەیە، بەمەبەستی لاوازکردنی بەرگرییەکانی بەرەی پێرس لە بەرامبەر هێزەکانی ئاکرێ، هەروەها سەرقاڵکردنی هێزەکانی بارزان لە بەرەی ئامێدی بۆ ئەوەی نەتوانن هاریکاری هێزەکانیان بکەن لە بەرەکانی دیکە (اسماعیل، ١٩٩٨، ص٥٧).

راپەڕین بۆ ماوەی چەند مانگێک بەردەوام بوو، بەڵام شێخ عەبدولسەلام و شوێنکەوتووانی نەیانتوانی تا سەر بەرگری بکەن، بۆیە شێخ فەرمانی دا بەپەلە لە ناوچەکە بکشێنەوە و روو بکەنە سنووری ئێران، پاشان هێزەکانی حکومەت و هۆزە کوردییە هاوپەیمانەکانیان لەدوای شەڕێکی دژوار توانییان لە حوزەیرانی ساڵی ١٩١٤ دەست بەسەر ناوچەی بارزاندا بگرن و هەرچی دەستیان پێگەیشت لە دێهاتەکان تالانیان کرد و گوندی شێخیشیان وێران کرد و تەکیە ئاینییەکەشیان خاپوور کرد (غولامی، ٢٠٠٤، ل٤٢ ؛ قفطان،٢٠٠٣، ص٢٣).

## ٤- سلێمان نەزیف و لە سێدارەدانی شێخ عەبدولسەلام بارزانی:

ئیتیحادییەکان بە سەرپەرشتی سلێمان نەزیف، هێرشیان کردە سەر دەڤەری بارزان بۆ دەستگیرکردنی شێخ عەبدولسەلام بارزانی پاش بەرگرییەکی زۆر لە لایەن خەڵکی ناوچەکەوە ئەوە بوو بە ناچاری شێخ ناوچەکەی بەجێهێشت رووی کردە کوردستانی ئێران، پاش گەیشتنی بارزانییەکان بۆ نێو خاکی ئێران، بەسەر گوندەکانی دەوروبەری ناوچەی " ورمێ " دابەش و نیشتەجێ بوون، شێخ عەبدولسەلام بووە میوانی ماڵی سەید تەهای شێخ محەمەد سدیقی شەمزینی بۆ ماوەی پێنج مانگ لە گوندی راژان، کە ئەم گوندە نزیکەی سێ قۆناغ لە شاری "ورمێ " دوورە (بارزانی، ٢٠١٢، ل٢٢ ؛ غولامی، ٢٠٠٤، ل٤٩)، بێگومان چوونی شێخ عەبدولسەلام بۆ رۆژهەڵاتی کوردستان، خۆ دزینەوە نەبووە لە گۆڕەپانی خەبات، بەڵکو زیاتر مەبەستی سیاسی و دبلۆماسی بووە، کە وای دەخواست خۆی لە کاربەدەستانی رووسیا نزیک

بکاتەوە و داوای پاڵپشتییان لیٚ بکات، بە مەبەستی بەردەوامدان بە خەبات دژ بە عوسمانییەکان (بالایی، ٢٠٠٣، ل٥٠).

شیاوی ئاماژەپێکردنە، شەڕی جیهانی لە سەروبەندی بەرپابووندا بوو، شێخ عەبدولسەلام بارزانی بیٚ ئاگا نەبوو لە ڕەوشی نێودەوڵەتی، بۆیە ویستی ئەم دەلیڤەیە بقۆزتەوە تا دۆزی کورد بەوڵاتانی گەورە بناسێنیٚ، هەرچەندە لەو ماوەیەدا کە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، دەچێتە دیدەنی " سمایل ئاغای شکاک " لەوێشەوە لە ئابی ١٩١٤ پێکڕا چوون بۆ " تەفلیس [٨]"و چاویان بە نوێنەری تزاری ڕووسیا کەوت (بەرزنجی، ٢٠٠١، ل٨٠).

سەبارەت بەناوەرۆکی وتووێژەکانی شێخ عەبدولسەلام لەگەڵ ڕووسەکان، تا ئێستا روون نییە، تەنها ئەوە نەبێت کە " ف . نیکتین "دەڵێت: "دەسەڵاتدارانی ڕووسیا ئامۆژگاری شێخ عەبدولسەلام بارزانی دەکەن، لەو بارودۆخەدا لە بەرژەوندییاندا نییە دژایەتی تورک بکەن، واباشترە بۆ ماوەیەک خۆی بشارێتەوە" (نیکیتین،١٩٧٣، ص٢١)، جێی سەرنجە کە کورد بەدرێژایی مێژوو بەدەگمەن خێری لە ڕووسەکان دیوە، چونکە کورد زۆر جار پەیوەندی پێوە کردوون و داوای کۆمەک و یارمەتی لێکردوون کەچی هەڵوێستی ڕووسەکان سەرەڕای ململانێی ڕووسیا – دەوڵەتی عوسمانی هەموو جار نەرێنی بووە (عەلیاوەیی، ٢٠٠٤، ل١٧٣).

لەم هەلومەرجەدا چالاکییەکانی شێخ عەبدولسەلام بارزانی وا لە دەوڵەتی عوسمانی دەکات، نیگەرانی و ڕەخنەکانیان ئاراستەی دەسەڵاتدارانی ڕووسیا بکەن، لە بەرامبەردا ڕووسەکان بۆ ڕەواندنەوەی ئەو پەرۆشییانەی حکومەتی ئەستانە، بەڵێن دەدەن کە هیچ یارمەتی و پشتگیرییەکی شێخ عەبدولسەلام نەکەن، بەمەش ناوەستن، بەڵکو دەیگوازنەوە نەخچەوان و دەیخەنە ژێر چاودێری و پێی رادەگەیەنن نابێت بەهیچ شێوەیەک دژی تورک بجوولێتەوە (هەورامی، ٢٠٠٦، ل ٣٨٥).

لەم ڕووەوە دەردەکەوێت کەوا حکومەتی تەزاری سیاسەتێکی جێگیری نەبووە بەرامبەر بە شێخ عەبدولسەلام بارزانی، بەڵکو پەیوەندییەکانیان لەگەڵیدا پەیوەست کردبوو بە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، بۆ

ئەم مەبەستەش داوایان لە شێخ کردووە بۆ ماوەی دوو تا سێ مانگ چاوەڕوان بکات، ئەگەر لە حاڵەتێکدا نێوانیان لەگەڵ تورکەکان بەرەو باشی بڕوات، ئەوە هەوڵ دەدەن لێبووردنێکی بۆ فەراهەم بکەن لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانی، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر پەیوەندییەکانیان ئاڵۆز بوو، ئەوە هەموو هەوڵێک دەدەن لەڕێگای دابینکردنی هێز و چەک بە مەبەستی گەڕاندنەوەی بۆ ناوچەکەی خۆی (نیکیتین، ١٩٧٣، ص٢١).

شێخ عەبدولسەلام بەر لەدەستپێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم، جارێکی دیکە داوای یارمەتی لە حکومەتی تەزاری رووسیا دەکات و ئاگاداریان دەکاتەوە کە وەڵامەکەی پەسند بکرێت یاخود نەکرێت دەگەڕێتەوە کوردستان، بەڵام پیتربۆرگ لە وەڵامی حاکمی قەفقاز دەڵێت "دەوڵەتی رووسیا دژی هەر چەشنە یارمەتیدان و راپەڕینێکی شێخ عەبدولسەلام بارزانییە دژ بە دەوڵەتی عوسمانی" جگە لەمەش فەرمان بە حاکمی قەفقاز دەدەن کە نابێت بوار بەگەڕانەوەی شێخ بدەن بۆ کوردستان، "لە بەرامبەردا مانگانە بڕی " ١٥٠" رۆپلی پێ بدەن و لە تەفلیس لەژێر چاودێرییان بێت" (هەورامی، ٢٠٠٦، ل٣٨٦).

دیارە ئەم رەفتارەی حکومەتی رووسیا بووە مایەی نیگەرانیی بەشێک لە هەڵسووڕاوانی سیاسەتی دەرەوەی حکومەتی تەزاری، چونکە پێیانوابوو بێ هەڵوێستیی حکومەتەکەیان لە بەرامبەر شێخ عەبدولسەلام و شۆڕشەکەی دەبێتە هۆکارێک بۆ نەمانی متمانە و دەسەڵاتی وڵاتەکەیان بەسەر هۆزە کوردییەکان، هەروەها رێگا خۆشکەریش دەبێت بۆ هۆزە کوردییەکان خۆیان بخزێننە باوەشی ئەڵمانەکان، هەر ئەمەش وایکرد " چیرکوف" یاریدەدەری کونسوڵی رووسیا لە شاری " خوی " لە سەرەتای دەرکەوتنی شۆڕشەکەی شێخ عەبدولسەلام بارزانی ناڕەزایەتی و رەخنە لە سیاسەتی وڵاتەکەی بگرێت (مەدەنی، ٢٠٠٩، ل ٣٨٥).

سیاسەتی دەرەوەی رووسیا لەو ماوەیەدا کاری بۆ دوو مەبەستی سەرەکی دەکرد، یەکێکیان بریتی بوو لەوەی بەهەر شێوەیەک بێت پارێزگاری لە پێگەی خۆی بکات لە رووی سەربازی و ئابووری لە ناوچەکانی ژێر قەڵەمڕەوی خۆی، ئەویتریان بریتی بوو لە زامنکردنی توانا بەرگرییەکانی لە سنوورەکانی قەفقاز

لەبەرامبەر عوسمانییەکان کە ئەوکات لەلایەن ئەڵمانەکانەوە هاندەدرا، کەواتە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە بۆچی ڕووسیا ئامادە نەبوو هیچ بەڵێنێک یاخود پشتگیرییەک بۆ شێخ عەبدولسەلام فەراهەم بکات، لەوانەیە زیاتر بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی نەوەک ببێتە مایەی ئاڵۆزی و کێشەی نوێ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەروەها لەسەر پەیوەندییەکانی ڕووسیا لەگەڵ وڵاتە زلهێزەکان (اسماعیل، ١٩٩٨، ص ص٦١-٦٢).

دوا بە دوای بێ ئومێد بوونی شێخ عەبدولسەلام بارزانی لە ڕووسەکان دەگەڕێتەوە کوردستان، بەمەرجێک لە " ورمێ " لەژێر چاودێری کونسوڵخانەی ڕووسیا بێت و بەهیچ شێوەیەک نەگەڕێتەوە شەمدینان و ڕەواندوز و بارزان، هەروەها جەخت کرایەوە لەسەر ئەوەی بەبێ ئاگاداری ڕووسیا هیچ هەنگاوێک نەهاوێژێت دژ بە عوسمانییەکان (هەورامی، ٢٠٠٦، ل٣٨٦)، شێخ عەبدولسەلام لەماوەی مانەوەی زۆرەملێ دەچێتە گوندی " چاریە "ی نزیک سنووری نێوان تورکیا و ئێران بەمەبەستی سەردانیکردنی سمایل ئاغای شکاک، ئەو ماوە کورتەی لەوێ مایەوە زۆر بەگەرمی پێشوازییان لێکرد، بەیەکەوە لە کۆبوونەوەیەکدا باسیان لە نەخشەی دواڕۆژی کورد کرد، پاشان شێخی بارزان سەردانی ژمارەیەک سەرۆکی کوردی ناوچەکەی کرد لە نێویاندا "سلێمان خان" سەرۆک هۆزی زەرزا و نوێنەری سەید تەهای نەهری چەندین کەسایەتی تر (ئەبو زێد، ٢٠٠٣، ل١٥٧ ؛ اسماعیل، ١٩٩٨، ص٦٢).

دیارە ئەوکات سمکۆی شکاک خەریکی خەبات بوو دژ بەحکومەتی قاجار لە ئێران، شێخ عەبدولسەلام پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری لەگەڵیدا بەست (شیوا، بەرگی سێیەم، ٢٠١٢، ل٤٨٩)، بێگومان ئەو دیدارە یەکەم پەیوەندیی رامیاری بوو لە نێوان بنەماڵەی بارزانییەکان و ڕێبەرە خەباتکارەکانی هاونەتەوەی خۆیان لە ئێران، کە دواتر ئەم پەیوەندییانە قایمتر کرانەوە و پەرەیان پێدرا، بەجۆرێ لەکاتی کۆماری مەهابادا بارزانییەکان و هێزە سەربازییەکانیان لە دامەزراندن و بەرگریکردن لەو کۆمارەدا ڕۆڵی بەرچاو و سەرەکییان هەبووە (نوری، ٢٠٠٧، ل١١٢).

عوسـمانییەکان لەبەرامـبەر چالاکییەکـانی شـێخ عەبدولسـەلام بـارزانی ئۆقرەیان لێبڕابوو، هەر بۆیە هەموو تواناکانیان خستەگەڕ تاکو شـێخ دەسـتگیر بـکەن یـاخود لەنـاوی بەرن، بـۆ ئەم مەبەسـتە " جەودەت بەگ " والیـی وان خەڵاتێکی گەورەی دیاریکرد بۆ هەرکەسێک بەزینـدوویی یـاخود مردوویـی شـێخ عەبدولسـەلامیان رادەسـت بکـات (بـەرزنجی، ٢٠٠١، ل٨٣ ؛ مـراد، البوتـاني، ٢٠١٥، ص٥٩)

دەزگـا هەواڵگرییەکـانی حکـومەتی عوسـمانی بەردەوام سۆسـەی جموجوولەکـانی شـێخ عەبدولسـەلام بارزانییـان دەکـرد، بەجۆرێـک ئەگەر ناڕاسـتەوخۆش بێـت ئاگـاداری سـەردانەکەی شـێخ بـوون بـۆ تەفلـیس و دیـدار ئەنجامـدان لەگەڵ کاربەدەسـتانی رووسـیا، کە دەوڵەتـی عوسـمانی بە مەترسـی لەسەر ئاسایشی خۆی هەژمـار دەکرد، چونکە لەلایەک نزیکبـوونەوەی جەنگـی جیهـانی یەکەم مەترسـییەکی گەورەی خسـتبووە سـەر کـۆی دامودەزگاکـانی دەوڵەتی عوسمانی، لەلایەکی دیکەوە مەترسییان لە گەڕانەوەی شـێخ هەبـووە لەوەی کە پەیوەنـدی ببەسـتێت لەگەڵ سـەرۆک هـۆز و بنەمـاڵە کوردییەکـانی باکور لە دژی حکومەتی عوسمانی (بالایی، ٢٠٠٣، ل ل٥٤- ٥٥).

شـیاوی باسـکردنە شـێخ عەبدولسـەلام بـارزانی پـاش تەواوکردنـی سەردانییەکانی لە گوندی چاریە بەرەو راژان بەڕێکەوت، بەهاوەڵـی شـەش کەس لە دڵسۆزانی ئەوانیش بریتی بوون لە " عەلی مح، عەزیز گوهار، نـوری (خـاڵی شێخ عەبدولسـەلام)، سـالح ئـاکرەیی، عەزیـز حـاجی و ئەحـمەد حـاجی ئەمـین ئاکرەیی " (مەلا ئەیوب، ٢٠٠٧، ل١٩٦)، هەرچەندە سمایل ئاغای شـکاک داوا لە شێخ عەبدولسەلام دەکات کە چەند چەکدارێکی لەگەڵ رەوانە بکات، بەڵام ئەم پێشنیازە لەلایەن شێخ قبوڵ نەکرا، سەرەڕای مەترسی رێگاکان کە نزیـک بـووە لە سـنووری تورکیـا لەگـەڵ چڕبوونـەوەی هەوڵەکـانی هەواڵگـری حکـومەتی عوسمانی بۆ دەستگیرکردنی شێخ عەبدولسەلام (پی رەش، ١٩٨٠، ص١٣٨).

لەکاتی گەڕانەوەیدا دەسـتەیەک لە داروەدسـتەی "سـۆفی عەبـدوڵلا "، لەو رێگایەدا لە بۆسـەدا بـوون، هەر بەدەرکەوتنـی شـێخ عەبدولسـەلام هـاتنە سـەر رێگـاکەی بەنـاوی " سـۆفی عەبـدوڵلا" و داوایـان لێکـرد، روو بکـاتە گونـدی

"گەنگەچین[9]" و گوندەکەیان پیرۆز بکات، هەر چەندە شێخ چەندین بیانووی بۆ هێنانەوە بۆ ئەوەی نەچێت، بەڵام پێداگری ئەو دەستەیە بەشێوەیەک بوو، کە " سۆفی عەبدوڵلا" کە یەکێ بووە لە سەرۆک هۆزێکی بچووکی شکاک، لە رواڵەتدا خۆی بە یەکێ لە دۆستانی شێخ داناوە، پێی راگەیاندوون ئەگەر شێخ ماڵەکەم پیرۆز نەکات ئەوە ماڵەکەم دەسووتێنم، ئەمەش شێخ عەبدولسەلامی ناچار کرد داواکانیان پەسند بکات (سەجادی، ٢٠٠٥، ل١٠١).

هەر بەگەیشتنی شێخ عەبدولسەلام و یاوەرەکانی بۆ گوندی گەنگەچین، لەلایەن سۆفی عەبدوڵلا پێشوازی گەرمی لێکراو یاوەری کرد بۆ ماڵەکەی خۆی، پاشان داروەدستەکەی گەمارۆی ماڵەکەیان دا، بەمەبەستی دەستگیرکردنی شێخ و هاوەڵەکانی، بەتایبەت دوای ئەوەی سۆفی عەبدوڵلا بەرەو رووی شێخ هات و نیشانەکانی ناپاکی و دووڕوویی لەسەر دەم و چاوەکانی هەڵماڵی و پێی گوت "تۆ لە یاسای ئەو حکومەتەی ئێمە ملکەچییەتی دەکەین دەرچووی، ئێستاش بۆت نییە تەنها ئەوە نەبێت کە خۆت بەئەمری واقع بسپێری، ئێمەش دەتدەینە دەست حکومەت" (غولامی، ٢٠٠٤، ل٥١ ).

هەرچەندە شێخ عەبدولسەلام بارزانی هەوڵەکانی چڕ کردەوە بۆ رازیکردنی سۆفی عەبدوڵلا بۆ ئەوەی دەست هەڵگرێت و دووربکەوێتەوە لەو هەزرە نابەجێیانە، بەڵام هەوڵەکانی سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە هاوەڵانی شێخ هەوڵیان دا بەرگری بکەن، کە ئەنجامەکەی کوژرانی هەریەکە لە "ئەحمەد حاجی ئەمین و عەزیز گوهار" ی لێکەوتەوە، پاشان شێخ گەیشتە ئەو بڕوایەی کە بەرگریکردن هیچ سوودێکی نابێت، بەناچاری دەستبەسەر دەکرێن (اسماعیل،١٩٩٨، ص٦٣؛ قەرەداغی، ١٩٥٩، ل١٦).

بەم شێوەیە جارێکی تر خائینان و شەڕەخۆرانی ناوخۆ لەبەر تەماح بەوپەڕی گەمژەیی و ساویلکەییەوە یەکێکی تر لە خزمەتگوزاران و خەباتکارە شۆڕشگێڕە راستەقینەکانی ئەو گەلەیان تەسلیم بە دوژمنەکەی کرد، دیارە لەنێوان خزمەتگوزاری و خیانەتدا رێگای دووەمیان هەڵبژارد، هەڵبەت ئەم مەسەلەیە یەکەمین و دوایین خیانەت نەبووە کە بەکرێگیراوانی ناوخۆ بەرامبەر ئازادیخوازەکانی ئەو سەر زەمینە تووشی بوون (نوری، ٢٠٠٧، ل١١٣).

لەو بارەیەوە هەموو سەرچاوەکان کۆکن کە شێخ عەبدولسەلام بارزانی و هاوەڵانی لە گوندی گەنگەچین دەستگیرکراون و رادەستی حکومەتی عوسمانی کراون[١٠]، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە " مەکدول" لەو باوەڕەدایە کە سمکۆی شکاک لەپشت بەدیلگرتنی شێخ عەبدولسەلام بارزانییەوە، لە بەرامبەریشدا "جەرجیس فەتحوڵلا" جەخت لەوە دەکاتەوە چەند جەردە و رێگرێک لە پیاوانی سمکۆی شکاک ئاگادار بوون بەو پارەیەی کە تەرخانکراوە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی بۆ گرتن و بە دەستەوەدانی شێخ عەبدولسەلام بارزانی (سەنگاوی، ٢٠١٤، ل٤٣٠ ؛ مکدول، ٢٠٠٤، ص١٧٤ ؛ فتح اللـه،٢٠٠٢، ص٧٤ ). لەم رووەوە دەکرێت بڵێین دەستگیرکردنی شێخ عەبدولسەلام بارزانی تاڕادەیەک پەیوەستە بە هۆکارە ناوخۆییەکان، بەڵام لە راستیدا بابەتەکە زۆر لەوە گەورەترە کە قەبارەکەی بچووک بکرێتەوە، بەڵکو پەیوەندیی راستەوخۆی بە بەرژەوەندی و هاوکێشە سیاسییەکانی ئەو کاتەی زلهێزەکان هەبووە.

لە کۆتاییدا شێخ و هاوڕێکانی برانە نزیکترین بنکەی سەربازی عوسمانی، پاش دیدەنیکردن لەگەڵ فەرماندەی بنکەکە توانی رازی بکات بەڕێگادان بە یەکێ لە هاوەڵانی بەناوی"عەلی مح" بەمەبەستی گواستنەوەی خانەوادەکەی لە مەرگەوەڕ، پاشان گواسترانەوە بۆ سەنتەری ویلایەتی " وان " لەوێش بۆ "دیاربەکر" ئینجا لەڕێگەی هێزێکی پاسەوانی توندوتۆڵ رەوانەی مووسڵ کران (پی رەش، ١٩٨٠، ص١٣٩)، کاتێک "سلێمان نەزیف" کە ئەوکات والیی مووسڵ بوو، هەواڵی گەیشتنی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی پێگەیشت، سواری گالیسکەکەی بوو بەرەو رێگای " باب سنجار" بەڕێکەوت، وە لە شوێنێکی نزیک مەزارگەی" شێخ قەزیب ئەلبان" گالیسکەکەی راگرت و هاتە خوارەوە و لەسەر لێواری رێگاکە دانیشت، وەک بڵێی بەپەلە بێت بۆ بینینی شێخ بە دەستبەسەرکراوی (غولامی، ٢٠٠٤، ل٥٣ ).

پاش بەسەرچوونی ساتێکی کەم شێخ عەبدولسەلام بە سواری دەوارێک بوو بەدیارکەوت، چوار دەوریشی بە سەرباز دەور درابوو، پاشان "سلێمان نەزیف " هەڵسا و لێی چووە پێش و پێیگوت: تۆ عەبدولسەلام بارزانیت؟ شێخ وەڵامی دایەوە " ئەزم ئەوێ تو دبێژی"، دیارە والیی مووسڵ بەمەش نەوەستا

بەڵکو پێیگوت: بۆچی سەرپێچیت لە فەرمانەکانی حکومەت کرد و نەهاتیە مووسڵ و بەم شێوەیە هاتی، ئینجا چووە سەر گالیسکەکەی و بەرەو سەرای میری گەڕایەوە، بەدوایدا سەربازەکان شێخیان برد تاکو گەیشتنە "قوڵغە سەربازییەکە " لەوێ شێخ و هاوەڵانی زیندانی کران" (مەلا ئەیوب، ٢٠٠٧، ل ل٢٠٣ — ٢٠٤ ؛ اسماعیل،١٩٩٨، ص٦٦).

دواتر (سلێمان نەزیف) ئەنجومەنێکی سەربازی پێکهێنا بۆ دادگاییکردنی ڕووکەشانە، کە گوایە شێخی بارزان کاتی خۆی بۆتە بەربەست لەبەردەم پێشڕەوی لەشکری شەشەمی عوسمانییەکان کە ویستوویانە بچن بۆ جەنگی ڕووسیا، بۆیە لە ئێوارەی، کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ز. بڕیاری دا شێخ و یاوەرەکانی لەسێدارە بدرێن، بەبێ گەڕانەوە بۆ فەرمانی باب عالی، دیارە بەر لە جێبەجێکردنی لە سێدارەدانەکە والیی مووسڵ لە زیندان بەشێخی بارزان دەڵێت "حکومەت دەسەڵاتدارە هەر زیانێکی پێ بکەوێت دەتوانێت دە هێندە تۆڵە بسێنێت، بەڵام هەر زیانێک بە تۆ بکەوێت بەهیچ قەرەبوو نابێتەوە و چاری حکومەتیش بەتۆ ناکرێت" شێخ عەبدولسەلام بارزانی لە وەڵامدا دەڵێت " من لەپێناو ئازادی گەلی کورد هەموو ئازارێک دەچێژم، بۆچی مافی کورد نادەن؟ (سەجادی، ٢٠٠٥، ل١٥٠ ؛ سالح، ٢٠١٦، ل٦).

شێخ عەبدولسەلام بەر لەوەی بچێتە بەر تەنافی لەسێدارەدان دەستنوێژێکی شۆرد و هەندێ قورئانی خوێند، پاشان بەرەو پەتی قەنارەکە ڕۆیشت و گوتی: "مردنی من بەم شێوەیە لە بەرژەوەندیی دەوڵەتدا نییە"، پاشان هەرسێ یاوەرەکەشی لەسێدارەدران کە ئەوانیش"محەمەد ئاغای هێشتەیی کە لە تەمەنی پیریدا بوو، هەروەها"عەبدی ئاغای مزووری کە تەمەنی لە دەوروبەری چل ساڵیدا بووە، لەگەڵ "عەلی کوڕی محەمەد ئەمین ئاغای مزووری" خەڵکی گوندی باسێڤا و گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو، کاتێک سەرکەوتە سەر کورسی سێدارەکە وتە بەناوبانگەکەی وت"مردن بۆ ئەو حکومەتە با باش بزانن کە بارزانییەکان کۆتایان نایەت بە لە سێدارەدانی ئێمە، بارزانییەکان نامرن"، ڕاستی وت گەلی کورد هەر ماوە و بارزانییەکانیش بەرەو دواڕۆژێکی گەش و خەباتی خۆیان بەردەوام کرد (سەجادی، ٢٠٠٥، ل١٥٠ ؛ غولامی، ٢٠٠٤، ل ل٥٤– ٥٥؛ ابوبکر، ٢٠١٠، ص ص١٣٢ — ١٣٣).

هەرچەندە لە دەوڵەتی عوسمانیدا جێبەجێکردنی فەرمانی لەسێدارەدان دەبێت بەئاگاداری فەرمانی سوڵتان بێت، بەڵام والیی مووسل گوێڕایەڵیی ئەم ڕێوڕەسمە کارگێڕییانەی سەرووی خۆی نەبوو، پێدەچێت ترسی لەوە بووبێت لەبەر نزیکبوونەوەی جەنگی جیهانی یەکەم سوڵتانی عوسمانی لە شێخی بارزان و یاوەرەکانی خۆشبێت (بالایی، ٢٠٠٣، ل٥٦)، لەو بارەیەوە "زوبێر بیلال" جەخت دەکاتەوە لە وتەکانی "رەشاد موفتی" کە لە کەسە بەتەمەنەکانی خانەوادەکەی گوێی لێ بووە و دەڵێت: "بەر لە جێبەجێ کردنی بڕیاری لەسێدارەدانی شێخ و یاوەرەکانی بە چەند کاتژمێرێک یاخود ڕۆژێک برووسکەیەکی بابی عالی گەیشتە مووسڵ بە مەبەستی دواخستنی بڕیاری لەسێدارەدانەکە، بەڵام سلێمان نەزیف دەیزانی برووسکەکە تایبەتە بەکێشەی شێخی بارزان و یاوەرەکانی بۆیە ئامادە نەبوو بیکاتەوە، تا کارەکەی جێبەجێ کرد (اسماعیل،١٩٩٨، ص٧٠)

هەر بۆ ئەم مەبەستە والیی مووسڵ فەرمانی دا بە هەندێک لە جەندرمەکان تەقە بکەن وەک ئاگادارییەک بۆ لەسێدارەدانی شێخ عەبدولسەلام لەو شەوەدا بە مەبەستی هاتنەدەرەوەی خەڵک بۆ بینینی ئەم دیمەنە جەرگبڕ و دڵتەزێنە،، کەچی "دەمەلوجی" هۆکاری دروستکردنی ئەو پشێوییە دەخاتە ئەستۆی والیی مووسڵ، بۆ ئەوەی وا نیشان بدات کە لایەنگرانی شێخی بارزان هاتوونەتە شاری مووسڵ بۆ ڕزگارکردنی شێخ و یاوەرانی، هەروەها بەرپاکردنی شۆڕش کە مەترسی دەخاتە سەر شاری مووسڵ (غولامی، ٢٠٠٤، ل٥٤ ؛ الدملوجي، ١٩٥٢، ص١٠٤). پێدەچێت ئەم کارەی بۆ پەردە پۆشکردنی نیەتە شاراوەکانی بەرامبەر بە شێخی بارزان و ڕازیکردنی رای گشتی عوسمانی بێت لە کارە ترسنۆک و قێزەوەنەکەی.

والیی مووسڵ لەدوای لەسێدارەدانی شێخی بارزان و یاوەرەکانی هەستی دوژمنکارانەی خۆی بەرامبەر شێخ نەشاردەوە، بەڵگەش لەسەر ئەوە هەڵسا بە بڵاوکردنەوەی ئەو وێنەیەی کە لەگەڵ شێخ و یاوەرەکانی لەکاتی هەڵواسینیان وەرگیرابوو، لەڕێگای دانانی ئەم وێنەیە لەسەر کارت و بڵاوکردنەوەی لەنێو بارزانییە دەستگیرکراوەکاندا (مراد، البوتاني، ٢٠١٥، ص٦٠).

دیارە ئەو کارەی والیی مووسڵ کاریگەریی نەرێنی لەسەر هەڵوێستی کورد بەرامبەر بە ئیتیحادییەکان لە جەنگی جیهانی یەکەم بەجێهێشت، بەتایبەتی ئەو کاتەی بەریتانییەکان دەستیان بەسەر شاری بەسرە داگرت، کوردەکان ڕەتیانکردەوە ڕوو بکەنە بەرەی جەنگ لە باشووری عێراق دژ بە سوپای بەریتانیا، بۆ ئەم مەبەستە "جاوید پاشا" والیی بەغدا (١٩١٤ — ١٩١٥) لە یاداشتنامەکەی خۆی دەڵێت" داوام لە والیی مووسڵ کرد، ژمارەیەک لە خۆبەخشە کوردەکان ڕەوانە بکات، هەرچەندە توانی حەوت سەد چەکدار کۆبکاتەوە لە قەزای دهۆک، بەڵام کاتێک زانییان لەگەڵ بەریتانییەکان دەجەنگن، ڕەتیانکردەوە بچن بۆ باشوور و پێیانوابوو بەریتانییەکان کەسانی چاکن و دەتوانن بەئاشتی لەگەڵیاندا بژین (احمد، ١٩٧٥، ص١٩١).

پاش لەسێدارەدانی شێخ عەبدولسەلام و یاوەرەکانی لە یەکی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ پاشان لە گۆڕستانی بەرامبەر مزگەوتی (عومەر ئەلمەولا) کە ئێستا بە گۆڕستانی (ئەلبوبەدران) دەناسرێ نێژران. بارزانییە دەستبەسەرکراوەکانی تریش خرابوونە نێو بەندینخانەوە ژمارەیەکی زۆریشیان هەر لەنێو بەندینخانەکەدا کۆچی دوایییان کرد، دەسەڵاتی عوسمانیش بۆ ڕێزگرتن لەو خزمەتەی"سلێمان نەزیف" مەدالیای لیاقا زێڕی کردە خەڵات، کەچی پەنگخواردنەوە و ڕق و کینەی بارزانییەکانی فەرامۆش کردبوو، بۆیە لەو بارەیەوە "دەمەلوجی" تیشک دەخاتە سەر هەڵوێستی بارزانییەکان و دەڵێت "بە هەموو دڵنیاییییەوە دەڵێم لەسێدارەدانی شێخ عەبدولسەلام هۆکاری یاخیبوون و گوێڕایەڵ نەبوونی بەردەوامی بارزانییەکانە لە دەوڵەتی عوسمانی و تا ساڵانێکی زۆریش لە بیری ناکەن" (غولامی، ٢٠٠٤، ل٥٥ ؛ بالایی، ٢٠٠٣، ل٥٧؛ الدملوجي، ١٩٥٢، ص ص٩٩-١٠٠).

"سلیمان نەزیف" دەستی کرد بە دەستگیرکردنی هەریەکە لە شێخ بەهائەدین بامەرنی و شێخ نور محەمەدی گەورە (بریفکانی) بەتۆمەتی بەرزکردنەوەی یاداشتەکە بۆ باب عالی و هاوکاریکردنی شێخ عەبدولسەلام بارزانی، هێنانیان بۆ شاری مووسڵ، سەبارەت بە شێخ محەمەد نور بریفکانی خرایە زیندانی خنکاندنەوە، بەڵام بەهۆی نەخۆشی پاش پێنج ڕۆژ بردرایە

نەخۆشخانە و زۆری پێ نەچوو لەوێدا مرد، دواتر ڕێگای نەدا کەسوکارەکەی تەرمەکەی ببەنەوە، بۆیە هەر لە شاری مووسڵ نێژرا، هەرچی شێخ بەهائەدین بامەرنی بوو، لەلایەن والیی مووسڵ ڕێگای پێدرا بگەڕێتەوە شوێنی خۆی. (سەجادی، ٢٠٠٥، ل١٥١).

دەکرێت بڵێین شێخ عەبدولسەلام ئاسۆیەکی روون بوو بۆ بزاڤی رزگاریخوازی کورد، بەشێوەیەک وەک داینەمۆی بیری ئازادی لە کۆمەڵگەی کوردی لەم قۆناغە هەستیارە دەردەکەوێت، بوو بە قوتابخانەیەک بۆ بنیادنانی کەسایەتیی کوردی شۆڕشگێڕ، ئەزموونەکانی دەرخەری ئەو راستییەن کە چەندین کەسایەتیی دیار قوتابی ڕێبازەکەی ئەون وەک شێخ ئەحمەدی بارزانی و مەلا مستەفای بارزانی کە ئالآی خەباتیان هەڵگرت لە شۆڕشە یەک لەدوا یەکەکانی کوردستانی باشوور بەمەبەستی بەدیهێنانی خەونی سەربەخۆیی کوردستان.

### ئەنجام:

١- سەختی و ستراتیژیی ناوچەکە لە رووی هەڵکەوتە و تۆبۆگرافیاوە نزیکی لە سنووری نێودەوڵەتی، گرنگییەکی زۆری هەبووە بۆ بارزانییەکان لە رووی بەرگریکردن بەرامبەر بە دوژمنان، دیارە ئەم هەڵکەوتە جوگرافیایەش بە شێوەیەکی گشتی رۆڵی گرنگی لە خەبات و مانەوەی نەتەوەی کوردی گێڕاوە کە هەمیشە وەکو لانەی شۆڕشی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد و شۆڕشگێڕانی پارێزراوە و لە باوەش گرتووە.

٢- سەرەڕای کەمیی ماوەی رابەرایەتیکردنی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی، بەڵام ئەوەی سەلماند کە توانایەکی گەورەی رابەرایەتیکردنی ئایینی و دونیایی هەیە، جگە لە چالاکییە شۆڕشگێڕییەکانی، پەیوەندیی کۆمەڵایەتی زۆر بەهێز بووە لە سەردەمی ئەودا. پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی پتەوی دروستکرد لەگەڵ زۆربەی تیرە کوردەکان، بووە مایەی رێزی هەموو میللەتی کورد، چونکە تەنها لە سنووری عەشیرەتە دراوسێیەکانی ناوچەی بارزان نەبوون، بەڵکو ئەو سنوورەیان بەرەو هەموو ناوچەکانی تری کوردستان برکرد.

٣- لە سەردەمی شێخ عەبدولسەلام ناوچەی بارزان پێشوەچوونێکی هەمەلایەنەی بە خۆیەوە بینی، چەندین چاکسازی لە بوارە جیاوازەکان ئەنجامدران بە تایبەتی ئەو چاکسازییانەی کە پەیوەندی بە بواری ئابووری هەبوو وەک نەهێشتنی موڵکایەتی و دابەشکردنی زەوی بەسەر جووتیاراندا.

٤- بێگومان گۆڕانکارییە سیاسی و ئابوورییەکانی شێخانی بارزان هەڕەشەیەکی جدی بوو بۆ خان و دەرەبەگەکانی ناوچەکە، چونکە چاکسازییە ئابوورییەکان راستەوخۆ مەترسی لەسەر بەرژەوندییەکانیان دروست کرد، بۆیە هەوڵەکانیان چڕ کردەوە لە شێوازگەلی جۆراوجۆر لەوانە راپۆرت و گوزارشتنی بەردەوامی خانەکانی ناوچەکە بۆ دەسەڵاتدارانی عوسمانی.

٥- ئەم ریفۆرمە پێشنیازکراوانە کە لەڕێگای یاداشتێک ئاڕاستەی دەسەڵاتدارانی عوسمانی کرا، بەتایبەت کە جەخت لە لایەنی زمان دەکاتەوە، لێدانی زەنگێکی مەترسیدار بوو لە بنگوێی تورکانی لاو، چونکە زمان بنەمای بنەڕەتی شوناسی نەتەوەیە، بەتێڕوانینی ئەوان بەخشینی ئەم جۆرە مافانە بەگەلانی ژێر دەستە، یەکێتی عوسمانی لاواز دەکات، بۆیە دەسەڵاتدارانی عوسمانی یاداشتەکەیان بە سەرەتای جیابوونەوە لە دەوڵەت لەقەڵەم دا.

٦- گوتاری شێخ عەبدولسەلام گوتارێکی ئاشکرایە و ڕەهەندەکانی دیارە، ئەو یەکەم کەسە کە بەرنامەی بۆ بزووتنەوەی نیشتمانی کوردی نووسیوە و داواکارییەکانیشی تێدا تۆمار کردووە، کە لە پلەی یەکەمدا بەڕەسمی ناسینی زمانی کوردی هاتووە، بەشێوەیەک زمان لە گوتاری شێخ عەبدولسەلام بارزانی پلەی یەکەمی وەرگرتووە، دیارە لەپشت داواکردنی بەڕەسمی ناسینی زمانی کوردییەوە دەلالەتی گەڕان بەدوای شوناسدا دێتە ئاراوە، شوناس بەو واتایەی کە بوونی کورد وەک پێکهاتەیەکی ئیتنیکیی جیاواز و سەربەخۆ لەوانی تر پیشان بدرێت و مافەکانیشی پێبدرێت.

## پەراوێزەکان :

[1] بنیامین مار شەمعون رابەری باڵای دونیایی و ئاینی کەمینەیی ئاسووری بوو، لە چوارچێوەی تێکۆشانەکانیدا بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی ئاسووری لە هەرێمی ئازەربایجانی ئێراندا، لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم لە ئازاری ساڵی ١٩١٨ ئینگلیزەکان هانیان دا لەگەڵ سمکۆی شکاک هاریکاری بکات، پاش ئەوەی لە هەردوو کەسایەتی بڕیاریان دا لە کۆنەشاری نزیک سەلماس کۆببنەوە بەمەبەستی گۆڕینەوەی بیرورا لەمەڕ پرسی هاریکاریی نێوان کورد و ئاسووری دژ بەئێرانییەکان، بەڵام لەناو کۆبوونەوەکەدا سمکۆی شکاک هەڵدەستێت بەکوشتنی مار شەمعون، پێدەچێت جیاوازیی بیروراکانی نێوانیان هۆکارێک بێت بۆ ڕوودانی ئەم کارە. بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ : سەید کەمال ئیبراهیمی، سمکۆ، ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠١٢ .

[2] مستەفا بارزانی: لە ١٩٠٣/٣/١٤ لە گوندی بارزان لە دوای دوو مانگ لە وەفاتی باوکی "شێخ محەمەد" لەدایک بووە، لە تەمەنی سێ ساڵیدا لەگەڵ دایکی لە شاری مووسڵ زیندانی کراوە لە سەردەمی عوسمانییەکان، بەشداری و هاوکاری زۆربەی بزووتنەوە و جووڵانەوە شۆڕشگێڕییەکانی کوردستانی کردووە، لە شۆڕشی یەکەمی بارزان وەک سەرکردەیەکی دیار ڕۆڵی گێڕاوە، لە حوزەیرانی ١٩٣٢ لەگەڵ خێزانە بارزانییەکان پەنا دەباتە بەر تورکیا، هەرچەندە حکومەتی تورکیا ئاوارەکان ڕادەستی حکومەتی عێراقی دەکات، بەڵام مستەفا بارزانی خۆی دەرباز دەکات و دەگەڕێتەوە ناوچەی بارزان، ساڵی ١٩٣٩ لەلایەن حکومەتی عێراقی دوور دەخرێتەوە بۆ شاری سلێمانی، لەوێش لە ١٩٤٣/٧/١٢ بەیارمەتی کەسانی نیشتمانپەروەر دەتوانێت لە سلێمانی بەرەو کوردستانی ڕۆژهەڵات بڕوات و پاشان دەگەڕێتەوە بارزان و شۆڕشی دووەمی بارزان دەست پێدەکات، لە ساڵی ١٩٤٥ لێژنەی ئازادی بە سەرۆکایەتی مستەفا بارزانی پێکهێنرا، لە کۆماری مەهاباد کرایە بەرپرسی سەربازی ئەو کۆمارە و پلەی جەنەراڵی پێدرا، دوای لەباربردنی کۆماری کوردستان لەلایەن حکومەتی ئێرانی، مستەفا بارزانی لەڕێگای ڕووباری ئاراس لە ساڵی ١٩٤٧ ڕوودەکاتە یەکێتی سۆڤیەت و لە ١٩٥٨/١٠/٦ دەگەڕێتەوە عێراق، پاشان لە ساڵی ١٩٦١ شۆڕشی ئەیلوولی هەڵگیرساند دژ بەحکومەتی عێراقی، هەروەها ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازاری لەگەڵ حکومەتی عێراقی واژووکرد، چەندین جار هەوڵی تیرۆرکردنی دراوە لەلایەن حکومەتەوە لە نێوان ساڵانی ١٩٧٠- ١٩٧٢ لە ١٩٧٩/٣/١ لە نەخۆشخانەی جۆرج تاون لە ئەمەریکا کۆچی دوایی دەکات. بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێنەوە بۆ: (شەعبان، ٢٠١٣، ل ل ١٤ — ١٨).

[3] سەبارەت بە ڕەوت و پەرەسەندنەکانی جەنگی "سەری باز "بگەڕێوە بۆ: (پي رەش، ١٩٨٠، ص ص١١٠ — ١١٣).

(٤) مەحمود شەوکەت پاشا کوڕی سلێمان فائق بەگ کوڕی حاجی تالیب، لە ساڵی ١٨٥٦ لە بەغدا لەدایک بووە، لەوێش خوێندوویەتی، پاشان پەیوەندی دەکات بەکۆلێژی سەربازی لە ئیستانبۆل بە پلەی نەقیب "یوزباشی" دەردەچێت، لەساڵی ١٨٨٢ وەک مامۆستایەک کاری کردووە لە قوتابخانەی ئەرکانی سەربازی لە ئیستانبۆڵ و سەردانی فەرەنسا و ئەڵمانیای کردووە، لەساڵی ١٩٠٥ بووەتە والیی کۆسۆڤۆ، لە کودەتای ١٩٠٨ لە سلانیک بەرەو ئیستانبۆڵ هات و سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی ناچار کرد واز لە دەسەڵات بهێنێت، لە ساڵی ١٩١٠ لەلایەن ئیتیحادییەکان کراوەتە وەزیری جەنگ لە حکومەتەکەی محەمەد کامیل پاشا قەبرسلی، لە کودەتای دووەمی ئیتیحادییەکان بەسەر پارتی حوریەت و ئیتیلاف لە ٢٢ی کانونی دووەمی ١٩١٣ کراوەتە سەدری ئەعزەم "سەرۆک وەزیران"، بەڵام لە ١٣ی حوزەیرانی هەمان ساڵ لە ئیستانبۆڵ تیرۆر دەکرێت. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: محمود شوکت باشا www.marefa.org/index.php/

(٥) ناوی ئیسماعیل پاشایە، بەڵام لەلایەن ڕۆژئاواییەکان بە ئەنوەر پاشا ناسراوە، لە ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٨٨١ لە ئیستانبۆڵ لەدایک بووە، سەرکردەیەکی سەربازی عوسمانی بووە، هەروەها یەکێ بووە لەسەرکردە دیارەکانی بزووتنەوەی تورکە لاوەکان، پاش ئەوەی لە کۆلێژی سەربازی دەردەچێت وەک ئەفسەر لە سلانیک لە فەیلەقی سێ دەستبەکار دەبێت، دواتر دەبێتە سەرۆک ئەرکانی فەیلەقەکە، هەر لەوکاتەوە پەیوەندی بەئیتیحاد و تەرەقی دەکات و لە ساڵی ١٩٠٨ بەشداریی کارای هەبووە لە کودەتای ئیتیحادییەکان بۆ دوورخستنەوەی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە دەسەڵات، بەشداری جەنگی کردووە لە تەرابلوس بەرامبەر بە ئیتالییەکان، پاشان دەگەڕێتەوە ئیستانبۆڵ دەکرێتە وەزیری جەنگ" ناظر الحربیة" لە جەنگی جیهانی یەکەم سەرکردایەتی سوپای سێیەمی عوسمانی کردووە لە جەنگی ساری قامیش دژ بە ڕووسیا لە قەوقاز، لە ٤ی ئابی ١٩٢٢ لە بوخارای ناوەڕاستی ئاسیا لە شەڕی بەلشەفییەکان دەکوژرێت. بۆ زانیاریی زیاتر بگەڕێوە بۆ : انور باشا www.wikiwand.com /ar

(٦) ناوی راستەقینەی وندکارە، هەرچی "سلێمان نەزیف" وەک لەقەبێک دواتر بۆخۆی داناوە، ناوبراو لە ساڵی ١٨٦٨ لە دایک و باوکێکی کورد لە دیاربەکر لەدایک بووە، کوڕی سەعید پاشایە کە لە حکومەتی عوسمانی والی بووە، یەکێ لە سەرسەختترین ئەندامانی ئیتحاد و تەرەقی بوو، سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە ئەورووپا ژیاوە، دوای کودەتای ئیتیحادییەکان چەندین پۆستی کارگێڕی و سەربازی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٠٩ دەبێتە والیی بەسرە، ساڵێک دواتر دەیگوازنەوە بۆ قستەمونی وەک والی، ئینجا لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٣ بۆ ماوەی سێزدە مانگ وەک والیی مووسڵ لەو شارە دەمێنێتەوە، لە ئاکامی تێکشکانی ئیتیحادییەکان لە جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵی ١٩١٨ تورکەکان کەوتنە جموجوول و هاندانی سەردارانی کورد لە ناوچەی ماردین

و دیاربەکر بۆ خواستی سەربەخۆیی کوردستان، سلێمان نەزیف لەگەڵ عەبدوڵلا جەودەت لە پێشەوەی هەموو داواکارانی ئەم بیروڕایەدا بوون، لە ساڵی ١٩٢٧ لە ئەستانە دەمرێت. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: (فتح اللە، ٢٠٠٢، ص ص٧٢ — ٧٣ ؛ بەسری، ٢٠٠٢، ل ل ٦٩ — ٧٢ ).

(٧) سەبارەت بە ڕووداو و پەرەسەندنەکانی جەنگەکە بگەڕێوە بۆ: (پی رەش،١٩٨٠، ص ص ١٢٨ — ١٣١).

(٨) سەبارەت بە سەردانەکەی شێخ عەبدولسەلام بارزانی بۆ تەفلیس بۆچوونی جیا بەدی دەکرێت، زۆربەی سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە شێخ عەبدولسەلام لەگەڵ سمایل ئاغای شکاک سەردانەکەی ئەنجام داوە، تەنها "پی رەش" نەبێت کە پێی وایە سەردانەکەی تەنها ئەنجام داوە، کە زۆر بەنهێنی بوو بۆ ماوەی چل ڕۆژ دەخایەنێت و پاشان گەڕاوەتەوە . (پی رەش، ١٩٨٠، ص ١٣٦).

(٩) گوندێکە لەسەر ڕێگای ورمێ — سێرۆ لەسەر سنووری تورکیا.

(١٠) سەبارەت بەڕووداوی خیانەتەکەی سۆفی عەبدوڵلا و دەستگیرکردنی شێخ عەبدولسەلام، جیاواز لە هەموو بۆچوونەکان "نیکیتین" بە کەمێک گۆڕانەوە چیرۆکی دەستگیرکردنی شێخ باس دەکات . بۆ زانیاریی پتر بگەڕێوە بۆ : بازیل نیکیتین و کوردناسی، وەرگێڕان : نەجاتی عەبدوڵڵا، بنکەی ژین، (سلێمانی، ٢٠٠٤)، ل ل ٦٠-٦١.

## سەرچاوەکان:

**یەکەم : کتێبە بەڵگەنامەییەکان:**

- **کوردی:**

- ئەفراسیاو هەورامی، کورد لە ئەرشیفی رووسیا و سۆڤیەتدا، پێداچوونەوە : مستەفا غەفور، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، (هەولێر، ٢٠٠٦).

- **عەرەبی:**

- خليل علي مراد، عبدالفتاح علي البوتاني، صفحات من تاريخ الكرد و كوردستان الحديث في الوثائق العثمانية (١٨٤٠ – ١٩١٥)، مطبوعات الاكاديمية الكوردية، (أربيل، ٢٠١٥).

**دووەم : نامەی زانکۆیی:**

- ابراهيم خليل احمد، ولاية الموصل دراسة في تطورها السياسي ١٩٠٨-١٩٢٢، رسالة ماجستير، قدمت لكلية الاداب، (جامعة بغداد، ١٩٧٥).

**سێیەم : کتێب:**

- **کوردی:**

- بابە شێخ مەردۆخ ڕۆحانی (شێوا)، مێژووی ناودارانی کورد، وەرگێڕان : ماجد مەردۆخ ڕۆحانی، بەرگی سێیەم، ئەکادیمیای کوردی، (هەولێر، ٢٠١٢ ).
- بازیل نیکیتین و کوردناسی، وەرگێڕان : نەجاتی عەبدوڵڵا، بنکەی ژین، (سلێمانی، ٢٠٠٤).
- پاول شیسمەن، خۆشەوی مەلا ئیبراهیم، لەژێر ئاڵای کوردستاندا ژیان و ڕێبازی مەلا مستەفا بارزانی، خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە (هەولێر، ٢٠١٤).
- جەعفەر عەلی، سۆفیزم و کاریگەری لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورددا (١٨٨٠- ١٩٢٥)، هەولێر،٢٠١٣ .
- حامید گەوهەری، ئیدریس مستەفا بارزانی و بارزانییەکان باشتر بناسین، چاپخانەی شەهاب، (هەولێر،٢٠١٤ ).
- حسێن مەدەنی، کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، (هەولێر، ٢٠٠٩ ).

- حەمید بۆز ئەرسلان، مێژووی تورکیای هاوچەرخ، وەرگێڕان: نەجاتی عەبدوڵلا، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٩.
- خالد مەحمود کەریم، دەوڵەتی عوسمانی و عەشیرەتە کوردەکان لە کوردستانی باشوور (١٨٦٩-١٩١٤)، بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران، (سلێمانی، ٢٠١٢).
- سەید کەمال ئیبراهیمی، سمکۆ، (سلێمانی – ڕۆشنبیری – ٢٠١٢).
- شەعبان عەلی شەعبان، هەندێک زانیاری سیاسی و مێژوویی، (هەولێر- چاپخانەی ڕۆژهەڵات- ٢٠١٣).
- عبدالخالید سابیر کەریم، بیری نەتەوەیی لە پەیڕەو و ئامانجەکانی جەمعیەت و حزبە کوردییەکان (١٩١٩-١٩٤٥)، چاپخانەی کەمال، (سلێمانی،٢٠١٣).
- عوسمان عەلی، بزاڤی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی " لێکۆڵینەوەیەکی بەڵگەنامەییە لە هۆکارە ناوخۆیی و هەرێمییەکاندا"، لە (مومتاز حەیدەری و ئەوانی تر)، کۆنگرەی یادەوەریی سەد ساڵەی بارزانی نەمر، بەشی یەکەم، (هەولێر- چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە - ٢٠٠٣ ).
- عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕان: کامەران جەمال بابان زادە، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ڕێ نوێ، سلێمانی، ٢٠١٠.
- عەبدوڵلا عەلیاوەیی، کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا (لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهان)، (خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاوێر، ٢٠٠٤).
- عەبدولمونعیم غولامی، سێ قوربانییەکە (شێخ سەعید بەرزنجی، شێخ عەبدولسەلام بارزانی، شێخ زاری ئەلزەوبەعی )، وەرگێڕان : ئیحسان ئیروانی، بڵاوکراوەی ئاراس، (هەولێر، ٢٠٠٤ ).
- عەتا قەرەداخی، گوتاری ناسیۆنالیستی کوردی، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- عەدالەت عومەر ساڵح، بارزانییەکان لە ڕاگواستنەوە تاکو جینۆساید بەپێی بەڵگەنامە فەرمی و مێژووییەکان، کۆنفرانسی جینۆساید لە ناسنامەوە بۆ پرۆژە، (چەمچەماڵ، ٢٠١٦).

- عەلائەدین سەجادی، شۆڕشەکانی کورد و کۆماری عێراق، ئەتڵەس چاپ، (تاران، ٢٠٠٥ ).
- عەلی تەتەر نێروەیی، نەتەوە و نیشتمان د بزاڤێن بارزاندا، کۆنفرانسی یەکەمی بارزان: سەدەیەکە بارزان پێشەنگی مرۆڤایەتی و ژینگە پارێزییە، هەولێر ٢٠١٠.
- فائق ئەبو زێد، (دەرخستنی واتاکانی ژیان لە ژیانی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی)، لە (مومتاز حەیدەری و ئەوانی تر)، کۆنگرەی یادەوەریی سەد ساڵەی بارزانی نەمر، بەشی یەکەم، (هەولێر، ٢٠٠٣).
- فەرەیدوون نوری، بزاڤی بارزانی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، (هەولێر، ٢٠٠٧).
- کۆمەڵێک نووسەر، عوسمانییەکان، وەرگێڕان: سەلام عەبدولکەریم، چ٤، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠١٣.
- کۆمەڵەی خۆیبوون، قەتڵوعامی کورد لە تورکیا، وەرگێڕان: نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- کەمال بورکای، کوردو کوردستان لە سەردەمی باستانەوە تا کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم، وەرگێڕان: علی فەتحی، چاپخانەی منارە، (هەولێر، ٢٠٠٨ ).
- م. ڕەسوڵ هاوار، کورد و باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی خاک، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- م. س لازاریف و ئەوانی تر، مێژووی کوردستان، وەرگێڕان : هۆشیار عەبدوڵڵا سەنگاوی، (هەولێر- دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات٢٠١٢).
- م. س. لازاریف، کێشەی کورد، وەرگێڕان: کاوس قەفتان، ب١، چاپخانەی الجاحظ، (بەغداد، ١٩٨٩).
- مارتن ڤان برۆنسن، ئاغا و شێخ و دەوڵەت، وەرگێڕان: کوردۆ عەلی، ب٢، (سلێمانی، ٢٠٠٣).
- محمد بریفکانی، چەند راستییەکی مێژوویی لە بارەی بارزانییەکان، وەرگێڕان : چەپەر، (بەغدا، ١٩٥٣ ).
- میر بەسری، ناودارانی کورد، وەرگێڕان: عەبدولخالق عەلائەدین، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، (سلێمانی، ٢٠٠٢).
- مەسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد (١٩٣١ -١٩٥٨)، (هەولێر، ٢٠١٢ ).

- مەعروف جیاووک، کارەساتی بارزانی زوڵملێکراو، وەرگێڕان: ئەبوبکر سالح ئیسماعیل، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، (هەولێر، ٢٠٠٩).
- مەعروف قەرەداغی، بارزان و نەهێنییەکانی، (بەغدا، ١٩٥٩ ).
- مەلا ئەیوب، پێداچوونەڤەک ل مێژوویا بارزان ١٨٢٠ – ١٩١٤، چاپخانەی حاجی هاشم، (هەولێر، ٢٠٠٧).
- مەنسور شێخ رەئوف بەرزنجی، چەند راستییەکی مێژوویی لەبارەی شۆڕشی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی و شۆڕشەکانی دیکەی بارزان تا ١٩٤٥، چاپخانەی خەبات، (دهۆک، ٢٠٠١ ).
- نەجم سەنگاوی، کوردستان و سەرکردە و دەسەڵات و شۆڕشەکانی لە ١١٦٩ – ١٩٩٤، بێ شوێنی چاپ، ٢٠١٤ .
- هاشم شێروانی، دەڤەرا بارزان (جوگرافیا، دیرۆک، کلتوور )، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، (هەولێر، ٢٠٠٨).
- وەدیع جوەیدە، جووڵانەوەی نەتەوەی کورد و بنەما و پەرەسەندنی، وەرگێڕان: یاسین سەردەشتی، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠٠٨.
- ئیریک جەی زۆجەر، مێژووی هاوچەرخی تورکیا، وەرگێڕان: یاسین سەردەشتی، چاپخانەی سیڤار، سلێمانی، ٢٠٠٩.
- ئەحمەد بالایی، سەرهلدانا شێخ عەبدولسەلام بارزانی ١٩٠٧ – ١٩١٤، (بەرلین، ٢٠٠٣ ).

- **عەرەبی:**

- احمد عثمان ابوبكر، الآثار الكاملة، الجزء الثاني، اعداد: آزاد عبيد صالح، مؤسسة ژين، (السليمانية،٢٠١٠).
- تلار على امين، موقف تركيا من القضية الكردية في العراق ١٩٣٧ - ١٩٧٥، (السليمانية – مطبعة بينايي – ٢٠١١ ).
- پى رەش، بارزان وحركة الوعي القومي الكوردي ١٨٢٦-١٩١٤)، دون مكان الطبع، ١٩٨٠.
- جرجيس فتح الله، يقظة الكرد (تاريخ سياسي ١٩٠٠-١٩٢٥)، دار ئاراس للطباعة والنشر، (اربيل، ٢٠٠٢).

- دبليو. أي . ويگرام، ادگار . تي. أي . ويگرام، مهد البشرية " الحياة في شرق كردستان " ترجمة : جرجيس فتح الله، دار ئاراس للطباعة والنشر، (اربيل، ٢٠١٠).
- ديڤيد مكدول، تاريخ الاكراد الحديث، ترجمة: راج ال محمد، دار الفارابى، (بيروت، ٢٠٠٤).
- زبير بلال اسماعيل، ثورات بارزان ١٩٠٧ – ١٩٣٥، وزاره الثقافه، (اربيل، ١٩٩٨).
- صديق الدملوجي، امارة بهدينان الكردية، مطبعة الاتحاد، (الموصل، ١٩٥٢ ).
- عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، (بغداد، ١٩٥٦).
- فؤاد صالح السيد، اعظم الاحداث المعاصرة ١٩٠٠– ٢٠١٤، مكتبة حسن العصرية، (بيروت، ٢٠١٥ ).
- كاوس قفطان، الانتفاضات البارزانية (صفحات من تاريخ الحركة التحررية الكردية في النصف الاول من القرن العشرين)، دار ئاراس للطباعة والنشر، (اربيل، ٢٠٠٣ ).
- كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة: محمد الملا عبدالكريم، دار اراس للطباعة والنشر، (اربيل، ٢٠١٣).

- **ئینگلیزی:**

- Bernard Lewis, the Emergence of modern turkey, (London-1961).
- *Karen dabrowska, Geoff hann, Iraq a then and now: a Guide of the country and its people, (London – 2008).*
- *Michael m. Gunter, the a to z of the kurds,(published by scarecrow prees, united kingdom – 2009).*

**سێیەم : وتار و توێژینەوە:**

- **کوردی:**

- عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی: بزاڤی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی لە بواری سیاسی و پێشمەرگایەتی، گۆڤاری مێژوو، ژمارە (٩)، ساڵی دووەم، (هەولێر، ١٩٩٨).

- **عەرەبی:**

- ف. نيكيتين، العائلة البارزانية، ترجمة: كاوس قفطان، مجلة شمس كردستان، العدد (٥)، السنة الثانية، (بغداد، ١٩٧٣).

**چوارەم : ئینتەرنێت:**


- عبدالعزيز المفتي، محاضرة التبعية السياسية للكورد، متاح على الموقع الالكتروني:
  أ– www.algardenia. Com
  ب– تمت زيارة الموقع في ٣:٣٠ في ١٥ / ١ / ٢٠١٨
- انور باشا www.wikiwand.com/ ar/ تمت زيارة الموقع في ٨:٣٠ في ٧ / ٥ / ٢٠١٨
- محمود شوكت باشا www.marefa.org/index.php/ تمت زيارة الموقع في ١٠:٢٠ في ١٨ / ٧ / ٢٠١٨

## ملخص البحث

م. مصطفى محمد كريم د. شوان محمدامين طه
قسم التاريخ – جامعة صلاح الدين

منطقة بارزان في عهد حكم الاتحاد والترقي ١٩٠٨ – ١٩١٤م كانت تتميز بمكانة بارزة ومرموقة مما جعلها تتجه نحو تكدر كبير لحكام الإتحاد والترقي، ومن هنا تتضح الحقيقة التاريخية لتلك المنطقة واهميتها وقد تعول تلك الاهمية الى الجهود المبذولة من قبل الشيخ عبدالسلام الثاني وتوجهاته الاصلاحية الواسعة التي شملت كافة المجالات الإجتماعية والثقافية والسياسية والإعمار هذا من جهة، ومن جهة أخرى تعزيز وتمكين سلطته في الداخل وإعادة القوة والعزة لتكية بارزان في مواجهة معارضها بشكل خاص. وما هذا البحث الا محاولة لتسليط الضوء على دور الشيخ عبدالسلام الثاني السياسية ومن خلال زعامته وإرشاده لتكية بارزان في إدعاء ومناشدة وإعلان قيام الإحتجاجات ضد استبداد الحكام الاتحاديين، كذلك توضيح الابعاد الإقتصادية والسياسية لتلك الإحتجاجات والتظاهرات التي اقيمت في حينها . ففي البداية تطرق البحث الى تلك المحاولات والحجج والبراهين التي اتخذها الإتحاديون لقيامهم بهجمات على منطقة بارزان في إطار تحقيق أهدافهم السياسية والإستراتيجية، ومن ثم ركز البحث على مجرى الأحداث وتطورات الحرب بين الجانبين بإبراز دور القبائل الكوردية في مواجهة تلك الهجمات العسكرية التي شنها الحكام وسلطات الإتحاد والترقي، وفي الختام تناول البحث أبرز الخطوات التي خطاها شيخ بارزان في مرحلة السلام.

# Abstract

**Mustaph Mohammed Kerim Dr. Shwan Mohammed Amin Taha**
University of Salahaddin – Departement of History

During the reign of Al-Etihad wa Al-Taraqi (meaning the Union and the Promotion), the region of Barzan (1908-1914) had a prominent and prestigious position. The unique status of the region caused a great annoyance of Al-Etihad wa Al-Taraqi rulers, and this seems to highlight a historical fact regarding the significance of this region and its influence. This attributable to the role of Abdulsalam II by which he put extensive effort through supporting a comprehensive reform process in different social, cultural, political, and constructional fields, on the one hand. On the other, he enhanced his internal authority and contributed in reinforcement and dignity of Barzan Tacia (hospice) in particular to stand against all their protestors. This research aims to shed some lights on Sheikh Abdul Salam's policy through his leadership and guidance of Barzan Takia in proclamation, appeal and declaration of protests against the tyranny of the Etihad wa Taraqi rulers. The research also clarifies the economic and political dimensions of those protests and demonstrations. It starts by focusing on the arguments' and excuses counted by Union and the Promotion fellows to reach their political and strategical aims through attacking Barzan region. Then the course of events and developments in the war between the two sides are discussed by highlighting the role of the Kurdish tribes in the face of these military attacks launched by the rulers and authorities of Union and the Promotion. Then the search concentrates on the most prominent steps taken by Sheikh Abdulsalam Barzani in the peace processes and guaranteeing the rights of the Kurds. Finally, the research discussed the return of the Union and the Promotion to power, followed by explaining the adoption of a strong policy towards the region through the threats of the rulers of the Etihad wa Taraqi, and the arrest of Sheikh Barzan through their internal and external conspiracies and execution in 1914.

# ڕۆڵی گۆڤاری "ڕۆژی نوێ" له نووسینی مێژووی کورددا

**ئارەزوو یوسف حەسەن**
م.ی. بەشی مێژوو - کۆلێژی ئاداب
زانکۆی سەلاحەددین — هەولێر

**پێشەکی**

ئەو گۆڕانکارییە مێژووییەی له ئاکامی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ سەری هەڵدا، له ڕووی سیاسی و ڕۆشنبیرییەوە تاڕادەیەک بوونەتە هۆی ئەوەی کە نەتەوەی کورد بوونی خۆی بسەلمێنێت له ناوچەکەدا بۆ بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکانی له ڕووی سیاسی بۆ یەکەمین جار، دان بەنەتەوەی کورد نرا وەک نەتەوەیەکی هاوبەش له عێراقدا له بواری ڕۆشنبیرییەوەش کرانەوەیەک سەری هەڵدا ، چەندین ڕۆژنامە و گۆڤار مۆڵەتی فەرمییان وەرگرت . گۆڤاری "ڕۆژی نوێ"یش وەک گۆڤارێکی سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی لەم هەلومەرجەدا سەری هەڵداوە و بایەخی تەواوی داوە بە مەسەلەی کورد له گشت بوارەکاندا، بەتایبەتیش بایەخدان بە بواری مێژوویی .

هۆکاری هەڵبژاردنی بابەتەکەش بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندیی گۆڤاری "ڕۆژی نوێ" له بواری نووسینی مێژوودا، لەبەر ئەوەی هیچ ژمارەیەکی ئەو گۆڤارە نەبووە بابەتێکی مێژوویی تێدا نەبێت، هەندێک جاریش باسە مێژووییەکان بەشێوەی زنجیرە بڵاوبوونەتەوە، ئەمە وێڕای نەبوونی توێژینەوەیەک و لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی دەربارەی ڕۆڵ و بایەخی گۆڤاری "ڕۆژی نوێ" له لایەنی مێژووییەوە .

توێژینەوەکە بەگشتی پێکهاتووە لە پێشەکییەک و سێ تەوەر و لیستی سەرچاوەکان . لە تەوەری یەکەمدا کورتەیەک لەبارەی گۆڤاری "ڕۆژی نویٚ" و ئەو هەلومەرجە سیاسییەی کە گۆڤارەکە تێیدا سەری هەڵداوە خراوەتە ڕوو، لەگەڵ ئاماژەکردن بە ئامانج و بایەخی ڕۆژنامەکە لە نێو کاروانی ڕۆژنامەوانیی کوردیدا، هەروەها باس لە کاریگەریی ڕەوشی سیاسی لەسەر داخستنی گۆڤارەکەدا کراوە.

لە تەوەری دووەمدا : تیشک خراوەتە سەر بایەخی "ڕۆژی نویٚ" لە بواری مێژوو نووسین، هەوڵ و تێڕوانینەکانی "ڕۆژی نویٚ" بۆ مێژوو بەتایبەت بۆ مێژووی نەتەوەیی کورد و ڕاستکردنەوە و ڕەخنەگرتنی لە مێژوونووسانی پێشووتر کە لە بارەی کورد نووسینیان هەبووە.

لە تەوەری سێیەمدا : بایەخ دراوە بە ئەو بابەتە مێژوویییە گرینگانەی کە لە گۆڤارەکەدا بە نموونەی مێژووی نەتەوەی کورد باس کراون، بەتایبەتیش شۆڕشە کوردییەکان، بەبێ جیاوازیی پارچەکانی کوردستان و هەروەها ڕۆڵ و پێگەی ئافرەت لە شۆڕشی نەتەوەییش خراوەتە ڕوو، لەگەڵ باسکردنی بواری وەرگێڕان کە لایەنێکی گرینگ و هەستیاری گۆڤارەکە بووە، کە نووسینی نووسەرە بیانییەکان سەبارەت بەکورد باس کراوە لە زۆر شوێن ڕەخنە و ڕاستکردنەوەی باسە مێژووییەکانی تێدا ڕوونکراوەتەوە.

لە گرینگترین ئەو سەرچاوە مێژووییانەی پشتی پێ بەستراوە بەپلەی یەکەم گۆڤاری "ڕۆژی نویٚ" خۆی بووە لەبەر ئەوەی لێکۆڵینەوە تایبەت بووە بە وردبوونەوە لە ژمارەکانی "ڕۆژی نویٚ" لە بارەی نووسینی مێژووی کورد، هەروەها پشتبەستن بە ئەو وتارانەی لەبارەی "ڕۆژی نویٚ" نووسراوە .

## ١- کورتەیەک دەربارەی مێژووی دەرچوونی گۆڤاری "ڕۆژی نوێ"

### ١-١ ناساندنی گشتی :

"ڕۆژی نوێ" یەکێک بوو لەو بڵاوکراوانەی کە گەشەسەندن و لەدایکبوونی پەیوەست بووە بەو هەلومەرج و گۆڕانکارییە سیاسییەی کە لە ناوچەکە ڕوویدا. ( زەنگەنە،٢٠١٠، ل١٠٨).

بەهۆی ئاکامەکانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨، ئەو شۆڕشەی توانی گۆڕانکاریی بنەڕەتی لە ڕەوشی سیاسیی ناوچەکەدا بەگشتی بکات و کۆتایی بە قۆناغێک لە مێژووی عێراق هێنا و، بووە هۆی گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانی لە پاشایەتییەوە بۆ کۆماری. (ترێپ،٢٠١٠، ل١٣٧).

لەبەر ئەوەی بە هاتنە سەر دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم (١٩١٤-١٩٦٣) وەک یەکەمین سەرۆک وەزیران لە عێراق و لە ٢٧ی تەممووزی یەکەمی ١٩٥٨ بۆ یەکەم جار دەستووری کاتی لە عێراق ڕاگەیەندرا کە لە پێشەکییەک و چوار بەشی سەرەکی پێکهاتبوو، بەپێی بڕگەی سێیەمی[1]. دەستووری کاتی کورد و عەرەب هاوبەشن لە عێراق. (گەلالی، ٢٠٠٩، ل٣١ ).

لە هەمان کاتدا هەر بەپێی دەستووری کاتی گشت پارت و ڕێکخراوە سیاسی و ڕۆشنبیرییەکان و جەماوەرییەکان ڕێگایان پێدرا بە ئازادی بنکە و بارەگاکانیان بکەنەوە و چالاکییەکانیان بکەن، هەروەها بڕیاڕی دەرچوونی چەندین ڕۆژنامە و گۆڤار درا لەم لایەنەوەش کوردیش وەک گەلانی تر دەرفەتی بۆ ڕەخسا کە لەم بوارەدا هەنگاو بنێت. (ئەمین،٢٠١٠، ل١٧٤).

پێش شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ هەوڵی زۆر دراوە بۆ ئەوەی ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردیی سیاسی بەئاشکرا دەربکرێت، بەڵام جگە لە " نزار" کە تاقە گۆڤاری سیاسیی کوردیی ئاشکرای تەمەن یەک ساڵەی سەردەمی پاشایەتی بووە، ڕێگا بە دەرچوونی ڕۆژنامەی

سیاسیی کوردی دیکە نەدراوە، تاوەکو دوای شۆڕشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨ نەبێت حکومەتی نوێ ڕێگای داوە دوو ڕۆژنامەی سیاسی بەئاشکرا دەربچێت. (ساڵح ساڵح، ٢٠١٠، ل٤، بۆتان،١٩٩٨، ل١٦).

ئەوانیش بریتی بوون لە ڕۆژنامەی "خەبات" ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان[٢]. ئەوەی تریان "ئازادی" ئۆرگانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق کە یەکەمین ژمارەی لە ١ی مایسی ١٩٥٩ لە کەرکووک بڵاوکرایەوە، لە پاش تێپەڕبوونی دوو ساڵ بەسەر دەرچوونی داخراوە. (جباری،١٩٧٥، ل٥١).

لە دوای شۆڕش چەندین بڵاوکراوەی دیکەش بەئاشکرا دەرچوون کە بناغەیەکیان بۆ ڕۆژنامەوانی کوردی دانا، لەوانە گۆڤاری (بڵێسە-١٩٥٨)، گۆڤاری (نەورۆز-١٩٥٩)، گۆڤاری (هیوای کوردستان-١٩٥٩)، لە ساڵانی شەستەکانیش بەدواوە ڕۆژنامە و گۆڤاری دیکە دەرکراون لەوانە: (بروا-١٩٦٠)، گۆڤاری (روناهی-١٩٦٠)، گۆڤاری (ژیان-١٩٦٠)، ڕۆژنامەی (کوردستان-١٩٦١). (مارف، ڕۆژنامەوانی ئازاد لە کوردستانی عێراق، ڕۆژنامەنووس،"گۆڤار"، هەولێر، ژ(٢٢) پایزی ٢٠١٠، ل٧٨).

لەم هەلومەرجەشدا گۆڤاری "ڕۆژی نوێ" بەهۆی ئەو ئازادییەی کە لە بواری ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەوانی ڕەخسابوو، ساڵێک بەر لە هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلوول لەدایک بووە. لە ٢٢ی شوباتی ١٩٦٠ مۆڵەتی فەرمی وەرگرتووە، "ڕۆژی نوێ" گۆڤارێکی مانگانە بووە، هەمووی بەسەر یەکەوە (١٨) ژمارەی لێ دەرچووە لە نیسانی ١٩٦٠ تاوەکو ئەیلوولی ١٩٦١) بەردەوام بووە. (حوسێن،٢٠١١، ل٧؛ ئەحمەد،٢٠٠٧، ل١٤٧ ).

سەبارەت بە ناونانی ڕۆژنامەکە و هەڵبژاردنی ناوی "ڕۆژی نوێ"، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ بیرۆکەی جەمال شاڵی[٣]. لە بەر ئەوەی ئەو بارودۆخەی کە گۆڤارەکە تێدا لە دایک بووە دەورو زەمانێکی نوێ بووە لە دوای نەمانی ڕژێمی پاشایەتی، بۆ کوردیش ڕۆژێکی نوێ

بووە، دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە محەمەد ئەحمەد تەها (کامەران موکری) [٤].. سکرتێری نووسین، موحەڕەم محەمەد ئەمین[٥]. ئیحسان عەبدولکەریم[٦]. کەریم زەندی[٧]. عەبدوڵڵا ئەژدەر وەک ئەندام (ساڵح و ساڵح،٢٠١٠، ل ١٢).

بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکە لە شارە کوردییەکان لە ڕێگای کتێبخانەکانەوە بووە لەوانەش لە هەولێر لە کتێبخانەی شۆڕش خاوەنەکەی قادر شۆڕش بووە، لە خانەقین لە کتێبخانەی سیروان خاوەنەکەی عەزیز پشتیوان – لە ڕەواندز لە کوردستان بووە خاوەنەکەی حاجی ئیسماعیل. ("ڕۆژی نوێ"، ژ(٧) ساڵی یەکەم تشرینی یەکەم _١٩٦٠، ل ١٣٠ ).

**١-٢ ئامانجی رۆژی نوێ:**

"ڕۆژی نوێ" لەم ڕەوشە سیاسییەی کە تیا گوزەری کردووە لە پێناوی بەدیهێنانی مافی نەتەوەی کورد و چەندین ئامانجی دیکە کۆششی کردووە لەوانە :

١- زمانی کوردی : "ڕۆژی نوێ" لە هەوڵی ئەوەدا بووە بە زمانی کوردی پەتی بابەتەکان بڵاوبکاتەوە، لە پێناوی زیاتر پێشخستنی زمانی کوردی لە ڕووی (ئیملا و ڕێزمانی )یەوە.

٢- ئەدەبی: هەوڵی داوە بۆ گەشەسەندن و پێشخستنی وێژە و ئەدەبی کوردی و نیشاندانی کەلەپووری نەتەوەی کورد و ناساندنی کورد.

٣- فۆلکلۆر : یەکێک لە ئامانجە گرینگەکانی "ڕۆژی نوێ" ناساندنی فۆلکلۆری کوردی بووە بە جیهان . (ئامانجی رۆژی نوێ، "ڕۆژی نوێ"، ژ (٤) پوشپەڕ – تەموزی،١٩٦٠ ساڵی یەکەم، ل٤٠).

٤- مێژوو: "ڕۆژی نوێ" بەتایبەت لە مەیدانی مێژوونووسین هەنگاوی گەورەی بەرەو پێشەوە ناوە، هیچ ژمارەیەکی نییە وتاری مێژوویی تێدا بڵاونەکرابێتەوە کە زۆربەیان بۆ باسی ڕووی جیاوازی

میٚژووی کورد تەرخان کراون، ڕوونکردنەوەی میٚژووی کورد و کوردستان و بەشیٚوەیەکی زانستییانە، یەکیٚک بووە لە ئامانجە دیارەکانی گۆڤارەکە . ( "رۆژی نویٚ"، ژ (٤)، پوشپەڕ – تەموزی،١٩٦٠ ساڵی یەکەم، ل٥٥).

**١-٣ داخستنی گۆڤارەکە :**

لە ئابی ١٩٦١ کاتیٚ پەیوەندیی نیٚوان عەبدولکەریم قاسم و کورد بەرەو خراپی ڕۆیشت عەبدولکەریم قاسم سیاسەتیٚکی توندی بەرانبەر گەلی کورد گرتە بەر لەوانەش بەرتەسک کردنەوەی ئازادییەکان و داخستنی رۆژنامە و گۆڤارەکان و گرتنی ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان. (ساڵح، ٢٠٠٧،ل٢٥).

لەم هەلومەرجەشدا ڕیٚبازی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیش جاریٚکی دیکە گۆڕان تا کودەتای ٨ی شوباتی١٩٦٣، هیچ رۆژنامەیەکی کوردی نەیتوانی بەردەوام بیٚت. (خەزنەدار،٢٠٠١، ل١٢٣).

هەر ئەوەش کرایە بیانووی بۆ داخستنی گۆڤاری "رۆژی نویٚ" لەبەرئەوەی سەرجەم ژمارەکانی ئەو گۆڤارە لە ناوەڕۆکدا داواکاری مافی نەتەوەی کوردن و زۆربەی وتارەکانیش لەسەر شۆڕشەکانی کوردی نووسراوە. ( شالی،٢٠٠١، ل٦٥).

**١- " ڕۆژی نویٚ" و میٚژوونووسین :**

"ڕۆژی نویٚ" لە ماوەی نیٚوان ساڵانی ١٩٦٠-١٩٦١ ڕۆڵی بینیوە لە خزمەتکردنی نەتەوەی کورد لە بوارە جۆربەجۆرەکان و بەتایبەت لە لایەنی میٚژووی سیاسی و نەتەوایەتی. لەوانەش لە بواری میٚژوویی هەر بۆیە لە کۆی لاپەڕەکانی "ڕۆژی نویٚ" بە تیٚکڕایی نزیکەی (٣٠٢٣) لاپەڕە لە کۆی ئەو ژمارەیەش نزیکەی (٣٨٠ ) لاپەڕە بابەتی میٚژوویین واتا لە سەدا نۆزدەی گۆڤارەکە بریتی بووە لە باسکردنی بابەتی میٚژوویی. (ساڵح و ساڵح،٢٠١٠، ل ١٤).

ئەگەر لە بواری رۆژنامەنووسی کوردیدا گۆڤاریک یان رۆژنامەیەک هەبیت بەتەواوەتی لە ئۆرگانی میژووی نزیک بیتەوە ئەوا یەکیک لەوانە "رۆژی نوێ " بووە، هەرچەندە وەک گۆڤاریکی ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتی دەرچووە، بەڵام لە بواری میژوویدا هەنگاوی گەورەی هاویشتووە .(مەزهەر،٢٠٠٨،ل١٤٧).

هەر لەم ڕوانگەیشەوە لە بواری میژوونووسیندا ڕۆڵیکی بەرچاوی هەبووە لە پیناوی وشیارکردنەوە و ڕاستکردنەوەی هەندێ هەڵەی نووسین لە میژوودا، لە هەوڵی ئەوەدا بووە خەبات و ناسنامەی نەتەوەی کورد زیاتر بە خوینەران ئاشنا بکات، ئەو خزمەتکردنەش لە دوولایەنەوە بەرجەستە کراوە :

یەکەمیان: ناساندنی میژووی کورد.

دووەمیان: میژووی گشتی بووە .

**١- میژووی کورد :**

بەر لەوەی باس لە چۆنیەتی باسکردنی میژووی کورد بکەین، پیویستە ئاماژە بەوە بکریت کە هۆکاری ئەو بایەخدانەی "رۆژی نوێ " بۆ نووسینی میژوو بەتایبەتیش بۆ نووسینی میژووی کورد لەوەوە بووە، دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە ئاگاداری هەندێ هەڵە و نادروستیی نووسینی میژوویی بوونە کە لە بارەی کورد نووسراوە بەدریژایی میژوو، لە هەمان کاتدا لە هەوڵی ئەوەدا بوونە، کە لە باسکردنی میژوودا هەندێ ستەم و زوڵمی کورد بخاتە ڕوو و بەرگیکی نەتەوایەتی وشیاریی میژوویی پیبدات بۆ ئەوەی خوینەرانی کورد لە کۆمەڵیک ڕاستی بەئاگا بینیتەوە بەهۆی زاڵبوونی بیری کۆمۆنیستی و بیری نەتەوەپەرستیی عەرەب. (ئامانجمان، "رۆژی نوێ"، ژ١)، خاکە لیو- نیسان - ١٩٦٠ ساڵی یەکەم، ل٤).

بەڵگەی ئەمەش لە یەکەمین ژمارەی گۆڤارەکەدا لە نیسانی ١٩٦٠ نووسراوە کە ئامانجی" رۆژی نوێ" بریتییە لەوەی " میژووی نەتەوەی

کورد وەک ئەستێرەیەک وایە لە هەوری بوختان و درۆ و دەلەسەدا بەدووربکرێت، رۆژی نوێ خەبات ئەکا بۆ (رەوینەوەی) ئەو هەورە و هەوڵ دەدات بۆ روونکردنەوەی مێژووی کورد، ئەویش بەبڵاوکردنەوەی مێژووی نەتەوەکەمان بەجۆرێکی رێکوپێک و (عیلمی) بە اسلوبیکی ئاسان و رەوان".("رۆژی نوێ"، ژ١)، خاکە لێو-نیسان،١٩٦٠ ساڵی یەکەم، ل٤).

لەلایەکی دیکەوەش گۆڤارەکە لەهەوڵی ئەوەدا بووە، کە بە بەڵگە هێنانەوە بیسەلمێنێت کورد وەک نەتەوەیەک خاوەن پێگەی تایبەتی خۆیەتی و دوورە لەو چەواشەکارییانەی لە هەندێ سەرچاوەی مێژووییدا لەبارەی کوردیان نووسیوە، بۆ راستکردنەوەی مێژووی نەتەوەی کوردیش لە یەکەمین ژمارەی گۆڤارەکەدا کەریمی زەندی باسی جوگرافیای کوردستانی کردووە، شوێن و نیشتمانی کوردی بەپێی سەرچاوە دێرینەکان و مێژوونووسانی عەرەب خستۆتە ڕوو. لە ژمارە (٢) لە مایسی ١٩٦٠دا جارێکی دیکە باسی لە نەژادی میللەتی کورد و بنەچەی زمانی کوردی و دانیشتووان و تیرەگەلەکانی کوردی کردووە. (زەندی، جوگرافیای سیاسی کوردستان،"رۆژی نوێ"، ژ (٢)، بانەمەڕ – مایس ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل٣١).

بەڵام لە ژمارە (٣)، لە حوزەیرانی ١٩٦٠ دا کە ژمارەیەکی تایبەت بووە بە بنەچەکەی کورد، جارێکی دیکە پرسی نەژادی کورد خراوەتە بەر لێکدانەوە و لە وتارەکاندا هاتووە کە ئەو بابەتانەی لەلایەن چەندین مێژوونووس باسی لێوەکراوە، هەموو ئەو بەڵگانەی لەبارەی کورد خراونەتە ڕوو لەلایەن بێگانەوە بووە و نەیانتوانیوە وەک کوردێک ڕاستی و دروستیی بابەتەکە شی بکەنەوە، بۆ ئەم مەبەستە "رۆژی نوێ " لە وتارەکەی (ع. ن. عطار) لە بواری مێژوونووسیندا هەوڵی داوە بەشێوازێکی ڕوونتر چەند و چۆنیەتی ڕەگەزی کورد بخاتە ڕوو. باسکردنی تیرە و هۆزە کوردییەکان بە شێوازی ڕوونتر بخاتە روو، بۆ نموونە لە وتارەکەدا هەندێ وشە شی کراونەتەوە، ئایا لە بنەڕەتەوە

ئەو وشانە کوردی بوونە یان وەرگیراوە، لەوانەش نووسەر ئاماژە بەوە دەکات کە وشەی (کورد- گورد) لە بنەڕەتەوە وشەیەکی کوردی بوو، فارسەکان لە کوردیان وەرگرتووە، لەمەشدا پشتی بەو بەڵگەیە بەستووە کە فارسەکان، ئازاکانی خۆیان ناو ناوە کورد – گورد هەروەها ئەو ناوەش بووەتە ناوبانگ بۆ ئەو کەسانەی کە بەئازایەتی و چاونەترسی ناسراون. (ع. ن. عطار، بنچینەی رەگەزایەتی کورد، ژ (٣) جۆزەردان – حوزەیران، ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل٩ ).

بەڵگەی دووەمیش وەڵامدانەوە بووە لەبارەی ناوچەی دەرسیم[٨]، "ڕۆژی نوێ" هەوڵیداوە وەڵامی ڕەخنەی ئەو کەسانە بداتەوە کە لەبارەی مێژووی ناوچەی دەرسیم دەیانوت دەرسیم هەمووی تورکن، بێگومان ئەمەش لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی فکری تۆرانی[٩] بووە، کە هەوڵی گۆڕینی دیمۆگرافی ناوچە کوردنشینەکانیان داوە، بۆیە "ڕۆژی نوێ" جارێکی دیکە وەک ئەرک و بەرپرسیاریەتی مێژوویی لە وتارێکدا هەوڵی دەرخستنی ڕاستییەکانی داوە لەپێناوی دوورخستنەوەی خوێنەری کورد لە چەواشەکاریی حکومەتی تورکیا و ڕۆشنبیرانی بە بڵاوکردنەوەی نامیلکەی (خەمی خانم - خەتی خانم) کە لەلایەن نووسەری کوردی سۆڤیەت (عەلی عەبدوڕەحمان مەمەدۆڤ) لەساڵی ١٩٥٩ لە شاری یەریڤان – پایتەختی کۆماری ئەرمینیای سۆڤیەتی چاپ کراوە، ئەو نامیلکەیە نزیکەی (١٠٠) لاپەڕە دەبێت، دەربارەی قارەمانی و دلێریی خەڵکی دەرسیم بووە، لەم نامیلکەیەدا زۆر بەوردی لە بارەی ناساندنی ناوچەی دەرسیم و قەزای دەرسیم و چیا و لاوانی ناوچەکە دواوە، هەموو بەڵگەکانیش ئاماژە بەوە دەکەن، کورد لە دەرسیم بوونی هەبووە، بۆ ڕاستیی ئەو بەڵگەیەش "ڕۆژی نوێ "نامیلکەکەی هەر بە زمانی کرمانجی بڵاوکردۆتەوە و لە هەمان ژمارەشدا دواتر بە زاراوەی سلێمانیش بڵاوکراوەتەوە. (مێژووی نەتەوەکەت دەرسیم، ژ (٤) پوشپەڕ – تەموزی، ١٩٦٠ ساڵی یەکەم، ل٩).

هەر بۆ بەرچاوڕوونی میٚژووی نەتەوەی کورد "رۆژی نویٚ" هەوڵیداوە بۆ پاکتاوکردنی هەڵە میٚژووییەکان، بۆئەوەی بەپیٚی توانا میٚژووی کورد وەک خۆی بخاتە ڕوو لەوانەش بۆ گەڕانەوەی ناسنامەی نەتەوەیی کەسایەتییەکان (شیٚخ سەعدیی شیرازی) [١٠]. کە بەڵگە دەیسەلمیٚنیٚت کە کوردە، ئاماژەش بەوە دەکات سەعدیی شیرازی لە بنەماڵەیەکی ئەدەبیی بەرز بووە کە فارسەکان زۆر شانازی پیٚوە دەکەن کوردە، سیٚ بەڵگە دەخاتە ڕوو بۆکوردبوونی، "یەکەمیان نووسراوەکەیەتی بەناوی "مثلثات" سەرەوە تا خوارەوە بەم جۆرە بووە بە تازەیی "عەرەبی " شیعریٚکی بە فارسی، شیعریٚکی بە کوردیی کۆنی لوور".

دووەم بەڵگە، "شیعریٚکی خۆی بووە بەفارسی وتوویەتی، لە گۆشەی چاوەوە پیشانی داوە کە کوردە "شیعرەکەیشی ئەمەیە:

**دورگشتم ازقبيله عمرى من ربادشد**

**حرفى ابجد رابخوانى دو سدو هفتادشد**

واتا لەگەڵ خۆم بررام تەمەنم بە باد بوو ، بەڵام ئەگەر تەماشای پیتەکانی ئەبجەدی بکەی بۆت دەرئەکەویٚت کە کویٚندەریم و لە چ گەلیٚکم . مەبەستی شاعیر" لەم شیعرەدا ئەوەیە کە بلیٚ من لە هۆزی جوانرودم

(ج- ٣، و- ٦، أ- ١، ن- ٥٠، ر- ٢٠٠، و- ٦، د-٤= ٢٧٠ **جوانرود)**. (کوردی، ئاورێک بەلای میٚژووی کەمیٚک دوورەوە، رۆژی نویٚ،ژ (٢)، بانەمەر – مایس،١٩٦٠، ساڵی یەکەم. ل ١٠ ).

بەڵگەی سیٚیەم: دەڵیٚت سەعدیی شیرازی ناوهیٚنانی بە (جوانرود) یان بە "توسرکان" هەردووکیان نیشانی ئەوە دەدەن کە کوردە، (جوانرود) یان (جوانڕۆ) هۆزیٚکن لە هۆزەکانی کورد تیرەیەکن لە جاف لە رۆژهەڵاتی هەڵەبجە و ڕۆژئاوای کرماشان نیشتەجیٚن . توسرکان بەشیٚکە لە کرماشان، کوردی لووڕن. لە بارەی کەسایەتی ڕەچەڵەکی سەعدی هیچ باس نەکراوە کە کورد نەبیٚت نە باسی کراوە کە

نەتەوەییێکی دیکە بێت ئەوەش کراوەتە بنەمایەک کەبیسەلمێنێت کە کوردە. (قەرەداخی، شێخی سەعدی کوردە، "رۆژی نوێ"، ژ (٣) جۆزەردان – حوزەیران،١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل٨٧ ).

کەسایەتیی بەناوبانگ "فیردەوسی تووسی "(١١) نووسراوەکەی بەناوی "شانامە" یە، ئەویش بەکورد دانراوە، "رۆژی نوێ" بۆ کوردبوونی ئەو بەڵگەی ئەوە دەخاتە ڕوو کە شانامەکەی پڕە لە وتەی کوردیی پەتی، لەلایەکی دیکەشەوە لە گۆشەی چاو بە تاکە شیعرێک ڕەگەزی خۆی نیشان دەدات و دەڵێت:

**زنام و نشانم کنند جستو جوی**

**دویست بشمروسی تو ای نیکخوی**

واتە ئەگەر عەودالّی ناوونیشانمیت دوو سەد و سی بە پیتی ئەبجەدی بژمێرە ئیتر بۆت دەرئەکەوێت، ئەمیش وەکو : ( ک- ٢٠، و- ٦، ر-٢٠٠، د- ٤= کورد ٢٣٠). (کوردی، ئاوڕێک بەلای مێژووی کەمێک دوورەوە، رۆژی نوێ، ژ (٢)، بانەمەڕ – مایس،١٩٦٠، ساڵی یەکەم. ل ١٠ ).

**٣- "ڕۆژی نوێ"و بابەتە مێژووییەکان :**

**١- شۆڕشە کوردییەکان :**

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی "ڕۆژی نوێ" بریتی بووە لە بایەخدان و ڕوونکردنەوەی شۆڕش و مێژووی شۆڕشی نەتەوەی کورد، کە ئەمە یەکێک بووە لە ئامانجە سەرەکییەکانی "رۆژی نوێ"، بۆ ئەوەی زیاتر ڕۆشنبیرانی کورد لە مێژووی نەتەوەکەیان و ئاکام و سیاسەتی دەوڵەتان بەرامبەر بەکورد دیاری بکات . تایبەتمەندییەکی دیکەی بریتی بووە لە باسکردنی مێژووی گشتی شۆڕشە کوردییەکان لە هەموو پارچەکانی کوردستان، بەبێ جیاوازی لە بارەی شۆڕشە نەتەوەیییەکان دواوە، هەرچەندە ئەوەی لەم لایەنەوە بەرچاو دەکەوێت ئەوەیە کە "رۆژی نوێ" توانایەکی ئەوتۆی نەبووە بۆ ئەوەی بە وردی باسی ئەو شۆڕشانە و چۆنیەتی ئەنجامدانیان بکات، بۆیە لە هەندێ

جاردا گۆڤارەکە خۆی ئاماژە بەوە دەکات کە پێویستە خوێنەر بگەڕێتەوە سەر ئەو سەرچاوانەی کە ئاماژەیان پێکراوە، هەروەک نووسیویەتی " داوا لە خوێنەواران ئەکەین کە پەڕاوە مێژووییەکان بە وردی بخوێننەوە " ئەوە دەیسەلمێنێت کە "ڕۆژی نوێ" لە باسکردنی مێژووی شۆڕشی کورد هەستی بەوە کردووە کە زانیارییەکانی وەک پێویست نین بۆیە ئاماژە بە هەردوو سەرچاوەی گرینگ دەکات لەم بارەوە، ئەویش نووسراوە مێژووییەکەی عەلائەدین سوجادی بەناوی (شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق) و (یاداشتی ڕەفیق حلمی) کە دوو سەرچاوەی گرینگی مێژووی ئەو سەردەمە بوونە. (بیرەوەری شێخ مەحمودی نەمر، ژ(٧)، تشرینی یەکەم، ساڵی یەکەم، ١٩٦٠، ل ٩١).

### ١-١ شۆڕشی قۆچگیری ١٩٢٠- ١٩٢٦:

یەکێک لەم شۆڕشە نەتەوەییانەی کە زۆرترین زانیاری لەسەر بڵاوکراوەتەوە لە " ڕۆژی نوێ"دا، شۆڕشی قۆچگیری بووە[١٢]. شۆڕشێکی سەخت و خوێناوی نەتەوەی کورد بوو بۆ ڕزگاری و سەربەخۆیی کورد و کوردستان. ئەم شۆڕشە بە دوو قۆناغ بەرپاکراوە، جاری یەکەم لە ٣ی کانوونی دووەمی ١٩٢٠ تا ئەیلوولی ١٩٢٠، جاری دووەم لە ٢٤ی شوباتی ١٩٢١ تا حوزەیرانی ١٩٢١، لە ٢٥ی حوزەیران بانگی لێبووردنی گشتی درا، شۆڕش کۆتایی هات. (شاوەیس، شۆڕشی قۆچگیری-٤-١٩٢٠-١٩٢٦، ڕۆژی نوێ، ژ(٥)، خەرمانان- ئاب ١٩٦١، ساڵی دووەم، ل ٤٣ )

هۆکاری ئەو شۆڕشەش هەڵگەڕانەوەی کەمالییەکان بوو لە مافەکانی کورد بەتایبەت دوای ئەوەی لە ٧ی نیسانی ١٩٢٠ لە شاری سیواس مستەفا کەمال ئەتاتورک لەگەڵ "علی شان بەک" (حەیدەر بەگ)ی بەڕێوەبەری شارۆچکەی عمرانییە و (عەلی شان)ی برای قائیمقامی شاری (ڕەفاهی ) بوون لە گفتوگۆکردندا ئەوەی ڕاگەیاند، کە دەوڵەتە گەورەکان نیازی وایان هەیە تورکیا بە یۆنان و ئەرمەن بدەن و کوردستانیش دابەش بکەن بەسەر عەرەب و ئەرمەن، بۆیە داوای

هاوکاری لە گەلی کورد کرد تا بتوانی بەسەر ڕەوشەکەدا زاڵ بێت ئەوساکە تورکیا دەبیتە دەوڵەتێکی کۆنفدراسیۆنی (هاوبەش) لە نێوان کورد و تورک، بەو شێوەیە کوردەکان هاوکاریی تورکیایان کرد لە دژی ئەرمەن و یۆنانییەکان، بەڵام دوای ئەوەی لە ١٨ی ئەیلوولی ١٩٢٠ شەڕ کۆتایی هات، تورکیا لە مەترسی ئەرمەنستان رزگاری بوو، دوای گەڕانەوەی عەلی شان و هاوەڵەکانی بۆ قۆچگیری و دەرسیم لەگەڵ مستەفا کەمال کەوتنە گفتوگۆ لە ئەنجامی ئەو کۆبوونەوەیەدا، کوردەکان بوونە دوو بەش، هەندێ ڕایان وابوو گەلی کورد تەنیا بۆ سەربەخۆیی هەوڵ بدات، ڕای دووەم لەگەڵ ئەوە بوو کە کورد تەنیا بۆ ئۆتۆنۆمی کوردستان هەوڵ بدات، ئەوە دەرفەتێک بوو بۆ ئەوەی مستەفا کەمال داوا لە (٧٢ ) نوێنەری کورد بکات برووسکە بۆ سەرۆک کۆماری ئەمریکا ولسن بنێرن، بۆ ئەوەی بە ئەورووپا ڕابگەیەنن کە کورد سەربەخۆیی ناوێت، لەگەڵ تورکیا بەیەکەوە دەژین، دوای ئەو هەوڵەی مستەفا کەمال لە ٢٩ ی نیسان ١٩٢٠ عەلی شان نامەیەکی بۆ سەرۆکە کوردەکانی ناوچەی سیواس و قۆچگیری و دەرسیم بەمەبەستی ئاگادارکردنەوەیان، لە هەمان کات لە ڕێگای "کۆمەڵەی تعالی جمعیتی"[١٣]، بە تەلگراف نامەیەک بۆ کۆنسڵەکانی دەوڵەتانی ئەورووپایش دەنێرێت کە مستەفا کەمال بەناوی (٧٢) نوێنەری کورد ئەو برووسکەی ناردووە ئەوان ئاگادار نین، ئەمەش بووە هۆی تێکچوونی پەیوەندیی کورد و حکومەتی ئەنقەرە لە ئەنجامدا سەرکردە کوردەکان لە ناوچەی قۆچگیری و دەرسیم کۆبوونەوە و خۆیان ئامادەکرد بۆ دەستپێکردنی شۆڕش. (شاوەیس، شۆڕشی قۆچ گیری-١- ١٩٢٠-١٩٢٦، "ڕۆژی نوێ"، ژ (١)، جۆزەردان – حوزەیران ١٩٦١، ساڵی دووەم، ل ٩٠-٩٥. ).

یەکەمین پەلاماردانی کورد لە ٢٠ی ئاب ١٩٢٠ بۆ سەر فەوجی جەندرمە تورکەکان بوو، ئەم شۆڕشە نزیکەی شەش ساڵی خایاندووە و لە ساڵی ١٩٢٦ بە کوشتنی موراد پاشای سەرۆک خێڵی "کینیان"

کۆتایی هاتووه. (شاوەیس، شۆڕشی قۆچ گیری-٢- ١٩٢٠-١٩٢٦، "ڕۆژی نویٚ"، ژ(٤)، پوشپەر – تەموزی ١٩٦١، ساڵی دووەم، ل ١٤ ).

لەم شۆڕشەدا گوندەکانی قۆچگیری تووشی تالان و سووتان هاتن، ئەو شۆڕشە لە پێناوی داواکردنی مافی رەوای کورد بوو، سەرئەنجام کەمالییەکان پەلاماریان بردە سەر ناوچەکە و زۆریان لێ کوشتن و بەدڕندەترین شێوە شۆڕشەکەیان دامرکاندەوە. (- شاوەیس، شۆڕشی قۆچ گیری-١- ١٩٢٠-١٩٢٦، "ڕۆژی نویٚ"، ژ (١)، جۆزەردان – حوزەیران ١٩٦١، ساڵی دووەم، ل ٩٠).

## ١-٢ شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران(١٤):

"ڕۆژی نویٚ"لە بارەی شۆڕشەکەی ١٩٢٥ بە سەرکردایەتی شێخ سەعیدی پیران، ئاماژە بەوە دەکات، کە یەکێک بووە لەو شۆڕشە نەتەوەییانەی کە لە تورکیا بەرپاکراوە. ئەو شۆڕشە بەرهەمی چالاکی کۆمەڵەی نهێنی سەربەخۆبوونی کوردستان بوو کە لە ئایاری ١٩٢٣ دامەزرابوو. (حەسرەتیان، ٢٠٠٦، ل ١٣).

دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی شۆڕش، حکومەتی تورکیا بە یارمەتی فەرەنسا لە ڕێگای (سیواس و ئەرزەڕۆم و لێواری دەریای رەش) و بەشێکی دیکەش لە ڕێگای هێڵی بەغدا- حەڵەب هێرش دەکەن، لە ئەنجامدا لەشکری شێخ شکست پێدەهێنێت. (دەرسیم، شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران، ڕۆژی نویٚ، ژ (٢)، بانەمەڕ – مایس،١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل ٥٩).

لە ئەنجامدا شێخ سەعید و دکتۆر فوئاد و (٥٦) کەس لە هاوەڵەکانی دەستگیر دەکرێن، لەنێوان ئەمانەدا لە دوای دادگاییکردن فەرمانی خنکاندنی شێخ سەعید و دکتۆر فوئاد و (٤٦) کەسی تر دەردەکەن، لە ٢٨ی ئایاری ١٩٢٥ لە سێدارە دەدرێن. (مێژووی نەتەوەکەت ٤٦ سێدارە، ژ (٢)، بانەمەڕ- مایس ١٩٦١، ساڵی دووەم، ل١).

"ڕۆژی نویٚ" هەوڵی داوە ئەو بەیاننامانەی کە لەلایەن شۆڕشەوە بڵاوکراوەتەوە، وەک بەڵگەیەکی مێژوویی بڵاوبکاتەوە، یەکێک لەو بەڵگەنامانەی کە لە "ڕۆژی نویٚ " لەلایەن (ئیسماعیل حەقی شاوەیس)

بۆگۆڤارەکە ڕەوانە کراوە و بڵاوکراوەتەوە و لەبارەی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیرانەوە، لەلایەن شێخ سەعید خۆیەوە لەمانگی ئازاری ١٩٢٤ کە بەهەردوو زمانی کرمانجی و تورکی نووسراوە لە ناوچەکانی (ئەرزەرۆم و وان – بتلیس – دیاربەکر- خەرپوت – مەلاتییە) بڵاوکراوەتەوە، بایەخی ئەو بەیاننامەیە بۆ بواری مێژوونووسین وەک سەرچاوەیەکی بەڵگەنامە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ڕەوشی شۆڕش پشتی پێ بەستراوە. (بەیاننامەی شێخ سەعیدی پیران مارتی ١٩٢٤زاینی، ڕۆژی نوێ ژ (٧)، تشرینی یەکەم، ساڵی یەکەم، ١٩٦٠، ل ٣٦-٣٩).

**١-٣ ڕاپەڕینی سمکۆی شکاک :**

لە بارەی شۆڕشە کوردییەکانەوە "ڕۆژی نوێ" وەک هەر بەشێکی دیکەی کوردستان بایەخی داوە بەو شۆڕشە کوردییانەی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش سەری هەڵداوە، لەوانەش ڕاپەڕینی سمکۆی شکاک (١٨٧٥-١٩٣٠) بووە، بایەخی ئەم ڕاپەڕینی لە مێژووی نەتەوەی کورد وای کردووە "ڕۆژی نوێ" لە بارەیەوە بنووسێت، سەربارى ئەوەش بە بەراوردکردن بە شۆڕشەکانی دیکەوە دەتوانین بڵێین باسکردنی شۆڕشی سمکۆی شکاک زۆر کەمتر بوو، هۆکاری کەمی زانیارییەکانیش باس نەکراوە تەنیا ئەوە نەبێت لە وتارێکدا هاتووە کە سمکۆ لە شەڕو سیاسەت بلیمەت بووە لەگەڵ دوژمن سەرسەخت بووە، ئەمەش وای کردووە هەر لە سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە ناوبانگی زیاتر دەربکات، زۆر شوێنی ڕۆژهەڵاتی کوردستان رزگار بکات، حکومەتی ئێران و تورکیا و عێراق زۆر هەوڵیانداوە سمکۆ لەناوبەرن، "ڕۆژی نوێ" لە بارەی سکمۆی شکاک دەنووسێت: "شۆڕشەکەی سمکۆ شۆڕشێک بوو بۆ رزگارکردنی هەموو کوردستان و بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی گەورە بووە، لەبەر ئەوەی سمایل خانی قارەمان لە شوباتی ١٩٢٣دا هاتە سلێمانی بۆ دیدەنی شێخ مەحموودی نەمر، بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی دامەزراندنی

حکومەتی کوردستانی گەورە" . ("رۆژی نویَ"، ژ (١٢)، مارتی ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل٥٦).

### ١-٤ شۆڕشی شێخ مەحموودی بەرزنجی:

"رۆژی نویَ"" لە باسی سەرکردەکانی شۆڕش زۆر بە هەستیارییەوە لە بارەی کەسایەتییەکان و ئازایەتی و ناو و ناوبانگییان دواوە، بۆ نموونە نزیکەی (٩) لاپەڕە بەسەریەکەوە دەربارەی شێخ مەحموود نووسراوە. لەو وتارەی لە بارەی ژیان و کەسایەتی شێخ مەحموود نووسراوە، هەوڵدراوە بەرگری لە کەسایەتی شێخ مەحموود بکات و وەڵامی ئەو کەسانەش بداتەوە، کە دەڵێن (شێخ هەر خەریکی ئەوە بووە خزمەکانی خۆی دانیَ؟) بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە حکومەتەکەی شێخ بەدوور بووە، لەو باسکردنەدا ئەو هەڵە مێژووییانەی کە پێشووتر باس کراون، وەزیرەکانی حکومەتی شێخ مەحموودی بە بەڵگە هێناوەتەوە و لە ئاماژەکردنی ئەو ناوانەشدا پشتی بە یاداشتەکەی[١٥] رەفیق حلمی (١٨٩٨-١٩٦٠) بەستووە، لەمانەش حاجی مستەفا پاشا (١٨٦٨-١٩٣٦)، سالح زەکی بەگ ساحێبقران (١٨٨٨-١٩٤٢)، ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ و حاجی مەلاسەعید، عەبدولکەریم عەلەکە، حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا بوونە، کە هیچ کام لەمانە خزمی شێخ نەبوونە، جگە لە شێخ قادر و شێخ حەمە غەریب. ("رۆژی نویَ"، ژ(٧) رەزبەر- تشرینی یەکەم،١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل ٢١ ).

"رۆژی نویَ" لە بارەی هەڵبژاردنی شێخ مەحموود بە حوکمداری کوردستان ئاماژە بەوە دەکات کە مێجەر نوئیل بە فەرمانی ویلسن یەکەمین حاکمی سیاسی ئینگلیز بووە لە عێراق، لە تشرینی دووەمی ١٩١٨ کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ سەرۆک خێڵەکان و پیاوماقووڵانی سلێمانی کردووە، لەم کۆبوونەوەیەدا شێخ مەحموود بە حوکمداری کوردستان هەڵبژێردراوە، بەڵام زۆری نەبردووە ئەم پەیوەندییە تێکچووە، "رۆژی نویَ " لە باسکردنی شەڕەکاندا ورد نییە لەوانەش لە

بارەی شەڕی ئاوباریکدا هاتووە، کە ئەوشەڕە لە کاتێکدا بووە کە شێخ نیازی هەبووە لە مانگی شوبات بەرەو کەرکووک بڕوات، بەڵام کە گەیشتە "ئاوباریک" لەلایەن سوپای بەریتانیا و عێراق و چەند دەرەبەگێکی خائینی کورد دەوری گیراوە، هێرشیان کردۆتە سەریان، لەوانەش کە ناویان هاتووە (داود بەگی فەتاح بەگی جاف و حەمەمین بەگی کەریم بەگ ) بوونە دوای ئەوەی لە دەربەندی بازیان لە ڕۆژی ١٩١٩/٦/٩ شێخ بریندار کراوە، بەو هۆیەوە بەدیل گیراوە و لە ڕۆژی ٢٥ی تەمووزی ١٩١٩ دا شێخ لە دادگای عورفی کە هەموو ئەندامەکانی ئینگلیز بوون بڕیاری خنکاندنی بۆ دەرکراوە، بەڵام دواتر بڕیارەکە گۆڕدراوە بە زیندانی هەمیشەیی و ڕەوانەی هندستان کراوە. ("ڕۆژی نوێ"، ژ(٧) ڕەزبەر – تشرینی یەکەم، ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل ٦٠ ).

لەبەر گرینگیی ماوەی شۆڕشی شێخ مەحموود،"ڕۆژی نوێ" هەر لە هەمان ژمارەدا وتارێکی دیکەی بۆ باسکردنی شۆڕشەکە تەرخان کردووە، لەوانە دەربارەی داخوازییەکانی کورد، لەبەر ئەوەی لەو کاتەی شێخ مەحموود لە (پیران) بووە، ڕووداوەکەی سەرای سلێمانی دەبیستێ بۆیە نامەیەک بۆ مەندووبی سامی لە بەغدا دەنێرێت، داخوازییەکانی کوردی تێدا نووسیوە لەوانە: " دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە زاخۆ تا پشتی خانەقین، نەمانی هیچ عەرەبێک نەعەسکەری نەمەدەنی لەم ناوچەیە، ئەم ناوچەیەی کوردستان لە ژێر چاودێری بەریتانیا دابێت، ئازادکردنی زیندانە سیاسییەکانی شۆڕشی بەردەرکی سەرا، هەر ئەفسەرو فەرمانبەرێکی کورد لەوڵاتی عەرەبستانەوە بنێردرێتەوە بۆ کوردستان" بەڵام وادیارە هەوڵەکانی کورد بێ هوودە بووە. ("ڕۆژی نوێ"، ژ (٧) ڕەزبەر _ تشرینی یەکەم، ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل ٦٠).

لەلایەکی دیکەوە هەر لە درێژەی باسکردنەکانی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی باشووری کوردستاندا " ڕۆژی نوێ" وەک ئامانج و ئەرکی بنەڕەتی لە نووسینی مێژووی کورد و ڕاستکردنەوەی هەڵە مێژووییەکانی نووسینی مێژووی کورددا، هەوڵیداوە ڕاستیی مێژووی

ڕاپەڕینی ڕۆژی شەشی ئەیلوولی ١٩٣٠ بەدەربخات و باس لەو گۆڕانکارییە مێژووییانە بکا کە بوونەتە هۆکاری دەستپێکردنی ڕاپەڕینێکی نەتەوەیی بەرگری لە بەنەتەوەبوونی ڕاپەڕینی شەشی ئەیلوول بکات، وەڵامی ئەو ناڕاستییە مێژووییانە بداتەوە کە دراونەتە پاڵ ڕاپەڕینی شەشی ئەیلوول، "ڕۆژی نویٚ" زۆر ڕاشکاوانە ڕەخنەی لەو کەسانە گرتووە کە ئەو بزووتنەوە نەتەوەییانەیان بە بزووتنەوەیەکی دەرەبەگایەتی لەقەڵەم داوە، گوایە چەند کەسانێک بۆ قازانجی چینی بورجوازی و دەرەبەگایەتی کردوویانە و مرۆڤی ساکاریان پیٚ هەڵخەڵەتاندووە، بەو کارە چاوی گەلیان بەستووە، " رۆژی نویٚ" پێی وایە هۆکاری شێواندنی ئەو ڕاستییە مێژووییانەش لەبەر ئەوەیە ئەو ڕاپەڕینە لەدژی بەرژەوەندییەکانی حکومەتی ئینگلیز و **عێراقدا** بووە. ("رۆژی نویٚ"، ژ(٧) رەزبەر _ تشرینی یەکەم، ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل٦٠).

ئەو ڕاپەڕینە لە دژی بەستنی پەیماننامەی ١٩٣٠ عێراق و بەریتانیای بووە، بۆ وەرگرتنەوەی مافی نەتەوەی کورد بووە. (شالی، شۆڕشی شەشی ئەیلول، ژ (٦) گەلاوێژ – ئەیلوولی ١٩٦١، ساڵی دووەم،ل١).

لەبەر ئەوەی لە پەیماننامەی ١٩٣٠ بەهیچ جۆرێک ناوی کورد نەهاتووە و بەئاشکرا ئینگلیزەکان کەوتنە دژایەتیکردنی گەلی کورد، بەتایبەت دوای ئەوەی لە پەیماننامەی لۆزان لە ١٤ی تەمموزی ١٩٢٣ لە لۆزان لە سویسرا بەسترا مافی کورد بە تەواوی پێشێل کراوە، هەر بەوەش نەوەستان، بەڵکو ئەمجارە ئینگلیزەکان بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان پەیماننامەی ١٩٣٠ سەپاند، بڕیار درا لە ڕۆژی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق ساز بدرێت، ئەوەبوو لە هەمان ڕۆژدا کۆمەڵێک لە نیشتمانپەروەرانی کورد بۆ داوا کردنی مافی نەتەوەیی کورد لەبەر دەرکی سەرای سلێمانی کۆبوونەوە و داوای مافی نەتەوەیی کوردیان کردووە، بەڵام بەچەک وەڵام دراونەوە، بەم هۆیەوە نزیکەی (٢٥) کەس کوژران و (٣٥) کەسیش

بریندار کران، لەو کەسایەتییانەی کوژراون لە " رۆژی نوێ" ئاماژەیان پێکراوە (حەمە چاوشین، حەمە قالە ئاغا، محەمەد خولە، عەزیزی کورتاندروو، عەولە حەمەد چایچی، عەلی سویجگر، عەزیزی پینەچی)، نزیکەی ٣٠٠ کەسیش دەستگیرکراون و ڕەوانەی بەندیخانەکان کراون. ("رۆژی نوێ "، ژ (٧) رەزبەر _ تشرینی یەکەم، ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل ٥٨. ).

هەر لە هەمان ژمارەشدا دیسان بابەتێکی دیکە دەبیندرێت لە بارەی کۆچی دوایی شێخ مەحموود ئاماژە بەوە دەکات کە لە ١٩٥٦/١٠/٩ لە خەستەخانەی حەیدەرییە لە شاری بەغداد لە تەمەنی (٧٤) ساڵیدا دڵی شێخ مەحموود لەکارکەوتووە، وێنای ڕەوشی کوردستانی نیشان داوە لە ساتە وەختی بڵاوبوونەوەی ئەو هەواڵە لە ئیستگەی بێ تەلی بەغدا، چین و توێژە جیاوازەکانی کوردستان بەگریانەوە بانگیان کردووە (شێخ مرد). ئاماژە بەوە دەکات کە نزیکەی (٥٠٠) ئۆتۆمبیل لە دوای تەرمەکەی بووە، کاتێک تەرمەکەی گەیەندراوەتەوە سلێمانی، ئەمەش نیشانەی پایەو گەورەیی شێخ مەحموود بووە لە نێو ڕۆڵەکانی گەلی کورد. ("رۆژی نوێ "، ژ (٧) رەزبەر - تشرینی یەکەم، ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل ٥٨).

**١-٥- کۆماری کوردستان (مهاباد) :**

یەکێک لەو بابەتە مێژووییە گرینگانەی کە بایەخی پێدراوە، ڕەوشی کۆماری کوردستان بووە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا، لە هەلومەرجی دوای جەنگی دووەمی جیهانی، کە لە ٢٢ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ لە مەیدانی چوارچرا لە شاری مهاباد بە ئامادەبوونی زۆربەی کادیرانی (حیزبی دیموکراتی کوردستان)[١٦] و نوێنەری زۆربەی ناوچە و عەشیرەتە کوردییەکان، هەر لە ماکۆوە تا سەقز و سەردەشت، بە سروودی " ئەی رەقیب"، مەراسیمی ئاهەنگی کۆماری میللی کوردستان دەستپێکردووە، دوای خوێندنەوەی وتارێکی مێژوویی لەلایەن قازی محەمەد (١٩٠٠-١٩٤٧) و خواردنی سوێندی سەرۆکایەتی بە هەڵکردنی ئاڵای کوردستان و دەسەڵاتی کۆماری کوردستان لە

هەرێمی موکریاندا، هەر لە میاندواوەوە تا نزیک سەقز و سەردەشت ڕاگەیاندرا . سەرباری ئەوەش کۆماری کوردستان هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە تووشی کۆمەڵێ گرفتی ئابووری و هەڕەشەی سیاسی و سەربازیی سەخت بووە. ( سەردەشتی، ٢٠٠٣، ل ١٥٢).

لەبەر ئەوەی "ڕۆژی نوێ" ڕووخانی کۆماری بە کارەسات و نەهامەتی بۆ کورد زانیوە پێی وابووە کە سەردەمی کۆمار، ماوەیەکی کەم بووە لە خۆشی ژیانی گەلی کورد لە (١١) مانگ تێپەڕ نەبووە. " ڕۆژی نوێ" لەبارەی ڕووخانی کۆمار و سیاسەتی دوژمنکارانەی کاربەدەستانی ئێران ڕوون دەکاتەوە، کەوا چۆن بەفێڵ و بەڵێنی ناڕاست، توانیویانە هەرەس بەکۆمار بهێنن، لەبەر ئەوەی کاتێک لە ١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ (سەدری قازی ) برای قازی محەمەد نوێنەری پێشووی پەرلەمانی ئێرانی ناوبژیکەری نێوان حکومەتی مهاباد بوو و حکومەتی ئێرانی، لەگەڵ (ژەنرال هەمایونی) دوای ئەوەی ئاگادارکرانەوە کە کوردەکان ئامادەن پێشوازی لە سوپای ئێرانی بکەن، بۆ ئەو مەبەستەش (هێزی بارزانی)[١٧]، ئاگادارکراوەتەوە کە پێویستە لە مهاباد بکشێتەوە و ناوچەکە چۆڵ بکات، بۆ ئەوەی ڕێگا بەهێزی ئێرانی بدرێت بچێتە ناو شارەکە، بەڵام حکومەتی ئێرانی دوو ڕۆژی دوای هاتنی سوپا بۆ ناوچەکە لە ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ قازی محەمەد و ژمارەیەک لە کاربەدەستانی کۆماریان گرت، لە ڕۆژی ٣٠ی کانوونی یەکەمی هەمان ساڵ سەدری قازی کە لە تاران بەند کرابوو گواسترایەوە بۆ مهاباد دوای دادگاییکردن لە ٣١ ی ئازاری ١٩٤٧ لە سێدارەدران، "ڕۆژی نوێ" ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم ڕووداوە و کارەساتەی کە بەسەر شۆڕشی کوردی داهات لە ئەنجامی نیاز پاکیی کوردەکان و سیاسەتی فێڵ و دوژمنکارانەی حکومەتی ئێران بووە . (ڕۆژی نوێ، ژ (٣)، جۆزەردان – حوزەیران،١٩٦١، ساڵی دووەم، ل١٥-١٧).

**٢- خەباتی ئافرەتانی کوردستان:**

یەکێک لەم بابەتە مێژووییانەی کە لە زۆرینەی ژمارەکانی گۆڤارەکەدا بەرچاو دەکەوێت، باسکردنی خەبات و ڕۆڵی ئافرەتانی کوردستانە. "رۆژی نویٚ " داکۆکی لە خەباتی ئافرەتی کورد کردووە، کەبە بەشێکی جیانەکراوەی خەباتی کورد و کوردستان زانیوە بەدرێژایی مێژوو. لە سەرجەم ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینە چەکدارییانەی لە مێژووی کورددا بەرپابوون، ئافرەتانیش کەم تا زۆر بەپێی توانای خۆیان بەشدارییان تێدا کردووە، چەندین نموونەی هێناوە بۆ ناساندنی مێژووی خەباتی ئافرەتی کورد، لە نموونەی ئەو ئافرەتە چاونەترسانەی لە شۆڕشی کوردی ناویان هاتووە "قەدەم خێری فەیلی" (١٨٩٩-١٩٣٣) بووە[١٨].

ئەو ئافرەتە کۆڵنەدەرە بە یەکەمین کەس داندراوە کە شۆڕشی لە دژی ڕەزا شای پەهلەوی (١٩٢٥-١٩٤١) هەڵگیرساندووە، بۆماوەی (٥) ساڵ لە دژی ڕەزا شا جەنگاوە، بۆیە ڕەزا شا دوای ئەوەی نەیتوانیوە بەسەریدا زاڵ بێت ناچار پەنای بردۆتە بەر فێڵ و بەوەی نامەیەکی لێخۆشبوونی بۆ ناردووە کە بڕیاری لێبووردنی بۆ خۆی و لایەنگرانی تێدا نووسیوە و بە سورەتێکی قورئانی پیرۆز نامەکەی دەست پێکردووە تاوەکو زیاتر متمانەی پێبکەن، ئەوەبوو دواجار پلانەکەی سەردەگرێت و خۆیان ڕادەستی حکومەتی ئێران دەکەن بەو هۆیەوە قەدەم خێر و (١٧) لە هاوەڵانی دەستبەسەر دەکات. (کۆیی، خەباتی ئافرەتانی کوردستان، "رۆژی نویٚ"، ژ (٢)، بانەمەڕ- مایسی ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل٧-٨).

لە نموونەی دیکەی خەباتی ئافرەتی کورد لە"رۆژی نویٚ" ناوی هاتبێت کچە نەغەدەیی- لەگەڵ هاوخەباتە شۆڕشگێڕەکانی لە مهاباد و نەغەدە بووە، بەپێی زانیارییەکانی "رۆژی نویٚ" کچەکەی نەغەدە شان بەشانی براکانی شەڕی کردووە تاوەکو ئەو ساتەی کۆماری کوردستان کۆتایی پیٚ هاتووە. (رۆژی نویٚ، ژ (٢)، بانەمەر- مایسی ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل٧-٨).

بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە ناوهێنانی ئەو ئافرەتانە لە"رۆژی نوێ"دا بەتەواوی ساغ نەکراوەتەوە تەنیا ئاماژە بەرۆڵیان کراوە لە شۆڕشە نەتەوەییەکان، بۆیە زانیاریی تەواو پێویست لەبارەی خەباتی ئەو ئافرەتانە نابیندرێت، لە هەمان کاتدا ئاماژەش بە سەرچاوەی ئەو زانیارییانە نەکراوە کە لێوەی وەرگیراون.

هەر لەم بارەیەوە ناوی چەندین ئافرەتی تر هاتووە لەوانەش عیسمەتی کچی قازی محەمەد، ڕەوشەن بەدرخان لە سوریا ، ئایشی بەرزان لە شۆڕشی بارزان. (کۆیی، خەباتی ئافرەتانی کوردستان، رۆژی نوێ، ژ (٢)، بانەمەڕ- مایسی ١٩٦٠، سالی یەکەم، ل٧-٨. ).

لە پاڵ ئەمانەی ناومان بردوون، باس لە بوێری و ئازایەتی "خاتوو شانازی " کچی مەولانە یەعقوبی ئەردەلانی دەکات لە سەردەمی هەڵۆ خاندا[١٩]، لە کاتی شەڕکردن لەگەڵ لەشکری سەفەوی لە سەرەتای شەڕ سوپای ئەردەلانییەکان توانیویانە بەسەر سەفەوییەکاندا سەربکەون لە سنووری میرنشینی ئەردەڵان دووریان بخەنەوە، بەڵام زۆری نەبردووە سەفەوییەکان بەیارمەتی سەرۆکی عەشیرەتی لوڕستان (ئەمیر کل) لە ئەردەڵان ناچار بکشێنەوە بۆ ناوچەی ( ئاریز) کە دەکەوێتە خوار سنە بەو هۆیەشەوە خاکی میرنشینیی ئەردەڵان دەکەوێتە بەر مەترسی، "رۆژی نوێ" ئاماژە بەوە دەکات لەم کاتەدا "خاتوو شاناز" بەجلی پیاوان بەرگری کردووە و کەوتۆتە هاندانی کچانی ئەردەڵانی بۆئەوەی بەشداری بکەن، تا وای لێهاتووە نزیکەی ٥٠٠ کچ بەجلی پیاوان شەڕیان کردووە، لەدەوری خاتوو شاناز کۆبوونەتەوە بۆماوەی (٣) رۆژ بەرگرییان کردووە، لە شەوی چوارەمدا بەهۆی تاریکیی شەو خاتوو شاناز بڕیاری هێرشکردن دەدات بۆ سەر بارەگای سەفەوییەکان لەم شەڕە (کلب علی خان) سەرکردەی گشتی سوپای سەفەوی دەکوژرێت، بەمەش دەتوانێت میرنشینیی ئەردەڵان لە مەترسیی سەفەوییەکان دووربخاتەوە، ئەوەی جێگای تێڕامانە لەسەر زانیارییەکانی "رۆژی نوێ" ئەوەیە کە ئاماژە بە

ڕووداوێکی گرینکی مێژوویی کردووە، بەڵام ساڵ و کاتی ڕووداوەکە دیاری ناکات تەنیا دەنووسێت لە سەردەمی هەڵۆخان بووە، بوونی "٥٠٠" کچ لەم کاتدا لە دەوری خاتوو شاناز جێگای گومانە. نەبوونی سەرچاوەی پێویست بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەو ژمارەیە گومان زیاتر دەکات. (نەسرین سابیر کۆیی، خەباتی ئافرەتانی کوردستان، رۆژی نوێ، ژ (٢)، بانەمەڕ- مایسی ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل٧-٨).

لەلایەکی دیکەوە هەر لە بارەی ڕۆڵ و خەباتی ئافرەتانەوە "رۆژی نوێ" ئاماژەی بە ڕۆڵ و پێگەی حەپسەخانی نەقیب[٢٠] کردووە، لە بارەی ژیان و کەسایەتی حەپسەخانی نەقیب وەک سەرگەورەی ئافرەتانی شاری سلێمانی کە چۆن بۆتە پەناگەی هەر ئافرەتێک کە دووچاری کێشە و تەنگوچەڵەمە بووە، نموونەی حەپسەخانی نەقیب وەک کەسایەتێکی تێکۆشەر لەپێناوی خەباتی نەتەوەیی کەم بووە، بەتایبەت بۆ ئافرەتێک بتوانێت ڕۆڵ بینینی لە ناساندنی کێشەی کورد بە جیهان و لەوانەش ناردنی نامە بۆ کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە لە "ڕۆژی نوێ"دا ئاماژە بە دەقی نامەکە نەکراوە، کە چۆن بووە، داواکارییەکانی حەپسەخان چی بووە تەنیا ئاماژە بەوە کراوە لە ١٩٣٠ کە سکاڵا نامەیەکی،[٢١]. بەرزکردۆتەوە بۆ (کۆمەڵەی گەلان ) [٢٢].

لە پاڵ ئەو خەباتە سیاسییەی حەپسەخان، لە "رۆژی نوێ "دا هاتووە کە حەپسەخان یەکەمین ئافرەت بووە کە کاتێک یەکەمین قوتابخانەی ژنان لە سلێمانی کراوەتەوە وەک قوتابی لەم قوتابخانە خوێندوویەتی، بەڵام بەهۆی کەم و کوڕییەکانی زانیاری ناو "رۆژی نوێ" زانیارییەکی تەواو لەبارەی ئەو قوتابخانەیە و ناوی ئافرەتەکانەوە بەردەست نەبووە، هەر لەم لایەنەوەش ئاماژە بە هاوسۆزیی حەپسەخان کردووە لە یارمەتیدانی بۆ کۆماری کوردستان لە مهاباد لە بەرامبەر ئەو هەڵوێستە نەتەوەییەی حەپسەخان، قازی محەمەد

سوپاسنامەیەکی بۆ ناردووە لەگەڵ چەند وێنەیەک لە ئاڵای کوردستان. ("رۆژی نویێ "، ژ (١)، خاکە لێو، نەورۆز – مارتی ١٩٦١، ساڵی دووەم، ل٤٥).

**٣– کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد:**

لە پاڵ ئەو بابەتە مێژووییانەی کە بایەخی پێدراوە لە "رۆژی نویێ" دا توێژی خوێندکاران بووە کە چینی کاریگەریی شۆڕش و خەباتی نەتەوەیی بوونە، بەتایبەت ئەو کۆمەڵ و ڕێکخراوانەی هەوڵی ناساندنی دۆزی کوردیان داوە، لەوانەش کە ناوی هاتبێت "کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد" لە ئەوروپا بووە، بەتایبەت ئەو کۆنگرە و چالاکییانەی کە ساڵانە لەلایەن کۆمەڵەوە بەستراوە، دەق و بەیاننامەکانی کۆنگرەی بڵاوکردۆتەوە، ئەمەش بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی زانینی کات و شوێن و بارودۆخی کۆمەڵەی خوێندکاران بایەخی هەیە وەک بەڵگەنامەیەکی مێژوویی دەکرێت سوودی لێوەربگیرێت. ("رۆژی نویێ"، ژ (٨) خەزەڵوەر، تشرینی دووەم ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل ١١١).

کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا لەلایەن حەڤدە خوێندکاری کورد کە ئەو کاتە لە ئەوروپا دەیانخوێند، بە هاندان و دەستپێشخەری دکتۆر نورەدین زازا (١٩١٩– ١٩٨٨) لە ١٠ تا ١٦ی ئابی ١٩٥٦ لە شاری ڤیزبادن لە ئەڵمانیای رۆژئاوا کۆبوونەتەوە لە پێناوی دامەزراندنی کۆمەڵەیەک، دوای حەوت رۆژ بڕیاردرا بە دامەزراندنی (کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا) کە وا بڕیاربوو تەنیا لە ڕووی رۆشنبیری و گۆڕینەوەی زانیارییەوە پەیوەندیی نێوان خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا ڕێک بخات و دوور بێت لە سیاسەت و تێکۆشانی سیاسی، کۆمەڵەکە دوای کۆنگرەی سێ ناوی گۆڕا بۆ (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا) و ساڵانە کۆنگرەی خۆی بەستووە تاوەکو ساڵی ١٩٧٥ بە یەکگرتوویی ماوەتەوە بەتێکڕای ساڵانی خزمەتیدا نزیکەی (١٦) کۆنگرەی بەستووە. ( ئەحمەد، ٢٠١١، ل٨).

بەشێک لەو کارو چالاکییانەی کۆنگرەی خوێندکاران لە " رۆژی نوێ " ئاماژەی بۆ کراوە، لەبەر ئەوەی کۆمەڵەی خوێندکاران هاوشانی ئەو بارودۆخەی کە کوردستان لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ پێیدا تێپەڕبووە، هەوڵیداوە نوێنەری خوێندکاران لە ئەورووپاوە ڕەوانەی بەغدا بکات بۆ بەشداریکردنی لە کۆنگرەی قوتابیانی جیهانی، بۆیە لە رۆژی ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٠ نوێنەری کۆمەڵەکە بە سەرۆکایەتی (عیسمەت شەریف وانلی (١٩٢٤- ٢٠١١ ) و کەمال فوئاد (١٩٣٢-٢٠١١) سکرتێری کۆمەڵە لە ئەورووپاوە دەگەنە بەغداو لە رۆژی ٨ی تشرینی یەکەم لە کۆنگرەی قوتابیانی جیهان بەشدار دەبن. ("رۆژی نوێ"، ژ (٨) خەزەڵوەر، تشرینی دووەم،١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل ١١٨).

**٤-"رۆژی نوێ" و وەرگێرانی بابەتە مێژووییەکان :**

"رۆژی نوێ" تەنیا بەوە نەوەستاوە لەبارەی مێژووی نەتەوەی کورد بنووسێت، بەڵکو لە خزمەتکردنی بواری مێژوونووسین بابەتی وەرگێڕانی بابەتە مێژووییەکانی تایبەت بە کورد ڕۆڵ و پێگەی دیاری هەبووە، دەتوانین بڵێین یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی بواری نووسین لە "رۆژی نوێ"دا بریتی بووە لە ڕەخنەگرتن و بەراورد کردنی زانیارییە مێژووییەکانی ئەو بابەتانەی کە لەلایەن نووسەرانی بیانی نووسراون، تایبەت بەکورد دوور و نزیک شیکردنەوەی بابەتی بۆ کردوون، لە وەرگێڕانی بابەتەکاندا هەوڵدراوە زانیارییەکان بخریتە ڕوو و لە هەندێ شوێنیش ئەگەر پێویست بووبێت سەرنج و تێبینی تایبەت بەگۆڤارەکە خراوەتە ناو وەرگێڕانەکان و هەندێ جاریش لە نێوان دوو کەوانەدا زانیاری زیاد کراون یان ڕوونکردنەوەی بۆ کراوە . بەڵگەی ئەمەش لە ژمارە (٤)ی گۆڤارەکەدا لە تەمموزی ١٩٦٠ بابەتی وەرگێڕان بەرچاو دەکەوێت، یەکێک لە وتارەکانی ژنە رۆژنامەنووسی ئەمریکی (تابیپابیتران) کە دەربارەی کورد بە ناونیشانی "کورد هێزێکی بەتوانایە" لە رۆژنامەی ( ناشنال گاردیان)، لە رۆژی ١١ ی نیسانی ١٩٦٠ بڵاوکراوەتەوە، لە وتارەکەدا لەچەند دێڕێکدا ڕووی ژیانی

کوردی دەرخستووە و لە هەمان کاتدا باسی ژیانی سەختی ناوچە کوردنشینەکانی تورکیای کردووە کە بە تورکە شاخاوییەکان ناوبراون. ("رۆژی نویَ"، ژ (٤)، یوشپەڕ – تەموزی ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل٣٣).

هەر لەبارەی مەسەلەی ناوهێنانی کورد بە تورکە شاخاوییەکان لە هەمان رۆژنامەدا هاتووە کە بەڕاشکاوانە دەڵێت "دوای دووساڵ بەسەر شۆڕشەکەی عێراقەوە حکومەتی تورکیا کەوتە بەندکردنی لاوی کورد وە هۆی گرتن و ئەو بەندکردنەی کورد لەبەر ئەوە بووە ئەمانە داوا لەحکومەتی تورک دەکەن کە بە کورد بیانناسن، نەوەک بە تورکی شاخاوی هەروەها داوا دەکرێت رێگا بدرێت بە چاپکردنی گۆڤاری کوردی " . (خەزنەدار،٢٠٠١،ل٢٥).

هەر لەم چوارچێوەیەدا لە بەشی وەرگێڕان "رۆژی نویَ " تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە هەندێ لەم نووسینە مێژووییانەی کە دەربارەی کورد هەن رووی پرشنگداری مێژووی نەتەوەی کوردیان تێکداوە، لەوانە وتارەکەی ( کورد و ولاتەکەیان ) کە بەزمانی ئینگلیزی نووسراوە، لە چەند دەقێکەوە "رۆژی نویَ" ڕەخنەی لە نووسینی ئەو وتارە گرتووە. بۆ نموونە لەو دەقەی کە لە بارەی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیرانەوە لە ساڵی ١٩٢٥ لە تورکیا کە سەری هەڵداوە وەک شۆڕشێکی نەتەوەیی بەلاَم نووسەری (کورد و ولاتەکەی) ئەو شۆڕشە و هەموو شۆڕشەکانی دیکەشی لە تورکیا بەخیانەت لەقەڵەم داوە، دەنووسێت: " لە پاش ئەوەی شێخ سەعید لە تورکیا لە ساڵی ١٩٢٥ هەڵسا بە شۆڕشە چەپەڵەکەی زۆر بەتوندی لە گەلێ لاوە جوولانەوەی شۆڕشەکەیان بەرپا کرد هەڵسووڕێنەرانی لە سێدارەدران بەتەواوی مافی خۆیان پێدرا" بۆیە "، لە شوێنێکی دیکەشەوە لە هەمان نووسراودا ستایش و پێداهەڵگوتن دەکات بۆ هێزی جەندرمەی ئێران و هێزی تورک لەبارەی ئەو توندو تیژییەی لە ناوچە کوردییەکاندا کردوویانە پاساوی بۆ هێناونەتەوە لە پێناوی ئاسایشی ناوچەکەدا بووە، وەک دەنووسێت "ئاشکرایە کە لەیەکگرتنی دوو رووباردا

تەیارێکی بەهێز پەیدا ئەبێت ئینجا وەرە لەیەکگرتنی چوار رووباردا! گێژاوێک پەیدا ئەبێت کە بەهێزترین پاپۆر لوول بدات و نوقمی بکات "، بۆیە "رۆژی نوێ" دەنووسێت لەوە دەچێت نووسەر لە یەکگرتنی چوار کوردستان ترسی هەبووبێت بۆیە هەوڵیداوە ترس و دڵەڕاوکێ دروست بکات، پێی وابوو ئەو وتارە شێواندنی ڕاستیی مێژووی کوردە لە پێناوی مەرامە تایبەتییەکانی خۆی. لە شوێنێکی دیکەدا بۆ شێواندنی زمان و ناسنامەی نەتەوەی کورد نووسیویەتی "زمانی کوردی تێکەڵە لە زمانی فارسی و عەرەبی و تورکی و ......کۆن" . لە هەمان کاتدا بۆ ئەوەی نووسەر بۆ داپۆشینی هەڵەی نووسینەکانی مەبەستی تایبەتی خۆی لە پێناوی ڕێگادان بە چوونە ناوچە کوردییەکان لە هەندێ شوێن پێچەوانەی نووسینەکانی خۆی ستایشی کوردەکان دەکات لەبەرئەوەی نووسەر "کابتن عبدالواحد" ئەفسەرێکی سوپای پاکستانی بووە و ئەو وڵاتە ئەندامی پەیمانی بەغدا [٢٣] بووە، ترسی لەو ناوچە کوردییانە هەبووە، ئاگاداری ڕەوشی ناوچەکە بووە، بۆیە لەبارەی کوردەکانەوە نووسیویەتی" کورد سەربازێکی جەنگاوەری زگماکە، لووت بەرز و خاوەن ئاینێکی پۆڵایە پاک و بێ گەردە میوان بەرێکەرە و ڕووخۆشە، زۆریش شانازی بە باو و باپیر و نەتەوە دەکات". ( عەبەکە، پەڕاوێکی مێژوویی بە نرخ، ژ(٩)، سەرماوەز - کانوونی یەکەم، ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل ٤٢-٤٤ ).

"رۆژی نوێ" بۆ زیاتر ئاشناکردنی خوێنەر بە نووسینی بیانییەکان هەوڵیداوە زانیاری لەبارەی ئەو نووسینانە بخاتە ڕوو کە لەبارەی کورد نووسراون، جێگای مشتومڕیی نووسەران بوون، لەوانەش وتارەکانی مێجەر نوئێل، لە ڕۆژی ١٨ی تەمموزی ١٩١٩ مێجەر نوئێل[٢٤] لە ئەستەمبۆڵ ڕاپۆرتێکی دەربارەی کورد نووسیوە کە زۆر بە ڕاشکاوانە دەڵێت :" بە روونی دەردەکەوێت بۆ مێژوونووسان و ڕۆژهەڵاتناسان کە نەتەوەی کورد نە لە نەتەوەی عەرەبە و نە فارس و نە تورک و نە ئەرمەنە، کورد نەتەوەیەکی ئارییە، ئەوەی تۆسقاڵێک لە مێژوو شارەزابێت ئەزانێ کە وا ئەو کوردانە نەوەی ئەو قارەمانانەن

که بەرەنگاری لەشکری یۆنانی بوونەتەوە و توانای شکاندنی ئەو لەشکرە گەورەیان هەبووە کە ١٠ هەزار شەرکەری یۆنانی بوونە "، بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییە مێژووییەی کە کورد نەتەوەیەکی کۆنە لە ناوچەکە پشت بەستراوە بە نووسینەکانی زەینەفۆن[٢٥]. هەوڵیداوە بوونی کورد بسەلمێنێت و وەڵامی ئەو تورکانە بداتەوە کە کورد بە تورکی شاخاوی ناو دەبەن. لە وتارەکەدا هاتووە کە زەینەفۆن چوار چەرخ پێش حەزرەتی عیسا لە بەگژدا چوونی کورد و سوپای یۆنانی ناوی کوردی هێناوە بە واتا وشەی جیاواز، ئەو کاتەی زەینەفۆن هاتووەتە کوردستان تورک لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەر ناوی نەبووە، ("ڕۆژی نویٚ"، ژ (٥)، خەرمانە_ ئاب،١٩٦١، ساڵی دووەم، ل٤٢). وەرگێڕانی بابەتە مێژووییەکان ئەمەش کارێکی زۆر پێویست و شایەنە گۆڤارێکی کوردی لەو رۆژگارە ئاوڕی لێداوەتەوە.

## پەراوێزەکان :

(١)- لە ماددەی (٣ )ی دەستووری کاتیدا هاتووە دەوڵەتی عێراق پابەندە بە چەسپاندنی برایەتی و عەدالەت لە نێوان هاووڵاتیانی عێراقدا، بە ڕێزگرتنی مافەکانیان و پاراستنی ئازادییەکانیان، هەروەها عەرەب و کورد هاویەکن لە وڵاتدا، ئەم دەستوورەش مافە نەتەوایەتییەکانی کورد دەپارێزێت لە چوارچێوەی یەکێتی عێراق. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە : (حەمدانی،٢٠١٢، ل٩٤).

(٢)- یەکەمین ژمارەی خەبات بە ئاشکرا لە ٤ی نیسانی ١٩٥٩ لە بەغدا بە زمانی کوردی بووە دواتر بە زمانی عەرەبی تا ٢٨ی ئاداری ١٩٦١ (٤٦٢) ژمارەی لێ دەرچووە لە ئەیلوولی ١٩٦١ دووبارە بە نهێنی دەرچووەتەوە. (ساڵح، یەکەمین ژمارەی (خەبات)ی نهێنی لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١، ئەکادیمیای کوردی "گۆڤار"، ژ(٣٤)،٢٠١٥،ل ١٧٦).

(٣)- جەمال شالی : لە ساڵی ١٩٣٢ لە شاری سلێمانی لە دایک بووە، لە ساڵی ١٩٥٦ کۆلێژی یاسای لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە، ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری سلێمانی بووە، لە ساڵی ١٩٦٧ لە لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان پێشمەرگە بووە، تا ناوەڕاستی حەفتاکان لە بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی سلێمانی فەرمانبەر بووە .( حوسێن،٢٠١٢، ل ٤٩٨).

(٤)- کامەران موکری: لە ساڵی ١٩٢٦ لە گەڕەکی دەرگەزێن لە شاری سلێمانی هاتووەتە دونیا ، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە سلێمانی تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٧٢دا بووە جێگری سەرۆکی لقی سلێمانی یەکیەتی نووسەرانی کورد لە ١٩٧٥ کراوەتە مامۆستای کۆلێژی ئادابی زانکۆی سلێمانی، دوای گواستنەوەی زانکۆی سلێمانی بۆ هەولێر هاتووەتە هەولێر تا لە ١٢/٧/ ١٩٨٦ لە تەمەنی ٥٧ ساڵی لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە . ( بابان،٢٠٠٦، ل٦٦٢).

(٥)- لە ساڵی ١٩٢١ لە سلێمانی لە دایک بووە، سکرتێری گۆڤاری شەفەق بووە، ئەندامی دەستەی نووسینی گۆڤاری "ڕۆژی نوێ" و گۆڤاری سلێمانیش بووە، کە لە تەمموزی ١٩٦٨ لە لایەن شارەوانی سلێمانی دەرکراوە، لە ساڵی ١٩٧٤ بۆتە سکرتێری گۆڤاری بەیان لە بەغدا، لە ٢٣ی تەمموزی ١٩٨٠ کۆچی دوایی کردووە. (ساڵح، فەرهەنگی ڕۆژنامەنووسانی کۆچ کردووی کورد، ڕۆژنامەڤانی، "گۆڤار"، ژ(٣) کانوونی یەکەم،٢٠٠٠، ل ٢١٦).

(٦)- لە ساڵی ١٩٣٥ لە هەولێر لە دایک بووە لە ١٩٥٧ خانەی باڵای مامۆستایانی تەواو، کردووە بۆتە مامۆستای زمانی ئینگلیزی لە ئامادەیی سلێمانی، لە ساڵی

١٩٦٧ دکتۆرای لە ئەدەبی کوردی وەرگرتووە، بۆتە سەرۆکی بەشی زمانی کوردی لە زانکۆی بەغدا لە ساڵی ١٩٧٠ دا بووەتە بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری کوردی لە بەغدا، لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ گەڕاوەتەوە کوردستان بەیاریدەدەری سەرۆکی زانکۆی سلێمانی تاوەکو ٦/٢/ ٢٠٠٨ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە . بڕوانە: (حوسێن، ٢٠١٢، ل٥٠٢).

(٧)- کەریم زەندی: ناوی تەواوی محەمەد ساڵحە لە ساڵی ١٩٢٥ لە شاری سلێمانی لە دایک بووە، قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی لە سلێمانی تەواو کردووە، پەیمانگەی مامۆستایانی لە بەغدا خوێندووە، بەهۆی هەڵوێستی نیشتمانپەروەری چەندین جار دوور خراوەتەوە لە سەردەمی کۆماری کوردستان مەهاباد ١٩٤٦ وەکو مامۆستا بەشداری کردووە .( بابان، ٢٠٠٦، ص٦٢٠).

(٨)- دەرسیم : دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا لەنێوان (دیفری، سیواس، ئەرزنجان، ئەلازیێ) لە ساڵانی سییەکانەوە ناوەکەی کرا بە تونجلی : بڕوانە: (کیسێر، ٢٠٠٦، ل١٧).

(٩)- لە دوای کۆدەتای ١٩٠٨ وەرگرتنی دەسەڵات، ئیتحاد و تەرەقی و سیاسەتی بەتورک لە دژی کەمەنەتەوەییەکان دانیشتوانی دەوڵەت وەک عەرەب و کورد و چەرکەس و ئەرمەن، واتا توانەوەی زۆرێک لە توخمە ئەتنیکەکانی ناو دەوڵەت لەنێو توخمی نەتەوەی تورک هەوڵدان بۆ سڕینەوەی کلتوور و زمانیان و ڕاگواستنیان لە ناوچەی خۆیان. (داقووقی،٢٠١٢، ل١٥٤).

(١٠)- ناوی مشرەفدین کوڕی موسڵیحی کوڕی عەبدوڵلای شیرازییە، لە ٦١٥ک لە شیراز لە دایک بووە، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە باوکی وەفاتی کردووە، لە ٦٢٣ک ڕووی کردووتە بەغدا، دواتر دەستی کردووە بە خوێندنی فیقهی شافعی لە قوتابخانەی نازمییە، چەندین شوێن گەڕاوە وەک دیمەشق و قودس و مەکە و باکووری ئەفەریقا، لە ٦١٩ک لە شیراز کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (هنداوي،١٩٥١، ص١٩٦).

(١١)- ئەبو قاسمی کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی تووسی ناسراوە بە فیردەوسی، لە ساڵی ٩٣٥ لە هەرێمی خۆراسان لە دایک بووە، لە بنەماڵەیەکی دەرەبەگ بووە، شانامە لە گرینگترین دانراوەکانی بووە، لە ١٠٢٠ ک. کۆچی دوایی کردووە بڕوانە : (البياتي، ٢٠٠٩، الحوار المتمدين).

(١٢)- له چوار ژمارەی یەک له دوای یەک لەلایەن ئیسماعیل حەقی شاوەیس باس لەو شۆڕشه کراوه که ئەوانیش ژمارەکانی (٣،٤،٥،٦) ساڵی دووەمی دەرکردنی گۆڤارەکه بووه.

(١٣)- کۆمەڵەی تەعالی کورد: (جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی کورد) یەکەمین کۆمەڵەی کوردی سیاسی بوو، له ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٠٨ له ئەستەمبۆڵ دامەزراوه، دیارترین دامەزرێنەرانی ئەمین عالی بەدرخان، شێخ عەبدولقادری نەهری، ئەحمەد زولکەفل، جەنرال شەریف پاشا . ( فەتاح، ٢٠١٢، ل٣٨).

(١٤)- ئەو شۆڕشه له کاتی سەردانیکردنی شێخ سەعیدی پیران بۆ گوندی پیران مانگی شوباتی ١٩٢٥ ڕوویدا، له ئەنجامی پێکدادانی نێوان جەندرمه تورکەکان و کوردەکان که بووه هۆکاری کوشتنی ژمارەیەک سەربازی تورک، له ئەنجامی ئەو ڕووداوه شێخ پەلەی کرد، له ١٤ی شوبات هاوسەنگەرەکانی کۆکردەوه که ١٠ هەزار کەس دەبوون دەستیان گرت بەسەر (گەنجو) . بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانه : ( لازاریف، ٢٠١٢ ، ل٣٥٨).

(١٥)- شەش بەرگه دانسقەکەی یاداشتی رەفیق حیلمی بەسەر یەکەوه نزیکەی (٦٥٠) لاپەڕه، بەناوی (کوردستانی عێراق و حکومەتەکەی شێخ مەحمود) بووه، هەر شەش بەرگەکه له بەغدا چاپ کراون، بەرگی یەکەم هەتا چوارەم له ساڵی ١٩٥٦ چاپ کراوه، بەرگی پێنجەم ١٩٥٧، دوا بەرگی ١٩٥٨ بووه. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانه: ( مەزهەر، ٢٠٠٨، ل ١٧٥). جارێکی دیکەش به دوو بەرگ چاپکراوەتەوه.

(١٦)- حیزبی دیموکراتی کوردستان له ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ له شاری مهاباد لەسەر داروپەردووی کۆمەڵەی (ژ. ک) به بڵاوکراوەیەک دامەزراندنی (حیزبی دیموکراتی کوردستانی) ڕاگەیاند له ٢٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥، به بەشداری ژمارەیەک کەسایەتییه ناسراوەکانی کوردستان و ئەندامانی ڕێبەرانی کۆمەڵەی (ژ.ک) یەکەمین کۆنگرەی خۆی بەست. (سەردەشتی، ٢٠٠٣، ل ١٣٣).

(١٧)- هێزی بارزانی: مەلا مستەفا له مهاباد نزیکەی ١٢٠٠ جەنگاوەر بوون خستیه خزمەتی کۆمارەوه، خۆشی بوو به یەکێک له چوار جەنەڕاڵەکەی هێزی کۆمار. بڕوانه : (کۆچێرا، ٢٠١١، ل ٢٢٥).

(١٨)- قەدەم خێر: له ساڵی ١٨٩٩ له ناوچەی لەکستان له باکووری کرماشان له دایک بووه له هۆزی پیرانه، که سەربه خوڕەمئاوای لوڕستانه له خانەوادەیەکی

دیار بووە، بەیەکەمین ژنی ئەو سەردەم دادەندرێت کە شۆڕشێکی چەکدارانەی هەڵگیرساندووە بۆماوەی چوارساڵ لە ١٩٢٨ کۆتایی بەشەڕەکە هات. (ڕواندزی،٢٠٠٥، ل٥٣).

(١٩)- هەڵۆخان لە دوای تەیمورخانی برای فەرمانڕەوایەتی ئەردەڵانی وەرگرت (١٥٩٠- ١٦١٥ز.) پەیوەندییەکانی لەگەڵ سوڵتان موورادی عوسمانی باش بوو، یەکەمین کاری نۆژەنکردنەوەی قەڵای پڵنگان بوو و گواستنەوەی پایتەخت بۆ ئەو قەڵایە بەهۆی سەختی و قائیمی قەڵاکەوە، دوای بە دیلگرانی لەلایەن سەفەوییەکان، خان ئەحمەدخان لە ١٦١٥ دەسەڵات وەردەگرێت. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە : (ئەردەڵانی، ٢٠٠٢، ل ٥٢).

(٢٠)- حەپسەخان کچی شێخ مەعروفی کوڕی شێخ محەمەد کە ناسراوە بە شێخە بچکۆڵە لە ١٢ی نیسان ١٩٥٣ بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (حەفید ٢٠٠٨، ل ٩).

(٢١)– لە ساڵی ١٩٣٠ لەو کاتەی کە شەڕی بەردەرکی سەرا لە ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ ڕوویدا لە سلێمانی دەستەیەک لە لاوانی کورد ڕاپەڕیون بە گوللەی سوپای حکومەتی عێراق لە سەردەمی وەزارەتەکەی نوری سەعید شەهید بوون، حەپسەخانیش وەک هەڵوێستێکی نەتەوەیی نامەیەکی سیاسی بۆ ڕێکخراوی نەتەوەکان لە شاری جنێف نارد و بەڕاشکاوانە داوای مافی چارەنووسی میللەتی کورد و دامەزراندنی قەوارەی سیاسی کوردستانی کردووە . (گەرمیانی، ٢٠١٣، ل٣٧).

(٢٢)– نەتەوە یەکگرتووەکان: لە دوای کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس لە ١٠ کانوونی دووەمی ١٩٢٠ لە سویسرا دامەزرا، بە هۆی زەرەرو زیانەکانی شەڕی جیهانی یەکەم لە جیهان بەگشتی و ئەوروپا بەتایبەت لەلایەن وردر ویلسون دامەزرا، بارەگای سەرەکییان لە سویسرا بوو، سەرەتا (٢٤) دەوڵەت ئەندام، بەڵام دوای سەربەخۆیی چەند وڵاتێک هاتنە ناو کۆمەڵەی گەلان بەر لە جەنگی دووەمی جیهانی ژمارەیان گەیشتە (٦٣) دەوڵەت. بڕوانە: (ئەحمەد،٢٠١٢، ل٦٣).

(٢٣)- پەیمانی بەغدا: بە هاوپەیمانیەتی (سنتۆ) ناسراوە، لە ساڵی ١٩٥٥ دامەزراوە، بۆ ڕێگرتن لە هاتنە ناوەوەی نفوزی سۆڤیەت بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەریەک لە عێراق و تورکیا و ئێران و پاکستان ئەندامی ئەو هاوپەیمانیە بوون، بارەگای سەرەکییان بەغدا بوو دواتریش وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش هاتە

ناو ئەو هاوپەیمانە. عێراق لەساڵی ١٩٥٩ لەم هاوپەیمانییە هاتە دەرەوە، لە ساڵی ١٩٧٩ بەیەکجاری هەڵوەشایەوە: بڕوانە ( ئەمین، ٢٠١٠،ل ١٥٨).

(٢٤)- ادوارد چارلز ولیم نوئیل: یەکێک بووە لە دەرچووانی ئەکادیمیای سەربازی بەریتانیا، لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لە هند کاری کردووە، لەماوەی جەنگی یەکەمي جیهانییەوە لە ناو هۆزەکانی بەختیاری لە ئێران ژیاوە، بە هۆی ئەوەی لەگەڵ ژمارەیەک لە سەرۆک عەشیرەت و کەسایەتییە کوردەکان تێکەڵ بووە و فێری زمانی کوردی بووە، لە کۆنگرەی قاهیرە لە ئازاری ١٩٢١ بەشدار بووە. (صابر، ٢٠٠٧، ل٤٠).

(٢٥)- زەینەفون : مێژوونووس و فەیلەسووف، زەینەفۆن (گزنفۆن) کوڕی غریلۆس ودیۆدۆرا بووە لە خێزانێکی بەناوبانک و دەوڵەمەند بووە، لە دەوروبەری ساڵی ٤٣١ پ.ز کۆچی لەدایک بووە، لە تەمەنی سی ساڵی کتێبی ئاناباسی نووسیوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: (گزنفۆن، ٢٠١٣، ل٣٦٤).

- **سەرچاوەکان :**
- **گۆڤاری رۆژی نوێ**
- ژ (١)، خاکە لێو - نیسان ١٩٦٠، ساڵی یەکەم، ل٧١ ژ(٢)، بانەمەڕ – مایس ١٩٦٠، ساڵی یەکەم. ژ(٣) جۆزەردان – حوزەیران١٩٦٠، ساڵی یەکەم. ژ(٤)، پووشپەڕ – تەمموزی١٩٦٠ ساڵی یەکەم . ژ(٥)، خەرمانان – ئاب١٩٦٠، ساڵی یەکەم . ژ(٦)، گەلاوێژ- ئەیلولی ١٩٦٠، ساڵی یەکەم . ژ(٧) ساڵی یەکەم تشرینی یەکەم -١٩٦٠، ژ(٨) خەزەڵوەر، تشرینی دووەم ١٩٦٠، ساڵی یەکەم. ژ(٩)، سەرماوەز - کانوونی یەکەم ١٩٦٠، ساڵی یەکەم. ژ(١٠)، بەفرانبار – کانوونی دووەم ١٩٦١، ساڵی یەکەم ژ(١١) ڕێ بەندان- شوبات ١٩٦١ ساڵی یەکەم .ژ(١٢)مارتی ١٩٦٠، ساڵی یەکەم .
- ژ(١)، خاکە لێو، نەورۆز – مارتی ١٩٦١، ساڵی دووەم. ژ(٢)، بانەمەڕ- مایس١٩٦١، ساڵی دووەم. ژ(٣) جۆزەردان – حوزەیران ١٩٦١، ساڵی دووەم. ژ(٤)، پووشپەڕ- تەموزی ١٩٦١، ساڵی دووەم. ژ(٥)، خەرمانان- ئاب ١٩٦١، ساڵی دووەم. ژ(٦)، گەلاوێژ- ئەیلوولی ١٩٦١، ساڵی دووەم.
- **پەرتووک بەزمانی کوردی :**
- ئازاد عوبێد ساڵح، **کاریگەریی شۆڕشی ئەیلول لەسەر رۆژنامەوانیی کوردی ١٩٦١-١٩٧٥**، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر،٢٠٠٧.

- ئەحمەد حەمەد ئەمین، **چەند لاپەڕەیەک له میٚژووی نویٚ و هاوچەرخی عیٚراق،** چاپخانەی ڕۆژهەلاٌت، هەولیٚر،٢٠١٠.
- ئەحمەد گەرمیانی، **گوڵبژیٚریٚک له ناودارانی کورد**، چ١، چاپخانەی چوارچرا، سلیٚمانی، ٢٠١٣.
- ئۆفرا بینگیۆ، **کوردی عیٚراق**، و: سۆران مستەفا کوردی، چاپخانەی ئاراس، هەولیٚر، ٢٠١٣.
- ئیبراهیم داقووقی، **کوردی تورکیا**، و: هیمەت عەزیز کاکەیی، چاپخانەی موکریانی، هەولیٚر،٢٠١٢.
- د. ئەفراسیاو هەورامی، **شۆڕشی شیٚخ سەعیدی پیران و سۆڤیەت له بەڵگەنامەکانی یەکیٚتی سۆڤیەت** ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلیٚمانی،٢٠٠٢.
- ڕەفیق ساڵح ئەحمەد، **بیبلۆگرافیای ڕۆژنامەنووسیی کوردی له شاری سلیٚمانی ١٩٢٠-١٩٩٠**، سلیٚمانی .
- د. کەمال مەزهەر، **میٚژوو**، چ٢، چاپخانەی هیڤی، هەولیٚر، ٢٠٠٨.
- کریس کۆچیٚرا، **کورد له سەدەی نۆزده و بیستەمدا**، و: حەمە کەریم عارف، چاپخانەی ڕۆژهەلاٌت، هەولیٚر،٢٠١١.
- گزنفۆن، **ئاناباس**، و: عەلی فەتحی،چ١، چاپخانەی موکریانی، هەولیٚر، ٢٠١٣.
- جەمال خەزنەدار، **ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی**، بەڕیٚوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری کوردی،١٩٧٣.
- حامد حەمدانی، **چەند لاپەڕەیەک دەربارەی میٚژووی نویٚی عیٚراق له شۆڕشی چواردەی تەمووزەوه بۆ جەنگی دووەمی کەنداو**، چاپخانەی چوارچرا، ٢٠١٢.
- حەسەن ئەرفەع، **کوردەکان**، وەرگیٚرانی بۆ کوردی. چاپخانەی مناره، هەولیٚر، ٢٠٠٧.
- م. ا. حەسرەتیان، **ڕاپەڕینی کوردانی ساڵی ١٩٢٥**، و: جەلال دەباغ، چ٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەرده، هەولیٚر، ٢٠٠٦.
- درەخشان جەلال حەفید، **ژیان و تیٚکۆشانی حەپسەخانی نەقیب**، چ٢، چاپخانەی شڤان، سلیٚمانی ٢٠٠٨.
- دڵشاد مەحمود عەبدولرەحمان، **ئیسماعیل حەقی شاوەیس**، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولیٚر،٢٠٠٤.

- سدیق ساڵح و ڕەفیق ساڵح ، **ڕۆژی نوێ**، ساڵی یەکەم ژ (١-٦) نیسان- ئەیلولی ١٩٦٠، بەرگی یەکەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی،٢٠١٠.
- سامان حوسێن ئەحمەد، **زلهێزەکان لەجەنگی یەکەمی جیهانییەوە تا کۆتایی جەنگی سارد ١٩١٤-١٩٩١**، چ١، چاپخانەی موکریانی، هەولێر،٢٠١٢،
- چارلز تریپ، **چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی عێراق**، و: محەمەد حوسێن ئەحمەد – عەبدولقادر کەڵهوڕ، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٠ .
- عەبدوڵلا زەنگەنە، **بەرهەمە ڕۆژنامەنووسییەکانی شەهید جەبار جەباری**، چاپخانەی هێڤی، هەولێر،٢٠١٠.
- عەقیلە ڕواندزی، **یاد و ئافەرین**، چ١، چاپخانەی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠٥.
- لازاریف و ئەوانی تر ، **مێژووی کوردستان**، و: وشیار عەبدوڵلا سەنگاوی، چ٥، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢ .
- نەوزاد عەلی ئەحمەد، **کوردستان ئۆرگانی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا، مارتی ١٩٥٨-١٩٧٤**، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠١١.
- مارف خەزنەدار، **مێژووی ئەدەبی کوردی**، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠١ .
- مەستوورەی ئەردەڵانی، **مێژووی ئەردەڵان**، و: هەژاری موکریانی، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢.
- ماجید خەلیل فەتاح، **ڕێکخستنە سیاسییەکانی باکووری کوردستان ١٩٦٠-١٩٨٠**، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر،٢٠١٢.
- هیمداد حوسێن، **ڕۆژنامەوانی کوردی، گۆڤاری "ڕۆژی نوێ"**، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر،٢٠١١.
- د. یاسین سەردەشتی، **کوردستانی ئێران لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد (١٩٣٩-١٩٧٩)**، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢.

- **کتێب بەزمانی عەرەبی:**

- جبارجباري، **تاريخ الصحافة الكردية في العراق**، مطبعة الامة، بغداد، ١٩٧٥.
- جمال بابان، **اعلام الكرد العراق**، مطبعة شڤان، سليمانية ،٢٠٠٦.

- شاخوان عبدالله صابر، **رفيق حلمى، دراسة تاريخية في النشاط السياسي والثقافي**، مطبعة شڤان، السليمانية، ٢٠٠٧.
- عبدالفتاح علي بوتاني، **جريدة الحقيقة – راستى أول جريدة كوردية فى مدينة الموصل دراسة و توثيق**، مطبعة خەبات، دهوك،١٩٩٨.
- محمد موسى هنداوي، **سعدي الشيرازي شاعر الانسانية**، القاهرة،١٩٥١.
- **یاداشت و بیرەوەری :**
- جەمال شالی، بەشێ لە بیرەوەری و یاداشتی ژیانم،چ١، سلێمانی،٢٠٠١.
- **وتارو لێکۆڵینەوەکان :**
– ئازاد عوبێد ساڵح، **یەکەمین ژمارەی (خەبات)ی نهێنی لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١،** ئەکادیمیای کوردی "گۆڤار"، ژ(٣٤)،٢٠١٥.
– ............. **فەرهەنگی رۆژنامەنووسانی کۆچکردووی کورد**، رۆژنامەڤانی،"گۆڤار"، هەولێر، ژ(٣)، کانوونی یەکەم،٢٠٠٠.
– دیاری خالید مارف، **رۆژنامەوانی ئازاد لە کوردستانی عێراق، "رۆژنامەنووس"**،"گۆڤار " هەولێر، ژ(٢٢)، پایزی،٢٠١٠.
– **پێگەی ئەلکترۆنی** :
– میسون البياتي – شاهنامە الفردوسي- الحوار المتمدن – ٢-١٠-٢٠٠٩
رۆژی سەردانی ٢٠١٨/١١/١ Www.m.ahewar.org/s.asp?aid=186554&r

## ملخص البحث

## دور مجَلة " روژى نوىٚ " في كيفية تدوين تأريخ الكورد

**ئارەزو يوسف حسن**
قسم التأريخ – كلية الاداب
جامعة صلاح الدين – اربيل

هذا البحث التأريخي يتناول دَور مجَلة "رۆژى نوىٚ" في تدوين تأريخ الكورد والتي صدرت خلال الفترة (١٩٦٠ ـ ١٩٦١)، في جنُوب كوردستان، تَمَ تقييم المجَلهُ ومكانته واِهتمام المجلة بالناحية الثًقافية الكوردية بشِكل عام، وتَاريخ الكُورد بشِكل خاص.

نَظراً لخِصائِص هذه المجلة "رۆژى نوىٚ" حُظيَ َتاريخ الشعب الكوردي في الاهتمام به أكثر مكانه في هذه المجلة. عَن طَريق تَصحيح الاخطاء التاريخية وتًعديل وَجهات النظره الخاطِئة للِتاريًخ، وشعور الناقِد، ومقارنة المجلة بالجرائِد والمجًلات الأُخُرى'.

من خِلال هَذاَ البحث نَتَعرف على المُجلة وتاريخ اصدارِها، والمواضيع المخُصصة باِلثُورات الكوردية وعرَض المواضيع المترجمة للكتُاب الاجانب على الكورد والى' جانبِ دَور المرأة الكوردية في الثًورة الكوردية وجَمعية طلبة الكورد في أوروبا.

## Abstract

## Role "Rozi Nue" magazine in writing the history of the Kurds

**Arazu Yousf hasn**
Universty of Salahadin-Erbil- colleg of Arts

This historical research is dedicated to the role of the magazine "Rozi Nue " in the writing of the history of the Kurds during the period (1960 1961), in the south of Kurdistan, the magazine was evaluated and the status and interest of a magazine in Kurdish cultural life in general, and the Kurds in particular

Due to the characteristics of this magazine, "Rozi Nue ", the history of Kurdish people has received more attention and place in this magazine. By correcting history and modifying their erroneous view of history, criticizing, and comparing magazines with newspapers and magazines.

Through this research we learn about the magazine and the date of issue, the topics devoted to the Kurdish revolutions and the presentation of topics translated foreign writers on the Kurds and the 'side of the Kurdish role in the Kurdish revolution and the Association of Kurdish Learners in Europe.

# ڕاپەڕینی قامشلو ١٢- ١٦ی ئاداری ٢٠٠٤
## (هۆکار و ئەنجامەکان)

**م.ی. هاوکار کەریم حەمە شەریف**
بەشی مێژوو – کۆلێژی ئاداب – زانکۆی
سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی**

شارو شارۆچکە و ناوچە کوردییەکان لە رۆژئاوای کوردستان لە ماوەی نێوان (١٦-١٢)ی ئادار ٢٠٠٤ رووداو و کارەساتی دژوار و گەورەیان بەخۆوە بینی، بەهۆیەوە دەیان کەس گیانیان لەدەستدا و سەدانی تر بریندار و هەزاران بەندکراو، هاوولاتی سڤیلی کورد لە بەندیخانەکان ئاخێنران، هەروەها زیاتر لە (٧٠) قوتابی کورد لە کۆلیجە جیاجیاکانی زانکۆکانی سووریا بەیەکجاری دەرکران، دووکان و شوێنی کارو کاسبی خەڵک لە شارەکانی حەسەکە، سەری کانی (رأس العين) و (بين دبكة) (وغيرها) تالانکران، لە ئە نجامی رووداوی یاریگەی قامشلو کە وەرچەرخا بۆ ڕاپەڕینێکی میللی، بەهۆی دەستتێخستنی شۆفینزمی عەرەب و هاندانی دەسەلات  بە ئامانجی خراپەکاری و تێکدانی پەیوەندییە مێژووییەکان و جیرانەتی باشی نێوان کورد و عەرەب و بۆ شلۆقکردنی ئارامیی ولات ئەویش بە گوتنەوەی هوتاف و دروشمی دژ بە گەلی کورد و سەرکردایەتییە مێژووییەکەی.

گرنگیی ڕاپەڕینی قامشلو سالی ٢٠٠٤ ئەوەیە، یەکەم: نۆبەرەی ئەو شۆڕشانەی پێکهێنا کە بە شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی دەناسرێن، هەرچەندە لە سەردەمێکی ترسناک ڕوویدا، بەلام توانی بەربەستی ترس و تۆقاندن بشکێنێ، نەک هەر لە ناوچە کوردییەکانی سووریا، بەلکو لەناو سووریا بەگشتی و ناوچەکانی جیهانی عەرەبی دەستپێکردبوو بۆ

دانانی بەردی بناغەی جوولاندنی هێزە شۆڕشگێڕەکان لە وڵاتانی ناوچەکەدا.

دووەم: لەبەرئەوەی یەکەمینە لەو جۆرەدا لەو بەشەی کوردستانی لکێندراو بە سووریادا، ڕۆڵی باڵا و بەرزی بینی لە پاڵنان بە دۆزی کورد بەرەو پێشەوە و بڕینی سنووری سووریا و گۆڕانی بۆ مەسەلەیەکی نێودەوڵەتی، جگە لەوەی سەرەتای قۆناغێکی مێژوویی تازەی جوولانەوەی سیاسیی کورد لە سووریا پێکهێنا و، بوو بە خاڵی وەرچەرخانێکی مێژوویی لە خەباتە ئازادیخوازەکەیدا.

ڕاپەڕینێکی میللی و بێ پلان، لە ڕاستیدا تووڕەیی جەماوەر، زوڵم و ستەمی مێژوویی و هەستی تۆڵەسەندنەوە، ڕابەرایەتی دەکرد، دژی هەڵسوکەوتی ڕەگەزپەرستی و پیادەکردنی سیاسەتی خۆسەپێن، هەروەها ڕاگوێزانی ناوەندی بڕیاری کوردی لە سەرکردەکانەوە بۆ جەماوەری شۆڕشگێڕ، ئەم ڕاپەڕینە بەهەزاران پیاو و ژن و جەوانی کورد بەشدارییان تێداکرد، گەنجانی وا ڕاپەڕینیان کرد پەیوەندییان بەجوولانەوەی سیاسی کوردییەوە نەبوو. (نیوز سنتر، المركز السوري للأخبار والدراسات، ٢٠١٢/٣). بەگوێرەی ئەندامێکی (ئەنجومەنی نیشتمانی کورد لە سووریا) "رژێم بەهۆی دامودەزگا هەواڵگرییەکانییەوە، ڕەوشەکەی قۆستەوە و ڕاپەڕینەکەی بەلاڕێدا برد کە گوایە پرۆژەیەکی کوردییە بۆدابەشکردنی سووریا و پارچەکردنی، ئەمەش وایکرد پێکهاتەکانی تر دژی ڕاپەڕینەکە بوەستنەوە و چەک لەدژی هەڵگرن". (عنب سوريا، جريدة، ١٢/اذار/ ٢٠١٧).

لەبەر گرنگیی بابەتەکە لە ڕووی مێژووییەوە، بەباشم زانی توێژینەوەیەک ئامادەبکەم، بەگوێرەی زانیاریم لە ڕووی ئەکادیمییەوە توێژینەوەی لەسەر نەکراوە. ئەم توێژینەوەیە زیاتر پشتی بەستووە بەسەرچاوەی بەڵگەنامەیی ڕەسەن، کە بێگومان بایەخ و زانستییەتی توێژینەوەکە دیاردەخات.

**١- هۆکارەکانی راپەڕین**

**١-١ هۆکارە ناڕاستەوخۆکان:**

نەتەوەی کورد بەدرێژایی مێژوو و بەتایبەتی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی و پارچەپارچەبوونی بۆ سەر چوار دەوڵەت، هەمیشە مافەکانی پێشێل کراوە و بە ئاگر و ئاسن وەڵامی داواکارییەکانی دراوەتەوە مەغدووریەت و جیاکاری رەگەزی توانەوەی نەتەوایەتی دیت لەسەر دەستی تێکڕای رژێمە یەک لەدوا یەکەکان کە دوای سەربەخۆیی لە سووریا هاتنە سەر حوکم، بێبەشکردنی ناوچە کوردییەکان لەڕووی ئابووری و ئاوەدانکاری و بنیاتنانەوە و هەروەها پیادەکردنی جۆرەها پرۆژەی رەگەزپەرستی وەک ئاماری هەڵاوێردراو (الاحصاء الإستثنائي)[1]ساڵی ١٩٦٢ لە پارێزگای حەسەکە، پرۆژەی پشتێنەی عەرەبی بەناو (مشروع محمد طلب هلال).[2]

بەتایبەتی دوای دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات لە ساڵی ١٩٦٣ لەلایەن حیزبی بەعسەوە و پەیڕەوکردنی سیاسەتی عەقلییەتی گشتگیر (العقلية الشمولية) و رەتکردنەوەی دانیان بە نەتەوەی کورد کە دووەم نەتەوەیە لەدوای عەرەب لە وڵاتدا، لە ساڵی ١٩٧٤ لەژێر سایەی رژێمی (حافظ الأسد)دا[3] پرۆژەی (الحزام العربي)[4] چووە واری جێبەجێکردنەوە.

ئەم سیاسەتانە بوونە هۆی دەرهاوێشتەی چەندین قەیرانی گەورە کە تەواوی ژیان و ژیاری کوردی گرتەوە. لەبارەی رووداوەکانی کورد لە سووریا لە راستییدا هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی کێشەیەکی حاشا هەڵنەگری لەبیرکراوی نەتەوەی کورد. (صلاح بدرالدين، ٢٠٠٤، ص٣١) .

**١-٢ هۆکارە راستەوخۆکان :**

سەرکەوتنەکانی کورد و دیموکراتییەت لە باشووری کوردستان، جێگای دڵەڕاوکێ و نیگەرانیی رەوتە شۆفێنییەکانی نێو ئەو ناوەندە حوکمڕانانەی لێکەوتەوە کە پارچەیەکی کوردستانیان داگیرکردووە، رەگەزپەرستەکان تووشی بێ هیوایی ببوون زیاتر

روویان لە بەکارهێنانی هەموو جۆرە ڕێگایەک کردووە بۆ تەگەرە خستنەبەر ڕێڕەوی مێژوو و وەستان دژی ئامانجەکانی بزاڤی ئازادیخوازی ڕەوای نەتەوەی کورد، سەرەڕای هەموو جیاوازییە دژبەیەک و دوژمنایەتییە مێژووییەکانیان ئەوا لە خاڵێکدا یەکیان دەگرتەوە، ئەویش لێدان و لەناوبردنی نەتەوەی کورد و دۆزە ڕەواکەی، بەواتایەکی تر ترس بوو لەوەی نەوەکا فیدڕالییەت لە عێراقدا ببێتە هۆی نموونەیەکی زیندوو بۆ چارەسەری پرسی کورد لە بەشەکانی تریشدا و گۆڕینی عێراق بۆ دەوڵەتێکی دیموکراتی بەرقەرار کە مەترسی بێ بۆ سەر تەختی ڕژێمە گشتگیرە تۆتالیتارییەکان (چتین، www.efrin.Net,2004).

هەموو گوتراوەکان ئاماژە بەوە دەکەن، پێش دەستپێکردنی، یاری تۆپی پێ فیتنەکە، پێشینەی بۆ ئامادەکرابوو تا هەنگاو بەهەنگاو ببێتە ڕاستی لەسەر ئەرزی واقعدا ڕەوشی سیاسی لە ساڵی ٢٠٠٤ دا گونجاو بوو بۆ پەلاماردانی کورد و دەستتێوەردانی ئەمەریکا لە عێراق نەعرەی قەومییە عەرەبەکانی هەڵایساند و هەستی دڵڕەشی بەرامبەر بە کورد بەرزکردنەوە و پشتیوانی (صدام حسین) و حیزبی بەعس، کوردیان بە بەرپرسیار دەزانی لە هاتنی ئەمەریکا.

ئەو یاریگایەی کە تیپێکی شاری دێرەزوور یاری تێدا دەکرد، کە دەکەوێتە سەر سنووری عێراق و پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ حیزبی بەعس هەبوو، دەرفەتێک بوو کە قەرەبوو نەدەکراوە بە نیسبەت قەومییەکانی عەرەب لەپێناو پەلاماردانی کوردان (مامای، ANF News (12/3/2018)

لە بەیانی ڕۆژی ١٢ی ئادار ساڵی ٢٠٠٤ کۆمەڵێک لە عەرەبی ڕەگەزپەرستی شاری دێرەزوور کە ژمارەیان بە دوو هەزار کەس دەخەمڵێندرا بە پەنجا ئۆتۆمبێلی گەورەی نەفەر گواستنەوە هێنرانە قامشلو وەک هاندەرانی تیپی دێرەزووری وەرزشی (الفتوة)[٥] کە یاری تۆپی پێیان هەبوو لەگەڵ یانەی (الجهاد)[٦].

لەبەرچاو و بێ دەنگی لێکردنی هێزەکانی ئاسایشی شارەکە دەستیان کرد بە خۆپیشاندان لە شەقامەکانی (قامشلو)دا و وێنەی سەدام حسێن سەرۆکی پێشووی عێراقیان بەرزکردبۆوە و هوتافیان بە ژیانی ئەو لێدەدا.

جوێنیشیان بە کورد و سەرکردەکانی دەدا و بە خائین و گوێ لە مستی ئەمریکایان وەسف دەکردن (نیوز سنتر، ٢٠١٢/٣/٩)، جەماوەری تیپی "جهاد" دەستیان کرد بە گوتنەوەی ئەو دروشمانەی پشتیوانییان لە مەسعود بارزانی دەکرد (ایلاف،١٣ مارس ٢٠٠٤).

سەرەڕای هەبوونی پۆلیس لە دەرگاکانی یاریگا کۆمەڵێ تێکدەر و گێرەشێوێن (ڕەگەزپەرست) بە دار و بە چەقۆ بەردیان هەڵگرتبوو دەستیان کرد بە دەستدرێژی بۆ سەر جەماوەری کورد و بەردبارانکردنیان و جنێوپێدانیان، پێکدادان دەستی پێکرد وێنە ڤیدیۆیەکانی شەڕەکە کە بە دزییەوە گیرابوون سەلماندیان کە هێزەکانی ئاسایش، کوردیان کردە ئامانج، پشتگیری "جنجویدەکان"[٧] یان کردبوو (نیوز سنتر، ٢٠١٢/٣/٩). میدیای سووری ڕووداوەکەی ورووژاند بەمەبەستی گەورەکردنی فیتنەکە و قووڵکردنەوە ململانێی نێوان هەردوولا. بە پێچەوانەی شێوەی میدیای سووریا کە باس لە ڕووداوەکانی سووری ناکا هەتا میدیاکانی عەرەبی و جیهانی لە باسکردنی بێزار نەبن، ئەم جارەیان میدیای سووری دەستبەرداری عادەتی خۆی بوو، بەرنامەی (ملاعبنا الخضراء) ی وەرزش لە ئێستگەی سووریا هەواڵی ڕاوەستانی یاری نێوان هەردوو تیپی (الجهاد) و (الفتوة)ی بڵاوکردەوە، کە بەهۆی تێکهەڵچوونی جەماوەری هەردوو تیپەکەوە بووە، گوتی "سێ منداڵ لەژێر دەست و پێیان مردوون"، ئەم هەواڵە زۆر کاریگەری هەبوو لە جۆشاندنی شارەکە و خستییە سەر ڕۆخی تەقینەوە.

دوایی دەرکەوت کە هەواڵێکی درۆ و دروستکراو بوو، (نیوز سنتر، ٢٠١٢/٣/٩) دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە بە هەزاران کەس ڕایانکرد

بەرەو یاریگا کە بۆ ئەوەی بزانن چی روویەدا و لە سەلامەتی کەسوکاریان دڵنیا بن، بەڵام پیاوانی پۆلیس و ئاسایش نەیانهێشت بچنە ناو یاریگاکەوە.

حەسەن چاچان کە ئەودەمای لە ریزەکانی تیپی "الجهاد" یاریزان بوو لە وتەیەکیدا بۆ ئاژانسی هەواڵ ANF News دەڵێ: "پێش یاریکردنیان لەگەڵ تیپی (الفتوة)، تووشی رووداوی لەم جۆرە هاتوون و رەوشی باوی ئەو کاتە بەم جۆرە کورت دەکاتەوە: "یارییێکمان لەگەڵ تیپی (أمیة) هەبوو لە شاری (إدلب) لەو یارییەدا دیسان سووکایەتیمان پێکراو، سووکایەتییان بە سیمبولەکانی کورد دەکرد، بەڵام لەدوای کۆتاییهاتنی یارییەکە هێزەکانی ئاسایشی سووریا کەوتنە نێوان و رووداوەکانیان راگرت، بۆ هەر یارییەک چووباین سووکایەتییان پێدەکردین، تا ئارامی رۆژبەرۆژ زیادی دەکرد". (ماماى، المصدر السابق).

حەمە عوسمان کە یەکێکە لە هاندەرانی یانەی (الجهاد) کە چۆتە یاریگا بۆ ئەوەی لە کاتی یاریدا ئامادەبێ دەڵێ: "ئاسایش بە وردی پشکنینی بۆ کردین، بەڵام رێگایان بە تیپی (الفتوة) دا بچنە ناو یاریگەوە بەو بەرد و چەقۆ و خوترانەشەوە کە لەگەڵ خۆیاندا هەڵیانگرتبوون هیچ پشکنینیان بۆ نەکردن و بە ئەستەم لەنێوان هاندەرانی ئێمەدا جێگای خۆیان کردەوە رێبەتیان باش نەبوو" (هەمان سەرچاوە).

ئەو رووداوانەی (حەسەن چاچان) باسی لێوەدەکردن کە رژێمی سووریا دەیویست گەورەیان بکات، هەروەک هەواڵگری و پۆلیسی سووریا دەیانویست بەرێوەچوو. هاندەرانی یانەی (فتوة) کە لە دێرەزوور و حەسەکە و هاپیون بە پشتیوانی کۆمەڵێکی دەمارگیری عەرەبی پەلاماری ئەو خەڵکەیان دا کە لە دەوری یاریگا کۆببوونەوە و بە پۆلیس و هەواڵگری سووریا دەوری گیرابوو، ئەم کارەش وایکرد کە رووداوەکان تەنیا شەڕ نەبن لەنێوان هاندەرەکاندا بەڵکو بوونە پێکدادان لەنێوان کورد و دەوڵەتدا. لەگەڵ بەردەوامبوونی راپەڕین لە تەواوی ناوچەکانی شارەکە، پارێزگاری حەسەکە سەلیم کابول هاتە (قامشلو) لە

بەیانی رۆژی ١٣ی ئاداری فەرمانی بەهێزەکانی ئاسایش کرد کە تەقە لە خەڵک بکەن (هەمان سەرچاوە).

نووسەر و سیاسەتمەداری کورد صلاح بدرالدین دەنووسێ "ڕووداوەکانی (قامشلو) هۆکارەکانی یاری تۆپێن نەبوو، بەڵکو دەسەڵات بۆنەکەی قۆستەوە تا پلانەکانی جێبەجێ بکا. لە هەر بیانوویێک دەگەڕا تا پلانە ڕەگەزپەرستانەکانی جێبەجێ بکا بۆ ئەوەی ئازار بە کورد و واقیعی گەلی کوردی زۆرلێکراو بگەیەنێ، بۆ رزگاربوون و بەدەستهێنانی مافە نەتەوەیی و دیموکراسییەکانی دەڕوانی. (بدرالدین، ٢٠٠٤،٢٠).

لەبارەی رۆڵی هەواڵگری سووریا و ڕێکخستنی پلاندانانی ڕووداوەکان سیاسەتمەداری کوردی (صلاح بدرالدین) لە چوارەم ساڵیادی ڕاپەڕینەکە نووسیویەتی و دەڵێ: "ئەو ڕاپەڕینەی کە لە قامشلویەوە دەستی پێکرد و تەنییەوە تا دیمەشقی پایتەخت سروشتێکی بەرگری و ئاشتیخوازانەی هەبوو وەک جوولانەوەیەکی میللی نارەزایی بە رووێکی کوردی و ناوەرۆکێکی نیشتمانییانەی سووری و بە ئاسۆیەکی گۆڕانکاری دیموکراتییانەوە بەو پێیەی ڕژێمی حوکمڕانی لەسەر ڕێ و شوێنی شۆڤێنییەکانی پێشوو بەڕێوەدەچێ و مامڵەتی لەگەڵ دۆزی کورد و کێشەکانی بەرهەڵستکارە نیشتمانییەکاندا بە ڕێکارە ئەمنییە ناسراوەکەیدا دەکا. حوکمڕانی لە دائیرە نهێنییەکاندا پلانی بۆ جێبەجێکردنی پرۆسەیەک لە قامشلو بەسەرپەرشتی ڕاستەوخۆی (ماهر الأسد)[8] دارشتبوو، بۆ ئەو مەبەستە ژوورێکی عەمەلیاتی تایبەتی لە نزیک ڕووداوەکەوە لە قامشلودا دامەزراندبوو بە بەشداری کۆنە جەنڕاڵەکانی هەواڵگری سوریا (منصورة[9]، المسؤول عن الملف الكردي وبختيار[10] والمملوك[11]) وەک دەڵێن بۆ ئەوەی دوو چۆلەکان بە بەردێکی بئەنگێوی. غافڵگیرکردنی جوولانەوەی نەتەوەیی دیموکراتییانەی کوردی و جەماوەرە ئاشتیخوازەکەی، ئەویش بە لێدانی تۆقێنەری توندی تاقیکاری وەک نامەیەکی گەف و ترساندن و

بەرپەرچدانەوە و تۆڵەکاری لە عێراقی ئازاد بوو لە دەست دیکتاتۆریەت و شادبوونی کوردستان بە فیدرالیەت، هەروەها چاندنی فیتنەی رەگەزپەرستی لەنێوان رۆڵەکانی یەک نیشتماندا و لێدانی کورد و عەرەب لە ناوچەی جەزیرە تا سوورییەکان بەڕووبەڕووبوونەوە ناوچەییە لاوەکییەکانەوە خەریک بن. رژێمی دیکتاتۆری لەسەر حیسابی بەرژەوەندیی هەمووان و دواڕۆژ و ئامانجە هاوبەشەکان بۆ ئەنجامدانی گۆڕان و دەربازبوون لە زۆرداری و پتەوکردنی یەکێتی نیشتمانی و ژیانێکی هاوبەش بە ئاشتی و دڵنیایی (بدرالدين Kurdistan Binxete, 12.3.2008).

**رۆڵی پارێزگاری حەسەکە (سەلیم کابول)[١٢] لە پیلانەکە و پەرەسەندنی ڕووداوەکاندا:**

لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕووداوەکاندا پارێزگاری حەسەکە سەلیم کابول لە هەمان کاتدا سەرۆکی لیژنەی ئاسایش بوو، هەموو لقەکانی هەواڵگری پارێزگاکەی لە خۆ دەگرت، گەیشتە شوێنەک، فەرمانی دا بە گوللەی زیندوو تەقە لە کۆمەڵانی خەڵک بکرێ. دەڵێن ئەو بە دەمانچە تایبەتییەکەی خۆی دەستیکرد بە تەقەکردن لە هاووڵاتیان، لێرەوە قەسابخانەکە دەستی پێکرد زۆر کەس کوژران و بریندار بوون.

ئەو شەوە قامشلو نەخەوت، لە ئەنجامی پەلامار و کەڕوفەڕی نێوان خۆپیشاندەران و پیاوانی ئاسایش و پۆلیس و هەڵمەتی گرتن و راپێچکردنی کوێرانە (نيوز سنتر، ٢٠١٢/٣/٩)، ئامانجیش دوژمنایەتی خستنە نێو کورد و عەرەب بوو. رۆژی دواتر ١٣ ی ئادار زیاتر لە ٢٠٠ هەزار کورد رژانە شەقامەکانی قامشلو بۆ بەڕێخستنی تەرمی چوار شەهیدەکەیان کە بە ئاڵای کوردان داپۆشرابوون، دوای ئەوەی کەسانی دوای تەرمەکان فەرمانی ئاسایشیان شکاند کە داماڵینی ئاڵاکان بوو لە تەرمی قوربانییەکانی، دیسان لە نوێ ئاگربارانیان کردن و قوربانی تازەی لێ کەوتەوە بەم جۆرە کورد تەقییەوە لە شێوەی راپەڕینێکی

جەماوەریی بەتین. پریشکەکەی لە قامشلووەوە دەستی پێکرد و ئاگرەکەی گەیشتە هەموو شارە کوردییەکانی تر لە باکووری سووریا (عامودا، دەرباسییە، مەعبەدە، دێرەک، سەرێ کانی، کوبانی، عەفرین، تا گەیشتە شاری حەلەب و دیمەشقی پایتەخت) کە کۆمەڵانی خەڵکی کوردی لێ بوون (هەمان سەرچاوە).

قوتابیانی کورد بەشێوەیەکی ئاشتییانە لە دەرەوەی حەرەمی زانکۆ و بەردەمی پەرلەمانی سووری خۆپیشاندانیان کرد، داواکاربوون، کاری توندوتیژی دژ بە جەماوەری گەلی کورد رابگیرێ و لێکۆڵینەوەی دادپەروەرانە لە کوشتارگەی قامشلو بکرێ، لە بەرامبەردا هێزەکانی رژێم، ژمارەیەکی زۆری لەو قوتابیانە گرتن، هەروەها فەرمانی دا بەڕێوەبەرایەتی زانکۆ زۆریان بە ناڕەوایی لە زانکۆ بەیەکجاری دەربکرێن و هەندێکیشیان دەرکردنەکەیان کاتی بێ و لە شاری زانکۆیش دەربکرێن، ئەمەش بە فیتی دەزگاکانی ئاسایش بوو، بەگوێرەی بڕیاری وەزاری ژمارە-٢٣٨٥ لە ڕۆژی ٢٠٠٤/٣/١٨دا (نداء إلى إتحاد الطلبة العالمي ٢٠٠٤/٣/٢٨) لە لایەکی تریشەوە قوتابییە کوردەکان لە دیمەشق بڵاوکراوەیان لە شاری زانکۆیی لە مزە و بادر بڵاوکردنەوە، هەندێ لە کوردەکان هەر لە بەیانی زووەوە بەردبارانی ئۆتۆمبێل و ڕێبوارانیان کرد کە بووە هۆی بریندااربوونی دەیان کەس، هەروەها هەندێ کورد کەوتن بەهۆی ئەوەی زۆر لە تابلۆی ریکلامکاری و کابینەی تەلەفۆنییان تێکشکاندن.

لە نێو هێزەکانی پاراستنی رژێم کە بڵاوەیان پێکرابوو، لەژێر ئەوەی هەندێ کە بەتاوانی کاری گێرەشێوێنی و تێکشکاندنی موڵکی گشتی چەندین کەس دەستگیرکران (إيلاف ١٣ اذار ٢٠٠٤).

بازنەی ڕاپەڕینەکە فراوانتر بوو، وڵاتی سووریا لە ڕۆژی دووەمی ڕووداوەکان، قەدەغەکردنی هاتوچۆی لە قامشلو ڕاگەیاند و هێزی سوپا و هەواڵگری لە شارەکانی ئەلرقە و دێرەزوور و پارێزگاکانی ترەوە

وەک هێزی پاڵپشتی کردن هاتبوون پەلاماری خەڵکیان دا کە دەچوون بۆ ڕێوڕەسمی پرسەی قوربانییان (ANF News 12 /3/2018).

لەدوای ماوەیەک لە هەڵایسانی ڕووداوەکان، بەڵگەنامەیەکی ئەمنی گرینگ دزەی کرد، لەلایەن پارێزگاری حەسەکە، سەرۆکی نووسینگەی ڕاپەڕاندن (د. سەلیم کابول) ئیمزا کرابوو، کە ئەمە دەقەکەیەتی: "پاڵپشت بە کۆبوونەوەی لیژنەی ئاسایش کە بەشێوەیەکی کتوپڕ لە ڕۆژی هەینی ئەم مانگەدا بە ئامادەبوونی پارێزگاری حەسەکە و سەرۆکی لقەکانی ئاسایشی پارێزگا بەسترا، بڕیاردرا:

یەکەم/ زۆر بە توندی وەستان بەرامبەر تێکدان لە شارەکانمان لە پارێزگای حەسەکەدا و گوللە بارانکردنی ڕاستەقینەی ئەوانەی پەشێوی دەنێنەوە و هەستی تایەفەگەری دەجووڵێنن و هەموو ئەوانەی کە دەیانەوێ دەست بۆ تێکدانی یەکێتی خاکی سووریا ببەن.

دووەم/ گرتنی ئەوانەی نایەنە ژێرباری یاسا لە تەمەنی دە ساڵییەوە تا شەش ساڵی.

سێیەم/ لقەکانی ئاسایش دەسەڵاتە ئەمنییەکانی خۆی بە گوێرەی یاسای لەناکاوی کارپێکراو (قانون الطوارئ المعمول به) بەڕێوەدەبا (سري للغاية التاريخ ٢٠٠٤/٣/١٢ العدد ٦٩٠/٢ أحداث القامشلي، ٢٠٠٤، ٤).

هەر لە سەرەتاوە سەرکردایەتی حیزبە کوردییەکان، هەڵوێستی هێورکردنەوە و ڕاگرتنی توندوتیژییان گرتەبەر، لە ڕۆژی ٢٠٠٤/٣/١٣ واتا لە ڕۆژی دووەمی دەستپێکردنی ڕاپەڕین سەرکردایەتی جووڵانەوەی نیشتمانی کوردی بە لیژنەی ئاسایشی ڕاسپێردراو لەلایەن دیمەشقەوە گەیشت، دەستبەجێ لەگەڵ هاتندا، باسی ئەو ڕێگا سەرکەوتووانە کران بۆ هێورکردنەوەی ڕەوشەکە لەلایەن هەردوولاوە. هەر لەم چوارچێوەیەدا تێکڕای حیزبە کوردییەکان لە هەمان ڕۆژدا بانگەوازێکیان دەرکرد، داوایان لە ڕۆڵەکانی گەلی کورد کرد کە ڕیز ڕۆیشتن و خۆپیشاندانەکان بوەستێنن و وریا و بە پارێز و دڵفراوان بن. هەروەها سەرکردایەتی بزاڤی کورد بڕیارێکی دەرکرد کە

ئاهەنگەکانی نەورۆزی ئەو ساڵە نەکرێ و بکرێتە ڕۆژی ماتەمینی نەتەوەیی .. (بیان إلى الرأي العام، ٢٠٠٤/٣/٢٣). بەڵام دەسەڵات لەجیاتی هێورکردنەوەی ڕەوشەکە، بەردادانە تۆقێنەرەکانی لە بەرەبەیانی هەموو ڕۆژەکاندا بۆ سەر ماڵی ڕۆڵەکانی گەلی کورد و چاندنی ترس لە ناخی ژن و منداڵاندا و گرتنی پیاو و منداڵان چڕتر کردەوە کە تووشی خراپترین جۆرەکانی ئازاردانی وەحشیگەرانە بوونەوە (المصدر السابق).

تێکڕا حیزبە کوردییەکان لە کۆبوونەوەی ڕۆژی پازدەی ئاداری ٢٠٠٤ دا بە پیرەوە هاتنی جەماوەری کوردیان بەرز نرخاند دەربارەی ڕاگرتنی خۆپیشاندانەکان و پەناگیری، هەرچەندە کەسانی چەکداری حیزبی بەعس بەردەوام بوون لە تاڵان و بڕۆی دووکان و شوێنی بازرگانی هاووڵاتیانی کورد بەتایبەتی لە هەردوو شاری حەسەکە و سەرێکانی. سەرکردایەتی تێکڕای حیزبە کوردییەکان داواکاری لە دەسەڵاتی بەرپرس ئەمە بوو بیانهێنێتە دی:

- ئازادکردنی تێکڕای ئەو گیراوانەی کە بە هۆی ئەم ڕووداوانەوە گیرابوون.
- پێش بەو کردەوە ئیستفزازانە بگیرێن کە هێزەکانی ئاسایش چەک بەدەست ئەنجامیان دەدەن و چەکە دابەشکراوەکانی سەر میلیشیاکان بکێشرێنەوە.
- دوای جێگیربوونی ڕەوشەکە، هێزەکان بکێشرێنەوە و گەمارۆ لەسەر هەندێ ناوچە و گەڕەکە کوردییەکان هەڵبگیرێ بەتایبەتی دەوروبەری (دمر)ی ڕۆژئاوا.
- پێدانەوەی ئاو و کارەبا کە چەند ڕۆژ بوو لێیان بڕابوو لە -وادي المشاريع- دووبارە گەڕانەوەی ئاو و کارەبا کە چەند ڕۆژە بڕاون.
- لێکۆڵینەوەیەکی دادپەروەرانە و گشتگیر بکرێ لە خەتاکار و بەرپرسانی ئەو ڕووداوانە.
- زەرەرمەندانی کرداری تاڵان و بڕۆ قەرەبوو بکرێنەوە.

هەروەها دووپات لەسەر مسۆگەرکردنی بینینی سەرۆکی کۆمار و برایەتی کورد و عەرەب کرایەوە و بانگی هێزە نیشتمانی و دیموکراسییەکانی کرد بە ئەرکی خۆیان هەستن و دەنگی بێزاری و تاوانبارکردن دەربڕن دژی ئەوەی کە بەسەر گەلی کورددا هات، لە کوشتن و سەرکوتکردن و تاوانبارکردنیان بە تاوانی ناڕاست، ئەوەی ڕوویداوە پەیوەندی بە هۆکاری دەرەکییەوە هەیە، هەروەها دژی دەنگە شۆڤینیست و ڕەگەزپەرستەکان کە دژ بە گەلی کورد بوون و نەتەوەیی کورد لە سووریا بەرزدەبنەوە (مجموع الأحزاب الكردية ٢٠٠٤/٣/١٥). سەرکردایەتی تێکڕایی هەر یانزدە حیزبە کوردییەکە نامەیەکیان ڕووبەڕووی سەرۆکی کۆمار (د. بشار الأسد) کرد ڕۆڵی ئەو کۆمەڵانەیان تێدا باس کردبوو کە هاوسۆزی سەدام حوسێن بە ئامانجی بزواندنی دەمارگیری ڕەگەزپەرستی و هەروەها سستی نواندنی دەسەڵاتداران و لایەنەکانی ئاسایش دەربارەی هەموو ئەو کارانەی ڕوویاندا، کە لە نامەکەدا هاتبوو: "بێگومان ئێوە بە گرنگییەوە چاودێری ڕووداوەکان و ئەوەی ڕوودەدەن لە دەستدرێژیکردن بۆ سەر ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە پارێزگای حەسەکە دەکەن، کە پەڕیوەتەوە بۆ شوێنی تری وڵاتیش کە لە سەرەتاوە لەو گێچەڵ پێکردنانەوە دەستی پێکرد، کە جەماوەری یانەی (الفتوة) کردی، کە لە دێرەزوورەوە وێنەی سەرۆکی عێراقی لادراو (صدام حسين)یان هەڵگرتبوو بۆ "قامشلو" و ئەو دروشمانەی دەگوتەوە کە پەیوەندیدار بوو بە هاوکاری لەگەڵ تاقمێکی گەلی عێراق و سووکایەتیکردن بە سیمبولەکانی کوردی عێراق. ئەمەش هەوڵێکی ئاشکرا بوو بۆ گێچەڵ پێکردنی جەماوەری کوردی قامشلو و ڕاگواستنی ئەوەی لە عێراق ڕوودەدا بۆ سووریا، دەسەڵاتداران هەر وا دانەنیشتن لەکاتێ پارێزگار لەجیاتی بە هۆشمەندی هەڵسوکەوت بکەن کەچی فەرمانی تەقەکردنی لە جەماوەر دا کە بووە هۆی کوژرانی زۆرێک لە هاووڵاتیانی کورد و کەشێکی نائارام و پڕ لە نیگەرانی لە قامشلو دروستکرد.

ئێمە بە ئەرکی خۆمانی دەزانین — لە نامەکە درێژەی پێداوە- بەڕێزتان لە هەندێک لەو ڕاستییانە ئاگادار بکەینەوە کە هەستی پێدەکەین لایەنە بەرپرسەکان بە ئانقەست بە لاڕێیدا دەبەن یاخود خۆی لێ بێ ئاگا دەکەن، ڕاگەیاندنی سووری و هی تریش بەمەزەندەی خۆیان وای دادەنێن کە پیلانێک لە دژی بەرقەراریی سووریا و یەکێتی نیشتمانی سووریا لە ئارادایە، ئەمەش وەک هەلێک بۆ شاردنەوەی بەرپرسیاریەتی هەندێ بەرپرسانی ڕاستەوخۆ لە کردەوەی گەورەکردنی ئیشەکە و سەرنەکەوتنی هەندێ بەرپرسی تر لە چارەسەرکردنی ڕەوشەکە. بۆ زانیاریتان لایەنە سیاسییەکانی کورد لە سووریا دەست پێشخەریان کردووە لە پێشکەشکردنی کاری پێویست بۆ دەوردان و تەشەنەنەکردنی ئەو ڕووداوە بە ئازارانە، تاڕادەیەکی زۆر توانیبوویان ڕەوشەکە ئارام بکەنەوە، بەڵام وا بەرەو بانگەشەی ڕەگەزپەرستی پەرە دەسێنێ، هەوڵدەدرێ بکرێتە ململانێی نێوان عەرەب و کورد کە ئەنجامی خراپی لێ چاوەڕوان دەکرێ، دەتواندرێ ئەمە بە شارەکانی حەسەکە و سەرێکانی و تل تمر و هەندێ ناوچەی تر هەستی پێبکرێ کە چەکدارە نافەرمییەکانی بەعس پەلاماری ماڵ و دووکانی هاوڵاتیانی کورد دەدەن بەمەبەستی تاڵان و کوشتن و تۆقاندن. ئێمە لەناو بزاڤی کوردیدا پێویستیمان بە کەس نییە شایەدی بۆ هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانە و بەتەنگەوە هاتن بۆ یەکێتی وڵات و سەربەخۆیی و بەرقەرار بدات، هەردەم هەڵبژاردەی نیشتمانی و دیموکراسییان بووە کە لە چوارچێوەی یەکێتی وڵاتدا دۆزی کورد لە سووریا چارەسەر بکرێ. بۆیە داوا لە بەڕێزتان دەکەین بەرپرسان ئاگادار بکەنەوە واز لە مامەڵەکردنی بە گێچەڵ لەگەڵ جەماوەری کورد بهێنن و بەدوای ڕیشەی حەقیقەتی ئەم قەیرانەدا بگەڕێن و بوار لەبەردەم دانوستان و گفتوگۆی نیشتمانی و بەرپرسانەدا بڕەخسێنن تا حەقیقەتی کوردانی سووریا دیاربێ (سەرچاوەی پێشوو).

**کردارەکانی کوشتن:**

هێزەکانی ئاسایش لە ١٢ی ئادار (٩) خۆپیشاندەریان کوشتن و لە ١٣ی ئادار ٢٤ خۆپیشاندەریان لە قامشلو کوشت و لە ١٦ی ئاداریش ٥ی تریان لە عەفرین کوشتن زۆریش لەژێر ئازار و ئەشکەنجە شەهید کران، لەدوای ئەم مێژووەش کوشتنی سەربازە کوردەکان دەست پێدەکا لەکاتی خزمەتکردنی سەربازییاندا کە لە سەرەتای ساڵی ٢٠١١ ژمارەیان گەیشتە ٤٨ سەربازی کورد، بەگوێرەی بەیانی سەرکردایەتی تێکڕای حیزبە کوردییەکانی سووریا لە ناوەڕاستی مانگی ئادارەوە ژمارەی بریندارەکان گەیشتە ٢ هەزار کەس (بیان بمناسبة نوروز ٢٠٠٤/٣/١٧). لە دیمەشق فەرمان بە هێزەکانی ئاسایش کرا کە هەرچی ئاشکرابوو تیکتی سووری (لا یحمل البطاقة الحمراء) واتا (بیانی) پێ بوو بیگرن تا ئێستا ژمارەی گیراوانی کورد بە زیاتر لە ٢ هەزار دەخەمڵێندرێ (الى الرأي العام ٢٠٠٤/٣/١٨).

لە حەڵەب و عەفرین دەسەڵات بەبێ هۆکار تەقەی لە هاووڵاتیانی بێگوناهـ کرد کاتێ وەستابوون بۆ یادکردنەوەی کیمیابارانی (هەڵەبجە) (تصريح صادر عن إجتماع الأحزاب الكردية ٢٠٠٤/٣/١٩).

وەزیری ناوخۆی سوریا (علی حمود) دانی پیانا کە (٢٥) کەس کوژران و زیانی ماڵیش بە ملیۆنان دۆلار دەخەمڵێندرێ، حیزبە کوردییەکانی سووریاش گوتیان ژمارەی کوژراوانی کورد گەیشتە (٤٠) کوژراو (النهار، جريدة، ١٩ اذار،٢٠٠٤).

پێگەی (الرأي) بڵاوی کردەوە لەکاتی پێکدادانەکاندا بڵێسەی ئاگر لە هەندێ بینا و باڵەخانەی گشتی بەرز دەبووە و عەمبارەکانی گەنم سووتێندراو و تاڵان کراون. هەروەها یاخییەکان هەرسێ نهۆمی باڵەخانەی گومرگیان سووتاندووە و جامی ئەو کامیۆنانەیان شکاندن کە لە وێستگەی ناوەندیدا ڕاوەستابوون وە ئاڵای سووریایان لە بینا حکومەتییەکان داگرتن و ئاڵای کوردیان لەجێ هەڵدان، وێنە هەڵواسراوەکانی سەرۆک (حافظ الأسد) ئاسەواری گوللەیان پێوە دیار بوو.

لە شاری (عامودا) جەماوەری تووڕە رابوون کاتێ دەسەڵات ڕێگایان گرت لە جەماوەر لە بەشداری ڕێوڕەسمی ناشتنی قوربانییان، دەستیان کرد بە تێکشکاندن و سووتاندنی دائیرەکانی ئاسایش و خانوو دەزگاکانی میری، ئۆتۆمبێلەکانی دەزگاکانی ئاسایشی سیاسی و ئاسایشی دەوڵەتی سووتێندران، لەوانە بینایەی شارەوانی، (نفوس)، بەسەربازکردن "التجنید"، بانک، پەیکەرەکانی سەرۆک (حافظ الأسد) لە دەروازەی شار و لەبەردەم شارەوانیدا تێک شکێندران، و سەرۆکی مەخفەر کوژرا و هەندێ هاووڵاتی سڤیل بریندار بوون (قامشلو. کوم) لە شاری دیرەک ئۆتۆمبێلەکانی ئاسایش و ناوەندی رۆشنبیری و دائیرەی ئاو سووتێندران (المصدر نفسه).

پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ لە تواناداا هەیە کەسانی ئامادەکراو (مندسین) تێکەڵ بەو خەڵکە بکرێن و دەست بە سووتاندن و کاری تێکدەرانە بکەن بۆ ئەوە ڕووداوەکان فراوانتر بکەن و پتر دەسەڵات لە دژی کوردان هان بدەن.

**دەنگدانەوەی راپەڕینی قامشلو لە لایەن کورد و سووریا و هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییەوە**

زۆر لە سیاسەتمەدار و ئەکادیمیست و نووسەرانی کورد لەسەر ڕووداوەکانی قامشلویان نووسی و بەڕێگای جۆراوجۆر باسیان لێوە دەکرد، لەم بوارەدا دوو ڕا بەهەند وەردەگرین: (صلاح بدرالدین) پێی دەڵێ (هبە) وای دادەنێ کە وەرچەرخانێک بوو لە مێژووی بزاڤی سیاسی جووڵانەوەی کوردی لە سووریادا، نووسیویەتی دەڵێ: "بۆ یەکەم جار ئەو بەرگریکارییە ئاشتییانە لە دوانزدەی ئادار لە قامیشلویەوە دەستی پێکرد و لە دیمەشق کۆتاییهات، قۆناغێکی تازە بوو لە خەباتی کوردانی سووریا و وەرچەرخانێک بوو لە ژیانی سیاسی و نەتەوایەتی، بۆ زیاتر لە نیو سەدە بەردەوامی هەیە، بێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکی قووڵی هاوشێوەی بەسەردابێ ئەگەر گۆڕانکاری فیکری و سیاسی کۆنفرانسی ئابی ساڵی هەزار و نۆسەد و شەست و

پێنجی لێ بەدەربگرین واتا دوای دەرکەوتنی حیزب بە کەمتر لە دە ساڵ، ئەگەر ئەنجام و دەرهاوێشتەکانی کۆنفرانسی (ئاب) لە چوارچێوەی پێداچوونەوەی کردەیەکی ناوخۆی فیکری و ڕێکخستندا هاتبوو بە ڕەهەندی بەرنامەی سیاسی نەتەوەیی کوردی لەبارەی داواکاری و ئامانجە نزیک و دوورەکانیەوە ئەوا (هبە) کە بە هەموو لێکدانەوەی پەیوەندیداری مێژوویی بە گیان و گەوهەری ناوەڕۆکی سیاسی – جێگری قوتابخانەی (ئاب) ی نەتەوەیی، دیموکراتی ڕێکخراو بە هەموو ڕەهەندە نیشتمانییەکانی سووریاوە وەک دەرهاوێشتە ئەوا بەبێ ئامادەکاری و پلان و بەرنامە هەروەک ئەوەی پێش خۆی بەشێوەیەکی خۆرسکی دەرچووە کە لە هەستێکی پڕ لە داگیرسانی هەستەوەرییەوە هەڵقوڵاوە کە لە نەوەیەک بۆ نەوەیەکی تر هاتۆتە خوارێ، ڕاستەوخۆش لەگەڵ دەوروبەری نیشتمانی فراوانتر لێکی داوەتەوە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنی هاوبەش کە لە ڕژێمی زۆرداریدا ڕەنگی دابۆوە. لێرەوە دەتوانین بڵێین کە (هبە) کەی کورد نموونەکەشی پێشکەشکرد بۆ گەڕانەوەی کرداری پێک بەستنی نەتەوەی کورد بە نیشتمانی سووریاوە و گەشەپێدانی بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری لەو پەڕی باکوورەوە بۆ ناو جەرگەی پایتەخت و بەگشتکردنی شەپۆلێکی ڕووبەڕووبوونەوەی ئازایانە بە شکاندنی دیواری ترس لە دکتاتۆریەت هەر لە چرکەساتەکانی یەکەمی بەرپەرچدانەوەی جەماوەری قامیشلو بۆ ملهوڕیی دەسەڵات و دارودەستە و بت و چەکەکانی بەمەش زللەیەکی بەهێز و بە پڕ ئێش ئاراستەی هەموو ئەوانە کرد کە لە لایەنی کوردییەوە دەیانەوێ جووڵانەوەی کورد لە بەرهەڵستکارانی نیشتمانی دابڕن و ئەوانەش کە لە لایەنی عەرەبییەوە وای بۆ دەچوون کە دۆزی کورد دەرکەوتنی ناوخۆیی و تایبەتە و دابڕاوە لە مەسەلەکانی نیشتمانیی چارەنووسساز (بدرالدین، المصدر السابق)، لەلایەکی ترەوە (صلاح بدرالدین) تۆمەت ئاڕاستەی حیزبە کوردییەکان دەکات بە گوێ پێنەدان ناویان دەبات و

دەڵێ: "دوای ئەوەی حیزب و ڕێکخراوەکان بەرنامە و سەرکردایەتیان، مەبەستەکانیان تەواو بوو، دەستیان بە ڕاکەڕاک بەدوای تەنینەوەی جەماوەری و دەستپێشخەرییەکانی جەماوەر کرد، بەڵکو لەزۆربەی کاتدا بوونە کۆسپ و جێبەجێکاری نەخشەکانی دەسەڵات و هەروەک لە ڕۆژی (هبە) لە قامیشلو ڕوویدا، کە زۆربەیان بوونە نێوانگیر بۆ ئەنجامدانی دامرکاندنەوە، بێ ئەوەی دەسکەوتێکی نەتەوەیی یان داواکارییێکی نیشتمانی دیموکراتی بەدەست بهێنن، لەوانەش قەرەبووکردنەوە و مافە یاساییەکان و گەڕاندنەوەی قوتابیان بۆ کۆلیجەکانیان و فەرمانبەر بۆ سەر کارەکانیان کە ئەمەش کەمترین کارە کە دەبوایە بکرابایە (المصدر نفسه،٢٩).

لەسەر کاریگەریی ڕووداوەکانی قامشلو لەسەر ڕێڕەوی جوولانەوەی کورد لە سووریا صلاح بدرالدین درێژە دەدا و دەڵێ: "زێدەڕۆیی ناکەین گەر ڕووداوەکانی ئەم دواییەی کوردی قۆناغێکی نوێی لە مێژووی بزاڤی نیشتمانیمان بەڕێ خست، چاوەڕوانی لێدەکەن، ڕاستیی نوێ لە هەموو ڕوویێکەوە بەدەرخا و تێگەیشتنی فیکری و سیاسی نوێی لێوە سەرهەڵبدات و بانگەوازێکی پەرەسەندوو گونجاو بێ بۆ خەباتی ئێستا و داهاتوو (بدرالدین، ٥٨،٢٠٠٤).

بەڵام سیاسەتمەدار و ئەکادیمی د. اسماعیل حصاف بە ڕووداوەکانی قامشلو دەڵێ، ڕاپەڕین بووە خاڵی وەرچەرخان لە خەباتی گەلی کورد لە سووریا نووسیویەتی و دەڵێ: "ڕاپەڕینی دوانزدەی ئادار وەرچەرخانی مێژوویی لە بزاڤی کوردی باشووری ڕۆژئاوای کوردستان پێکدەهێنێ، سەرەتای قۆناغێکی نوێیە لە خەباتی نەتەوەیی کورد لەو بەشەدا، کە ئاسەوار و ئەنجامی جێهێشتووە لە ڕووی نەتەوایەتی و نیشتمانی و هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییەوە. مەسەلەی کورد بۆ یەکەم جار لە سووریادا لە ساڵەکانی بەرایی کە لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی هاتن و سووریا وەک دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەسەر نەخشەی سیاسی دەرکەوت بەو بارستاییەوە ببێتە ماددەیەک

بۆ ئاڵوگۆڕی و قسە لەسەرکردن، تا وردە وردە قەبارەی سروشتی و شوێنی خۆی لەسەر ئاستی نیشتمانی و نێودەوڵەتی بگرێ" (حصاف، عفرين. نت).

هەروەها دەڵێ: "ڕووداوەکە هەر لە ساتە وەختەکانی سەرەتاوە ڕۆڵی مێژوویی خۆی بینی وەک گۆڕانێکی نەوعی یان بازدانێک لە پەرەسەندنی دۆزی کوردی لە سووریادا کە نەخشەی سنووری نیشتمانی کێشا تا بگۆڕێ بۆ مەسەلەیەکی نێودەوڵەتی، ڕاپەڕینەکەی قامشلو بۆ ماوەی پەنجا ساڵ مەسەلەی کوردی لە سووریا پاڵ پێوەنا بەرەو پێشەوە" (المصدر نفسه).

لە بابەت ڕۆڵی ئەو ڕاپەڕینە بۆ دەرخستنی خەباتی نەتەوەیی و سیاسی دیسان د. حصاف دەڵێ: ((بەڵام لەلانی کوردەوە، هەرچەندە ئەو ڕاپەڕینە شەقامی کوردی بەشێوەیەکی بەرباد یەکخست، دەرکەوت قەیرانەکە لە بەدەنی جوولانەوەی سیاسی کوردیدا چەندە قووڵە و پێویستە تێپەڕێندرێ بۆ ئەنجامدانی خەباتی نەتەوایەتی و دیموکراتی، ڕاپەڕینی قامشلو جوولانەوەی کوردی لە وڵاتدا خستە بەردەم کاری سەختەوە، کە پێویست دەکا فۆرمی باڵاتری هاوپەیمانی خەباتکاری بۆ بدۆزرێتەوە نا لەگەڵ قۆناغە مێژووییەکەدا بگونجێ و دامەزراوە سیاسی و دەستەی نوێنەرایەتیکردنیان بۆ دابمەزرێندرێ لە لیژنەکانی ڕاگەیاندن، ڕۆشنبیری، سیاسیدا، هەروەها بانگەشەی سیاسی و ڕاگەیاندن یەک بخرێن و داواکاری کوردی و دیدی کورد لە پرۆژە و بەرنامەیەکی یەکگرتوودا بە گوێرەی ستراتیجیەتێکی تازە دیاری بکرێ و پێشکەش بە سەرکردایەتی سووری لە دیمەشق بکرێ، کە کلیلی حەلکردنی مەسەلەی کوردییە لە هەمان کاتدا مەسەلەیەکی نیشتمانیی ناوخۆی پێویستیشە (حصاف،المصدر السابق).

لەلایەنی خۆشیانەوە کۆمەڵی حیزبە کوردییەکانی سووریا بەیانێکیان لە هەمان ڕۆژدا دەرکرد، کە تێیدا هاتووە: "لەنێوان بەدواداچوونە پەیوەندیدارەکانمان بە کوشتارگەکەی قامشلو لە ڕۆژی

هەینی ٢٠٠٤/٣/١٢دا جەماوەری یانەی (الفتوة) لە دێرەزوور بەهەزارانیان بەناوی ئامادەبوون لە یاری لەگەڵ یانەی (الجهاد) دا روویان لە قامشلو کردووە، پلانیان بۆ کاری گێچەڵ پێکردن داناوە لە دژی گەلی کورد لە روانگەی باکگراوندی ئەو پێشهاتانەی کە لە عێراقدا بەردەوامییان هەیە.

لەپێناو ئەمەشدا کە لە شەقامەکانی قامشلودا سووڕابوونەوە، پێش دەستپێکردنی یارییەکە وێنەی سەدام حسێنی میرغەزەبیان بەرزکردبۆوە، ئەو دروشمانەیان بڵند کردبوون کە پەسندی دیکتاتۆری دارماو دەدەن و بەناوی خەباتکارانی فەلووجە هوتافیان دابوو، هەروەها قسەی ناشیرن و ناماقووڵیان بەرامبەر هەندێ لە سیمبولەکانی کوردستان کردبوو... بە بەرچاوی لایەنەکانی ئاسایشەوە کە جەماوەری یانەی (الفتوة) ی نەپشکنیبوو کە هەگبەی بەرد و چەکی سووکیان هەڵگرتبوو لایەنەکانی ئاسایش درەنگ هاتبوونە یاریگا هەرچەندە پێشەکی لەکاری تێکدەرانەی جەماوەری یانەی (الفتوة) ئاگاداربوون پیاوانی ئاسایش بەرپەرچی نەدانەوە کە گێچەڵیان بە جەماوەری یانەی (الجهاد) دەکرد، هەرکە وەڵامی ئەو گێچەڵ پێکردنانەشیان درایەوە پیاوانی ئاسایش رووبەڕووی جەماوەری قامشلوی بێ چەک بوونەوە و بە زەخیرەی زیندوو گوللەبارانیان کردن کە بە دەیان کوشتار و برینداری لێکەوتەوە، بووە هۆی دروستبوونی کوشتارگەیەک، کە نە قامیشلو نە یاریگاکانی تری سووریاش لەم شێوەیان نەبینیبوو. (بيان مجموعة الأحزاب الكردية، ٢٠٠٤/٤/١٢) بەیانەکە بەرپرسیاریەتی تەواوی خستبووە ئەستۆی نیشتمانی کوردی لە سووریا تەواوی بەرپرسیاریەتی دەربارەی ئەو رووداوە ترسناکە دەخەینە ئەستۆی دەسەڵاتەوە، داوادەکەین کە لێکۆڵینەوەی خێراو دادپەروەرانە بکرێ و کۆشکی کۆماری سەرپەرشتی بکا و بەرپرسە راستەوخۆکانی کوشتارگەکە لە بەرپرسیاریەتی دەربکرێن و لەکاتی لێکۆڵینەوە دوور بخرێنەوە تا پاکی و بێگەردی بپارێزرێ و هۆکارەکانی

نا ئارامی لە قامشلو و تێکڕای ناوچە کوردییەکان لابچن، لە هەمان کاتدا بانگهێشتی لیژنەی لێبووردنی نێودەوڵەتی و لیژنەکانی مافی مرۆڤ سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان دەکەین کە بەدواداچوون بۆ ئەم بابەتە بکەن و لێی بکۆڵنەوە. لە کاتێکدا ئێمە زۆر بەتوندی ئەو کوشتارگەیە ریسوا دەکەین داوادەکەین بەرپرسانی بە توندترین سزا بدرێن. داوادەکەین خوێنی قوربانییانی بێ گوناهـ قەرەبوو بکرێنەوە، داواکارین سەرۆک کۆمار بشار الأسد ببینین ئاوێنەی راستەقینەی ئەم رووداوە و باکگراوندەکەی پێ بگەیەنین، هەروەها داوا لە جەماوەری گەلی کوردمان دەکەین دان بەخۆیاندا بگرن و بەشێوەیەکی شارستانییانە نارەزایەتیی خۆیان دەربڕن و دەوری جوولانەوە نیشتمانیەکەی خۆیان بگرن و بیانوو نەدەنە دەست لایەنە دوژمنکارەکان کە غەدر و دوژمنکاریان بۆ گەلی کوردمان لە هەناودایە. (المصدر نفسه).

هەیە وای دادەنێ کە برووسکی شۆڕشی سووریایە کە لە ٢٠١٢ دا هەڵگیرسا، لە راپەڕینی قامشلو ٢٠٠٤ سەرچاوەی گرتووە، وەلە بەیانی حیزبی (الوحدة) دا هاتووە، راپەرینی قامشلو تەنها رووداوی ئاڵۆزی نییە هەروەک راگەیاندنی فەرمی برەوی پێدەدا، دەربڕینی مەیلی جیابوونەوە نییە هەروەک دەسەڵات نیشانی دەدا تاکو تەنیا و دوورەپەرێزی بکا، بەڵکو یەکەم هەست دەربڕینی سووریاییەکانە بۆ داواکاری ئازادی و کەرامەت لەدوای دەیان ساڵ لە دەسەڵاتی بەعسی توندڕۆ کە کۆسپی ترسی لەبەردەم سوورییەکان رووخاند و حاڵی نالەباری کوردەکانی خستەبەر رۆشنایی وەک مەسەلەیەکی نیشتمانی دادپەروەرانە تاکو ڕاپەڕینەکە سەرەتای قۆناغێکی تازە تۆمار بکا کە لاوانی سووریا لە درعا و حمص و دێرەزوور دوای حەوت ساڵان (سروش) ئیلهامی زاتکردن و پاڵنەر و زۆر دروشمی لێ وەرگرن کاتێ دەرچوون بۆ خۆپیشاندان لە شەقامی شارو شارۆچکەکاندا لە سەرەتای شۆڕشەکەیاندا کە دەستپێکردنەکەی رێکەوتی یادی

گوێزانەوەی ڕاپەڕینی کورد بوو بۆ عەفرین و کوبانی و تێکڕای ناوچەکانی)) (بيان حزب الوحدة (يكيتى) (٢٠١٥/٣/١١) لەلایەنی خۆیەوە (المجلس الوطني للحقيقة والعدالة والمصالحة) لە ٢٠٠٤/٣/١٢دا بەیانێکی ڕۆژنامەوانی بەپەلەی دەرکرد، تێیدا هاتووە "بە پێچەوانەی بانگەشەی نێردەی الجزيرة) لە سووریا بەر لە کەمێک: دەزگاکانی ئاسایش و هەواڵگریی سووریا کوشتارگەیەکی گەورە ئەنجام دەدەن کە بیست و دوو کوژراو و ژمارەیەکی زۆری بریندار هەنە، کە بە دەستی لایەنگرانی سەدام حسێن و دەزگاکانی ئاسایش و دەسەڵاتدارانی سووریا ئەنجامدراون شاری قامشلو بەر لە کەمێک پێش ئێستا لە ڕووی تەلەفۆنکارییەوە لە دونیا دابڕێندراوە و تەقەش بەردەوامە (المجلس الوطني للحقيقة والعدالة والمصالحة، ٢٠٠٤/٣/١٢).

(مركز دمشق للدراسات النظرية والحقوق المدنية – السويد) کردارە توندوتیژییەکانی دەرهەق بە هاووڵاتیانی بێ تاوان ڕیسواکرد جەختی کردەوە، ئەوەی لە قامشلو ڕوویدا ئەنجامێکی حەتمییە کە ماوەی چل ساڵە خۆسەپاندنی سیاسی کە خۆی دەبینێتەوە لە حوکمەکانی عورفی و یاسای لە ناکاو و ڕای تاکە کەسی پیادە دەکرێ. ئیستیبداد هۆی شلۆقکردنی پەیوەندیی نیشتمانییە، لەناو سووریا، داوای لیژنەیەکی سەربەخۆی بێلایەنی لە حکومەتی سووریا کرد بۆ چارەسەری ئەو هۆکارە ڕاستەقینانەی لە پشت ئەو کوشتارگەیەوە بوون، هەروەها لابردنی حوکمەکانی عورفی و یاسای لەناکاو و گێڕانەوەی ڕەگەزنامە بۆ تێکڕای ئەو هاووڵاتییانەی لە ڕەگەزنامە بێبەش کراون بە گوێرەی ئاماری ساڵی ١٩٦٢ هەروەها گێڕانەوەی مافی هاووڵاتیبوون و مافی ڕۆشنبیری و زمان بۆ تێکڕای پێکهاتەکانی سووریا (مركز دمشق للدراسات ١٢-٢٠٠٤/٣/١٣).

لە بەیانێکدا بۆ ڕای گشتی کە ئیمزا کراوە لەلایەن لیژنەکانی زیندووکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی، کۆڕبەندی نیشتمانی دیموکراتی، کۆمەڵەی مافی مرۆڤی سووریا، پارتی کاری شیوعی لە سووریا،

لیژنەکانی بەرگری لە ئازادییە دیموکراتییەکان، مافی مرۆڤ لە سووریا، ڕێکخراوی ئاشووری دیموکراتی لە سووریا، هاوپەیمانی دیموکراتی لە سووریا و بەرەی دیموکراتی کوردی سووریا و غەیری ئەوانە داوایان کرد " باری لەناکاو هەڵبگیرێ و حوکمی عورفی نەهێڵدرێ" (بيان الى الرأي العام، قامشلي ٢٠٠٤/٣/٢١) لەلایەنی عەرەبیشەوە ئەمینداری گشتی ئەنجومەنی هاوکاری کەنداو (عبدالرحمان العطية) کە قسەی لەگەڵ (الأسد) و وەزیری دەرەوەی سوریا (فاروق الشرع)دا پێی ڕاگەیاندبوون ئەم کردارانە قبوڵکراو نین لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریادا و گوتوویەتی ئەم کارە لە ئەنجومەنی هاریکاریدا نیگەرانمان دەکا بەناوی ئەنجومەنی ناڕەزایی و ڕیسواکردنی ئەو ڕووداوانەی کرد کە لە قامشلو ڕوویاندا نویشکی قسەکانی گوتی "هەر زیانگەیاندنێک بە ئاسایشی سووریا زەرەرگەیاندنە بە ئاسایشی عەرەبی" (موقع الرأي ٢٠٠٤/٣/١٥).

لە کاتێکدا ڕاگەیاندنی عەرەبی دوور ڕۆیشتبوون و پەنجەی تاوانیان بۆ هەندێ حزبی کوردی ڕاکێشابوو کە لە پشت ڕووداوەکانی قامشلون. ئەو چوارچێوەیەدا ڕۆژنامەی (السفير اللبناني) لە ژمارەی خۆیدا لە ٢٠٠٤/٣/٢٢ ئاماژەیداوە، هەروەها ڕۆژنامەی (الخليج الإماراتي) لە ژمارەی خۆیدا لە ٢٠٠٤/٣/٢٢ دا دەرچووە لەسەر زمانی (محمود صوان) ئەمینداری گشتی گردبوونەوە لە پێناو دیموکراتی و یەکگرتندا نووسیویەتی کە حزبی (الوحدة الديمقراطي الكردي) لە سووریا (یکیتی) لە پشتی ئەو کردەوە تێکدەرانەوە بووە کە لە پارێزگای حەسەکە و شاری قامشلی و حەلەب و دیمەشقدا ڕوویانداوە حیزبی (یەکێتی) پەیوەندی بە دەرەوە هەیە (توضيح حزب الوحدة الديمقراطي). لە ڕەتدانەوەی بۆ ئەم تاوانبارکردنە حزبی ناوبراو ڕوونکردنەوەیەکی بڵاوکردەوە ئاماژەی بەوەکردووە، حیزبە کوردییەکان لەنێو ئەوانیش لەوانە حیزبەکەی ئەوان ڕۆڵیان هەبووە بۆ هێورکردنەوەی جەماوەری تووڕە و خەبەرەکە لە حەقیقەت و

ڕاستییەوە دوورە. (بيان الى الرأي العام ٢٠٠٤/٣/٢١، المصدر السابق) سەرۆکایەتی سووریا گفتوگۆی چڕی عەرەبی بۆ ئاگادارکردنەوە لەگەڵ دەوڵەتە عەرەبییە هاوکارەکاندا ئەنجامدا کە کەناڵی پەیوەندیی چاکیان لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەیە وەک میسرو سعودیە، لەم گفتوگۆیانەدا کە ڕووداوەکانی قامشلو پشکی زۆری ئەو ڕاگۆڕینەوانە بوون بۆ هەوڵدان بۆ جڵەوکردنی هەڵوێست و تێپەڕاندنی هەر ڕووداوێکی کتوپڕ لە داهاتوو، لەو سۆنگەیەوە سەرۆکی میسر حسني مبارک[١٣] سەردانێکی لەناکاوی دیمەشقی کرد لە فڕۆکەخانەی نێو دەوڵەتی دیمەشق چاوی بە سەرۆکی سووریا کەوت .

هەروەها سەردانێکی لە ناکاوی سەرۆک بشار الأسد بۆ ریاض لە (١٦ شازدەی ئادار) ڕاگەیاندرا کە چەند کاتژمێری خایاند لەو سەردانەدا الأسد بە جێنشینی سعودی "الامير عبدالله بن عبدالعزيز"[١٤] گەیشت. سەرچاوەیەکی دبلۆماسی سووریا دانی پێدانا کە ئەوەی بەو دواییانە لە سووریا ڕوویاندابوو لە دیدارەکەدا باس کران. بەگوێرەی گواستنەوەی ئاژانسی فرانس پرێس (لندن، اخبار الشرق، ٢٠٠٤/٣/١٨).

لەلایەنی خۆیەوە قسەکەری فەرمی بەناوی لیژنەکانی بەرگری لە ئازادییە دیموکراتییەکان و مافەکانی مرۆڤ لە سووریادا پارێزەر (أكثم نعيسە) ڕایگەیاند: "چەوساندنەوەی کوردەکانی سووریا لە ڕووداوەکانی قامیشلو مانگی ڕابردووەوە بەردەوامی هەیە، تا ئێستا کرداری گرتن دەرهەق بە سەدان لە – ژن و پیاو – ڕۆژانە لە زۆربەی شوێنەکان هەبوونیان بەردەوامە، ژمارەی گیراوانی کورد نزیکەی لە هەزار کەسی تێپەڕاند، زۆربەیان تووشی ئازاردان و کوشتن هاتن...لیژنەکانی بەرگریکردن لە ئازادییە دیموکراتییەکان و مافی مرۆڤ لە سووریا ناڕەزایی و مەحکومی ئەو کردارە تیرۆرستی و نایاساییانە دەکات کە دژ بە ڕۆڵەکانی گەلی کوردی سووریا، ئەنجام دەدرێ داوا دەکەن دەستبەجێ ئەو کارانە ڕابگیرێت لێکۆڵینەوەیان لێبکرێ بە تایبەتی ئازاردانی وەحشیگەرانە کە بۆتە هۆی مردنی زۆرکەس و سزای بکەرەکانی بدرێن" (پارێزەر أكثم نعيسە ، ١١ نيسان ٢٠٠٤).

هەروەها کۆمەڵی (اخوان المسلمین) ی سووری لە لەندەن بەیانێکیان دەرهێنا داوایانکرد کە لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکانی قامشلو بکرێ. لە بروکسل هەندێ سەرچاوەی پۆلیس ئاشکرایانکرد کە نزیکەی (٦٠) کورد لە پایتەختی بەلجیکا بە هۆی شەڕێکەوە لە حەرەمی سەفارەی سووریا گیراون. کە نزیکەی (١٥ تا ٢٠) خۆپیشاندەر توانیبوویان بچنە ژوورەوە یەکێ لە خۆپیشاندەران بەنزینی بەخۆیدا کردبوو، بەڵام پێرانەگەیشتبوو ئاگر لە جلەکانی بەردا. باڵیۆزی سووریا ئەو کات لە بەلجیکا (توفیق سلوم) گوتی: (١٥-٢٠) خۆپیشاندەر توانییان لە باخچەی سەفارەت بەژوورکەون. ئەنقەرە هێزە چەکدارەکانی تورک مۆڵەتی (اجازە) تێکڕای ئەو سەربازانەیان هەڵوەشاندبووەوە کە لە سنووری تورکیا لەلای خاڵی شاری (نصیبین) کاریان دەکرد، دوابەدوای پێکدادان و باری ئاڵۆزی قامشلو، تۆڕی (دی) تەلەفزیۆنی تورکیا بڵاوی کردەوە کە سەرکردایەتییەکانی هێزە چەکدارەکان تورکیا ڕێنمایی خێرایان دەرکرد بۆ یەکەکانی جێگیر لەناوچەی سنووری تورکیا و سووریا لە دەڤەری (نصیبین) و شارە نزیکەکان، بۆ زێدەکردنی کاری سەربازی (موقع الرأی ٢٠٠٤/٣/١٥) گەیشتنی هێزی سەربازی دەبابەی سووری گوێزراوە بە هۆی قەتارەکانەوە بۆ بڵاوە پێکردنیان لە ناوچە سنوورییەکان لەگەڵ تورکیا بۆ کونترۆڵکردنی ڕەوشەکە. (المصدر نفسە).

لەلایەنی خۆیشیەوە وەزیری دەرەوەی تورکیا عبدالله گول بانگەشەی ئارامی کرد و گوتی "پێویستە هەمووان بزانن کە ئەم ئاڵۆزییانە لە بەرژەوەندیی کەسدا نینە.. نە کورد و نە عەرەب و نە تورکیا" (المصدر نفسە).

لە واشنتۆن ئیدارەی ئەمەریکا ئەو بیرۆکەیەی ڕەتکردەوە کە گوایە بانگەشەکردنی بۆ دەستهەڵگرتن لە داپڵۆسینی کورد لە سووریا ئامانجی هاندان بێ بۆ جیابوونەوە. وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا (ادم بایرلی) لە وەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی ئەم بابەتە لە

کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانیدا گوتی: "ئێمە پشتگیری جیابوونەوە ناکەین ئێمە پشتیوانی بەڕێوەچوونی کاری ئاشتییانەی مافی خەڵک دەکەین لە چوارچێوەی یەکیەتی خاکدا، بیرۆکەی پشتیوانی لێکردنی ئەمەریکا لە جیابوونەوەی کورد تەنیا لە سووریا" (النهار ٢٠٠٤/٣/١٩).

ڕەتکردنەوەی ئەمەریکی دوابەدوای ئەوە هات کە پیاوانی هەواڵگری سووریا دبلۆماتکارێکی ئەمەریکیان گرتبوو کە بەشداری لە پەناگیری هەندێ هێزی بەرهەڵستکاری سووریادا کردبوو لەبەردەم ئەنجومەنی گەلی سووری لە دیمەشق. بیانووی گرتنەکەیان ئەوەبوو کە لە شوێنێکدا گیراوە پەیوەندی بەکاری دیبلۆماتکارییەکەیەوە نییە. ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ بەرپرسیاریەتی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆی ئەمەریکا لە ڕووداوەکانی ئەم دواییەدا (النهار، ٢٠٠٤/٣/٢٠).

هەروەها حکومەتی بەریتانیا پێی وابوو کە "تووڕەیی کورد لە سووریادا کارێکی ڕەوایە پێویستە بگۆڕدرێ بە بەشێک لە خەبات لەپێناو مافەکاندا" (بدرالدین، ٢٠٠٤، ٥٣) پەرلەمانی ئاوروپا بەیانێکی دەرهێنا سەرکۆنەی هەڵوێستی سووریای کرد دەرهەق بە کورد، هەروەها هەریەک لە پەرلەمانی سویسرا و سوید بەیانی لە هەمان شێوەیان دەرکرد (المصدر نفسه).

شارەکانی ئاوروپا و ئەمەریکا و ئوستralیا خۆپیشاندان و ناڕەزایی دەربڕینی بەربڵاویان بەخۆیانەوە بینی لەلایەن جالییەی کوردەوە وەک پشتگیری لە ڕاپەڕینی قامیشلو و ریسوا کردنی تاوانکاری و هەڵسوکەوتی ڕژێمی دیمەشق دژ بە کوردان و هێزە سیاسییەکانی کورد لە بەشەکانی کوردستاندا بەشدارییان کرد هەروەها جەماوەری میللیی بەرفراوان هاوسۆزیی خۆیان ڕاگەیاند لەگەڵ کوردستانی سووریا، بۆ ئەم مەبەستە خۆپیشاندانی بەربڵاو لە شارەکانی هەولێر و سولەیمانی و دیاربەکر و مەهاباد بەڕێوەچوو بۆ پاڵپشتی لەگەڵ قوربانیانی داپلۆسین و خەباتی گەلی کوردستانی سووریا لە پێناو مافە ڕەواکانیدا. (بدرالدین، ٢٠٠٤، ٥٣).

**هەڵوێستی فەرمی حکومەتی سووریا لە ڕووداوەکانی ١٢ی ئاداری ٢٠٠٤ دا**

لە قسەکردنیاندا لەسەر ڕووداوەکانی ناوچە کوردییەکان، هەریەک لە عبدالحلیم خدام جێگری سەرۆکی کۆمار و علی حمود وەزیری ناوەخۆ لە لێدوانە ڕۆژنامەوانییەکانیاندا ڕایانگەیاند: "ئەوەی ڕوویدا هەوڵێک بووە بۆ نانەوەی فیتنە بە هەوڵی دەرەکی بۆ بەرپاکردنی فیتنە و نانەوەی پشێوی و شلۆقکردنی ڕەوشی ناوەخۆ. دەسەڵات توانی دەستی پێڕابگاو یاسا بەسەر هەموو ئەوانەدا پیادە دەکرێ کە ئەم کارانەیان کردووە، وەزیری ناوخۆی سووریا علی حاج حمود گەیشتە ناوچەکە (موقع الرأی ٢٠٠٤/٣/١٥) ڕەتی کردەوە "کێشەی کوردی لە سووریادا" پێش ئەو ماوەیە هەبووبێ و گرفتێکی وانییە ببێتە هۆی خۆ بەخاوەنکردنی دەرەکی چ وڵاتە یەکگرتووەکانبن یان ئەوانی تر (النهار، ٢٠٠٤/٣/١٩).

سەدام گوتبووی کورد کەمینەیەکی زۆر لێکراو نین و ڕەگەزنامەش لە کەس وەرنەگیراوەتەوە و کوردە بیانییەکانیش لە عێراق و تورکیاوە هاتوون لەدەست ستەمکاری. بۆیە هێزەکانی ئاسایش ناچاربوون تەقە بکەن دوای ئەوەی هەندێ لە ئاژاوەچییەکان چەکیان بەکارهێنابوو (تصریح صادر عن اجتماع الأحزاب الكردية ٢٠٠٤/٣/١٢) لە لانی خۆیەوە سەرۆک وەزیرانی سووریای ئەوسا (محمد ناجی عطری) ڕایگەیاند ئاڵۆزییەکانی ئەو دواییەی باکووری ڕۆژهەڵاتی وڵات پێشتر هەبووە لە پێش یاری نێوان هەردوو یانەی "الجهاد" و "الفتوة" دەستی پێکردووە. هەروەها گوتی گرفتی کوردەکان درێژخایەنە و دەگەڕێتەوە بۆ ئاماری گشتی ساڵی ١٩٦٢ (اخبار الشرق، المصدر السابق).

لەلانی خۆیەوە وەزیری غەوارەکان (بثینة شعبان) گوتی کورد لە سووریادا بوونیان نییە، ڕەتی کردەوە هیچ گرفتێک لە قامیشلی یان شوێنێکی دیکە ڕوویاندابێ. (بدرالدین، ٢٠٠٤،٦٢).

ئەم بۆچوونانە بەپێداگرییەوە حکومەتی سووریا جەختی لێی دەکاتەوە کە جوولانەوەی نەتەوایەتی کورد پاکتاو بکاو ئینکاری لە هەبوونی کورد لە سووریادا بکا. وای لە پارتە کوردییەکان کرد یەکریزبن داوای کێشانەوەی هێزەکانی سوپا و ئاسایش لە شارەکانی هەردوو پارێزگای حەسەکە و حەلەب و کێشانەوەی چەک و میلیشیاکان و ئازادکردنی تێکڕای هاوولاتیانی کورد بکەن، کە بە هۆی ئەم ڕووداوانەوە گیرابوون و پووچەڵکردنەوەی تێکڕای سیاسییەکانی جیاوازیکاری و چەوسانەوەی نەتەوایەتی و پرۆژەکانی ڕەگەزپەرستی کە بەسەر گەلی کورددا سەپێندراون و هەوڵدانی تەواو بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەکی دادپەروەر و دیموکراسییانە بۆ چارەسەرکردنی پرسی کوردی لە سووریادا (المصدر السابق). سەرۆکی دەستگای ئاسایشی دەوڵەت لیوا (هشام بختيار) چاوی بە بەرپرسە کوردەکان کەوت و "جەختی بۆ کردنەوە کە دەستی بیانی و ڕۆژئاوا لە هەوڵدان بۆ فیتنەنانەوە و تێکدانی ئارامیی سووریا" بەناوی (سەرۆک الأسد)ەوە داوای یەکگرتنی کرد، و ڕۆژنامەی (البعث)ی سووری هەندێ کۆمەڵەی تاوانبار کردن کە "دروشمی دژ بە یەکێتی نیشتمانییان داوە و پرکێشییان کردۆتە سەر هەندێ یاریزان و جەماوەر کە یاریگای گۆڕیوە بە گۆڕەپانی شەڕی دژوار و خوێناوی". گوتی "ئاڵۆزییەکان بە گوێرەی پلان ئەنجامدراون و ئامانجی خراپەکاری بووە بۆ سووریا و لەتێکڕای پاڵەپەستۆ زانراوەکان بۆسەر بەشداربووان."

(خالد خضير) جێگری پارێزگاری حەسەکە چەند گرووپێکی سیاسی کوردی تاوانبارکردن کە هانی ئاڵۆزییەکانیان داوە و گوتی ئەو لایەنانەی هاندەری توندوتیژی بوون لقەکانی دەرەکی و ناوەخۆییان هەیە..) (موقع الرأى ٢٠٠٤/٣/١٥).

لە ئێوارەی ٨ی نیسانی ٢٠٠٤دا تەلەفزیۆنی فەرمی سووریا لە هەواڵی ئێوارەدا بلاوی کردەوە کە لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە لە "کردارە تێکدەرانەکان" پێکهاتووە، کە لە قامشلو ڕوویدا، تەلەفزیۆن لەیەکەم

ئاماژەیدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەکانی کە ڕۆژانی شەممە و جومعە لە نێوان ئاسایش و کوردەکان لە شاری قامشلی ڕوویاندابوو گوتی: "هەندێ تێکدەر لە پارێزگای حەسەکەدا بە هەندێ کاری گێرەشێوێن هەستاون دژی بەرقەراریی نیشتمان و هاووڵاتیان و ئاسایشیان، کە ئەمەش سەلمێندراوە کە بەرژەوەندیی نیشتمانییە و ناکرێ بە هیچ بیانوویێک کاری ناڕەواو یاری پێبکرێ، بەدەرفەت زانینی ئەوەی ڕوویدا لەلایەن هەندێ لە گومان لێکراو فیکری هاوردەکراو دەخاتەڕوو، ئەمەش لەو کردارانەن بە پێچەوانەی یاسانە و دەکەونە بەر لێپێچینەوە لیژنەیەک پێکهات بۆ لێتوێژینەوە لە ڕووداوەکە و کاردانەوەکانی". (تاریخ سوریا الحدیث، المصدر السابق، ٣٤).

دیمەشق لە ڕووی ئاسایشەوە مامەڵەتی لەگەڵ ڕووداوەکانی قامشلودا کرد، بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی گەیشتنە بەیروت و گوترا کە لەناو سووریاوە کۆکراونەتەوە باسی لە ڕۆڵی زیاتر لە بەرپرسێکی ئاسایشی سووریا کرد، کە هۆکاری هەڵگیرسانی پێکدادانەکان بووە، ڕۆژی شەممە بەڕێوەبەری ئیدارەی ئاسایشی گشتی لیوا (هشام بختیار) چۆتە قامشلی و حەسەکە بۆ چارەسەری هەڵوێستەکە، دووانی تریش بەدواداچوون بە داواکاری سەرۆک (بشار الأسد)، ئەوانیش براکەی (ماهر الأسد) بۆ سەرپەرشتی کردنی کارەکانی ئاسایش و سیاسی لە هەمان کاتیشدا، کارێکی وەک کاری بختیار لە حەلەب بەسەرۆکی هۆبەی ئاسایشی سیاسی بە (لیوا غازی کنعان)[١٥] سپێردرا. و یاریدەدەرەکەشی (عقید محمد منصورە) لە چوارچێوەی پلانی گێڕانەوەی ئاسایش لەو ناوچەیەدا ڕووی لە قامیشلو کرد.

سەرکردایەتی سووریا ویستی بەهۆی هێزەکانی ئاسایشەوە ڕووبەڕووی یاخیبوونەکە ببێتەوە، نەک لە ڕێگای هۆزو عەشیرەتە لایەنگرەکانی ڕژێمەوە لە ناوچەکانی باکووری دەورەدراو بە کۆمەڵی کوردەکان بۆ خۆ بەدوور گرتن لەوەی کە ئەو ڕووداوانە مۆرکی کێشەی ناوەخۆ وەربگرن و مۆرکی تایەفەگەری و مەزهەبی پێوە

نەهێڵن ئەویش لە ڕێگای داواکردنی سوپا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی یاخیبوون و تێکدان (النهار، ٢٠/ ٣ /٢٠٠٤).

ڕۆژنامەی (الثورة) ی فەرمی سووریا داوای توندی و پێداگری کرد بەرامبەر هەر جوولانەوەیەک کە ببێتە هۆی تێکدانی یەکێتی نیشتمانی کە کۆڵەگەی بنەڕەتییە بۆ زامنکردنی ئاسایشی نیشتمانی و ڕووبەڕووبوونەوەی هەموو ئەو فشارانەی کە سووریا تووشیان دەبێت بە هۆی هەڵوێستەکانی دەرهەق بە مەسەلەکانی ناوچەکە.

لە چوارچێوەی پەیوەندییەکانی سووری – تورکیدا بۆ بەرەنگاربوونەوەی جوولانەوەی کورد بە گوێرەی هەندێ سەرچاوە پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لە نێوان (لیوا غازی کنعان) سەرۆکی لقی سیاسی لە وەزارەتی ناوخۆی سووریا و هاوتا تورکییەکەی ئەنجامدراوە.

لایەنی سووری داوای یارمەتی سوپای تورکیای کردووە تا هاووڵاتییە کوردە بێ چەکەکانی قامیشلو هیچ جۆرە هاوکارییەکی لۆجیستییان لە هاووڵاتییەکانی (نصیبین) پێنەگا کە دەکەوێتە ڕۆخ (قامشلو) لە ناو سنووری تورکیادا. ئاشکرایە پاشکۆی نهێنی سێیەم لە پێکهاتنی (أضنە) بۆ ئاسایش کە لە نێوان سووریا و تورکیادا لە تشرینی یەکەمی ١٩٨٨دا مۆرکراوە ڕێ بە هێزەکانی ئاسایشی تورکیا دەدات بە دوای (تیرۆرستە)کاندا بگەڕێن لە ناو خاکی سووریادا. گەیشتنی وەزیری بەرگری (مستەفا طلاس) و سەرۆکی راستەقینەی گاردی کۆماری (ماهر الأسد) برای سەرۆکی رژێم (بەشار الأسد) بە سواری فرۆکەیەکی سەربازی بۆ فرۆکەخانەی قامیشلو (المجلس الوطني للحقيقة والعدالة والمصالحة ٢٠٠٤/٣/١٤).

لەگەڵ ئاڵۆزبوونی ڕووداوی کوردی و بۆ زاڵبوون بەسەر تەنگژەکەدا سەرۆکی کۆمار (بەشار الأسد) لە دیدارە تەلەفزیۆنیەکەیدا لە یەکی ئایاری ٢٠٠٤دا گوتی کە "نەتەوەی کورد بەشێکی سەرەکییە لە پێکهاتەی سووریادا". لە پاشخانی ڕووداوەکانی قامیشلودا یەکەم

بەڵگەی فەرمییە کە لە کاتی سەربەخۆییەوە لە سەرۆکی دەوڵەتەوە دەردەچێ، شەقامی کوردی دڵنیاکردەوە، وەک تیشکێکی سەوزی ڕێگە پێدان بوو لە ڕووی فەرمییەوە بۆ لایەنە ڕەگەزپەرستە عەرەبەکان بۆ راوەستاندنی فیتنەکە و بەردەوام نەبوون، کە ڕووداوەکانی قامشلو پەیوەندی بەدەرەوە نەبوو، لەڕووی دەستوورییەوە پێویستی بە پیادەکردنی لایەنە باڵا دیاریکراوەکانەوە هەبوو، تا قسە و کردار یەک بخرێن. وەک دووەم نەتەوە لە وڵاتان دان بەنەتەوەی کورددا بندرێت (حصاف، عفرین. نت).

**ئەنجام :**

بۆ یەکەم جار ڕاپەڕینی قامشلو لە سەربەخۆبوونی سووریاوە کە بەشێک لە کوردستانی پێوە لکێندرا، گرفتێکی پشتگوێخراوی خستە بەردەم دیمەشقەوە، هەروەها بەو هۆیەوە قۆناغێکی نوێی لە جوولانەوەی نەتەوەیی کورد لە سووریادا بەرێخست، لەلایەک لە سەرکردایەتییە کوردییەکانی تێپەڕاند لەلایەکی تریشەوە مەسەلەی کورد سنووری نەتەوەیی کوردی بەزاند و چووە نێو هەموو ماڵەکانی سووریاوە کە زۆربەیان تا ئەو کاتە بە حەقیقەتی مەسەلەی نەتەوایەتی کە ناوی کوردیان لە وڵاتدا نەزانیبوو، بەهۆی تاریکی خستنە سەری لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە و کەمتەرخەمی هێزە سیاسییە عەرەبییەکان لەم بارەیەوە، جگە لەوەی بۆ یەکەم جار لە مێژووی نوێدا مەسەلەی کورد بوو بە مەسەلەیەکی هەرێمی و نێودەوڵەتی، ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەگەری و ئێزگەکانی سووریا و دەوڵەتان باسیان لێوە دەکرد، وەک مادەیەکی ئاڵوگۆڕی دیبلۆماسی و نێو دەوڵەتی .

لەلایەکی ترەوە ڕاپەڕینی قامشلو بە نۆبەرەی شۆڕشەکانی ناسراو بە بەهاری عەرەبی هەژمار کرا بەهۆی تێکشکاندنی دیواری ترسی تۆقاندن، هەرچەندە کورد پلانی بۆ دانەڕێشتبوو، بەڵکو بۆتە قوربانی پیلانێکی ئەمنیی داڕێژراو دوابەدوای ڕووخانی سەدام حسین و ڕژێمی بەعسی و گۆڕانکارییەکانی کوردستانی عێراق .

ڕاپەڕینی قامشلو حکومەتی سووریا و دەزگاکانی ئاسایشی سەرسام کرد وای دانەنابوو هەرایسانێکی مێژوویی هەیە بەهۆی سیاسەتە ڕەگەزپەرستانەکەی و هەبوونی وریایی سیاسی تا ئەو ڕادەیە لەلای جەماوەری کورد و توانای سەرکردایەتی کردنی ڕاپەڕین و تێپەڕکاری لە پارتە کوردییەکان .

ڕاپەڕینی قامشلو خەباتی گەلی کوردی لە هەر چوار پارچەکە و هەندەران یەکخست، تەختی ڕژێمەکانی لە دیمەشق و شارەکانی تردا هەژاند، ڕاپەڕیوەکان لە جەزیرە بۆ ماوەی سێ ڕۆژان دەستیان بەسەر هەرسێ دامەزراوەکانی دەوڵەتدا گرت، وای لە ڕژێم کرد ئەگەر بە

تاکتیکی بێ زاراوەی خۆی و مامەڵەکردنی لەگەڵ ڕووداوی کوردیدا بگۆڕێ بە ئامانجی جڵەو گرتنەوەی دەست و گەڕاندنەوەی ئاسایش و بەرقەراری.

لە ئەنجامە ڕاستەوخۆکانی پلانی دەسەڵاتەکانی سووریا چاندنی فیتنە و بە ئامانج گرتنی نەتەوەی کورد، ئەویش بە کوشتنی دەیان و بریندارکردنی سەدان و گرتنی هەزاران کەس و ڕاوەدوونانیان لەلایەن دەستگا هەمەجۆرەکانی ئاسایش و دروستکردنی باری نیگەرانی و ترس کە پاڵی بە زۆر لەوانەوە نا کە بەرەو کوردستانی عێراق کۆچ بکەن .

لە دوماهیدا، ڕاپەڕینی قامشلو سەرکردایەتییەکانی کورد و حکومەتی سووریای خستنە بەردەم بەرپرسیاریەتی مێژووییەوە.

## پەراوێز

١- **الإحصاء الإستثنائي:** سەرژمێرییەك بوو لە پارێزگای جەزیرە لە ٥ تشرینی دووەمی ١٩٦٢ لەلایەن حکومەتی سووریا ئەنجامدرا، ئامانج لێی بەعەرەبکردن و کەمکردنەوەی ڕێژەی دانیشتوانی کورد بوو لەوە زیاتریش بەو هۆیەوە زیاتر لە ١٥٠ هەزار کەس ناسنامەیان لێ سەندرایەوە، بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە: . د. إسماعيل محمد حصاف، سياسة الحكومات السورية تجاه المسألة الكردية في سوريا ١٩٥٨ – ١٩٧٥ (في ضوء تطور الأحداث في جنوب كوردستان)، مجلة الأكاديمية الكوردية، العدد ٢٥، ٢٠١٣، ص ٤٥٠ وما بعدها.

٢- **محمد طلب هلال:** لە بنەماڵەی مقدادییەکانە لە ناوچەی غصب لە پارێزگای درعا لە ساڵی ١٩٣١ لە دایك بووە، ماوەیەك مامۆستای سەرەتایی بووە لە جەزیرە و عین هلال دواتر کراوەتە سەرۆکی هۆبەی ئاسایشی سیاسی لە حەسەکە لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیست، لە ساڵی ١٩٦٥ بووە بە پارێزگاری حەسەکە، کەسێکی شۆفینیزم بووە کاری زۆر کردووە لەسەر بە عەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان و تواندنەوەی نەتەوەی کورد لە بۆتەی بە عەرەبکردن، لە ڕێکەوتی ٢٠١١/٢/٩ کۆچی دوایی کردووە. بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە: إسماعيل محمد حصاف، تاريخ كردستان سوريا، الجزء الثالث، من إصدارات: معهد كردستان وآسيا الصغرى للدراسات الإستراتيجية روسيا الفيدرالية – موسكو – فرع كردستان – أربيل مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل، ٢٠١٧، ص٣٢- ٣٣.

٣- **حافظ الأسد:** ناوبراو ساڵی ١٩٣٠ لە قرداحە لەدایك بووە، لە ١٦ تشرینی دووەمی ١٩٧٠ کودەتایەکی سەربازی ئەنجامداوە و بووەتە سەرۆك کۆماری سووریا، لە سەردەمی خۆیدا پشتێنەی عەرەبی چووە واری جێبەجێکردنەوە کە بە هۆیەوە هەزاران خێزانی عەرەبی لە پارێزگای رقە و حەلەب هێنرابوون بەزۆرەملێ نیشتەجێکران لە ناوچەکانی سنووری نێوان عێراق و تورکیا. بە مەبەستی نەهێشتنی پەیوەندی لەنێوان کوردەکان لە هەرسێ پارچەی کوردستاندا و تێکدانی دیموگرافیای ناوچەکە لەڕووی سروشتی و ڕەگەزی و ڕۆشنبیری، لە ١٠ ی حوزەیرانی ٢٠٠٠ کۆچی دوایی کردووە. بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە: د.إسماعيل محمد حصاف، تاريخ كردستان سوريا، الجزء الثالث، من إصدارات: معهد كردستان وآسيا الصغرى للدراسات الإستراتيجية روسيا الفيدرالية – موسكو – فرع كردستان – أربيل مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل، ٢٠١٧، ص ص ١٧٢- ١٨١ .

٤- **الحزام العربي:** پرۆژەیەکی شۆڤینیی بوو ئامانجی کۆچپێکردنی زۆرەملێی کورد لە گوند و دێهاتەکانی باوباپیرانیان بوو، کە ئەوەش ناوچەکانی کوردی دەگرتەوە لە سێگۆشەی سنووری نێوان سوریا و عیراق و تورکیا بەدرێژایی ٣٧٥ کم و پانی ١٥ کم و

نیشتەجێکردنی هۆزە عەرەبەکان لەشوێنیان. بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە: د.إسماعیل محمد حصاف، سياسة الحكومات السورية تجاه المسألة الكردية في سوريا ١٩٥٨ – ١٩٧٥ (في ضوء تطور الأحداث في جنوب كوردستان)، مجلة الأكاديمية الكوردية، العدد ٢٥، ٢٠١٣، ص ص ٤٥٧ – ٤٥٩.

٥- **الفتوة:** ئەم یانە وەرزشییە ساڵی ١٩٦٢ دامەزرا بەناو یانەی لاوانی وەرزشیی لە قامشلو، ویکیبیدیا الموسوعة الحرة.

٦- **فريق الجهاد:** ئەم یانە وەرزشییە ساڵی ١٩٦٢ دامەزرا بەناوی یانەی لاوانی وەرزشی لە قامشلو، ویکیبیدیا الموسوعة الحرة.

٧- **جنجويد:** زاراوەیەکە لە کێشەی دارفور کە بەکار دەهات بۆ میلیشیاکانی نیمچە ڕێکخراو و خاوەن بنەمای عەرەبی کە کاری دەکرد بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی بەسەر هەرێمەکەدا و تاوانبار دەکران بە ڕێکخستنی پرۆسەی دەستدرێژی و کوشتنی بە کۆمەڵ دژ بە دانیشتوانە ڕەسەنەکە، ئەم کردارانە بە یەکێك لە هۆکارە ڕاستەوخۆکانی تەقینەوەی کێشەی دارفور دادەنرێت. ویکیبیدیا الموسوعة الحرة.

٨- **ماهر الأسد:** ناوبراو لەدایکبووی ١٩٦٧ بووە و سێیەم کوڕی خێزانەکەیەتی سەرکردایەتی فرقەی چواری سەربازی گرتە دەست و ڕۆڵی کارای هەبوو لە سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی قامیشلوی ٢٠٠٤ و شۆڕشی سووریای ٢٠١١. ویکیبیدیا الموسوعة الحرة.

٩- **محمد منصورة:** لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو پارێزگاری دێرەزوور بووە، لە کۆتایی حەفتاکان کراوەتە سەرۆکی نووسینگەی ئاسایشی عەسکەری لە قامشلو بە پلەی ملازم و لەدوای ڕووداوەکانی قامشلو شارەکەی جێهێشتووە، ناوبراو لە سەردەمی بوونی لە قامشلو وەك لیوا ئەندازیاری دۆسیەی کوردی بۆ ماوەی چوار دەیە. بەهۆی توندوتیژییەکانی ناوبراو دژی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی بەشێك لە سیماکانی شۆڕشگێڕی لەدەست دا، بڕوانە : الأستاذ الدكتور اسماعيل محمد حصاف، تاريخ من إصدارات: معهد كردستان وآسيا الصغرى للدراسات الإستراتيجية روسيا الفيدرالية – موسكو – فرع كردستان – أربيل مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل، ص١٣٤.

١٠- **اللواء هشام بختيار:** سیاسییەکی سوورییە لە ساڵی ١٩٤١ لەدایك بووە لە چەندین پۆستدا کاری کردووە لەوانە سەرۆکی ئاسایشی نەتەوەیی و بەڕێوەبەری کارگێڕی بووە لە هەواڵگری گشتی (ئاسایشی دەوڵەت)، لە ئەنجامی تەقینەوەیەك لە کۆبوونەوەی وەزیر و بەرپرسانی ئاسایش لە ٢٠ تەمموزی ٢٠١٢ کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: القدس العربي ٢٠ تموز ٢٠١٢ .

١١- **اللواء علي المملوك:** ئەفسەرێکی سوورییە لە ساڵی ١٩٤٦ لە دیمەشق لەدایك بووە، یەکێکە لە سەرکردە باڵاکانی ئاسایش لە سووریا پاشان بەفەرمانی سەرۆك کۆمار کراوەتە سەرۆکی نووسینگەی ئاسایشی نەتەوەیی لەشوێنی لیوا هشام بەختیار ناوبراو تاوانبار دەکرێت بە سەرکوتکردنی راپەڕین و شۆڕش و دەستی هەبووە لە تێکدانی بارودۆخی لوبنان. دمشق، باريس ١٩ حزيران ٢٠٠٥، اللواء علي المملوك، نسخة محفوظة ٢١ ايار ٢٠١٧ على موقع واي باك مشين.

١٢-**د. سليم كبول:** لە ساڵی ١٩٥١ لە گوندی عرنە لە چیای شێخ لەدایك بووە هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە بواری ئابووری چەندین بەرپرسیاریەتی گرتۆتە دەست، لەوانە پارێزگاری حەسەکە لەکاتی ڕووداوەکانی قامشلو، ناوبراو فەرمانی دا بە دەسڕێژی گوللە بۆ سەر راپەڕیوان لە قامشلو.

Zaidal 4.10.2004. http://www.zaidal.com/229/showthread.php?t=1020

١٣- **محمد حسني مبارك :** ناوبراو لە ٤ی ئایاری ١٩٢٨ لە منوفیە لەدایك بووە، دەرچووی کۆلێژی سەربازییە، فڕۆکەوان بووە لە هێزی ئاسمانی میسر، لەدوای تیرۆرکردنی ئەنوەر سادات ناوبراو لە ١٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٨١ سەرۆکایەتی کۆماری گرتۆتە دەست لەو پۆستەیدا بەردەوام بووە تاکو شوباتی ٢٠١١ بەهۆی شۆڕشی گەلانی میسر لە پۆستەکەی دوورخرایەوە. ويكيبيديا الموسوعة الحرة.

١٤-**الأمير عبدالله بن عبدالعزيز آل سعود:** ناوبراو ساڵی ١٩٢٤ لە شاری ریاز لەدایك بووە، مەلیکی شەشەمی عەرەبستانی سعودی بووە، رۆژی ٢٣ ی کانوون دووەمی ساڵی ٢٠١٥ کۆچی دوایی کردووە. ويكيبيديا الموسوعة الحرة.

١٥- **اللواء غازي محمد كنعان:** ناوبراو ساڵی ١٩٤٢ لە پارێزگای لازقییە لەدایك بووە، دەرچووی کۆلێژی جەنگییە لە ساڵی ١٩٦٥، یەکێکە لە گەورە پیاوانی ئاسایش لە سووریا، سەرۆکی هۆبەی هەواڵگری سووری بووە لە لوبنان تا ساڵی ٢٠٠٢، سەرۆکی هۆبەی ئاسایشی سیاسی و وەزیری ناوەخۆ بووە لە سووریا لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣ تاکو رۆژی خۆکوشتنەکەی کە لە رێکەوتی ١٢ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٥ بووە، بەڵام تاکو ئێستا هۆکاری خۆکوشتنەکەی نەزانراوە.

Zaidal 4.10.2004. http://www.zaidal.com/229/showthread.php?t=1020

وكذلك: ويكيبيديا الموسوعة الحرة.

## سەرچاوەکان


١- د.إسماعيل حصاف، إنتفاضة قامشلو وإنعكاساتها الإقليمية والدولية على المسألة الكردية في سوريا، عفرين نت ٢٠٠٤، www.efrin.net; webmaster@efrin.net

٢- د.سامي جتين، أحداث قامشلو، أسباب ونتائج دروس وعبر، عفرين نت ٢٠٠٤/٥/١٣، www.efrin.net

٣- القامشلي مصطفى ماماي، لاعب نادي الجهاد يتحدث عن مجزرة ١٢ آذار، ANF News، ٢٠١٨/٣/١٢، وكالة أنباء الفرات، ٢٠١٨.

٤- التفاصيل الكاملة لـ "إنتفاضة ١٢ آذار" الكوردية في سوريا، إنتفاضة صنعها الشباب، همشها النظام، تبرأ منها السياسيون وأحيتها ثورة اليوم، نيوز سنتر، ٢٠١٢/٣/٩، المركز السوري للأخبار والدراسات، ٢٠١١، SyriaServ.com

٥- ANF القامشلي – مصطفى ماماي، الإثنين ١٢ آذار ٢٠١٨، وكالة أنباء الفرات.

٦- صلاح بدرالدين، عندما هب كرد سوريا في وجه الإستبداد، ، Kurdistana Binxete, 12.3.2008

٧- نيوز سنتر، ٢٠١٢/٣/٩، المركز السوري للأخبار والدراسات، ٢٠١١، SyriaServ.com

٨- ANF News، ٢٠١٨/٣/١٢.

٩- كرد سوريا يحيون ذكرى إنتفاضة قامشلو ضد النظام، عنب سوريا (جريدة سورية تاسست في داريا)، ١٢ آذار ٢٠١٧.

١٠- بيان حزب الوحدة الديمقراطي الكردي في سوريا (يكيتي) إلى الرأي العام، ٢٠١٥/٣/١١. إنظر موقع :

Welateme.net@gmail.com

١١- بيان ياجماهير شعبنا الكردي أيتها القوى الوطنية والديمقراطية، مجموع الأحزاب الكردية في سوريا، ٢٠٠٤/٣/١٢، إنظر: أحداث القامشلي آذار ٢٠٠٤ ، من المؤامرة إلى الحركة الشعبية السلمية، من منشورات لجنة الثقافة والأعلام لحزب الوحدة الديمقراطي الكردي في سوريا – يكيتي–، تم نشر هذا الكتاب في موقع نوروز بتاريخ ٢٠٠٧/٢/٦، بصيغة PDF www.Yek-dem.com

١٢- الجمهورية العربية السورية، محافظة الحسكة المكتب التنفيذي، التاريخ ١٢/ ٣/ ٢٠٠٤، العدد ٢/ ٦٩٠، سري للغاية، في كتاب: أحداث القامشلي آذار ٢٠٠٤ في تاريخ أكراد سوريا الحديث، ٢٠٠٧، من منشورات لجنة الثقافة والإعلام لحزب الوحدة الديمقراطي الكردي في سوريا (يكيتي)، ص ٤، منشور في موقع:

.www.Yek-dem.com

١٣- بيان صحفي عاجل من المجلس الوطنى للحقيقة والعدالة والمصالحة، ٢٠٠٤/٣/١٢، في كتاب: أحداث القامشلي آذار ٢٠٠٤ في كتاب: تاريخ أكراد سوريا الحديث، من منشورات لجنة الثقافة والإعلام لحزب الوحدة الديمقراطي الكردي في سوريا (يكيتي).

١٤- ماحصل في القامشلي نتيجة حتمية لما مورس خلال أربعة عقود من الإستبداد السياسي، مركز دمشق للدراسات النظرية والحقوق المدنية – السويد، ١٢-٢٠٠٤/٣/١٣. في كتاب: تاريخ أكراد سوريا الحديث، من منشورات لجنة الثقافة والإعلام لحزب الوحدة الديمقراطي الكردي في سوريا (يكيتي).

١٥- بهية ماردينى من القامشلي، تفاصيل المواجهات في مدينة القامشلي السورية: كيف تحولت مباراة لكرة القدم إلى مواجهات دامية، ١٣ مارس ٢٠٠٤، في كتاب: تاريخ أكراد سوريا الحديث.

١٦- تصريح صادر عن إجتماع قيادة مجموع الأحزاب الكردية في سوريا، ٢٠٠٤/٣/١٥. أحداث القامشلي آذار ٢٠٠٤ ، من المؤامرة إلى الحركة الشعبية السلمية، من منشورات لجنة الثقافة والأعلام لحزب الوحدة الديمقراطي الكردي في سوريا –يكيتي–، تم نشر هذا الكتاب في موقع نوروز بتاريخ ٢٠٠٧/٢/٦، بصيغة www.Yek-dem.com PDF

١٧- سيادة الرئيس الدكتور بشار الأسد، مجموع الأحزاب الكردية في سوريا، ٢٠٠٤/٣/١٥، موقع:www.Yek-dem.com

١٨- بيان بمناسبة نوروز إلى الرأي العام إلى جماهير الشعب السوري وقواها الوطنية والديمقراطية والإنسانية إلى أبناء وبنات شعبنا الكردي، مجموع الأحزاب الكردية في سوريا، ٢٠٠٤/٣/١٧. إنظر:أحداث القامشلي، www.Yek-dem.com.

١٩- بيان إلى الرأي العام، مجموع الأحزاب الكردية، ٢٠٠٤/٣/١٨، راجع، أحداث القامشلي آذار ٢٠٠٤.

٢٠- تصريح صادر عن إجتماع الأحزاب الكردية، قامشلي في ٢٠٠٤/٣/١٩). www.Yek-dem.com

٢١- تصريح صادر عن إجتماع مجموع الأحزاب الكردية في سوريا، قامشلي في ٢٠٠٤/٣/٢٠. راجع، أحداث القامشلي آذار ٢٠٠٤.

٢٢- بيان إلى الراي العام، قامشلي في ٢٠٠٤/٣/٢١ موقع من لجان أحياء المجتمع المدني والتجمع الوطني الديمقراطي والتحالف الديمقراطي الكردي في سوريا وحزب الإتحاد الشعبى الكردي في سوريا وجمعية حقوق الإنسان في سوريا وحزب العمل الشيوعي في سوريا ولجان الدفاع عن الحريات الديمقراطية وحقوق الإنسان في سوريا وحزب يكيتى الكردي في سوريا والإتحاد الديمقراطي والجبهة الديمقراطية الكردية في سوريا ومنتدى جلادت بدرخان في

القامشلي والمنظمة الآثورية الديمقراطية في سوريا، قامشلي في ٢٠٠٤/٣/٢١. راجع، أحداث القامشلي آذار ٢٠٠٤.

٢٣- بيان إلى الرأي العام، مجموع الأحزاب الكردية، ٢٠٠٤ /٣/٢٣ ، راجع موقع: www.Yek-dem.com

٢٤- نداء إلى إتحاد الطلبة العالمي الموقر — إلى منظمة اليونسكو الموقرة — إلى منظمة أمنستي الموقرة، مجموع الأحزاب الكردية في سوريا، ٢٠٠٤/٣/٢٨، أحداث القامشلي آذار ٢٠٠٤.

٢٥- توضيح، ناطق بإسم حزب الوحدة الديمقراطـي الكـردي في سـوريا — يكيتي — في ٢٠٠٤/٣/٢٢، www.Yek-dem.com

٢٦- لجان الدفاع تدين الممارسات الإرهابية بحق المواطنين الأكراد في سورية، تصريح صحفي، الأحد ١١ نيسان ٢٠٠٤، الناطق الرسمي لـ (لـ. د. ح)، المحامي أكثم نعيسة، إنظر موقع: www.Yek-dem.com

٢٧- القامشلي تعاني آثار الدمار وتستعيد هدوءها وروايات عن إستمرار الإشتباكات في الحسكة، موقع الراي، ٢٠٠٤/٣/١٥، في كتاب: تاريخ أكراد سوريا الحديث.

٢٨- بيان صحفي عاجل- ٥ — المجلس الوطنى للحقيقة والعدالة والمصالحة، ٢٠٠٤/٣/١٤، أحداث آذار ٢٠٠٤.

٢٩- النهار اللبنانية، ١٩ آذار، ٢٠٠٤.

٣٠- قامشلو. كوم، ٢٠٠٤/٣/١٤.

٣١- أخبار الشرق، لندن، ١٩-٢٠ آذار، ٢٠٠٤.

٣٢- د. إسماعيل حصاف، إنتفاضة قامشلو وإنعكاساتها الإقليمية والدولية على المسألة الكوردية في سوريا، في موقع: WWW.efrin.net

٣٣- صلاح بدرالدين، غرب كردستان .. الربيع الدامي، رابطة كاوا للثقافة الكردية، أربيل، ٢٠٠٤.

٣٤- محمد طلب هلال، دراسة عن محافظة الجزيرة من النواحي السياسية والاجتماعية والقومية، ط١، الاتحاد، برلين، ٢٠٠١.

٣٥- رينية موريس، كردستان أو الموت، ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله، ط٢، مط التربية، أربيل،١٩٩٩.

٣٦- شێرزاد زكريا محمد، أثر حلف بغداد ١٩٥٥ على الحركة التحررية الكوردية، مط جامعة دهوك، دهوك، ٢٠٠٩.

**ملخص البحث**

**انتفاضة قامشلو (١٢-١٦) أذار، ٢٠٠٤**

**(أسبابها ونتائجها)**

م. م هاوكار كريم حمه شريف
قسم التاريخ- كلية الآداب
جامعة صلاح الدين -أربيل

في الثاني عشر من آذار ٢٠٠٤ شهدت مدينة قامشلو إنتفاضة جماهيرية عارمة على اثر الأحداث التي وقعت بين فريق "الفتوة" لدير الزور وفريق "الجهاد" في القامشلو بتخطيط من أجهزة الأمن. وتأتي أهمية إنتفاضة قامشلو ٢٠٠٤ كونها شكلت أولا باكورة مايات يعرف بثورات الربيع العربي، فقد تمكنت من كسر حاجز الخوف ليس فقط في المناطق الكوردية من سوريا بل وفي الداخل السوري ومناطق العالم العربي الرازحة تحت سيطرة حكومات مستبدة وطغم عسكرية وشرعت بوضعها لحجر الأساس في تحريك القوى الثورية في بلدان المنطقة، وثانيا لأنها كانت الأولى من نوعها في هذا الجزء من كوردستان الملحق بسوريا، ولعبت دور الرافعة في الدفع بالقضية الكوردية إلى الصدارة وإجتيازها الحدود السورية لتتحول إلى قضية دولية، ناهيك عن أنها شكلت بداية مرحلة تاريخية جديدة للحركة السياسية الكوردية في سوريا، ونقطة تحول تاريخية في نضالها التحرري.

## Research Summary
## Qamishlo Rebellion (12-16) March, 2004
## (Causes & Results)

**Assist. lecturer. Hawkar Karim Hamasharif**
History Department – College of Arts –
Salahaddin University- Erbil.

On the 12th of March 2004, the city of Qamishlu witnessed a mass uprising following the events that took place between the "Fatwa" team of Deir al-Zour and the "Jihad" team in Qamishli, planning by the security services.

The importance of the March 2004 uprising was the first to be known as the first of the Arab Spring revolutions. It broke the barrier of fear not only in the Kurdish areas of Syria but also in the Syrian interior and in the regions of the Arab world under the control of autocratic and military governments. And secondly because it was the first of its kind in this part of Kurdistan annexed to Syria, and played the role of leverage in pushing the Kurdish issue to the forefront and crossing the Syrian border to become an international issue, not to mention that it was the beginning of a new historical stage of the political movement Pink in Syria, and a historic turning point in the liberation Ndhalalha.

# کولتووری نشیمەنی و نیشتەجێبوونی کوردەکان لە ناوچە کوردییەکان لە سەردەمی عوسمانیدا

**م.ی. سازان سەباح پیرباڵ**
بەشی شوێنەوار - کۆلێژی ئاداب
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پوختە**

نشیمەنی و شوێنی نیشتەجێبوون کولتوورێکی تایبەتی بەرهەم هێناوە کە بەستراوەتەوە بە پرۆسەی زەمەنی پێشکەوتنی شارستانییەت، هۆکارە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان کاری تێدەکات، لە ناوەرۆکیشدا رەنگ و سیمای نەتەوەکەشی هەڵدەگرێ، شوێنی نیشتەجێبوون دەشێ بکەوێتە بەر کارتێکەری جۆرێکی دی یان هاوردە بکرێ واتا وەربگیرێ،

لەم توێژینەوەیە باس لە کولتووری نیشتەجێبوونی کورد دەکەم لە ناوچە کوردییەکان لە سەردەمی عوسمانی واتە لە نێوانی سەدەی 16 تا 20 زایینی، واتە لە نێوانی کولتووری ئەم کۆمەڵگایانە و سەرەتای هاتن و لەناوچوونی ئەم کولتوورە لەگەڵ زیادبوونی کاریگەریی هونەری بێگانە، ناوچە کوردییەکان دابەشکرابوو بەسەر دوو ئیمپراتۆریەت، فارس و عوسمانی، ئەم بارودۆخەی ناوچە کوردییەکان کە هەمیشە لەژێر شەڕ و ئاژاوە و داگیرکاری و کاولکاری بووە، ئەم بارە سیاسییەی کوردستان رێگای نەداوە بیناسازی پێشکەوێت، رێگای پێشکەوتنی لەبەردەم داخراوە جگە لەوە هەمیشە کەوتۆتە بەر شاڵاوی پرۆسەی سڕینەوەی نیشانەی هەر شێوەیەکی داهێنانەکانی ئەویش واتە داگیرکردن و دەستدرێژی و وێرانکردن و سووتاندن و تاڵانکردن ئەم دیاردەیە لە هەموو بوارەکان دەردەکەوێت.

جگە لەوە سەرچاوەی هەرە کارای ئاوەدانی شارە گەورەکان و دروستکردنی بیناکانی دانیشتوان بێت کە لە دێر زەمانەوە لە جێنشینەکان و گرووپە کۆچەرییەکان پێکهاتوون، لەم تێکەڵاوبوونە کۆمەڵگەیەک و هونەرێکی بیناکاری تێکەڵاو و فرە رەنگ دروست دەبێت.

ئەم توێژینەوەیە هەوڵدانێکە بۆ روونکردنەوە و نمایشکردنی کولتووری نشیمەنی و نیشتەجێبوونی کوردەکان کە هەنگاوێکی سەرەکییە لە بەرامبەر هەر هەوڵدانێک بۆ پاراستنی جیاوازیی کولتووری ئەو شارانەی کە رووبەڕووی لەناوچوونی خۆجێیی خۆیان بوونەتەوە لەبەرامبەر کولتووری وەرگیراوی هاوچەرخی نوێ، هاوکات هەڵوێستی کۆمەڵی رۆژهەڵاتناس نیشان دەدات سەبارەت بە کولتووری کوردەکان کە هەمیشە بەر سەرنجیان داوە و لێی وردبوونەتەوە و لەسەریان نووسیوە و باسیان کردووە ئەم زانیارانە بۆتە گەنجینەیەکی بەهادار کە هەوڵمداوە لەم توێژینەوەیە بیانخەمە روو وەکو بەڵگەیەکی راستی بۆ نەوەی نوێ .

دەرەنجام دروستکردنی شوێنی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە ژێر کاریگەریی هۆکارگەلی خۆجێیی و کۆمەڵایەتیدایە، بارودۆخی خۆجێیی لە بەکارهێنانی کەرەستە بۆ دروستکردنی خانوو، رۆڵێکی سەرەکی دەگێڕێ، هۆکارگەلی کۆمەڵایەتیش کاریگەرییان لەسەر جۆری شوێنی نیشتەجێبووندا هەیە. بەڵام پێشکەوتنی شارستانیەت رۆڵێکی کاریگەری گێڕاوە لە بەرەو پێش چوونی و لە رووی ئەندازیاری و نەخش و نیگارەوە سیمایەکی تری وەرگرتووە.

## بەشی یەکەم

### یەکەم: سەرەتای نیشتەجێبوون لە ناوچە کوردییەکان

بەڵگە ئارکۆلۆژییەکان نیشانی دەدەن کە سەرەتای شارستانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ناوچە جۆر بەجۆرەکانی کوردستان دەستی پێکردووە چەندین شوێنەواری کۆن دۆزراونەتەوە کە سەرەتای شارستانیەتی مرۆڤ نیشان دەدەن لەم ناوچانە، بۆ نموونە چەرمۆ کە تەمەنی نزیکەی ٩٠٠٠ ساڵە، یەکێکە لە گوندە سەرەتاییەکانی نیشتەجێبوونی مرۆڤ نەخشەی خانووبەرەکانیان وەکو دیوار و ژوور و شوورای هەندێک لە حەوشە و سنووریان بە وێرانی و رووخاوی ماوەتەوە، تا کشتوکاڵیش دانەهێنرا دروستکردنی خانووبەرە بۆ حەوانەوە نەبوو، چونکە کۆمەڵگا راوپیشەکان پێویستییان بەم جۆرە نیشنگانە نەبوو چونکە جۆری ژیانەکەیان وا پێویستی دەکرد، بۆ حەوانەوە ئەشکەوت شوێنی نیشنگەیان بێت. (باقر، ٢٠١٨، لا٨٨)

کە کشتوکاڵ داهێنرا و ئاژەڵ و ماڵات ماڵیکران ئینجا دروستکردنی خانووبەرە لە نزیک کێڵگەکان بۆ حەوانەوە دروستکران ئەمەش دەگەڕێتەوە سەرەتای چاخی بەردینیی نوێ (٨٥٠٠ پ. ز ) ئەمەش چەند خانووەکی قوڕین بوون. لە قۆناغی حەلەف (٦٠٠٠ پ. ز) خانووەکان شێوەی چڕ پێی دەوترا (tholos) ئەمەش خانووەک بوو بچووک بوون بۆ تاکە خێزانێک دروستکرابوون ئەم کەرەستانەی بۆ دروستکردنی بەکار دەهات جۆراو جۆر بوون (خشتی قوڕ، بەرد و دار کەرەستەی هەرە سەرەکی بوون بۆ دروستکردنی ئەم خانووانە) بە گومەزی قوڕ سەریان دەگیرا کەلاوەکانی یارم تەپە بەڵگەی بەهێزیی ئەم شێوازانەن. (المالكي، ٢٠٠٧، لا٢٨-٣٠)

میدییەکان و هیندو ئەوروپییەکان پاشان هاتن بابەتی بیناسازی بە ئاسانی دەتوانین دەستنیشان بکرێت بەڵگەیەکی زۆری وێنەسازی سەر تاشە بەردەکانی سەردەمی ئاشوورییەکان ئەوە دەردەخات چۆن

هێرشیان کردۆتە سەر شارە کوردنشینەکان کە دیزاینی شارەکان دەردەخات کە لەسەر بڵندابییەکی دروستکراون.

دواتریش هەیکەلی زەقوورە لە وڵاتی میزوپۆتامیا وێنەیەکی بچووککراوەی دیزاینی یەکێک لە شارەکانی کوردستان بووە، ئەم دەشتایی نشینانە شێوەی چیای دەستکردی هاوشێوەی هی کوردەکانیان بۆ خوداوەندەکانیان دروستدەکرد لەسەر ئەم هەموو بیابانە پەرستگاکەیان دروستدەکرد. (ئیزەدی، ٢٠٠٧، لا، ٥٨١-٥٨٤).

تاکە گەواهیدەر بۆ ئەمە دروستبوونی قەڵا کۆنەکەی شاری هەولێر و کەرکووکە کە پێش ماد و ئاشوور دروستکراوە تایبەتمەندییە جەوهەرەکان و هەڵاواردەی قەڵات تەنها لە شوێنەوارەکەیدا نییە بەڵکو لەو کولتوورە بیناسازییەدایە کە خۆی لە زۆر خانوو و بینایەی کولتووری دەنوێنێت بە رواڵەتێکی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و بنیاتنان دەژمێردرێت (صالح، ١٩٨٧، لا٨٣)، جگە لەوە شوێنەوارە کۆنەکانی ناوچەی قۆپی قەرەداخ کە بە دەربەندی گاور بەناوبانگە تا ئێستاش شوێنەواری خانووبەرە و کڵێسەی کۆنی رووخاو بەرچاو دەکەوێت هەروەها شوێنەوارە دێرینەکانی ئامێدی و ناوچەکانی بتلیس و دیاربەکر و جزیرە و بۆتان شوێنەوارە کۆنەکەی پەیکولی کە تا ئێستا دیوار و کۆشک و سەرا و دیوانی پادشایی سەردەمی ساسانییەکانی لێیە کە بە خشتی سوورەکراو نەخش و نیگاری لەسەر هەڵکۆڵراوە، پاشان ئەو شوێنەوارانەی سەردەمی میرنشینەکان گەلێک لە قەڵا و کۆشک و تەلاری خۆیی و سەربازیی خانووبەرەی نەوەی کوردی سەردەمی ئەو کاتەی لێیە (نەقشبەندی، ٢٠٠٨، لا١٤) لە ناوچەکانی رواندز و خورماڵ و پاشان دامەزراندنی شاری سلێمانی لە رووی بنچینەی دامەزراندنی خانووبەرەوە تا ئێستاش لە زۆربەی گەڕەکەکان ماون (حمید، ٢٠٠٩، لا١٥٨-١٥٩).

## دووەم: هۆکارە کاریگەرییەکان لەسەر کولتووری نیشتەجێبوونی کوردەکان

دەتوانین بڵێین شوێنی نیشتەجێبوونی کوردەکان ڕەگ و ڕیشەی بۆ قۆناغی دوور و جیاوازەکانی مێژووی ئەو گرووپ و ڕەگەزانە دەگەڕێتەوە کە لە سەدەکانی دواتر میللەتی ئێمەیان پێکهێنابوو، بە واتایەکی تر ئیمپراتۆریەتی سۆمەری و میدییەکان و ساسانییەکان کاریگەرێکی باڵایان هەبووە لە کولتووری نشیمەنی کوردەکان، لەو سۆنگەیەوە دەتوانین بڵێین میللەتی کورد وەکو میللەتانی تر کارلێکەر و کار لێکراویش بووە، ئەم کولتوورە جیاوازانە بە شێوەیەک لوول دراون لە نێو خودی خۆیان توانراوەتەوە، هەندێ جار وەکو خەسڵەتێکی ڕەسەنیش خۆی نمایش دەکات، (تاهیر، ٢٠٠٨، ل ١٢٧) لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامیش، کە ئایینی باوی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، هەندێ لە کریستیانەکان و جوولەکەکانیش دەورێکی کارایان هەبووە بۆ دروستکردنی کولتوورێکی هاوبەش لە کوردستان، لە ماوەی نێوان سەدەی ١٦ تاکو سەدەی ٢٠ لەم ماوەیە زۆربەی شارەکانی کوردستان لە ژێر دەستی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بوون، ئیمپراتۆرییەک لە ناوەڕاستی ئەورووپا درێژ دەبۆوە بە تورکیا و عیراق و تا کەنداوی عەرەبی و کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست و باکووری ئەفریقای تێپەڕاندبوو لە بەهێزترین قۆناغیدا بوو جگە لەوە سەفەوییەکانیش بەشێکی تری ڕۆژهەڵاتیان لەدەست بوون ئەم بارودۆخە ناجێگیرە و دەستبەسەر داگرتنە ڕەنگاو ڕەنگی زۆریان لە کۆمەڵایەتی و کولتووردا کرد بە تایبەت شێوازی نیشتەجێبوون، بۆ نموونە دروستکردنی باخچە و چیمەنەکان سیفەتێکە لە سیفەتەکانی بیناسازی عوسمانی ئەمەش ئاماژەیەکە بە بوونی پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان ژینگەی ناوەوە و دەرەوە، ئەم سیفەتە تەنها بۆ ماڵی چینە باڵاکان، بەڵام ماڵە هەژارەکان هەر ئەوەندەیان بۆ دەماوە پانتاییەکیان هەبێت بۆ شوێنی حەوانەوەیان یان لە نێو مەرکانەکان دەچێنران لە ڕۆخی پەنجەرەکان دادەنران، بەڵام

ماڵی لادێکان زیاتر گرنگییان بە باخ دەدا ئەمە لە بیناسازی ئێرانیش دەردەکەوێت کە لە سەدەکانی نۆزدەهەم کاریگەریی ئێرانی خانووی فراوان لە نێو باخ دروست دەکران ئەم جۆرە خانووانە لە شارەکانی شیراز و کرمان ناوچەکانی دەوروبەری دەبینران، لە سەردەمی عوسمانییەکان تەنانەت مزگەوتەکان و مەزارگاکانیش بە گوڵ و باخچە دەرازێنراوە، بەڵام شێوازی بیناسازی ئێرانی لە کوردستانی باشوور و رۆژهەڵات باو بوو، ئەمیش خشت زۆر بەکاردێت تاکو ئێستاش ئەمە باوە، جگە لەوە بەردی تاشراو رێک و نارێک لە شێوەی خشتدا لە گوندەکان بەکاردێت، دەوری هەر خانووەک بە پەرژینێکی بەرز دەورە درابوو، خانووەکانیش لە تەک یەکەوە بوون بەڵام خشتی رۆژئاوا و باکور خشتی گەورە و تاشراو بەکاردێت ئەوەندە پێویستی بە بەرد برین نییە کە لە شوورەی شاری دیاربەکر (ئامەد) بەکارهێنراون هەتا ئێستاش هەر ماون، لەگەڵ ئەوەی هەر شارێک لە شارە کوردییەکان بە حوکمی ئەوەی کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی چەند وڵاتێکی زلهێز بە مۆرکی لۆکاڵی خۆی زەخرەفە و رووی شێوازی بیناسازی جیادەکرانەوە (Oliver، 1996، p80-94 )

جگە لەوە پلاندانان و بیناسازیدا بە رەگەز ئەورووپیش کاریگەر بوو٬ لەگەڵ کولتووری رەسەن ئەوا شتی نوێش لە رووی بیناسازییەوە دەکران وای لێهات باڵەخانە و خانووەکان چەندین بەشیان لابران و گۆڕان، وا باو بوو باڵەخانە نوێکان لەسەر بنچینەی پاشماوەی باڵەخانە کۆنەکان دروستدەکران (سکێرس، ٢٠١٢، ل٧٩-٨٣)

لە ناوچەیەک بۆ ناوچەیەکی تری کوردستان بە هۆکاری تایبەتمەندی جوگرافیای کوردستان لە رووی سروشتی بیناکاری و روخساری خانووەکان جیاوازی دەبینرێت بەهۆی ئەو کەرەستانەی لە دروستکردنیدا بەکار هاتوون هەروەها جیاوازی لە رووی جۆرەوە وەکو خانووەکان بەشێکی لە خشتی سوورنەکراو دروستدەکران بەڵام لە ناوچەیەکی تردا بە بەرد دروستدەکران لە هەندێ بینادا دەبینین لە

نێوان بەردەکاندا هیچ کەرەستەیەک بەکارنەهێنراوە بۆ پێکەوە لکاندنی. هەندێ بینا لە بەردی ناڕێک دروستدەکران بەڵام پارچەکانی بە دیمەک لکێنراوە یان بە گەچ و قوڕ. بۆ نموونە ناوچەکانی هەورەمان بە بێ جیاوازی بە یەک جۆر کەرەستەی خانوو دروستدەکران وەکو بەرد و قوڕ و دیمەک، لەبەر ئەوەی بەرد لە ناوچەکانی هەورەمان ئێجگار زۆرە و (دیمەک)یش بریتییە لە قەدی درەخت لە قەوارەی سیی سانتیمەتر چوارگۆشەیەک ئەستووری یان لەوە ئەستوورتر نزیکەی گەزێ درێژ یان پانتر و هەر چوار دیوەکەشی بە هۆی دارتاشاوە رێک دەکرێن بۆ ئەوەی لەسەر دیوارەوە نەخلیسکێ و جوولە نەکا ئەوجا دەخرێتە ناو دیوارەکانەوە بە مەبەستی بەستنەوەی درزەکانی نێوان بەردەکان، (هەورەمانی، ٢٠١٦، لا ٢٥١-٢٥٢) لە هەندێ ناوچەش بە دار دروستدەکران. بۆ نموونە لە ناوچە بێ دارەکان وەکو باکووری سوریا خانوو بە قوڕی سوور، کا، ئاو دروستدەکران بەم جۆرە خانووە دەڵێن (جلب) ئەم جلبانە لە کۆمەڵێک خشت دروستدەکران کە پێیدەڵێن کەرپیچ (کەرپووچ) لەم ناوچانە بەهۆی نەبوونی دار بۆ دروستکردنی بانی ساف، بانگەلی شکلی گومەزی دروستدەکران بە گوێرەی لێکۆڵینەوەی کۆلێژی حەلەب مێژووی ئەم جۆرە خانووانە دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی چوارەمی پێش زایینی، لە ناوچە شاخاوییەکان جۆرێکی دیکەی خانوو هەیە کە بەردینە و بانەکەی سافە، بانی ساف لە داری دارەڕا و لقی داری سپیندار و توێژێک جلب دروستدەکرێت، ئەم جۆرە بانە پێویستی بە ماندووبوون هەیە دەبێت پاش باران و بەفر، وشک بکرێتەوە، وشککردنەوەی بانەکان بە بانگەردێنێکی بەردین (لوقتاش) ئەنجامدەدرێت، لە رووی فەنییەوە بانە سافەکان سێ پلە کووڕ دروستدەکرێن بۆ ئەوەی باران لێی بڕژێتە خوارەوە (کرینبروک، ٢٠١٢، لا٢٥١-٢٥٢) جگە لەوە دەرەوە و ناوەوەی شارەکانیش جیاوازییان هەبوو لە خانووبەرەکانیان لەگەڵ ئەوەی لە هەر شارێک لە شارەکانی رۆژهەلات بە مۆرکی لۆکالی تایبەتی خۆی لە رووی شێوازی بیناسازی

و زەخرەفەوە جیادەکرێنەوە بەڵام بنەما گشتییەکان لە شارە ڕۆژهەڵاتییەکان پەیڕەو دەکران بۆ نموونە حەوشەیەکی کراوە و بەیتوونەیەک و چەند ژوورێک لە دەوری یەکدا دەوری حەوشەکەیان دابوو لەگەڵ ئەو پەرژینە بەرزانە کە بۆی دروستدەکران نە دەتوانرا نێو ماڵەکان ببینرێن، وە لەگەڵ ئەو دەرگا سادە و ساکارانە چاوی خەڵکی لەبەرامبەر زەنگینیی ئەو خێزانانە لەودیو دیوارەکان دەژیان دەخەڵەتاند ( Keall qaleh ،1967، ل٩٤)

## بەشی دووەم

## کولتووری نیشتەجێبوون لە ناوچە کوردییەکان و دیدی ڕۆژهەڵاتناسەکان

بە دەگمەن *ڕەوەندێک* ببینین سەرنج و تێڕوانینەکانی خۆی لەسەر چەشنی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە ناوچە کوردنشینەکان تۆمار نەکردبێت.

کۆمەڵێ چەشنی نیشتەجێبوون هەن کە کوردەکان لە ناوچە جیاوازەکانی شار و گوندەکان دروستیان دەکرد، شارە کوردنشینەکان ئەوەندە بەس بوو پاشا یان ئاغا کۆشکێکی لێ دروست دەکرد ئیدی لە دەوروپشتی خانوو دروست دەکران، گوندەکانیش هۆکاری ئاو و هەوا و بەپیتیی خاکەکەی و ئاسایش لەبەر ئەم هۆکارانە لەم شوێنانە هەڵدەبژێردران خانوویان لێ دروست دەکرد.

***گرنگترین چەشنی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە ناوچە کوردییەکان لە شار و گوندەکان:***

١. خانووی کاتی – ئەمەش چەند جۆرێکە:

١. کەپر :

کەپر خانووەکی کاتییە لە کوردستاندا باوە بە چڵ و گەڵای دار و دەوەن سەری دەگیرێ لەسەر چوار کۆڵەگەی دار ڕاگیر دەکرا بە



تابلۆی ژمارە (١) ماڵی کوردیی نەستووری

زۆریش کۆڵەگەکان داری سپیندار بوون مەبەستیش ئەوەیە شوێنێکی سارد و فێنک و سێبەر دابین بکات ئەو جۆرە کەپرانەش لە نزیک گوندەکان دروستدەکران بە مەبەستی مانەوە لەم شوێنانە کە کشتوکاڵیان لێ دەکردن (سندی، ٢٠٠٨، لا ٥٧٩)

تابلۆی ژمارە (١) (p164, 1867,layard) باسی خانووی کوردە نەستوورییەکان دەکات شێوەی گشتی وێنەکە خانووەکی گەورەی دوو چینە ناوچەی (وان) چەند پەنجەرەیەکی هەیە بۆ رووناک کردنەوەی ژوورەوە و بۆ هەوا گۆرکێ بەڵام لەسەر بانەکە دوو کەپریان دروست کردیە بۆ کاتی حەسانەوەیان کە دەچن رۆژ لێیان نەدا بۆ سێبەر دروستکردن ئەمەش شێوازێکی کۆنە.

ئەولیا چەلەبیش یەکێک لە رۆژهەڵاتناسە تورکەکانە کە لە ساڵانی ١٦٥٥ دا سەردانی ناوچەکانی کوردستانی کردووە، لە کتێبەکەیدا بە ناوی (سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی) باسی سەیرانگاکانی دیاربەکر دەکات کە بۆ خۆشی لە جیهاندا بێ وێنەن. دەڵێ (( لە بەهاراندا دوای ئەوەی لافاو نیشتەوە و ئاو رۆن بۆوە و خەڵکی دیاربەکر هەژار و دەوڵەمەند دەستی ژن و منداڵیان دەگرن دێنە گۆی رووبار هەر کەسەو لە شوێنی تایبەتی خۆیدا خێوەت و کەپر هەڵدەدات لە قەراخ ئاوەکە کاڵەک و شووتی دەهێنن و رێحانێکیان هەیە بۆ پەرژین بەکار دەهێنن دوای مانگێک ئەوەندە زیاد دەکات کەپرەکان و چواردەوریان بەم رێحانە دادەپۆشن هەموو کەپرەکان جۆگە و ئەستێڵیان هەیە کە لە



**تابلۆی ژمارە (٢) کوردەکان لە کاتی گفتوگۆکردن بە وەرزی هاوینە**

زێوە ئاویان بۆ راکێشاوە بەم شێوەیە حەوت مانگی رەبەق قەراخی ئەم زێیە دەبێتە کانگای هەرا و بەزم و رابواردن و گۆرانی و خواردنیان تەنانەت خاوەن پیشەکانیش هەر خەریکی کار و پیشەی خۆیان دەبن. (چەلەبی، ١٩٧٩، ل٦٣-٦٤)

رۆژهەڵاتناس ریچ لە گەشتەکەیدا بۆ کوردستان لە ساڵی ١٨٢٠ دا هاتۆتە ناوچەکانی کوردستان سەردانی سلێمانی کردووە لە ١٠ ی حوزەیران باسی تێکچوونی تەندروستی خۆی دەکات دەڵێت ((ئەم دوو رۆژە تەندروستیم تێکچوو بۆچوونم وایە هی گەرمایەکەیە تا ئێستا لە چادردا دەژین بە هیوای ئەوەین خانووەکی هاوینەی کوردەواریمان بۆ دروست بکەن کە سابات و کەپرە، چونکە گڕەی گەرما زۆر بە تین لە چادرەکە دێتە ژوورەوە کە دەگاتە ١٠٣ و ١٠٠ بەڵام لە ژێر کەپر٩٢ تێپەڕ ناکات))

دوای ئەوە لە ١١ ی حوزەیران کەپرەکەیان بۆ مستەر ریچ دروست کردووە بەم شێوەیە باسی کەپرەکە دەکات ((ئەمرۆ کەپرەکەمیان بۆ دروست کرد کە درێژییەکەی ٣٠ پێ، پانیشی ١٥ پێ دەبوو، لە رووی نەخشەوە و چۆنیەتی دروستکردنیەوە شتێکی کۆن و سەرەتایی بوو، سێ ریز کۆڵەگەیان بۆ چەقاندبوو هەر ریزەی چوار کۆڵەگەی هەبوو بەرزیەکەشیان نزیکەی ٧ پێ دەبوو کۆڵەگەکان رایەڵ



تابلۆی ژمارە (٣) سەپان خەریکی درویّنە کردنن

و داری تریان خستبووە سەری لەسەری ئەمانەشەوە لق و پۆپی گەڵای بەڕوویان لەسەر دانابوو لەسەر ئەمانەشەوە هەندێ خشتیشیان دانابوو تا گەڵا و کۆڵەکە بنیشن و جێی خۆیان بگرن، زەوییەکەشیان تەخت کرد بە چینێک قوڕی ئاسایی سواخیان دا پاش ئەوەش گڵە سوور و وشک و کا تێکەڵ دەکەن سواخێکی تری دەدەن هەر چوار دەوری ئەم زەوییەش سەکۆیەک دەور دەکەن بەرزی ٦ گرێیەک دەبێ هەندێ جاریش بە قامیش پێیدەڵێن چیغ دەوری دەدەن ئەم چیغە لە قامیشی باریک دروستدەکرێت هەواشی لێ دێتە ناوەوە تەڕی دەکەن بۆ ئەوەی ئاو و هەوای فێنک بێتە ناوەوە. (ریچ،٢٠١٢، لا ١٤٢-١٤٣)

هینری بیندەر یەکێکە لەو گەڕیدانەی سەفەرنامەکەی تەرخان کردووە بۆ میللەتی کورد بە ناونیشانی کوردستان کە لەسەر بەرگی کتێبەکەی بەکاری هێناوە وەکو خۆی لە پێشەکیەکەی سەفەرنامەکەیدا دەڵێت ((لەساڵی ١٨٨٧ بە ریگای ئیستەنبوڵەوە گەیشتووینە دیاربەکر پاشان گەیشتووینە موسڵ لە رۆژی ٧ ی تشرینی یەکەمدا سەردانی دهۆکمان کرد، دهۆک گوندێکە نزیکەی شەست ماڵ دەبن بایەخێکی مام ناوەندییان هەیە خەڵک لەسەر بانەکان بە دار و چرۆ کەپرۆکەیان دروستکردووە تێیدا دەژین (binder ، 578،1952 p) تابلۆی ژمارە (٢) دەردەکەوێ کە لە بانەکانەوە راوەستاون گفتوگۆ دەکەن. کەپرێکیش لەبەر دەمی خانووەکەیان بە دار دروستکراوە بە پووش و پەرش



تابلۆی ژمارە(٤) شێوەی کەپرێکی تۆپزاوە

سەری گیراوە لە زەوی ژێریان کردووە زەوییەکەشیان تەخت کردووە بۆ کاتی حەوانەوەیان بەکاری دەهێنن. دیارە کەپرەکەش بەهێز دروست کراوە لە زەوی گیرکراوە بەرگەی ئەوە



دەگرن کە دوو کەس وەستاون لەسەر کەپرەکە (layard, 1876,p147)

(دەبلیو. ئار. هێی) حاکمی سیاسیی هەولێر لە سەردەمی داگیرکاری بەریتانیادا لە ساڵی ١٩٢٠ دا باسی ئەوە دەکا دەڵێ (لە شەقڵاوە کەپر لە ناو باخی میوەجات دروست دەکەن یانیش وەکو تابلۆی ژمارە (٣) لە هاویناندا لەناو باخ و بێستان و لەکاتی دروێنە کردندا کەپر دروست دەکەن زۆربەی جار لەسەری دەنوون یان لە ژێری پشوو دەدەن دەحەسێنەوە)، ( هێی، ٢٠١٤، لا ٤٧).

جگە لەوە نیکیتین باسی دوو جۆر خانوو دەکا کە چەسپاون لە هەمان کاتیشدا لێک جودان بریتین لە کەپر کە بۆ هاوین دروست دەکرێ (باسیل، ١٩٢٢، لا٣٣٥)، هانسن تابلۆی ژمارە (٤) باسی گوندی تۆپزاوە دەکات (لە ناو پەرێز کەپر دروست دەکەن لە هەر چوار لاوە ئەستوونی دار دەچەقێنن ئەم ئەستوونانە سەرەوەیان دوو گۆیییە، ژمارەی ئەستوونەکان بەپێی قەبارەی کەپرەکە دەگۆڕێ، ئەم دوو گۆیانە دوو کاریتەی بە قەد خۆیان دەخەنە سەری لەسەر ئەم کاریتانە لق و پۆپی داری داوێنێ زۆر جار لاکانی حەسیری حازری پێوە دەکەن بەڵام ئەمە خۆی لەبەر با و بژ ڕاناگرێ جگە لەوە باسی ئەوە دەکات کە پیاو کەپر دروست دەکەن بۆ ئەوەی هاوینان خاو و خێزان بچنە

ناوی بە تایبەتی ئەوانەی کە خانووی هەمیشەییان چ لەبەر شوێنەکەی بێ و چ لەبەر قەبارەکەی، وەکو گەورەکان فێنک نییە. (هانسن، ١٩٨٣، لا٦٢-٩٦)



تابلۆی ژمارە (٥) کوردەکان لەکاتی بۆنەکانیاندا

زۆر جار هەبووە ئەم کەپرانە دروستدەکران بۆ بەڕێوەچوونی ڕێو رەسمەکانیان و ئاهەنگە خێزانییەکانیان لە دەرەوەی گوند و شارەکان بە شێوەیەکی پتەو جوان دروستدەکران، لە تابلۆی ژمارە (٥) میواندارى کوردەکان نیشان دەدات بۆ بەڕێوە چوونی ڕێوڕەسمەکانیان گرنگترین ئەو ڕێوڕەسمانەش (لەدایکبوون، خەتەنەکردن، زەماوەندکردن و ڕێوڕەسمە ئاینییەکان) بۆ نموونە جوولەکەکان بۆنەیەکی ئایینییان هەبوو لە کوردستان بە ناوی (کەپرە شینە) بۆ ماوەی (١٠) ڕۆژ لە وەرزی پایزدا بەڕێوە دەچێت، کەپریان دروست دەکرد جۆرەها میوەی وەرزییان دادەنا وەکو هەنار و ترێ و چاوەڕوانی باران بارین بوون بۆ ئەوەی میوەکانیان لێبکەنەوە، دەست بکەن بە خواردنی بەشێکی و دابەشکردنی بەشەکەی تری، ئەگەر هەر بارانیش نەباریبا ئەوا خۆیان ئاویان بەسەر خۆیان دەپرژاند. ( تیب، ٢٠١٢، لا٢٧٢)

٢. رەشماڵ: دروستدەکرێ لە مووی بزنیان بڕیوەتەوە مووەکەیان شۆردۆتەوە پاشان لەبەر هەتاو هەڵیانخستووە و کە لە لایەن ئافرەتانەوە دروست دەکران بە ئالەتێکی بچووکی سادە کە پێیدەڵێن تەشی، رەشماڵ جێگیر دەکرێ بە دارێکی ستوونی، ئەمەش بەکار

دەهێنرێت لە لایەن کوردە رەوەندەکانەوە چونکە دەتوانی بگوازرێتەوە کە هاوینان بە مەڕ و ماڵاتەوە دەچنە ناوچە شاخاوییەکان دەمەو پایزانیش دادەکشێنە خوارەوە بۆ پێدەشتەکان ناوچە گەرمە سێرەکان ئەوەندە لەگەڵ پیشەگەری سەنعەتکاری نەبوون بەڵکو تەنها سامانی رەوەندەکان پێکدێت لە مەڕ و بزن و چێڵ و ئەسپ و گوێدرێژ. (سدیق، ٢٠١٦، لا ٦٨)



**تابلۆی ژمارە (٦) ئافرەتی کورد لە ژێر رەشماڵ**

(هینری بیندەر)یش تایبەتمەندیی رەشماڵی کوردی دەردەخات دەڵێ (( بنەبانی رەش و بەرینی رەشماڵەکە کە لە مووی بزن دروست کراوە بە لێژییەکی توند دێتە خوارەوە بەسەر لایەنە بەرینەکانی دەورەکە، ئەو کۆڵەکەیەش کەوا لە لووتکەوە دێتە خوارەوە نیەتی بنەبانەکەش کراوە بە چەند بەشێکەوە بە یەکەوە بەستراون، لە ناوەوەش بە فەرش و حەسیر داپۆشراوە ناوبەرەیەکیش لە نێوان بەشی ژنان و بەشی پێشوازی کە دەکاتە دیوەخانی پیاوان هەیە ئەمە لە نێو رەشماڵی ئێزیدییەکاندا هەیە لە ناوەڕاستدا ئاگردانی قاوە هەیە کە بریتییە لە چاڵێکی بچووکی ئاگری تیا دەکرێتەوە هەندێ رەشماڵی سەرۆک خێڵەکانیش سەرینی نایابیان تێدایە نیشانەی دەست رۆییە) (p67,1952,bender) لە تابلۆی ژمارە (٦) ی بۆگاسیان کە ئافرەتێکی کوردە لە ژێر رەشماڵ لە کاتی چێشت لێنانە دانیشتووە خەریکی چێشت لێنانە لە دەرەوەی رەشماڵەکە بە جلوبەرگی پیاوەکەوە دیارە کە پیاوێکی ئەورووپییە ئەمەش میواندارێی کوردەواری نیشان دەدات و ئازادیی ئافرەتیش دەردەکەوێت مینورسکی لە کتێبەکەی خۆی باسی سەربەخۆیی ئافرەتی کورد دەکات دەڵێ (ژنان لە نێو رەشماڵەکانیاندا،

بە چ شانازییەکی بێ وێنە پێشوازی لە میوانەکانیان کـــــردووە) (مینورســـــکی، ٢٠١٦، لا٢٥). تــــــــابلۆی ژمـارە (٧) وێنـەی هێنـری بینـدەرە ئەمانـــەش هـــەر کۆچـــەرین دیـــارە زیـــاتر کۆچەرییـەکان رەشـماڵیان زۆر بـــەکار دەهێنـــا تێیـدا دەژیـــن چونکـــە کاتییـــە دەتـوانێ لـەکاتی گـەرمیان



**تابلۆی ژمارە (٧) ئافرەتی کوردی کۆچەری لەگەڵ رەشماڵەکانیان**

و کوێسـتان بگوازرێتـەوە، ئـەم کۆچەرییانـە شـوێنە جوگرافییەکە گرنـگ بـوو بـۆ لـەکاتی هاوینـان کـەش و هەوایـەکی گونجاوی هەیـە لـە هـەمان کاتیشدا بۆ لەوەڕاندنی مەڕەکانیش سوودیان هەبوو (bender، 1952، p67 )

رەشماڵی کوردەکان بە شێوەیەکی گشتی لە گەورەیی و فراوانیدا جۆراوجۆرن رەشماڵی وا هەیە لە دوو تا نۆ کۆڵەکەی هەیە رەشماڵ لە نۆ کۆڵەگە زیاتر نابێت ئەو رەشماڵانەی کە نۆ کۆڵەگەیان هەیە بە پەردە دەیکەن بە دوو بەشەوە پێش ماڵ و پشتە ماڵ واتە بەشێکی دیوەخانەیە بۆ پیاوانە پشتە ماڵیش بۆ ژنانە، کاتێ کە بەفر و باران و سەرما ئەبێت ئەوا پێش ماڵ و پشتە ماڵ دائەپۆشی وە لە هەردوو لادا ئاگر دەکرێتەوە رەشماڵەکە گەرم دەکەن (بایەزید، ١٩٨٢، لا٧٠-٧٤)

ژاک دمورگان رۆژهەلاتناسێکی فەرەنسییە لە ساڵی ١٨٩٧ وەکو سـەرۆکی وەفـدێک دێتـە ئێـران دەسـت بـە لێکۆڵینـەوە دەکـات لـە نێـو کوردەکان، باسی رەشماڵی کوردەکان دەکات لە وێنەکەدا دیارە دەڵێت: ((رەشـــماڵی کوردەکـــان وەکـــو هەمیشـــە ئاســـاییە و لـــە قوماشـــێکی لاکێشـــەیی مـــوویی فـــراوان پێکـــدێت لـــە کـــاتی بەکارهێنانیـــدا ریـــزی ناوەڕاستی بە دار و ئامرازی لە شێوەی عەموود بەرز رادەگیرێ بەڵام

چەندیەتی فراوانی و چۆنایەتی ئەم خێوەتانە بەپێی چەندێتی خێزانی ناو خێوەتەکە و باری ئابووریی خێزانەکە جیاوازە، خێوەتەکانی خێڵەکین لە شێوازی حەسیرەکانن و گەورەترن و بۆ چەند بەشێک دابەش دەکرێن)) نموونەیەکی چادر دەهێنێتەوە خێوەتی سەرۆکی خێڵی مەنگوڕ واتا باپیر ئاغا، لە تابلۆی ژمارە (٨) دیارە ئەمە گەورەترین و فراوانترین خێوەتە کە من لەم سەفەرەی خۆمدا لای کوردە کۆچەرییەکان بینیومە، درێژایی ئەم خێوەتە زیاتر لە ١٣ مەترە، دەوری خێوەتەکان ماوە ماوە ئەڵقەیان تیا دروست کراوە ئەم ئەڵقانە بۆ بەستنی خێوەتەکان بە ئەرز کەلکیان لێ وەردەگیرێ بۆ ئەوەی لە گواستنەوە و ئاڵوگۆڕ تێیدا ئاسانتر بێت ئەوا خێوەتەکان بۆ چەند بەشێک دابەش دەکرێت ئەو شوێنانەی لە ناو خێوەتەکە دووراونەتەوە بە پارچەیەکی تری قوماش دەشاردرێتەوە بەم شێوەیە خۆڕاگریی ئەم بەشە زیاتر دەبێت، بەشێک لە ناو خێوەتەکە کە بەشێکی بچووکە بۆ راگرتنی خواردەمەنییەکان تیایدا تەرخان کراوە بەشێکی تر بۆ زۆرینە لە خۆ دەگرێت بۆ دانیشتن و حەوانەوەی خێزان کەلکی لێ وەردەگیرێ گشت چالاکییەکانی ماڵەوە لەم بەشە ئەنجام دەدەن، لە ژوورەوەش ئاگر واتا سۆپا دانراون بۆ خۆ گەرمکردنەوە (موردگان، ٢٠١٢، -٤٦-٤٨) تابلۆی ژمارە (٩) تابلۆی هینری بیندەر ژیانی ئەم کۆچەرییانە دەردەخات زۆر جار هەبوو دوو یان سێ خێزان بە یەکەوە دەژیان تاکو زستان لە گەڕانەوەیان بۆ سوود وەرگرتنی ئەم کەشەیان لەم وێنەیە



تابلۆی ژمارە (٨) نەخشەی رەشماڵێکی کورد

دوو ئافرەتی کۆچەرین یەکیان خەریکی مەشکەکەیە بۆ ئامادەکردنی و دروستکردنی دۆ لە شیرەکەیان و ئافرەتی دەستە راستیش خەریکی منداڵەکەی خۆیەتی، هەژاری لەم خێزانە دەبینرێ بەهۆی ئەوەی چادرەکەیان بچووکە و کەلوپەلەکانیشیان سادەن.

ئەدمۆندز لە سەفەرنامەکەی خۆیدا باسی رەشماڵ دەکات دەڵێ لەگەڵ رەشماڵی عەرەب لێک دەچن کە لە مووی بزن دروستکراوە بەپێی پانیی رەشماڵەکە پارچەکان بەیەکەوە دەبەسترێتەوە لە ناوەوەش بە شێوەیەکی گونجاو بەرزدەکرێتەوە بە ستوونێکی دار کە لەگەڵ با و باران و کەش و هەوادا بگونجێ چیغیش بۆ دابەشکردنی رەشماڵەکە لە ناوەوە بەکار دەهێنن قەبارەی رەشماڵەکە پێوەرە بۆ ناوبانگی و دەستڕۆیشتی خێزانەکە. لە نێو هۆزی جافدا دوو جۆر رەشماڵ هەن تایبەتن بە زستان و هاوینەوە. (ئەدمۆندز، ١٩٧٢، لا ٣٢) هەموو کۆچەرییەکان هەژار نین زۆر جار هەبووە دەوڵەمەندیش بوونە بەڵام هەر کۆچەریش بوونە ئەمە نەریتیانە. زۆر لە رەوەندەکان هەبوونە باسی ئەم کۆچەرییانەیان کردووە لەوانە باسیل نیکیتین ئەوەندە جوان باسی ژیانی کۆچەرییەکان دەکات وا لە مرۆڤ دەکات حەز بکات ببێ بە کۆچەر، نەریتی ژیانیان نمایش دەکات لە کتێبەکەی خۆی بێگومان ئەم نەریتانەش ئەمرۆ لەگەڵ نیشتەجێبوونی کۆچەرییەکان لە شار و گوندەکان خەریکە نامێنێ چونکە پەروەردەکردنی مەڕ لە کوردستان پێویستی بە دوو جار کۆچ هەبوو بەهارە بۆ چیا و شوێنە بەرزەکان پایزانیش گەڕانەوە



تابلۆی ژمارە (٩) خێزانێکی کوردی کۆچەری هەژار

بۆ دەشتەکان، باسی وەرزی زاوزێی دەکات نەریت وابووە هەر کوردێکی دەستڕۆیی بەرخێک سەر ببڕی لە دەرەوەی چادرەکانیان بۆ مێوانەکان لێی بنێن لە شێوەی ئاهەنگ ئەنجام دەدرا پاش نان خواردنەکەش لاوان بە گۆرانی و هەڵپەڕکێ ئاهەنگیان گەرم دەکرد پاش لێبوونەوەیان هەموویان داوایان لە یەزدان دەکرد ئەو خاوەن خوانە بپارێزی مەڕو ماڵاتی لە نەخۆشی دووربێت شیر و رۆنیان بەرەکەت بکات (نیکیتین، ١٩٢٢، ل٣٥٧) لەم تابلۆی ژمارە (١٠) ژیانی کۆچەرییەکان دەردەخا کە مەڕو ماڵاتیان هەیە وا دیارە خێزانێکی گەورەن ئافرەتەکان خەریکی کارن، پیاوەکانیش لە ژێر چادرەکە خەریکی گفتوگۆن بە دەم کێشانی پەمپەوە، ژنە کۆچەرییەکان هەم کاری ماڵەوە دەکەن هەم کاری دەرەوەش دەکەن، بەیانییان زوو لە خەو هەڵدەستن ئالیک ئەدەنە ئەسپەکانیان مەڕو ماڵاتیان ئەنێرنە دەرەوە شیر ئەکوڵێنن بۆ ئەوەی ماست و رۆن دروست بکەن، زۆربەی کاری ماڵ لە لایەن کۆچەرییەکانەوە بەدەست ئافرەتانەوەیە. هەرچی جلوبەرگ و راخەر هەیە خۆیان دروستی دەکەن و دەیچنن لە وێنەکەدا دیارە ئافرەتێک لەبەر رەشماڵەکەیەوە خەریکی دروستکردنی رایەخێکە.

شەرەفخانی بەدلیسیش لە تابلۆکانیدا باسی رەشماڵی کردووە باسی گەیشتنی شا تەهماسبی کوڕی شا ئیسماعیلی سەفەوی دەکات بۆ شاری خەلات باسی ئەو داوەت و دیارییانەی کردووە، جگە لەوە شا تەهماسب لە



تابلۆی ژمارە (١٠) خێزانێکی گەورەی کۆچەری

تابلۆکەدا لەسەر تەختی نەخشداری جوانی ژێر چادرێکی شین و بە نەخشداری گیایی و ئەندازەیی رازێندراوەتەوە دانیشتووە بە چوار مەشقی، چادرێکی دی وا لە پشت چادرەکەیە نەخشی گیایی لەسەر نییە شەرەفخان نووسیویەتی چادری سوور و شین و چادری گوریسی لە ئاوریشم و بۆ شا و لەشکرەکەی هەڵداوە تەختی زێڕین و زیوینی بۆ ئامادە کردوون، تیپی موسیقاش لەبەر دەمی شا ئامادەیە، دوو خزمەتکاریش لە دەستە چەپن (یوسف، ٢٠١٢،لا ١٩٦-١٩٧.)

ئەولیا چەلەبیش لە سیاحەتنامەکەی خۆی دیارە رەشماڵی کوردی جیا کردۆتەوە باسی چاوپێکەوتنی مەلیک ئەحمەد پاشا و خانی پایە بەرزی بەتلیس عەبدال خان و میوانداری گەورە دەکات دەڵێت( پاش ئەوەی خان گەیشت و بەرەو پاشا هات پاشان دابەزین و باوەشیان پێداکرد و خان گوتی ((فەرموون خوار ببنەوە و لەم نزیکانە بەرقەلیانێک بخۆن)) دوای ئەوە گەیشتن لە ناو مێرگێک سەرانسەری دەشتەکە بە ئۆبەی تورکمانی و خێوەتی تورکمانی و رەشماڵی کوردی رازاوەتەوە، دوای هەستانی خان سەری بۆ پاشا دانەواند پێی گوت ((گەورەم ئەم حەوت خێمە و کە تێیدا حەسانەوە لەگەڵ پەنجا قاپی زیوی فەخفوری هەموو فەرش و حاجاتەکانی تر تکام وایە لێم قبوڵ بفەرموون))) (چەلەبی، ١٩٦٧، لا٩٩).



**تابلۆی ژمارە (١١) ژمارەیەک لە کۆچەری جاف لە ناوچەکانی شارەزوور**

زۆر جار هەبوون ئەم رەشماڵانە زیاتر لە خێزانێکی جێگیر بوون ئەمەش زۆر جار خزمی یەکتر



وێنەی ژمارە (١٢) خانووی مەلا صالح چەلەبی لەسەر قەڵای هەولێر

بوون وەکو تابلۆی ژمارە (١١) ی میجەرسۆن لە گەشتنامەکەی خۆی ئاماژەی بەوە کردووە کە ژمارەی کۆچەرییەکانی جاف کە هەر خێزانێک یان زیاتر لە چادرێک بوون، سەرەتا ئەم خێڵە جافانە لەژێر کاریگەریی ئەردەڵانەوە بوون واتا سەر بە ئێران بوون دوای ئەوە دوژمنایەتی دروست بوو لە نێوان بەگەکانی جاف و بەنی ئەردەڵان بەشێکی گەورەی جاف ١٠٠٠٠ دە هەزار خێزان دەبوون ڕەویان کرد بۆ خاکی سلێمانی ئیدی بەو هۆیەوە پەیوەندییان بە حوکومەتی تورکیاوە کرد ڕێگەیان دا هەواری خۆیان لەم شوێنانە هەڵبدەن وەکو دەشتی شارەزوور وەکو لەم وێنەیەدا دیارە باسی چادرەکانی جاف دەکا لە ناوچەکانی شارەزوور (سۆن، ١٩٧٠، ل٢٣٨-٢٤٨ )

٢. **خانووی هەمیشەیی:** ئەمەش دوو جۆرە : (کۆشک) : ئەمانەش تایبەت بوون بە چینی حاکم و دەوڵەمەندەکان و ئاغا و چینە باڵاکان چونکە بۆ دروستکردنی پارەیەکی زۆری دەوێ، و پێکهاتبوو لە پانتاییەکی فراوان و چەند ژوورێکی زۆر و لە ژوورەوە باخچەی هەبووە و تایبەتمەندی جیاکردنەوەیان بە جوانکاری زەخارف و نەخش ڕازێنرابۆوە، وەکو خانووەکانی سەر قەڵای هەولێر و قەڵای کەرکووک و گەڕەکەکانی سلێمانی کە بەشێکی گرنگی بیناسازی سەر

قــەڵای هــەولێر پێکــدەهێنن، گەڕەکی سەرا کە تایبەت بوو بــە ئاغــا و دەوڵەمەنــدەکان وێنــەی ژمــارە (١٢) (خــانووی مــەلا صــالح چەلــەبی). کــە شــێوازی دروســتکردنی ئــەم خانووانە جیاواز بوون لەگەڵ خانووەکــانی تــری گــەڕەکی هــەژارەکان هــەم لــە رووی پێکهــاتی ئــەو مادانــەی لێــی دروســت دەکــران کــە بــە کــەرپووچ و گرانیــت و هــەم شــــــێوازی گرنگیــــــدانی خانووەکانیــــان لــــە رووی جوانکارییەوە کە بە زەخارف و تاق و کۆڵەگە و نووسین و نــــافوورە دەڕازێنــــراوە وە

**تابلۆی ژمارە (١٣) تابلۆی شەرەفنامە**

تایبەتمەندییێکی تری کۆشک ئەوەیە لە دوو چین پێکهاتووە چینێکیان پێکهاتووە لە ژێر زەمین سەردابی هەیە زۆر جار هەبووە تەنها یەک خــانوو ســێ ژێــر زەمینــی هــەبووە وە چینێکــی تریــان پێکهــاتووە لــە ژوورەکان کە دابەش کراون لە دەوروبەری حەوشە، دەرگاکانیش لە داری کۆن دروستدەکرێ هەندێ لەو دەرگایانە یەک دەری بوون بە بزماری ئاسنینی ئەبڵەق ڕێکخراو بە شێوەیەکی ئەندازەیی جۆراو جۆر لەسەر رازێنرابوونەوە لەسەر رووی هەر دەرگایەکیش گرێیەک هەیە دوو دەسکی رازاوەی رووەکی لەسەر کە هاوشێوەی ئەو دەرگایانەیە کە لە بەغدا بەکار هاتووە، پەنجەرە ئاسنینەکانیش کە بە زۆری لە ناوچەی کوردستان بەکاردێت، زۆر جار هەبووە ئەو کەسە پارچە

زەوییەکی بچووکی لە بەرامبەری هەبووە ئەویشی هەر کردۆتە خانوو بەهۆی قەمتەرێکەوە بەیەک دەگەیەنران ئەوەی لە ماڵی عەبدوڵا ئاغا لە گەڕەکی سەرای لە قەڵای هەولێر وە ئەمە لە موصلیش ئەوە دەبینرێ و لە قەڵای کەرکووکیش ئەوە دەبینرێ (حسین، ١٩٨٦، ص ٢١٩-٢٣٠)

بە شێوەیەکی گشتی خانووی کوردی ناتوانرێ جیا بکرێتەوە لەگەڵ خانووە بڵاوانەی سەردەمی ئیسلام لە ناوچە ئیسلامییەکان بەڵام گۆڕانکاری لێ دەکرێ لە هێڵکاری و ئەو مادەیەی لێی دروست دەکرێ بەپێی ناوچەی جوگرافی بەهۆی کەش و هەواوە و ئەو مادانەی کە لەو ناوچەیە بەکاری دەهێنن،

بەپێی هەندێ زانیاری کۆشکی ئەمیرەکانی کورد بەناوبانگ بووە پارەیەکی زۆری لێدەدەن لە رووی جوانکاری ئەو مادانەی کە بەکاری دەهێنن، پێکدێت لە چەند چینێک، وەکو ئەمیری دەولەی مەروان کۆشکێکی دروستکردووە لە شاری نصرییە لەسەر دەریاچە و چەند گەرماوێکی دروستکردیە جگە لەوە بیستان و باخچەیەکی گەورەشی لەسەر دروستکردووە ( عزت، ٢٠٠٩، لا ١٣٢)) ئەولیا چەلەبی ئاماژە بە کۆمەڵێ خانووبەرەی ئەمیرەکانی بەتلیس دەکات لەوانە ئاماژە بە کۆشکی خەوەرنەق دەکات کە سلێمان پاشا دروستی کردووە ژووری تایبەتی پاشای لێکراوە ساڵی ١٠٥٥ ی لێ نووسراوە، کۆشکێکی تر کۆشکی بەرز کە عومەر پاشای کەتانچی لەگەڵ ئاوەدانکردنەوەی وان دروستی کردووە ساڵی ١٠٥٦ی لێ نووسراوە کە چل تا پەنجا ژوور هەیە لە چەند قاتێک پێکهاتووە لە قاتی خوارەوە مەیدانێکی زۆر فراوان لە ناوەڕاستیەتی پەنجەرەکانی خوارەوە بەسەر باخێکی وەکو بەهەشتدا دەڕوانێ بەردەمی دەروازەکەی مەیدانی دەرەوەی سەرایە کە مەلیک ئەحمەد پاشا هەموو رۆژ لەوێدا تەپڵ لێدەدات ئاغاکان سوارچاکیی خۆیان دەنوێنن. جگە لەمانە ئاماژە بە کۆمەڵێ سەرا دەکات. (سعید، ص١٧٢)

کۆشک و تەلاری دەوڵەمەندەکان کە تاکو ئێستا ماون زۆربەیان کە دەگەڕێتەوە سەردەمی عوسمانی گۆڕانکاریی جیاواز لە هەمان نەخشەی ماڵەکان پەیڕەو دەکران خانووەکان بەشی پیاوان و ئافرەتانیان جیاواز بوون هەندێ لە خانووەکان بەچەند پەیژەیەک دەچینە بەشی سەرەکی خانووەکان بە جۆرێک خانووی شارنشینی لەگەڵ خانووی گوندەکان لە رووی دیوار و رووی دەرەوە و نەخشەکان جیاوازییان هەبوو، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی خانووی شارەکان رووی دەرەوە هیچ جۆرە زەخرەفەیەکی لەسەر نەبووە تەنها لە رووی ناوەوەی خانووەکان بە شێوەیەکی زۆر فراوان دەکران بۆ جوانکاری کۆشکەکانیش تەواو فراوان بوو بیناکانیان حەوشەی هەبووە هەیوانی فراوان و لە دەوری حەوشەکە چەن ژوورێک دروستدەکران، جیاوازی ئاستی بڵندی نێوان بەشەکانی ماڵەکە شێوەیەکی سەرنج راکێشی هەبوو کە چەند باڵکۆنێکی فراوانی دروستدەکران ئەم ژوورانەش بە چەند ڕاڕەوێک بە یەکتر دەبەسترانەوە، لە خانووە گەورەکان ئەو بەشانەی حەوشە کە دەکەوێتە بەرامبەر یەکتری رۆڵی ژووری زستانە و هاوینەیان دەبینی، ژێر زەمینەکان لە زستانان رۆڵی ژووری دانیشتنیان دەبینی (سکێرس، ٢٠١٢، ل١١١-١١٥). وە بە کاشیش رووپۆش دەکران و بە کەرپووچ دروست دەکران، وەکو ئەوەی شەرەفخانی بەدلیسی لە تابلۆی ژمارە (١٣) باسی بیناسازی شاری هیزان دەکات کە بەشێکی خانووەکانیان بە کەرپووچ دروستکراون و بە کاشی پرتقالی رووپۆشکراون و وە لە چەند تابلۆیەکی شەرەفنامەدا وێنەی کاشی هەیە کە زۆر پێدەچێ ئەو کاتە کاشی لە کوردستان بەکارهاتبێ جا چ لە کوردستان دروستکرابێ یا لە دەرەوە هێنرابێ (یوسف، ٢٠١٢، ل ١٧١) هەروەها لە سیاحەتنامەکەی ئەولیا چەلەبی لە بدلیس باسی حەمامی باخ دەکات گوتوویەتی دیوارەکانی گومەزەکەی بە کاشیی چینی رازێندراوەتەوە و قەسیدەی فضولی لە بارەی حەمامەوە بە دەستخەتی محەمەد رەزای تەورێزی لەسەر ئەم کاشییانە



وێنەی ژمارە (١٤) خانووی شێخ جەمیل ئەفەندی

نووسراون، (چەلەبی، ١٩٦٧، لا ١٢٨) كەرەستە و شێوازەكانی بیناسازی و رێگاكانی دروستكردن رازاندنەوە رۆڵیان لە بوونی ئەو جیاوازییە هەرێمییەی كە مۆركێكی جیاكراوە بەماڵەكان دەبەخشێت هەبووە، یا دروستكردنی وێنەی هەمەڕەنگی شین و سەوز پرتەقاڵی كاڵ بۆ رووپۆشكردنی ماڵە گەورەكان ناوەندێكی نموونەییە، هەروەها فرە رەنگی زۆر لە رێگەی قایمكردنی پارچە شووشەی رەنگاو رەنگی سوور و زەرد و بۆ ئەو چوارچیوە دارینەی لە تاقی نیوە بازنەیی سەر دەروازەكان یان بۆ پەنجەرەكان بەكار دەهاتن (سكێرس، ٢٠١٢،. لا ١١١-١١٥.) لە لایەكی ترەوە هەندێ خانووەكان سادە و ساكار و بچووكن كە پێكدێت لە هەیوانێك و دوو ژوور لە لاكانی هەیوانەكە و حەوشەیەكی بچووك و ژێرزەمینێك و چێشت لێنەرێك هەتا ئیستاش ماون لە ناوچەكانی هەولێر و كەركووك و ناوچەكانی تر، هەندێ لە خانووەكان باخچەشیان هەبووە، جگە لەوە دیواری خانووەكانیان شورفە و تاق و ستوونی دار هەبووە وەكو خانووی شێخ جەمیل ئەفەندی لەسەر قەڵای هەولێر وێنەی ژمارە (١٤). ئەو مادانەش كە بەكار دەهاتن بۆ دروستكردنی خانووەكان لە رووی جوگرافیاو زۆری و هەرزانی مادەكانەوە گۆڕانكاری لێدەكران، وەكو بۆتان بە بەرد خانوویان دروستدەكرد وە حلوان لە بەردو قوڕ وە سیروان زۆربەی بیناكانیان گەچ و بەرد بوون هەندێ خانووی لە قوڕیش وەكو ئەوەی



وێنەی ژمارە (٥) خانووی گوندەکان

(معلثایـــــــــا)، وە سەقفەکانیشـیان لـە دار دروســــــتدەکرد کــــە چیاکـانی کوردسـتان بـە ناوبانگە بە دار .

بـــــەڵام جـــۆری دووەمــــی خــــانووی خـــەڵکـی گشـــتییەکانن: ئـــەم جۆرەیان بـە گشتی [illegible] ەوە پانتاییەکـەیان بچووکـەو هـیچ زەخـرەفـەو جوانکارییـەکی تێـدا نـەکراوە وە لـە یـەک چـین پێکهـاتووە هـەموو بەشـەکانی لـە یـەک چـین کۆبۆتـــەوە (یوســف، ٢٠٠٧، ص ٥٨٨-٥٩٢) خـــانووی هەمیشـــەیی لـــە زۆر کەرەسـتە دروسـت دەکرێ لـە هـەر جێگایـەکیش لـە سـەرەتادا لـە قوڕ دروسـتیان دەکرد و بانەکـەیان بـە کاریتـەی دار چنـار دروسـت دەکـرد، دوای ئـەوە گۆڕانکـاری لێکـرا ئـەو مادانـە بـە بـەرد دروسـتیان دەکـرد نموونە لە نزیک شاخەکانی ئێران کە بەردی زۆرە بە بەرد دروسـتیان دەکرد لە کاتی دیوارکردندا دارســـیلە داوێنە ناو ڕیزی دیوارەکان بۆ مەلاتیش تەنکە قوڕێک لەسـەر ڕیزەکـان ڕوو دەکـەن یـان هەر بە بێ مەلات دەیکەن، بەڵام خانووی نوێ بـە کـەرپووچ و چیمـەنتۆ دەیکـەن کـە دیوارەکـانی بـە گـەچ سـواق دەدەن لـە لایـەکی تریشـەوە خانووی گوندان بە خشت یان بەردی ناڕێک وەک تابلۆی ژمارە (١٥)ی هانسن دروستکراوە هـەر لـەو شـوێنە قوڕ دەگرنـەوە واتـا خـۆڵ و ئـاو لێـک دەدەن و پیـاو و ژن دەیشـێلن دوای ئـەوە قوڕەکـەیان گرتـەوە دەیکەن بە خشت، وە بەردیش بۆ بناغـە بـەکار دەهێنن خشـت بـە قالب بڕێکی لاکیشەیی دەبڕن و سەری لووس دەکەن و قالبەکە دەردەهێنن و خشتەکە لە جێی خۆی دەهێڵنـەوە چەند ڕۆژێک ئینجا وشـک دەبێتـەوە بـەکاری دەهێـنن، پەنجـەرەیان لاکێشـەییە و تاقیشـیان تێـدا دروسـت دەکەن و پێی دەڵێن دەلاقە (هانسن، ١٩٨٣، لا٦٤-٦٥).


**وێنەی ژمارە (١٦) خانووی لە بەرد دروستکراو**

کورد بە گشتی خانوو لەسەر شوێنی بەرز دروست دەکات وەکو سنجار و ئاکرێ و هەولێر و ناوچەکانی هەورەمان و کەرکووک بێجگە لەوە دیوارەکانی بەرزن وەکو شاری ماردین، وەکو ئەوەی ئەولیا چەلەبی لە سیاحەتنامەکەی خۆیدا باسی خانوو بەرەکانی ئەو ناوچانە دەکات کە سەردانی کردووە وەکو ئەولیا چەلەبی دەڵێ (( بەتلیس بە قەڵای ناو وارش پێنج هەزار خانووی خۆش و ئاوەدان لە حەڤدە گەڕەکدا کۆبوونەتەوە زۆریان حەواڵەیان بەسەر یەکەوەیە هەندێکیان کەوتۆتە سەر بەرزایی هەوایان خۆشە و بە قوڕ سواخ دراون)) (چەلەبی، ١٩٧٩، لا ١١٢) هەندێ جاریش لە گوندەکان پاشماوەی گیانەوەر و وشکیان دەکردەوە بۆ دروستکردنی خانووەکانیان بەکاریان دەهێنا.

هینری بیندەر دەربارەی تابلۆی ژمارە (١٦) نموونەی خانووەکانی ئامێدی دەهێنێتەوە کە، ئەو خانووانەی کە لە باشووری کوردستان دروستکراون لایەنی ئابووریيان لاوازە دەڵێ ((ماڵەکان لە قوڕ یان لە بەرد دروستکراون بنە بانەکانیش پانن ژوورەکان بچووکن و هەمیشە تاریکن، کۆڵەگەکانیش بە دار دروستکراون، نهۆمی دووەمی خانووش کەم دەبینرێت زۆربەی جاریش دەرگایان نییە بۆ داخستنی ژوورەکان و خانووەکان وە پەنجەرەکانیش شووشەی پێوە نییە بەڵکو زیاتر لایلۆن بەکار هاتووە بۆ داپۆشینی ژوورەکان هیچ جۆرە تفاقێکیان تێدا

نییە ئەوەی میوان بەرچاوی بکەوێ سەماوەرە کە چای تیا دروست دەکرێ کە لەسەر ڕەفەیەک دانراون لەگەڵ بەڕەیەکی کە لەسەر زەوی رادەخرێت، ژمارەی ژوورەکانیش لە خانووێکەوە بۆ خانووێکی تر جیاوازە، وە لە نێو خانووەکە جێگای تایبەت بۆ ئاژەڵ هەیە)) (p188،1887،bender)، لە ناوچەکانی هەورەمانیش خانووەکان وەکو پێبلیکانە یەک بە تەنیشت یەکەوە یەک بەسەر یەکەوە دروستکراون چونکە لەم جۆرە پەیڕەوانەدا سوودی زۆری هەیە و هەندێ لەو سوودانەش دراوسێ لە کاتی تێگیراندا زوو بە دراوسێ دەزانێ و زوو بە هانایەوە دێ، جگە لەوە بە پاڵدانی دیوارەکان بە یەکترییەوە ژوورەکان گەرمتر دەبن بۆ بڕینی دیوارەکان هەرگیز نابڕدرێن، لە کاتی هێرش هێنان بۆ سەریان زۆر زوو هەمووان پێدەزانن دەستوبرد توانای بەرەنگاری کردنیان دەبێ، باشتر پاس دەکرێن لەوانەی ئەگەر خانووەکانیان پەرژ و بڵاو بوونایە. (هەورەمانی، ٢٠١٦، لا ١٠٥٣-١٠٥٤).



تابلۆی ژمارە (١٧) خانووی شێخ تەیفور لە تۆپزاوە

ریچ لەکاتی سەردانەکەی بۆ کوردستان لە گەشتنامەکەی خۆیدا کۆشکی ساکاری هەندێ لە ناودارانی کورد سەرنجی راکێشاوە، ئەمەش گەڕاندیتیەوە بۆ

بەرقەرار نەبوونی سیاسی و ئاستی گەشەنەسەندنی بیناسازی، ئەمە هەر لای میرەكانی كورد ئاشكرا بووە هەر بۆیەش مەحمود پاشای میری بابان لەگەڵ ریچدا گفتوگۆیەك دەكا داوای لێبووردنی لێ دەكا كە ئاستی بیناسازی لە سلێمانی ئەوەندە نزمە دەڵێت ((ئەوەی بینایەك لێبدات یا كارێكی ئاوەدانی بە ئەنجام بگەینێ دڵنیا نییە پێی شاد دەبێت چونكە دوور نییە ئێران یان توركەكان داوای لێبكەن كە دەستی لێ هەڵگرێ)) هەتا ریچ باسی كۆشكەكەی مەحمود پاشای میری بابانی كردووە دەڵێت ((رێڕەوەكەی نزم و تەسك و نابووت و پیس بوو، كە هەرگیز شیاوی ئەوە نییە ببتە شوێنی نیشتەجێبوونی فەرمانڕەوا، بەڵكو شیاوی پیاوێكی ئاسایی نێو كۆمەڵە)) بەڵام ریچ لێرەدا بۆ ئەوەی گەڕاندۆتەوە كە ببێتە مایەی بەرگریكردن لە كورسی پاشایەتی لە كاتی نائاساییدا.

ریچ زۆر بە وردی باسی ئەو خانووەی كردووە كە ئەو ماوەیە تێیدا بەسەری بردووە دەڵێت ((دیوەخانێكی لێبووە، لەگەڵ دوو حەوشە پانتاییەك سەوز و گیا بووە داری چنار و گوێز و تووی لێبووە، وەكو حەوشەكانی تری خانووەكان جۆگەلەیەكی بچووكی ئاوی كارێزی پێدا تێپەڕ بووە)) (ریچ، ١٩٥١، لا ٥٦-٦٠)

جگە لەوە میجەر سۆن لەكاتی سەردانەكەی بۆ سلێمانی باسی چەشنی بیناسازی كوردی كردووە لە سلێمانی لە گەشتنامەكەی خۆیدا، باسی نموونەیەك لە خانوو دەكات دەڵێت ((خانووەكە ژوورەكانی لە قوڕ دروستكراوە، سێ ژووریان دیواری نەبووە فێنك بووە بۆ هاوینان، ریزێك ژووری زستانەی هەبووە تەنها یەك دەرگای قایمی پێوە بووە بە گەچ سپی كرابوو، ئەوانی تر بە قوڕ سواغ درابوون، زەوییەكەش هەر قوڕ بووە و باسی ئەو كارێزەشی كردووە كە ریچ ئاماژەی پێكردووە)) (سۆن، ١٩٧٠، لا ٢٥٠)

جگە لەوە هانسن لە گەشتنامەكەی خۆیدا دەربارەی ئافرەتی كورد لە بەشێكی بە تێر و تەسەلی باسی بیناسازی كوردی دەكات و

چۆنیەتی دروستکردنی و ئەو مادانەی کە دروستدەکران و چەند نموونەیەکی خانووی هێناوەتەوە لە ناوچەکانی هەولێر و تۆپزاوە (هانسن، ١٩٨٣، لا ٦٣) وەکو تابلۆی ژمارە (١٧) نموونەیەکی




**تابلۆی ژمارە (١٨) دیوەخانی ئیبراهیم ئاغا لە مەخمور**

خانووی شێخ تەیفور ی هێناوەتە بەر باس دەڵێ خانووەکە لەسەر تەلان دروست کراوە بە تاقی تەنێ هەڵکەوتووە خانووەکە بە خشت دروست کراوە خشتی وشککراوی بەر هەتاو بناغەی بەردە بە کا سواخ دراوە بانەکەی بە کاریتەی چنار دارەڕێ کراوە بە قوڕ پەستێکی باشی کراوە بە باگوردان پەستراوە، خانووەکە سێ بەشی هەیە لای ماڵێ، لای باخچە لای دیوەخان لای ماڵێ هەیوانێکی گەورە و لەگەڵ ناندينەک روویان لە حەوشە، باخچەش دیوارێکی نزمی هەیە دەرگایەک و ڕاڕەوێکی هەیە، دەرگای خانووی ماڵی دەرگایەکی تەسکی داری هەیە بە کۆسپەیەکی دوو پایە بەرز دەچیتە ژوورەوە دیوەخانێکی هەیە هەرچەندە دیوەخانەکە چەند پەنجەرەیەکی بەرزی هەیە ئەوەندە بەرزن کەس پێی ناکرێ لەو پەنجەرەوە بەشەکانی تری خانووەکە ببینی (هانسن،١٩٨٣، لا٧٣-٨٥)

لە هەمان کاتدا دەبلیو. ئار. هەی. حاکمی سیاسی هەولێر لە سەردەمی بریتانییەکان لە گەشتنامەکەی خۆیدا بە ناوی دوو ساڵ لە کوردستان ئاماژەی بە ماڵە ئاغاکانی شار داوە کە ژیانێکی ئارام و جێگیریان هەیە، باسی خانووەکانیان دەکات دەڵێ ((ژوورەکان لە دەوری حەوشەکەدان کەمێک دار و درەختی تێدا رواون وە دیوەخانەکانیشیان جوان بنیاتنراوە لە کەرپووچ دروستکراوە هەیانە

زەوییەکەشی بە مەرمەڕ داپۆشراوە و بانیژەی هەیە، ئاغاکان لە دیوەخانەکانیان پێشوازی لەو میوانانە دەکەن کە دێنە شار)) باسی جۆرێکی دیکەی خانوو دەکات کە هی ئەو جوتیارانەیە کە هەژارن کە لە دوو ژوور یان سێ ژوور پێکدێت و تەوێلەی ئاژەڵی تیایە کە مەڕو ماڵات تێیدا دەخەون داری سووتاویشی تێدا هەمبار دەکا زۆر جار هەبووە چێشتیشی تێدا لێدەنێن لەگەڵ ئەو هەموو شتانەشدا تەنیا دیوارەکانی نەبی ڕەش هەڵگەڕاون بە دووکەڵ ئیدی هەموو شتێک پاک و خاوێنە ڕەنگە جوتیار چینێکی هەندێ بە تواناترە لە دوو ژوور یان سێ ژووری هەبێ، موختاری گوند بە گشتی ماڵێکی ڕێکتری هەیە دیوەخانێکی سەربەخۆی هەیە میوانداری برادەرەکانی ڕێبوارانی بکات) لە لایەکی ترەوە زۆر بە فراوانی باسی دیوەخان دەکات خشتەیەکیشی بۆ دروستکردووە لە تابلۆی ژمارە (١٨) دیارە دەڵێ ( بەر بڵاوترین دیوەخان ئەوەیە کە لە دوو ژوور و بانیژەیەک پێکهاتووە، هەموو دیوەخانێک مزگەوتێکی هەیە کەس ڕێگری نییە ئەوەی ئەوروپییەک لە دیوەخان بژی، لە زستانیشدا ژوورەکە بە ئاگردانێکەوە گەرم دەکرێتەوە کە دووکەڵەکەی لە بنمیچی دووکەڵکێشەوە دەچێتە دەرەوە،

نموونەیەکی دیوەخانێک دەهێنێتەوە لە مەخمور سەرۆکی دزەییەکانە (ئیبراهیم ئاغا) کە لەگەڵ گەیشتنی فەرمان بە خزمەتکارەکان دەکا ڕایەخ و بالیف بێنن و ژوورەکە چۆل و پاکە، بە خێرایی ڕایەخ و سەرینیان هێنا لە بن دیوار و لای سەرەوەی ژوورەکە ڕاخران، مافووری تایبەت بۆ ئێمە ڕاخران ئێمەش پێڵاوەکانمان داکەند و چوار مەشقی لێی دانیشتین، کە سەرینەکان دانران یەکسەر ئاو ڕشێن کران تا بە پاکی و فێنکی بمێنێتەوە ئەگەر کەش و هەوا گەرم بوو ئەوا پارێزگاری لە ژوورەکە دەکەن (هێی، ٢٠١٤، لا ٤٩-٥٩)

بە هەمان شێوە میجەر سۆنیش باسی هەمان خانوو دەکات کە پێیان گوتووە مسافرخانە، دەڵێ (کە چوومە ژوورەوە ژوورەکانی بەرین و پاک و خاوێنن کە شێوازێکی کوردی لە خۆ گرتووە مەگەر

بینای بەدەگمەن هەبێ لەم چەشنە لە کوردستان) باس دەکات وەکو هۆتێل بەکار هاتووە خەڵکی بیانی توانیویەتی لە ناوی بحەوێتەوە ئینجا دێتە سەر وەسفکردنی دیوەخانەکە دەڵێ (کراوە بە دوو بەش بەشێکی تایبەتە بە ڕێبوارانەوە بەشێکی تری بۆ وڵاخەکانیان تایبەت کراوە (تەویلە) (سون، ١٩٧٠، ل٢٥٠)

## لیستی سەرچاوە کوردییەکان


١. ئیزەدی، میهرادی: و، ئەمین شوان، چەردە باسێک لە بارەی کوردانەوە، سلێمانی، دەزگای چاپی سەردەم،٢٠٠٧ .
٢. بایەزید، مەلا مەحمود، و شکریە رەسول، داب و نەریتی کوردەکان. بەغداد، وەزارەتی رۆشنبیری، ١٩٨٢.
٣. تاهیر، کامەران: بەها کەلەپوورییەکان و نوێگەری لە هونەری تەلارسازیدا، گۆڤاری رامان، هەولێر، دەزگای رامان، ٢٠٠٨.
٤. دەبلیو. ئار. هێی. دوو ساڵ لە کوردستان، هەولێر، دەزگای چاپی رۆژهەلات، ٢٠١٤.
٥. چەلەبی، ئەولیا: کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، سەعید ناکام، بەغداد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری، ١٩٧٩،
٦. حەمید، فاروق: مۆزەخانەی ئەتنۆگرافیای کورد لە باشووری کوردستاندا، سلێمانی، پەخشی سەردەم، ٢٠٠٩.
٧. سکێرس، جێنفەر: کەلتووری شارنشینی لە شارەکانی رۆژهەلات، هەولێر، دەزگای موکریان، ٢٠١٢.
٨. سندی، بدرخان: کۆمەڵگای کوردەواری، و . ئیسماعیل ئیبراهیم، دەزگای موکریان، ٢٠٠٨،
٩. سدیق، زرار، کۆمەڵگای کوردەواری لە سەدەکانی ناوەڕاست، هەولێر، چاپخانەی رۆژهەلات، ٢٠٠٩.
١٠. کرینبروک، فلیب، کریستییەن ئالیسۆن: کولتوور و ناسنامەی کورد، و. وریا رەحمانی، دەزگای موکریان، ٢٠٠٨.
١١. مینۆرسکی، ڤلادیمێر: مینۆرسکی و کورد، و. ئەنوەر سوڵتانی، هەولێر، دەزگای موکریانی. ٢٠١٦
١٢. موردگان، ژاک: کوردستان لە لێکۆڵینەوەکانی ژاک مورگان، هەولێر، دەزگای موکریان، ٢٠١٢.

١٣. هانسن، هێنی هارۆلد: ژیانی ئافرەتی کورد، بەغداد، کۆڕی زانیاری عیراق، ١٩٨٣.
١٤. هەورەمانی، محەمەد ئەمین : مێژووی هەورەمان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی چوار چرا، هەولێر، ٢٠١٦
١٥. یوسف، عبدالرقیب: تابلۆکانی شەرەفنامە، سلێمانی، چاپخانەی شڤان، ٢٠٠٢
١٦. تەیب، د. جمال فتح الله: جوولەکەکانی کۆیە (١٩١٨-١٩٥١) لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتییە، گۆڤاری زانکۆی کۆیە، هەولێر، ٢٠١٢.
١٧. نەقشبەندی: د حسام الدین علی غالب: شارەزوور و لورستانی باکوور لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، و. رەنج ئەبوبکر محەمەد، سلێمانی، مەکتەبی بیرو هۆشیاری، ٢٠٠٨.

**لیستی سەرچاوە عەرەبییەکان**

١. المالكي ا. د. قبيله، تاريخ العمارة عبر العصور، عمان، ٢٠٠٧.
٢. ادموندز: ترک وعرب، كرد، ت. جرجيس فتح الله – بغداد، ١٩٧٢.
٣. حسين، حميد محمد (نماذج من البيوت التراثية في قلعة اربيل (سومر) العدد (٤٤) بغداد ١٩٨٦.
٤. ريج، رحلة ريج في العراق ١٨٢٠، ت. بهاءالدين نورى، بغداد، ١٩٥١.
٥. سون، رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين و كردستان، هەولێر، ١٩٧٠،
٦. سعيد، سكفان محمد: الفارقي و منهجه، بغداد، ١٩٧٠.
7. صالح، قحطان رشيد، الكشاف الاثري في العراق، بغداد ١٩٨٧.
٨. عزت، فائزة محمد: الحياة الاجتماعية بين قرنين (٤-٩)، اربيل، ٢٠٠٩.
٩. نيكيتين باسيل: الاكراد، ت: دار الروائع، بيروت.
١٠. يوسف، شريف، تاريخ فن العمارة، الاردن. ٢٠٠٧.

**لیستی سەرچاوە بیانییەکان:**

:(١٢) henry binder: au kurdstan en mesopotamie et perse، paris 1887
Henry bender: anthropologyof iraq partII kurdstan،cambrdige1952
Henry layard: **Nineveh and Its Remains: A Narrative of an Expedition to Assyria During the Years 1845، 1846 and 1847** ,1882,London.
Oliver, Paul, “Encyclopedia of Vernacular Architecture of the World”, Cambridge university preses,1997.

## ملخص البحث

## ثقافة الاقامة والسكن في المناطق الكوردية في العصر العثماني

**أ.م. سازان صباح بيربال**
كلية الآداب - قسم الاثار
جامعة صلاح الدين - اربيل

تعتبر العمارة من أهم أوجه مظاهر التقدم الحضاري، وان الاسباب الاقتصادية والسياسية والاجتماعية لها تأثير مباشر عليها. وفي كل الحالات تحمل الهوية القومية لاصحابها ومن الممكن ان تقع تحت تأثير اساليب التقليد أو النقل من الحضارات الاخرى.

ان هذا البحث المتواضع يتحدث عن تراث موطن الكورد في المناطق الكوردية وذلک في الفترة العثمانية القرن ١٦ - ٢٠ الميلادية، أي في فترة وجود التراث القديم لتلک المجتمعات الى بداية ظهور التراث القادم الجديد وزيادة تأثيراتها الفنية عليها.

كانت المناطق الكوردية مقسمة بين امبراطوريتين العثمانية والفارسية الصفوية، وان هذا الوضع جعل من هذه المناطق ان تعاني وتتاثر بالحروب والاحتلال والدمار، كل هذا ادي الى تواجد مظاهر عدم الاستقرار السياسي والاجتماعي والاقتصادي في كوردستان وهي من الاسباب الرئيسية في تدمير البنى الحضارية المتواجدة من جهة وخلق وضع يؤدي الى عدم تطور وتقدم العمارة فيها من جهة اخرى، اضافة الى ذلک فان حملات التدمير والتخريب المستمرة للمظاهر و الوجود الكوردي بطريقة مباشرة او غير مباشرة كان من سمات تلک الفترة ويلاحظ تاثيراتها في جميع المجالات.

ان هذا البحث محاولة لتوضيح العروض التراثية للمجتمعات الكوردية وهي تعتبر خطوة اساسية للحفاظ على الفرق التراثي الاصيل لتلک المدن والقرى التي تعرضت لتلک الحملات التدميرية مقابل التراث

المعاصر الجديد الداخل اليها، وفي بطون هذا البحث تطرقنا الى مواقف وآراء بعض المستشرقين الذين اهتموا بالتراث الكوردي والذين كانوا متواجدين في هذه المناطق بصورة مستمرة، ويمكن ان تكون اهميتها قليلة بالنسبة الى الذين تابعوا هذه الآراء ولكن بالنسبة الى الجيل الجديد فهي مفيدة ويجب ان تكون لهم موضوعا ذا اهمية خاصة.

وبالنتيجة فان بناء التجمعات الكوردية يقع تحت تاثيرات داخلية واجتماعية، فالوضع الداخلي يتاثر في مجال استعمال المواد المختلفة لبناء الدور، وللعامل الاجتماعي تأثيراته في مجال نوع ومكان الاستقرار لتلك التجمعات.

## Abstract


### preccepations culture of Kurds in Kurdish regions since the age of Ottoman



**Sazan Sabah perball**

University art. Department archology



Construction is a shape of development ; economical، social and political reasons affect on it; it bears the identity of its nation. Construction is an art which may face another type of influence or imported i.e. extracted.

This thesis talks about residence heritage of Kurds in Kurdish regions since the age of Ottoman i.e. between the 16 to 20 centuries، between the heritage of these communities and the start of existing and elimination of this heritage with the increase of foreign art influence. The Kurds areas were divided into two empires : Persia and Ottoman empires. The condition of the Kurds region which was always confronting war, dispute, occupation and destruction and this critical condition in Kurdistan did not allow Construction to develop. The way of its growth is blocked ; moreover, it had confronted the currents of elimination of any sign of its inventions directly i.e. occupation, trespass, destruction, burning and hooting; this phenomenon can be seen apparently in all the aspects.

Besides, The source of the most effective of construction of the big cities and erecting the residents buildings which are consisted from the residents and travelling groups. In consequence of this mixture, a community and a multi color and mixed construction art will be built.

This thesis is an effort to clarify and show residential heritage of the Kurds ; it is a main step in front of any attempt to protect the difference of heritage of the cities which confront the threat of their ethical elimination in front of current modern heritage. In addition to

that, the stand  of the orientalist, in regard to the Kurds heritage, who are have talked about it ; some persons may have followed them, is a non-modern thing  for the new generation. We should take advantages from them and to be given attention to.

Consequently,  constructing the residences of the Kurds is under multi local and social  effects. The local condition in using materials to build houses plays a main role;  the social reasons have effects on the type of residential place. But, current civilization have developed today and has taken another shape in the field of  engineering, map and picture.

# ڕۆڵی کەلتوور و کەلەپوور و فۆلکلۆر لە پەرەپێدانی ئابووری کشتوکاڵی و کۆمەڵایەتی ناحییەی شارەزووردا

**م. مەحموود کەریم ئەحمەد**
زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی
پەیمانگای تەکنیکی بەکرەجۆ

**پێشەکی**

فۆلکلۆر و کەلەپوور واتای (زانیاریی خەڵك و داهێنانی میللی) دەگرێتەوە ، ناسنامە و گەواهی بوونی نەتەوەیی و تایبەتمەندێتی قۆناغە جیاجیاکانی مێژوو پیشان ئەدات. فۆلکلۆریش بریتییە لە (زانست و ئەدەب و هونەر و بیر و بۆچوون و داب و نەریت و خوو ڕەوشت و خۆراك و پۆشاك و ڕۆشنبیری گشتی مرۆڤ کە لە کۆمەڵەکەیەوە وەری ئەگرێت) . ئەو سێ زاراوەیە وابەستە و تەواوکەر و تێهەڵکێشی یەکترن . کەلەپووری نەتەوایەتیمان بە هەموو بەشەکانیەوە، بەڵگەیەکی مێژووییە، پلە بە پلە باری ژیانی کورد لە هەموو بارێکەوە دیاری ئەکات. ئێمەش وەك نەتەوەکانی تری جیهان خاوەن گەنجینەیەکی گەورە و فراوانین، بەڵام **کێشەی توێژینەوەکە** ئەوەیە تا ئێستا بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە تا لە فەوتان رزگاربکرێت، لەگەڵ ئەوەی باری ژیانمان لە هەموو ڕوویەکەوە لە گۆڕاندایە، بەڵام ئەو سامانە گەورەیە پشتگوێ خراوە. **ئامانجی توێژینەوەکەش** کۆکردنەوەی ئەوەندەی لە توانادابێت و بخرێتە سەر خەرمانی فۆلکلۆریمان بۆ ڕزگارکردنی لە کەوتنە ژێر هەرەسی فەوتان و لەبیرچوونەوە. **گرنگیی توێژینەوەکەش** ئەوەیە کە ئەو کەلەپوورە بەنرخە لە دەماو دەمەوە بکرێتە توێژینەوە و نامیلکە و پەرتووك تا لەوە زیاتری بەسەردا نەڕوات و لەکیس نەچێت. چونکە ناسنامە و بەڵگەی بوون و زیندوویی و بەشداری کاریگەریی کوردن لە قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا. **گریمانەی توێژینەوەکە**

ئەوەیە ئەگەر ئەم سامانە گشتییە پڕبەهایە بەباشی کۆبکرێتەوە سوودی گەورەی ئەبێتو پێچەوانەکەشی ڕاستە. بۆ **پلانی توێژینەوەکە**و ئامادەکردنی پشتمان بەستووە بەو شێوازانەی ، کە لەگەڵ بابەتی توێژینەوەکەدا بگونجێ وەك سوودوەرگرتن لە ئەزموونی زیاتر لە ( 64 ) ساڵ تەمەنی خۆم و قسەی دایکم و باوکم و نەنك و باوەلێو بەساڵاچووانی گوندەکەمان و دەوروپشتمان، جگە لە پشتبەستن بەناملیکە و گۆڤار و پەرتووك و هەرچی بڵاوکراوەم چنگ کەوتبێت ، لە بواری فەرهەنگ و کەلەپوور و کەلتوور و فۆلکلۆری کوردیدا، بۆ ئەم مەبەستەش توێژینەوەکەم لە چوارچێوەی پێنج باسدا چڕوپڕ کردووەتەوە، باسی یەکەم لەسەر مێژوو و جوگرافیای ناوچەکە و دووەم تایبەتە بە گەشەکردنی دیمۆگرافیو ئەسنۆگرافی، باسی سێیەم ژینگەی سروشتی ناوچەکە لەخۆ ئەگرێت. باسی چوارەم باری ئابووری و کۆمەڵایەتی، پێنجەمیش تایبەتە بە فۆلکلۆر و کەلتوور و کەلەپووری ناوچەکە کە هەموویان مۆرکی کەلەپووری و فۆلکلۆریی کوردیان زۆر پێوە دیارە.

## باسی یەکەم: مێژوو و جوگرافیای ناحیەی شارەزوور

شارەزوور بەهۆی خاك و ئاو و کەشوهەوای لەباریەوە هەر لە کۆنەوە بووەتە مەڵبەندی نیشتەجێبوونی مرۆڤ. گۆتییەکان کە بە ڕەچەڵەك کورد بوون لە نەتەوە زاگرۆسییەکان بوون 3000 ساڵ پێش زایین لە باشووری دەشتی شارەزووردا نیشتەجێبوون و سنووری فەرمانڕەوایی خۆیان فراوان کردووە ، کە (لە ڕۆژهەڵاتەوە رووباری سیروان و لە ڕۆژئاواوە رووباری زێی بچووك و لە باکوورەوە چیاکانی سلێمانیو لە باشوورەوە رووباری دیجلە بووە) و شاری کەرکووکی ئەمڕۆ (ئارابخا) یان کردووەتە پایتەختی خۆیان و هەمیشە لە شەڕدابوون لەگەڵ سۆمەری و ئەکەدی و ئاشوورییەکان (احمد، بدون تاریخ، ص١٠-١١). ساڵی 636ی زایینی سوپای ئیسلام گەیشتووەتە ناوچەی شارەزوور (الحمودي، ١٨٦٨، ص ٢٤٠). ساڵی 1332ی زایینی و لە کۆتایی سەردەمی عەباسییەکاندا ناوچەی شارەزوور خراوەتە سەر عێراق (فهد، ١٩٧٣، ص ٤-٧). ساڵی 1514ی زایینی دوای شەڕی چاڵدێران کەوتووەتە ژێر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانییەوە (احمد، ١٩٨٥، ص٢٢٩). دوای جێگیربوونی فەرمانڕەوایی عوسمانی، عێراق کراوە بە چوار

ئەیالەتەکەی (بەغدا، موسڵ، بەسرە، شارەزوورەوە (مراد، ١٩٧٥، ص ٥٠-٥٢). لە سەدەی شازدەیەمدا شارەزوور (20) سنجەق (لیوا) بووە و لە ناوەڕاستی سەدەی هەڤدەیەمدا بووە بە (32) سنجەق، ئەم راستییە جێگیر و مێژووییبیانەیە، سەرچاوەی فەرمیو توێژینەوەی زانستی زانکۆکانی عێراق بەردەوام دانیان پیاناوە (الدليل العراقي، ١٩٣٦، ص ٥٠-٥٢). دوای ئەوەی عوسمانییەکان توانیویانە بە تەواوی کۆنترۆڵی عێراق بکەن دەسەڵاتیان داوەتە میرنشینەکانی (بابان، سۆران، بادینان) لەژێر سەرپەرشتی والیی بەغدادا (نوار، ١٩٦٨، ص ٧-٨). ساڵی 1638ی زایینی لە سەردەمی سوڵتان موڕادی چوارەمی عوسمانیدا، عێراق کرا بە سێ ئەیالەتەوە (بەغدا، موسڵ، شارەزوور)، (ولستيد، ١٩٨٤، ص ٧-٦٤). ساڵی (1869-1872)ی زایینی و بەتایبەتی لە سەردەمی مەدحەت پاشادا عێراق بوو بە دوو ئەیالەتو هەموو کوردستان خرایە سەر ئەیالەتی موسڵ، کە لە سێ لیوا پێکهاتبوو (موسڵ، کەرکووک، سلێمانی)، بەڵام کەرکووک هەر بە لیوای (شارەزوور) ناوزەند کرابوو وە سلێمانی سەر بە لیوای کەرکووک (شارەزوور) بوو تا ساڵی ( 1925)، کە یەکەم موتەسەڕیفی بۆ دانرا (احمد، بدون تاريخ، ص ٤٠). لە ساڵی ( ١٩٥٥ )دا بووە بە ناحیەی شارەزوور و لە ساڵی (2007 )ی زاینیدا ، بەبڕیاری حکومەتی هەرێمی کوردستان کراوە بە قەزای سەید سادق و ناحیەی بەرزنجەشی پێوە لکێنرا (غفور، ٢٠٠٥، ص ٨١). لە رووی جوگرافیشەوە ئەو رووبەرەی سەر بە ناحیەی شارەزوور بوو تا ساڵی (2007) ی زایینی درێژییەکەی نزیکەی 25 کیلۆمەترە و تێکڕای پانییەکەی 14 کیلۆمەترە، بەمەش رووبەرەکەی 341.4 کیلۆمەتری چوارگۆشەیە (خشتەی 1)، سنوورەکەی لە رۆژهەڵاتەوە چەمی ڕیشێن (شەڵم) و لە رۆژئاواوەی خڕی چەناخچیانی نزیک بێستان سوورە، لە باکوورەوە بەرزاییەکانی بەرزنجە و هەروەها لە باشوورەوە چەمی تانجەڕۆیە (الوقائع، ١٩٥٥، العدد ٣١٧٥). دەشتی شارەزوور یەکێکە لە دەشتە بەپیتەکانی جیهان (فرع الزراعي، ٢٠٠٦). نەخشەی جبس بۆ پۆلینکردنی زەوییەکانی عێراق ئاماژە بەوە ئەکات ، کە دەشتی شارەزوور باشترین زەوییە لە پارێزگای سلێمانیدا ، کە ئەتوانرێت بە ئاسانیو دڵنیاییەوە بچێنرێت (الحفيد، ١٩٩٢، ص ٧-٩). کەشو هەوای دەریاری سپی ناوەڕاستی هەیە و ئەکەوێتە ناوچەی بارانی مسۆگەرەوە کە (400-1000) ملیمەترە، بەرزی لە رووی دەریاوە (540-600) مەترە و پلەی

ناوەنجی گەرمای لە تەمووزدا (39) پلەی سەدییە، بەڵام نزمترینیان لە نیوەی مانگی کانونی دووەمدایە کە تێکڕاکەی (4.8) پلەی سەدییە، بای شەماڵو ڕەشەبای هەیە کە هەریەکەیان چوار مانگ بەردەوامن بە دوای یەکدا لە مانگی شوباتەوە،. باران لە ساڵێکدا هەشت مانگ ئەبارێ لە مانگەکانی (حوزەیران، تەمووز، ئاب، ئەیلول)دا نابارێ. ڕێژەی شێ لە کانوونی دووەمدا ئەگاتە بەرزترینی 75%و نزمترین 18% لە مانگی تەمووزدا (خصباك، ٢٠٠٥،ص ٢٥). هەروەها دەوڵەمەندە بە ئاوی ژێر زەوی لە هەندێ شوێنیدا قووڵییەکەی لە چەند مەترێك زیاتر نییە و ئاوی سەر زەوی لە شێوەی چەم و خڕ و کانیدایە (الحفید، ١٩٩٢، ص ٧-٩). وەك چەمی (ئالآنقۆز) ، کە سەرچاوەکەی کانی پانکەی خوارووە و چەمی (قوماش) سەرچاوەکەی قوماشی سەرووە و چەمی (دۆمان) کە سەرچاوەکەی سەراوی سوبحان ئاغایە و گۆلی (حەسار) کە سەرچاوەکەی سەید سادقی کۆنە و چەمی (شەڵم) کە سەرچاوەکەی گوندی ڕیشێنە، جگە لەو خڕانەی کە بە هاوین وشك ئەکەن وەك خڕی (سوورەجۆ، چەقان، بالانتەران، چەناخچیان) و زۆربەی گوندەکانیشی کانیی خۆیان هەیە، ئەمانە هەموویان لە وەرزی زستاندا پێکەوە ئەڕژێنە چەمی تانجەرۆ لە باشووری ناحیەکە و دواتر لەگەڵ چەمی زەڵم یەك ئەگرن و ئەڕژێنە دەریاچەی دەربەندیخانەوە.

**خشتەی (1):**

**ڕووبەری گشتی زەویوزاری ناحیەی شارەزوور دوای 1958:(*)**

| جۆری زەوی | ڕووبەر دۆنم | جۆری زەوی | ڕووبەر دۆنم | جۆری زەوی | ڕووبەر دۆنم |
|---|---|---|---|---|---|
| دێم | 57278 | بەردەلان | 12835 | دارستانی سروشتیو دەستکرد | 231 |
| بەراو | 22647 | جێ گوند | 2612 | لەوەڕگای سروشتی | 12047 |
| ژێرئاو | 15688 | ڕێگاوبان | 5256 | لەوەڕگای دەستکرد | 227 |
| گاکێڵ | 1347 | باخ | 1402 | ناکشتوکاڵی | 9711 |
| کۆی گشتی | 136546 دۆنم = 341.4 کم$^2$ | | | | |

(*) لقی کشتوکاڵی شارەزوور، بەشی زەویوزار، 2006.

لە خشتەی ژمارە (1)دا دەرکەوتووە ، کە زەویی دێم زۆرترە، کە (57278) دۆنمە و ڕێژەکەی ( 42% ) هەموو زەوییەکانە و چاندنی پشت بە ئاوی باران ئەبەستێ، دواتر زەویی بەراو کە رووبەرەکەی (22647) دۆنمە و ڕێژەکەی 17%ی هەموو رووبەرەکەیە و هەروەها ژێرئاو کە ئەکەوێتە باشووری ناحیەکە و هەندێ ساڵ ئاوی دەریاچەی دەربەندیخان دایئەپۆشێ کە رووبەرەکەی 15688 دۆنمە و ڕێژەکەی 11%ی هەموو جۆرەکانە، بەڵام دوای کشانەوەی ئاوەکە لە وەرزی پایزدا ئەکرێتەوە بە شووتی و سەوزە، وە گەنم لەو ساڵانەی کە باران کەمە و دایناپۆشێ. شایانی باسە ئەو زەوییانە زۆر بە بڕشتترن لە زەوییەکانی تر. ئەو و جۆرەکانی تر بە هەموویان ڕێژەی ( 30% ) زەوییەکان پێك ئەهێننو هەموویان سوودی خۆیان هەیە.

## باسی دووەم: گەشەی دیمۆگرافی و ئەسنۆگرافی

ئەو هەموو (گرد و تەپە) خۆڵ و دەستکردانەی وەك گردەکانی (فالێچۆ، مووان، سواری، شێخ عەلی، سەراو، قلرخ، هەیاس، تەپەڕەش، شاتوان، شاملو، سادق، مەسەکان، قاجر، عەلیاوا، قاینەجە، کێلەکەوە) وە تەپە چەقەڵان و قەڵای شجاع و قەڵاکوڕکوڕە، کە هەندێکیان پانو فراوانن و هەندێکیان بەرزترنو 2-3 کیلۆمەتر لە یەکەوە دوورن، نیشانەی ئەوەن ، کە مرۆڤ هەر لەکۆنەوە بە چڕی لەم ناوچەیەدا نیشتەجێبوون. پێش بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی (1914–1918) و دووەمیش ( 1939– 1945) ی زایینی ڕێگە و هەوارگەوی تیرە و خێڵە کۆچەرەکانی هۆزی گەورەی جاف بووە هەر لە: (شاتری، کەماڵەیی، رۆغزایی، مکایەڵی، تەرخانی، گەلاڵی، باشکی، شێخ سمایلی، مامۆیی، سۆفیوەن، نەژوێنی، هاروونی، یوسوجانی) (خشتەی 1)، (باوەر، ٢٠٠٦، ص٤٧). کە هەوارگەی تایبەتی خۆیان هەبووە لە ناوچەی گەرمیان و شارەزوور و مەریوان. دوای تەواوبوونی وەرزی بەهاری پێدەشتەکانی گەرمیان (کەلار، سەرقەڵا، کفری) لە ملەی پەیکوڵیو گوێ چەمی سیروانەوە، هەر خێڵەو بەرەو هەوارگەکانی خۆیان لە ناوچەی شارەزوور بەرێکەوتوون و دواتر لە پێنجوێنەوە بەرەو ناوچەی شلێر و ناوخوان و چەمە شارەزوورەی مەریوان ڕۆشتوون. لە ساردی پایزدا بە هەمان ڕێگە و هەوارگەی خۆیاندا شۆڕبوونەتەوە و زستانیان بردووەتەوە هەوارگەکانیان

لـە ناوچـەی گـەرمیان. مێجـەر سـۆن Ely Banister Soane ( 1881– 1923 ) لـە ساڵانی 1914-1918ی زاینیدا هۆزی جاف و تیرەکانی کە هـەر یەکـەو ئێسـتا لـە ناوچـەی گـەرمیان و شـارەزووریش نیشـتەجێن، بـەم شـێوەیەی خـوارەوە پـۆلێن کردووە (خصباك، ٢٠٠٥، ص١٧٣).

**خشتەی ژمارە (2) تیرەکانی جاف 1914-1918.**[(١٧)]

| زنجیرە | ناوی تیرە | ژمارەی خێزان | هێــــز | | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | سوار | پیادە | |
| 1 | هاروونی | 800 | 300 | 400 | کۆچەرن |
| 2 | مکایەڵی | 2000 | 7000 | 1500 | کۆچەرن |
| 3 | تەرخانی | 500 | 200 | 200 | کۆچەرن (بەشێکن لە رۆغزایی) |
| 4 | باشکی | 300 | 100 | 100 | کۆچەرن |
| 5 | یوسوجانی | 500 | 100 | 200 | کۆچەرن |
| 6 | کەماڵەیی | 500 | 150 | 200 | کۆچەرن |
| 7 | گلاڵی | 2000 | 700 | 1400 | کۆچەرن |
| 8 | شاتری | 1800 | 800 | 900 | کۆچەرن (بەشێکیان لە سەید خەلیل نیشتەجێن) |
| 9 | شێخ سمایلی | 1000 | 100 | 700 | کۆچەرن |
| 10 | سوفیوەن | 60 | 10 | 20 | کۆچەرن |

کە هەموویان دوای جەنگی جیهانی یەکەم و داخسـتنی سـنوورەکانی ئێـران 1935ی زایینی بەڕوویاندا، هـەر هـەموویان لـە هەوارگـەکانی خۆیانـدا لـە ناوچـەی گەرمیانو شارەزوور و هەندێکیشیان لە دیوی ئێران نیشـتەجێبوون (خصباك، ٢٠٠٥، ص١٧٣). سـەرەتا لـە ڕەش دەوار و زنجـدا ژیـاون، لـە کۆتـایی چـلەکانی سـەدەی بیستەمی رابردوودا ماڵ و گەوڕەکانیان پێکەوە بە قوڕو مور دروستکردووە، ساڵی 1934 ڕێگای سلێمانی – سەید سادق – هەڵەبجە – پێنجوین دروسـتکرا، پردێك لەسەر خڕی چەقان و جێگەی ئێسـتای سـەید سـادقدا دروسـتکراوە و لـە کـەپردا چایخانەیەك دانراوە، چونکە ڕێگای جەڵەب و قەتار و کـاروانی و بازرگـانیی نێـوان

سنە و سلێمانی بووە، تا کۆتایی شەستەکانی سەدەی رابردوویش شوێنەواری هەندێ لە خان و چایخانە لە سەراو، خەرابە (سەر بێ کەسە)، خەراجیان مابوو. ساڵی 1945 گوندی سەید سادق گەشەی کرد و ساڵی 1949 رادیۆ و لۆری و 1950 جێبی (ئاسکی مۆدێلی) تێهاتووە. ساڵی 1953 بنکەی تەندروستیو 1955 بووە بەناوەندی ناحیەی شارەزوور و قوتابخانەی تێدا کراوەتەوە و بنکەی پۆلیسی بۆ دانراوە. ساڵی 1963ی زایینی وێنەگر و تیپی وەرزشی هەبووە. ژمارەی گوندەکانی 69 گوند بووە (بابان، ٢٠٠٧، ص٢١٦-٢١٨). زەوییەکانی بەزۆری موڵکی بەگزادەکانی جاف بووە. دوای رووخانی سیستەمی پاشایەتی (1958) و سەرهەڵدانی فەرمانڕەوایەتی کۆماری، زەوییەکان بەپێی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی ژمارە 30 ساڵی 1958 دەستی بەسەردا گیرا و دابەشکرا بە سەر جووتیارەکانی ناوچەکەدا بەپێی جۆری زەوییەکان لە دێم و بەراو. ناحیەکە کرا بە 26 کەرتی کشتوکاڵیو 10 کۆمەڵەی هەرەوەزی کشتوکاڵیو دوو تراکتۆری رووسی تایە زنجیریان لە جۆری ( AT )دا بە هەر هەرەوەزییەك لەگەڵ دابینکردنی کۆمباین بۆ درەو و کردنەوەی قوتابخانە و هەڵمەتی نەهێشتنی نەخوێندەواری لە هەندێك لە گوندەکاندا لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەمی رابردووەوە دەستی پێکرد. بەجۆرێك شارەزوور وەك تەشتی نانو زەمیلەی خۆراکە بۆ خۆی و دەروپشتی، هەر ئەوەش وایکرد رێژەی دانیشتوانی بەخێرایی گەشە بکات لە ژیانی کۆچەرییەوە بۆ گوند و شارنشین (رەشید، ٢٠١٦، ص٥١). خشتەی (3).

**خشتەی (3): گەشەکردنی دانیشتوانی ناحیەی شارەزوور (13 ,14 ,19):**

| ساڵەکان | گوندنشین | % | شارنشین | % | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| 1957 | 7771 | 87 | 1151 | 13 | 8949 |
| 1965 | 9197 | 77 | 2700 | 23 | 11897 |
| 1977 | 14806 | 65 | 7895 | 35 | 22701 |
| 1987 | 19527 | 34 | 26193 | 57 | 45720 |
| 2009 | 17751 | 26 | 51015 | 74 | 68766 |
| 2017 | 22486 | 26 | 64624 | 74 | 87110 |

وەك ئەوەی خشتەی (3) سێیەم ئەوەمان پیشان ئەدات، کە دانیشتوانی گوندەکان بە بەردەوامی کۆچیانکردووە بۆ شارەکان بەهۆی زوڵمی دەرەبەگ و سەرکارەکانیان بەتایبەتی لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی پاشایەتیدا و هەروەها زوڵمی بازرگانە کشتوکاڵییەکان و سەلەم و سوو فرۆفێڵی زۆریان و نائارامیی ناوچەکە بەهۆی شەڕی کورد و عێراقو گواستنەوەی گوندەکانو شەڕی عێراق ئێران و رووخانی سەرجەم ناوچەکە و گواستنەوەیان بۆ کۆمەڵگەکانی نەسر و باریکەی زۆرەملێ و شەڕی کەنداوی یەکەم و بەسەربازگەکردنی ناوچەکە و دامەزراندنی کوێرانەی خەڵك لە کەرتە خزمەتگوزارییەکاندا و بایەخنەدان بە لادێکان لە رووی خزمەتگوزاریی پێویست و ڕێگاوبانەوە.

## باسی سێیەم: ژینگەی سروشتی ناحیەی شارەزوور

وەك دەبینین خاك و ئاووهەوای ناحیەی شارەزوور هەمیشە لەبار بووە بۆ ژیانی سەدان جۆر لە گژوگیای سروشتیو ئاژەڵ و باڵندەی کێوی و ماڵی، کە ئەکرێ پۆلین بکرێت بۆ رووەکی سروشتی گوێ چەمەکان وەك (چنار، بی، بنەواچ، پەڵك، لاولاو، تورك، حەسیر، دەڵاو، زەل، قەرەم، کورتو، تەرو، پیکە، پیزڵك، قەوزە، ڕوشە)، هەروەها ڕووەکی سروشتی گوێ جۆگە و دەشتەکان وەك (کەرکۆل، گاشاخە، کەرتەشی، گەرچەك، خرێلە، حوشترخۆر، کەڵەوی، خەرتەلە، لوسکە، قنڵاشکە، دەرزیلە، سێ پەڕە، گوڵە زەردە ، گوڵاڵەی خاشخاشە)، بژارەکانی وەك (بەلەك، خڕنووك، قەلاس، پۆڵکە، گلێنەڕەشە، خوشیلك، سێفلۆکە، قازیاخە، سرناتك، گونەسەگانە، پەیکوڵ، سمڵ، مووسەنەك، نمرە، قەلاس، مرەکوەژە، پەیکوڵ، هەرێز، مەلەوێچە، گیاکەڵە، مرۆر، کاڕوش، قاپ کەوەلە، داڕوجان، گوژاڵکە)، هاوکات ئەو گژوگیایانەی کە بەزۆری خۆراکی مرۆڤ بوون وەك (چاوەزەڵە، چاوبازەڵە، خەرتەلە، قارچك، تۆڵەکە، زاخ، هاز، قنگر، گۆزروان، گوێ بەرخە، کووزەڵە، بەنۆڵە، پونگە، تریشکە)، جگە لە ڕووەکی بۆنداری وەك نێرگسو رەیحانەی کێویو گوڵاڵە، چاوەپشیلەش بۆ دەرمان. لەگەڵ بوونی نەخۆشی و مێرووی زیانبەخشی وەك (سون، کوللە، هاڕێ، مڵە، گەنە، کرنگ، سیسرك، گوێرەسوورە "خاڵخاڵۆکە" نەخۆشی کشتوکاڵی وەك (شەرا، شیرینە، بنەوشکە) کە بە دوعاو نوشتە و دەمبەس بەرگرییان لێ ئەکردن.

هــەروەها ئــاژەڵی کێـویی وەك (چــەقەڵ، گــورگ، کــەمتیار، ڕێـوی، کەروێشــك، سوچــەڕ، پشــیلەکێوی، ژژو، بــەراز)، باڵنــدەی کێــویی وەك (چۆلەکەپاســاری، ڕیشـۆڵە، پلـی سـرگ، پەپوسـلێمانە، فشـەکڵاونە، جـرە، کەنەسمـە، عەیانەمـەل، تەیرەئەبابیلە، شینەشاهۆ، واق، بایەقوش، کونەبەبوو، کەپوکەرە، بەتەچـەرمەڵە، واشـە، هـەڵۆ، داڵ، قـاژە ڕەشـکە، کـۆتر، قژاکـە، قشـقەڕە، پیوەقنگـە، گامـارۆ، شەلاقە، دەنووك سـوورە، ماسـیگرە، دارکونکـەرە، قـاز، سـۆنە، فیسـقە، حـاجی لەقلەق، پۆڕ، کوڵـەفرە، زیقاوڵـە، مرەڕەشـە، کلـك هەڵتەکێنـە، شـوان خەڵەتێنـە، سوێسـکە، قورِاویلکـە، مێشەسـی، شەمشـەمەکوێرە، قورِبـاق، ماسـی، مارماسـی، کیسەڵ، قرژانگ، جەلاوی، سەگڵاو، مشك، رزق "جرج"، بزنمژە، مار، مارمەزۆکە، دووپشك "چـزەوپیاڵە"، قۆلانچـە، جاڵجاڵۆکـە، مێروولـە، زیکزیککـەرە، پەپوولـە، پــووش بەقنگــە، زەردەواڵــە، خەڕەنگــەزە ، مێشەســەگانە، مێشــوولە، هــووڕە، گوەئەستێرە، کێچ، ئەسپێ، هەزارپێ). جگە لە چاندنی دانەوێڵەی زستانە و دێمی وەك (گەنم، جۆ، نۆك، نیسك، پاقلە، رەشکە، کەتان، ترۆزی و کاڵەکی دێم) جگـە لە بەرووبوومی هاوینەی بەراو وەك (مـەرەزە، لۆکـە، تـووتن، گـوش، گوڵەبـەڕۆژە، شووتی، کاڵەك و ترۆزی  بەراو، زەڕات، خەیار، بامیە، تەماتە، کوولەکە، باینجان، لۆبیا، رەیحانە، هەزبێلە، بستە)، وە سەوزەی زسـتانە و هاوینـەی وەك : ( پیـاز، سیر، توور، سڵق، شێلم، کەوەر، کەرەوز، تەڕەتیزە، چەوەنەر، سیوی بـن عـەرز، تــەرخوون، شملــی، کەلــەرم، قــەڕنابیت، برۆکلــی)و داری بــەری وەك : (هــەنار، هـەرمێ، قەیسـی، هـەڵووژە، تـرێ، سـێو، قـۆخ، نـارنج) لـە زەوییـە بەراوەکانـدا ئەچێنران، لەپاڵ بەخێوکردنی ئاژەڵی مـاڵی وەك : (مـەڕ، بـزن، گـا، مانگـا، کـەر، ماین، ئەسپ، هێستر، سەگ، تانجی، کەروێشك، قەل، قاز، سۆنە، کۆتر، هـەنگ و ماسی) لەم دواییانەدا بەخێوئەکران.

## باسی چوارەم: بارودۆخی ئابووری و کۆمەلایەتی

بارودۆخی ئابووری و کۆمەلایەتی کـورد چـەندین چـەرخو رۆژگـار و قۆنـاغی جۆراوجۆری تێپەڕاندووە و هەمیشە لـە خـەباتی سـەخت و پـڕ رەنـج و خوێناویـدا بووە لە پێناوی بوون و مانو بەرەوپێشچوونی ژیاندا، هەر لە دابینکردنـی شـوێنی نیشــتەجێبوون و خــۆراك و پۆشــاك و دەرمانــەوە تــا پێداویســتییە مــادی و

ڕۆحییەکانی تری ژیان. سەبارەت بە جێی نیشتەجێبوون سەرەتا لە زنجو کەپردا ژیاون، دواتر ڕەشدەوار کە پێکهاتووە لە : ( تەخت، هەسوون، کۆمانج، گیر، چڵە، پاچڵە، مێخ، چیخ، مێکوت، سەرەك، بنەك، سنك، بەلو) (*). لە سەرەتای چلەکانەوە دەستیان کردووە بە دروستکردنی خانوو گەوڕی ولاخەکانیان بەسەریەکەوە بە قوڕو مور (سرگە) کە پێکهاتبوون لە : ( ژووری نوستن، گەوڕ، گایەن، کولانە، کۆزە، ئاخوڕ، بەنێرگە، دەسەك، رایەڵە، گورگە، کۆڵەکە، چرپی و بە زەلو قەڕەم سەریان ئەگرت و گڵەبانیان ئەکرد. کونەواجە (کلاوڕۆشنە)یەکیان تیا ئەهێشتەوە، بەلام تاق یان دەلاقە (پەنجەرە)ی نەبوو، بانگردێنیان لە سەربان دائەنا بۆ تکە (دلۆپە)ی زستان، بە چۆڵەپێچەن یان قابی و چەپەر کە لەسەر گێژەنگەیەك دایان ئەنا بۆ گرتنی دەرگای سەرەکی (کەلەوەر). یەك کوانووی تیابوو بۆ چا و چێشت لێنانو خۆ گەرمکردنەوە و ڕووناکیی شەو. خۆراکی ئەو سەردەمانە نان و خەپلە بوو لە گەنم یان جۆ یان زەڕات، کە کەرەسەکانی (ئارد، تەشت، ساج، سێکوچکە، پنە "دەرخۆنە"، ماگە، هێڵەك، سەردۆڵە) کە ئەکرا بە هەویر و گونکە و نان. سووتەمەنییەکەی پووشکە و چیلکە و تەپاڵە و پشقەڵ بوو. بۆ چا لێنان کەرەسەکانی (قۆری، کتری، پیاڵە، ژێرپیاڵە، کەوچکی چا، باولێکی دار بۆ هەلگرتنیان هەبوو. دۆ، کە کەرەسەکانی پێکهاتبوو لە : (سێپا، دۆژەنکە، گوریس، مەشکە، ئەرخورد، بەن، هەنگڵ، پشك) (**). ساوەر، دۆینە، ترخێنە، فرۆ، گوڵەپروزە، دۆخەوا، ماست، کەرە، پەنیر، کەشك، خەستە، کەلانە، مزرۆکە، کزینکە، برۆێش، ناوساجی، کولیچە، تۆڵەکە، زاخ "هاز"، قنگر، قارچك، کووزەڵە، گۆزروان، پەڵپینە، سەڵمکە، هێلکە، ترشو گۆشت، فرووجاو، کەشکەك، سەروپێ، خومەڕەشی، شیرەوا، خورماوڕۆن، شۆرمەزە، بەلام برنج زۆر بە کەمی بەکارهێنراوە. پۆشاکی پیاوان بریتیبوو لە (کەوا، سەڵتە، دەرپێ، پشتوێن، (مشکی یان جامانە، یان هەر پەڕۆیەکی تر)، تەقلە (کلاو)، فەقیانە، سۆل، کەوش، پووزەوانە، کەچە (فەرەنجی)، کلاوەزەڕ، خەنجەر، تەشوێ، تفەنگ، دەمانچە، فیشەکلغ، کەڕەك بۆ لای ئاژەڵ، تاقمی تەراش. بەلام پۆشاکی ژنان و کەنیشك پێکهاتبوو لە (کراس، کەوا، سەڵتە، دەرپێ "ئاوەڵکراس"، سوخمە، پژوێن، لەچك، چارەکە، مێزەر (هەوری و پووشێن) بۆ خۆ ڕازاندنەوەش (کلاوزەڕ،

تاکە، پۆیلە، ملوێنکە ، moorووی زەردوویی، شیلان، کرمەك، لاگیرە، پشتەسەرە، کەمەرە، loolە، هەیاسە، بازن، بازیوەن، پاوانە، کلکەوانە، سملّو مێخەك، ژێرچەنە، گەردانە، گوارە، کوڕەمەکە، لووتەوانە، گێلگێلە، گۆوبەرۆك، مێخەکبەن، دوگمەو دۆلاب، پۆیلە، ملەگۆ، گژنیژە، ملەلیرە). جگە لە هەندێ کەرەسەی جوانکاری وەك (خەتوخاڵ کوتان، دانی ئالتوون دروستکردن، خەنە و وسمە، کلو کلدانو میل چەوك، شانەی دار، ئاوێنە، سابوون) ، کە زۆربەیان لە گۆرانییە کوردییە فۆلکلۆرییەکاندا ڕەنگی داوەتەوە. بەڵام پۆشاکی منداڵ هەر کراسی دەرەدامانو کولەنجە بوو،، کە نوشتە و زەنگڵە و کڵانەکەوەی پیا هەڵواسرابوو بۆ چاوەزار، تا کۆتایی چلەکانی سەدەی رابردوو زۆربەیان پێخاوس بوون. بەڵام پێداویستییەکانی ناو ماڵو ئیشی رۆژانە بە گشتی پێکهاتبوو لە (بەڕە) کە بە تەونکردن لە بەنی مووی بزن کە بە تەشی ڕێسرابوو دروست ئەکرا و دەزگاکەی پێکهاتبوو لە (2) کۆڵەکە، بنتێزە، گورد، باڵ، کەڵکیت، هەپك، قولاپ، مەقەس، سەکۆ) [*]. تەکینمەگ (لەباد)، حەسیر، لێفە، بوخچە، مەوج، هۆڕ، تێر، خورج، هەوانە، جەواڵ، توورەکە، خوێدان، هەندێکیان وەك پێخەف لەسەر هەرزاڵەی ماڵەوە دائەنران. گورێس، کەژوو، گوڵەنگ، چەڵەمە، گۆزە، دیزە، کونە، جەوەنە، مەشکە، مەشکۆڵە، کە لەسەر کونەڵان دائەنران، قازان، تماق، لەگان، جامۆڵکە، دەوری، کاشی، کەوچك، کەوگیر، کە بۆ چێشت لێنان و خواردنی بەکار ئەهێنران. پیاڵە، ژێرپیاڵە، تەشپی شەکر، شەکرشکێن، باوڵ، کتری، قۆری بۆ چالێنان، بۆ جگەرەکێشان: کیسە، سەبیل، توتن، سیغار، پیو، چەخماخ. هەروەها سینی و مەسینە و دەستشۆری مس، هیزە، هیزۆڵکە بۆ ڕۆن، چیخ، چیخۆڵکە، حەسیر لە پیکە و حەسیری چەم دروست ئەکران. ئاوانو دەسکەوان، دۆڵ و دەسکەدۆڵ، قولێنە، تولێنە، سەبەتە، زەمیلە، بەرچینە،، تەیکە کە لە تووڵی بی دروست ئەکران. جگە لە چەندین کەرەسەی تر کە بێگومان هیچ ماڵێك هەموویانی نەبوو، بەڵکو یارمەتی یەکتریان ئەدا، وەك : ( تەشوێ، پاچ، بێڵ، خاکەناز، قولنگە، تەور، تەوراس، تەورزێن، گالۆك، گلاکوتك بۆی سیپاڵ شۆردن. دەرزی، بەن، سوورن، پیك، نوێڵ، داس، داسۆڵکە، ئەسکەنە، هەڕە، چەقۆ، قەڵەم، برپەن، هەسان، مێخ، مێخسکە، کوتەك، مێکوت، تێلا، چەکوش، تەڵە، فاقە، شەن،

سێلك، کەو، بێژن، گلگیر، هێڵەك، ڕەشکە، تەشی، خوێدان، کەنو، زەنگ، گوڵەنگ، جڵەو، لەقاو، رەشۆ، جل، کورتان، کۆپان، زینی ئەسپ و ماین کە پێکهاتبوو لە (زین، سەرزین، لەقاو، ورزەنگی، ژێرزین، کەڵپوز، بەرەك، پاشوو، ژێرسك، قەیاسە) (**) بۆ تەنگو پالوو. ئیشەکانی ئەو سەردەمە بریتی بوون لە (جووتیاری، رەنجوەری، گاوانی، شوانی، ئاشەوانی، قوڕەکاری، مزگەری، خەڕاتی، هەلاجی، پینەچێتی، تەنەکەچێتی و کرێکاری). گرنگترینیان کە جووتیاری بوو، واتە چاندنو ئاژەڵ بەخێوکردن بوو کە هەرچوار وەرزەکە بێ پشوودان بەردەوامبوون. وەرزی چاندنی زستانە مانگی تشرینی یەکەم پێش بارانی پەڵە، زەوی تۆو ئەکراو بە (وشکەکێڵ) یان دوای بارانی پەڵە ئەچێنرا بە (گەنم، جۆ، نۆك، نیسك، کەتان، ڕەشکە) لە زەوییە دێمەکان بە جووتێ (گا، هێستر، کەر)و بە هەوجاڕ ئەکێڵرا کە پێکهاتبوو لە (دەمەگاسن، هەوجاڕ "هێرەق"، مژان، هەپە، بانملە، کەڵەمە، دەسەکەوشە، نەقیزە)*. لە هاوینی داهاتوودا بە داس درەویان ئەکرد جگە لە نۆك بە (دەسکەنە)و ئەکرانە (چەپك، سواڵە، گورزە،ـ مەلۆ، شارا) و بە کۆڵی ژن کێشەئەکرایە سەر (خەرمان). دواتر قرچی خەرمان دائەخرا بە (4-5) گا یان هێستر یان کەر قرچ لە دوای قرچ خەرمانەکە ئەکوتراو لە کۆتاییشدا (وردەکوت) ئەکرا. ولاخەکان (بنەو، ناوەند، سەرپەڕیان) هەبوو، هەرکامێکیان لاسار بوونایە پێیان ئەوت (گێرەشێوێن). لە گۆرانیدا ئەیانوت (حاحای گاگیرە تۆزێ بن خەرمان — ئاوی جامەکەت لێم بووە بە دەرمان). ئینجا خەرمانە کوتراوەکە ئەکرا بە (تارمە)یەك و ڕوو لە بای ڕۆژئاوا (شەماڵ) بە شەن و سێلك بە با ئەکرا، مەولەویش بە هەر مەبەستێك بێت وتوویەتی (خەرمانی خەمان هاوەکەل باوە — شەنکەر یەکێکە دوو شەن بەلاوە)، (مودەریس، ١٣٨٩ئێرانی، ص٢٣٧). بە (بێژن، کەو، گلگیر) کۆزەرە و بەربا ئەکرا و خۆڵەکەی لێ ئەگیرا پاك ئەکرایەوە لە (سەرکۆزەر و چەوڵوك). دوای سوورکردنی، بەرهەمەکە خرئەکرا پێی ئەوترا (جێز)(*)، بە تەنەکە ئەکرایە هۆڕو هەمانە و بە هەرەوەزی ئەبرایەوە بەشی باراشی زستانو تۆو ئەکرایە چاڵ. بەشی ئاڵفو دانی مریشك و دۆینە و ساوەر و ترخێنەش لە هۆڕ و هەمانە و کەنوودا هەڵئەگیرا. ئەم پرۆسەیە بۆ هەموو جۆرە دانەوێڵەکان وەك یەکە تەنانەت مەرەزە

و گوڵەبەڕۆژەش، دواتر بە (ڕەشکە) کاکەیان ئەکێشایە کایەن بۆ زستانی وڵاخەکان، کە لەگەڵ کۆزە و کولانەدا پێکەوەبوون. بۆ گەنم و جۆ هارِین چەندین ئاشی ئاو لە ناوچەکەدا هەبوون کە پێکهاتبوون لە (جۆگە، نێ، گونج، تۆپ، مورەسەنگ، بڵسک، تەوەر، بەرداش، دوڵیان، چەقچەقە، پێ، ئارماڵ، پوت، بلوچە، گسک) (**) ، ئاشەوان مزە ئاشی وەرئەگرت کە 10\1 ی بارەکە بوو، ئاش وەستاش ساڵانە ئاشەکەی نۆژەن ئەکردەوە. هەر ئاشەوانێك زیادەی وەربگرتایە واتە (گەندەڵ) بوایە ئەیانوت فلان جگە لە مزە (چزەمزە، ئاردەوارە، هەقەچرا)ش وەرئەگرێ. وەرزی چاندنی بەهاریش لە بەراوەکاندا دوای جۆماڵی کردنی جۆگەکان لۆکە و تووتنو گەنمەشامی دائەچێنرا، مەرەزەش بە هەرەوەزی (تێرو پاراو) ئەکرا و دوای چاندنی (گۆخڵ)ی بۆ دائەنراو (شکارتە)ی بۆ دیاری ئەکرا جگە لە 10\1ی کۆی بەرهەمەکە . ئەویش ئیشی تەنیا (داسماڵ)ی جۆگەکانو پاراوکردنی ڕۆژانەی مەرزەکەی لەسەربوو لەگەڵ (سەرپاچ)ی داڕووجانو بژاری تری مەرەزەکە. هەموو درەو و خەرمان و هەموو کارەکانی تری وەك (خەلە) ئەکرا، چەڵتووك ئاشی تایبەتی هەبوو لێی (کرە) ئەکرا و ئەبووە برنجو لە کەنوو هۆڕ و هەمانە و تووڕەکەدا هەڵئەگیرا. بەڵام لۆکە ئەچێنراو دوای بژار ئاوو خزمەتکردنو پێگەیشتن (قۆزاخەتەقین) ئەچێنرا ئەکرایە فەردە و ئەشێلرا و قەبلاخ ئەنرا بۆ فرۆشتن، تووتنیش دوای چاندنی بە شەتڵ لە شەتڵگە و لێدانی لە دێراوەکاندا و خزمەتکردنی تا پێگەیشتن چین چین (بن گەڵا، ناوەڕاست، سەرگەڵا) گەڵاشکێن ئەکرا و بە شەڵتە ئەهێنرایە بن کەپر و بە (سیخو شریت) لێ ئەدرا و لە (چەرداخ) ئەدرا بۆ وشکبوونەوە دواتر ئەخرایە (زینان) بۆ خاوبوونەوە و لە قاڵبدانی لە سندووقی داردا، دواتر گونیە تێگرتنی کە پێی ئەوترا (فەردەتووتن). لۆکە و تووتن ئەدرانەوە بازرگانە کشتوکاڵییە ناوخۆییەکان لەجیاتی (سەلەمو سوو)ی زستان کە چەندین فێڵیان لێ ئەکردن لە کێڵانی زەوییەکەوە تا نووسینی قەرزەکانو کێشانەی بەرهەمەکە و نرخەکەیدا، بە هەمان شێوەی دەرەبەگ و سەرکارەکانیان و لە کۆتاییدا زۆرجار بە قەرزاری ئەمانەوە، زۆربەی ئیشەکان بە (گەلەجووت، دەسەوام، گەلەدرەو) ئەکران، فرۆشتنی (ماست، دۆ، هێلکە، تەماتە، بامیە) تا کۆتایی شەستەکانیش نەنگی بوو.

سەبارەت بە بەروبوومی ئاژەڵی شیری (مەڕ و بزن و مانگا) ئەکرایە ماست و ئەژەنرا (ئەکێزرا) کە کەرەسەکەی پێکهاتبوو لە (سێپا، گوریس، ئەرخورد، دۆژەنکە، مەشکە، هەنگڵ، پشك، بەن)[*] ، کەرەی لێ جیا ئەکرایەوە و بە ڕۆنی ئەیانکردە (هیزە و هیزۆڵکە) بۆ زستانو دوای جیاکردنەوەی بەشی خۆیان و دراوسێ لە دۆ (دۆوشکە،/ کامکە، خەستە، دۆینەیان) لێ دروست ئەکرد. لە بواری ئاژەڵیدا ئیشەکانی (شوان، گاوان، بەرخەلەوان، گوێرەوا، نۆرەڕان، نۆرەگا) هەبوو. بۆ پاراستن لە مێرووە زیانبەخشەکان و نەخۆشی پەنایان ئەبردە بەر (پاسەچۆلەکە و بەراز بە تەنەکە لێدان، داهۆڵ، چاوەزار، دەمبەس، قورئان هەڵواسین، دەمی گورك بەستن) بە دۆعا و خوێندن بەسەر چەقۆدا. ڕۆڵی ژن لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا بەهۆی پیاوسالارییەکی توندەوە لە کۆمەڵگەی کوردەوارییدا زۆر قورستر بووە، واش هەمیشە بە کەمتر سەیرکراوە لە پیاو. هەر لە کاتی دایکبوونییەوە جیاوازی کراوە، پێیان ناخۆشبووە کچیان بووە، وەك کوڕ ئێشکیان بۆ نەگرتووە لە دژی (شەوەگرتن) هەر لەسەر بێشکەوە کە پێکهاتبوو لە (لانکە، دەسرازە، دۆشەك، بلوێر، سەرین، سەردڵە، تەتکەو موروو زڕزڕە)[**] یان لە مێلوو جۆلانەدا بە گەورە و بچووك ئەدرا بە شوو، فامی ئەکردەوە ئەبووە کارەکەری ماڵ لە نانکردنەوە بە (ساج، سێکوچکە، تەشت، ماگە، دەرخۆنە، سەردۆڵە، کوانوو) تا چێشتکردن، ئاو، تەپاڵە، پووشکەهێنان، ئاژەڵ دۆشین، گەوڕماڵین، کادان، مەشکەژەندن، تەشی، تەون، پێستەخۆشکردن بۆ کەرەسەی ئاو و دۆ، دەساڕ، سەنێرکۆکردنەوە بۆ تەپاڵە دروستکردن، هەر هەموو ئیشی ماڵ لەگەڵ ئیشی دەشت لە (کێشە، گێرە، بژار، لۆکەچنین، تووتن لێدان) لەگەڵ ئەوەشدا مافی ئەوەی نەبوو بخرێتە بەر خوێندن یان بە نابەدڵی ئەدرایە (پیاوی پیر، ئامۆزا) بە شیربایی یان ژن بەژن و سێ بەگایی، سەر بە هەوێ کە زۆرجار تەڵاق یان تەڵاق بە تەڵاقی لێ ئەکەوتەوە بێ گوێدانە حەز و ئارەزووی خۆی و لانەوازبوونی خۆی و منداڵەکانی و پارە پێوەبەستن لە کاتی تەڵاقداندا، جگە لە کێشەکانی (خەسوو، خەزوور، باوەژن، باوەپیارە، هەوێ، دش، هێوەرژن). سەرباری لە لێدان و سووکایەتی جۆراوجۆر لە گفتار و کرداری پیاودا کە زۆر جار ئەوترا (سەگ بە ژن ناوەڕێ) یان (ژن دووانیان بە شایەتێك ئەژمێردرێ)، جگە لە

کوشتن، خۆکوشتن، خۆسووتاندن، خۆخنکاندن، منالْ جێهێشتن و دەیان زولْم و ستەمی دیار و نادیار و هەست پێنەکراو هەبوو کە بێگومان نیشانەی نەزانین و هۆکاری سەرەکی دواکەوتنی کۆمەڵگەی کوردەوارییە لە شارستانییەت و جیهانی ئەمڕۆدا (قانع، ٢٠١٤، ص٤١١).

## باسی پێنجەم: کەلەپوور و کەلتوور و فۆلکلۆری کورد

کۆتایی وەرزی پایز (گەڵاڕێزان، سەرماوسۆڵە و بەدوایدا، زوقم، سیخچە، سەهۆڵبەندان، باوباران، بەفر، تەمومژ، کەوەڕۆژ، تەمو تەمەلوول) دەست پێئەکرد و تا رادەیەك کاتی پشوودان بوو. کاتەکانی بێ ئیشی رۆژانەیان بە (راوەماسی بە سەبەتە، قولاپ، تۆڕ، ژاڵ، راوی پۆڕ، کۆتر، چۆلەکە، ریشۆڵە، سۆنە، قاژ، قاز، .. هتد) بەدەست یان کولێت یان فاقە و تەڵە یان تاپڕ و ساچمەزەن یان شەوارە و راوی (رێوی، بەراز، کەروێشك) بەسەر ئەبرد یان بە یارییەکانی (گولێن، نانێن، سێباز، کێلوبەرد، سێڕسکێن، هەڵماتێن، شێروخەت، لگاو، زۆرانبازی، گوریس بچڕکێنە) لە رۆژدا و (چاوشارکێ، گەنم گرد و جۆ بڵاو، باڵەکەی شلیقەدەرە، کلاوێن "پشکیلان"، مەتەڵ، رازی بەربەرۆچکە، ئێشکگرتنی منالْ، شەوگەڕ ماڵەومالْ، گۆرانی، سۆز، هۆرە، کۆڕی زیکر و خەنجەرو زەرگ لە خۆدان و ئاگر و شووشە خواردن، قسەی نەستەق، شیعر و شانامە، بەیتو بالۆرە، ناو و ناتۆرە وتن بە یەکتر و خەڵکدا و خوێندنەوەی پەرتووك و نامیلکەکانی (قانع، میعراجنامە، رۆستەم و زۆراب، شیرین و فەرهاد، لەیلێ و مەجنوون، مەلای مەزبوورە، خورشیدو خاوەر، ئەمیر ئەرسەلان) جگە لە کادانی وڵاخ و ئاژەڵ. سەرچاوەی خوێندن تەنها مەلاکان بوو، سۆفیگەری و دەروێشی باو بوو شێخەکانی وەك (قادر قەمچی رەشی سۆڵە، شێخ بابە رەسووڵی توران، شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزان، شێخ ئەحمەدی باخەکۆن) رابەرایەتییان کردوون لە رێگەی خەلیفەکانیانەوە لە ناوچەکاندا. وردەواڵە فرۆش بە زەمیلەوە ئەگەڕان، سەرتاش، خەڕات، چەقۆتیژکەر، هەلاج، مزگەری گەڕۆك هەبوون، هەجیجی (تەشی و شانەی داریان ئەهێنا و بنێشت بە پەڕۆ. لە گوندە ناودارییەکانەوە بارە داریان ئەهێنا بۆ فرۆشتن. دەهۆڵکوتو زوڕناژەن لە ئێرانەوە ئەهاتن بۆ شاییەکان پێیان ئەوترا (لۆتی). قەرەج هەبوو، عەرەب بە حوشتر خورما و

خوێیان ئەهێنا بۆفرۆشتن، پارە بە روپیە و شەکر و چا بە ئیزرەم و ئەلیرەم، قوماش بە یاردە ئەژمار ئەکران. چەکی ئەو سەردەمانە (خەنجەری دەبان، ساچمەزەن، ماوزەڕ، دارداش، حسکە، سێ تیر) بوو. لە سەرەتای شەستەکاندا تفەنگی (یانزتیر، هۆڵەندە، برنەو، تاپڕ، سیمینۆف، کلاشینکۆف) دەرکەوتن و دەمانچەی (چواردەخۆر، لامە، کەندە، دەتیر، ستار) پەیدابوون. پلەو پایە کۆمەلایەتییەکانی ئەو سەردەمە (مەلا، فەقێ، شێخ، خەلیفە، دەروێش، دێوانە، سۆفی، ئاغا، بەگ، خان، سەرخێڵ ، سەرکۆمار) بوون. ناوەکان زۆری کوردی بوون وەك (خانزاد، زلێخا، ئالتوون، خەمە، پەریزاد، پیرۆز، ئاسکە، شاسوار). دەنگ و جووڵەی مرۆڤ و ئاژەڵەکان ناوی جیاوازیان هەبوو، وەك (قیڕە، قووقە، جریوە، سەرین، لوورە، هۆڵە، قاڕە، باڕە، قیژە)، زاراوەی (رەوت، نەرمەغار، غار، سمکۆڵان، مێشە) بۆ شێوازی بەرێگاڕۆشتنی ئەسپ و ماین و کەر و هێستر و ولاخ بەکارئەهێنرا. یاری منالانیش (هەڵەمەقۆ، هەلووکێن، ماقلە، ماچەقولە) بوو. نەخۆشییەکانی ئەو سەردەمە جگە لە هەژاری و بێکاری و نەزانی و نەخوێندەواری و دەمارگیری و دابو نەریتی کۆمەلایەتیی چەقبەستوو، چەندین نەخۆشی جەستەیی و دەروونیی تر هەبوون وەك (لەرزوتا، گرانەتا، سێوەڕۆ، سوورێژە، چاوەقووڵە، ئاوڵە و زلزڵە، بەچەوازی، گلاراو، بالووك، دڕکەومێکوتە، خەرکانە، باژێلە، سیل، سێوەڕۆ، ئاوبەن، شڵی، مێخەکە، ناوککەوتن، سووزەنەك، ئێسقای تەپڵ، شێتی، شەل، کوێر، خێل، کەڕ، لاڵ، گۆج، گەڕ، کەچەڵ). نۆڕینگە و کلینیکەکانیان تەنیا (دۆعا و نوشتەی مەلا و چوونە سەر ماڵ و مەزارگەی شێخو سەید، کە بەپێی بیرو باوەڕیان هەریەکەیان چارەسەری نەخۆشییەك یان چەند نەخۆشییەکیان گرتووەتە ئەستۆی خۆیان و لە زۆربەی گوندەکان مەرقەد یان نەزرگەیانی هەیە تا ئێستاش لە شارەزووردا ماون، وەك (کامیری حەوت بەیاخ لە گرێزە، مەحموی سرواڵە لە نزیك مووانی مەلا تایر، خدری زیندوو لە سواری، گۆڕی کەوەسوار، ئەسحابەدرێژ، نەزەرگەی شێخ حەسەنی قەرەچێوار لە سەراوی سوبحان ئاغا، شێخ برایم لە قلرخی خواروو، سەید سادق لە سەر شاخی سەید سادق، حاجی عبداللە لە نزیك گوندی ناوگردان، شێخ سەرەف لە کێلەکەوە و، پیر ئازیز لە دۆڵی گەلاڵ) جگە لە میری سوور و شێخ محەمەدی تەڕاتەوەن، کە لەسەر

سنوری خورماڵ و پێنجوێن سەید صادقدان. هەروەها بەکارهێنانی (مورووەتانە و سـەنگەڵی دار) هەڵواسـینیان بـەلای چـاودا بـۆ چاویەشـە. لـە گۆرانییـە فۆلکلۆرییەکانیش هاواریان بۆ ئەکەن بۆ نموونە ئـەڵێن: (یـا سـەی سـایەق بـەرەو ڕووت هاتم – بمکەیتە جووتیار باوکەکەی فاتم)، یـان ئـەڵێن: (بـەو سـەی سـایەقە بـەو مـیری سـووره – دڵەکـەی مـن بـۆ تـۆ وەکـو تـەنووره). گـرنگترین بـیرو بۆچوونەکانی ئەو سـەردەمە کـە تـا ئێسـتاش هەنـدێکیان مـاون و ئـەکرێت پـۆلین بکـرێن بـۆ (فەلەکناسـی ، ئەفسـانە ، داب و نـەریت ، ئـاین ، خورافـە ، پاراسـیکۆلوژی) هەرچـەندە هەنـدێکیان تێهـەڵکێش و تەواوکـەری یـەکترن لـە بوارەکاندا کە ئەکرێت بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلین بکرێن :

**یەکەم: لە بواری فەلەکناسیدا :**

١- دەمدان لە ئەستێرەناسیو ناوی ئەستێرەکان وەك: (لەیل و مەجنوون، کاروان کوژە، گەلاوێژ، کۆ، حەوتـەوانان، ڕێـی کـاکێش، شـایەن و تـەرازوو)، (احمـد، ٢٠٠٨، ص١٣٤).

**دووەم: لە بواری تێکەڵکردنی ئاین و خورافاتدا :**

٢- جنۆکە، خێو، دێو و درنج، مێردەزمە، مۆتەکە.

٣- دەمی گورگ بەستن لە ئاژەڵێك کە شەو نەهاتبێتەوە بەخوێندنی دۆعایـەك بـە دەمی چەقۆیەکدا..

٤- هەڵواسینی دۆعای دەمبەست و قورئـان لـە کێڵگەکانـدا بـۆ ڕێگـری لـە دزی و دەرد و بەلآ.

٥- نوشتە و جادوو بـۆ نەخۆشـی، منـاڵبوون، چـەوری و شـیرینی، نیـاز، بـەخت، ڕەشکردن و ڕازو نیازی هەمەجۆر.

٦- خوێندنی ئایەتەلکورسی بەسەر نیشانەدا بۆ نەپێکانی.

٧- دۆعای گوللەبەن، بۆ ئەوەی ئەو کەسە گوللە نەیبڕێ.

٨- دۆعای چاوەزار، یان هەڵواسـینی ناڵەکـەر ، یـان کڵانـە و کوژەکـەی کـەوە لـە دژی چاوپیسی.

٩- قۆچو حەوتم کردن بە سەربڕینی ئاژەڵ بۆ پەڕینەوە لە پردی سیرات بە کـۆڵی ئەوان.

١٠- شەوی بەرات و نوقڵ بەخشینەوە و، هەردوو جەژنی رەمەزان و قوربان و چێشت لێنانی بەیانیانو گەڕان و گەردن ئازایی و جەژنانەی منداڵ و یاریکردن.

**سێیەم : لە بواری داب و نەریت :**

١١- تەقەکردن بەسەر منالّی بەچەوازی کردوودا.

**چوارەم لە بواری ئەفسانە :**

١٢- قبوڵ بوونی هەموو نیازەکان لای خوا بە بینینیی لێکدانی ئەستێرەکانی (لەیل و مەجنوون) .

**پێنجەم : لەبواری پاراسایکۆلۆجی:**

١٣- دەروێشیو سۆفیگەری و حاڵ لێهاتن و زەرگ و خەنجەر وەشاندن و ئاگر و شووشە خواردن.

**شەشەم : لە بواری خورافاتدا :**

١٤- رژانی ئاوی گەرم لە بێ وەختدا ئەبێتە هۆی کوشتنی جنۆکە و دوژمنایەتی.

١٥- شەوەگرتنی منالّ بە تایبەتی کوڕ و ئێشك گرتنی لە حەوت رۆژی یەکەمدا.

١٦- روودانی بوومەلەرزە بەهۆی ئەوەی زەوی لە سەر پشتی گایەك لە دەریادا بێ پەیدا وەستاوە و گاکەش لەسەر پشتی ماسییەك و بە جووڵانەوەی ماسییەکە بوومەلەرزە روودەدات.

١٧- تەپڵ و دەف و تەنەکەلێدان و تەقەکردن بۆ بەردانی مانگگیران، کە گوایە کافر گرتوویەتی.

١٨- بە شووم دانانی خوێندنی بایەقوش، لوورەی سەگ یان خوێندنی کەڵەشێر لە ناوەختدا.

جگە لە چیرۆکی ئەفسانەیی وەك (تیتیلە و بیبیلە، پیرقرۆڵی داران، میر هەمزەی عەرەب، مام رەمەڵانە، گورگەشەوێ، هەلووربلوور) [*]، هەزاران قسەی نەستەقو پەندی پێشینانی وەك (قسە هەزارە یەکی بەکارە)، (چی بچێنی ئەوە ئەدووریتەوە) و (شەڕکەر ئاشتیت لە بیربێت) و (ئەو کەسە کەسە ئەلفێکی بەسە)و (ماڵی خۆنەخۆر بۆ چەکمەبۆر)، هەزاران مەتەڵ وەك (سەری هەسانە و بنی قورئانە) ( قارچکە)، (هەتا مردن لێت نابێتەوە) ( ناو)، (هەر ئەرۆی لێت جێ

ئەمێنێ) (جێ پێ)، (قەڵای گەچین ڕێی نییە تێی چین) (هێلکە)، (هەڕ لە هەڕاو، بن لە قوڕاو، چۆغەلەبەر، نوقوڵ لەناو) (چەڵتووك و برنج)، (حسن، ٢٠٠٣، ص٦٧).
جگە لە هەزاران هۆنراوەی میللیو هۆرە و گۆرانی کە گوزارشتن لە شێوازی ژیانیان. ئەوتریێ کورد دایە گەورەی مرۆڤایەتییە، داهێنەرترینیانە، بەڵام خۆی تا ئێستا لە قۆناغی خێڵ و خورافاتدایە، بە چەقبەستوویی ماوەتەوە، چونکە نەیتوانیوە مێژووەکەی خۆی تۆمار بکات، ئێستا چەند لە دەرگای وەچەکانی خۆی لە ئەورووپاو ئەمەریکا و جیهان ئەدات، نایناسنەوە، چونکە ناسنامەی پێ نییە کە مێژووەکەیەتی (ئوچ ئالان، ٢٠٠٣، ص٢١، ٣٥٧-٣٧٢). ژیانی کورد چەند سەخت و پڕ ڕەنج و خوێناوی بووە، فەرهەنگ و کەلەپوور و کەلتوور و فۆلکلۆرەکەشی وەك سارا و دەریای بێ پەی وایە، هەتا چاو بڕکات سەرەتا و کۆتایی دیار نییە و نووسەر ون ئەکات، هەرچییەك بنووسێ هەر کەمە ناگاتە مشتێك لە خەرمانێك یان دڵۆپەیەك لە دەریایەك. جگە لەوەش ناتوانێ هەموو ڕاز و نیاز و گفتار و کردارەکان بە ڕوون و ڕاشکاوی بنووسێ و دەرگای هۆر و هەمانە هەڵتەقێنێ و هەرچی ژێر بەڕەیە بیخاتە سەر بەڕە بە چاك و خراپیەوە، بەهۆی دواکەوتن و چەقبەستوویی و دەمارگیری و پەرچەکرداری نەرێنی تاك و کۆمەڵگا، با ڕاستی و گوزارشتیش بن لە ڕەوتی ڕۆژگار، ڕەوڕەوەی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی فەرهەنگیمان لە ڕابوردوودا، بۆیە نەك هەر نەیتوانیوە هەرچی بینراو و بیستراو و هەستپێکراوە جگە لە نادیارەکان تۆمار بکات و بیکاتە قەواڵە و بەڵگە بۆ ناساندنو سەلماندنی خۆی لە جیهانی ئەمڕۆدا بۆ ئەوە مافخوراو و ڕەنج بەزایە نەبێت، بەڵکو ئێستاش هەر بە دەستی خۆی ئاگر بە ماڵی خۆیەوە ئەنێ. بێگومان کەلەپوور و کەلتووری شارەزووریش مشتێکە لە خەرمانی کەلەپووری کورد، خۆشی بۆ ڕەنجەڕۆیی خۆی ئەڵێت:

**چەند ساڵ چەند مەینەت چەند خاکەساری**
**بووم بە شوانەکەی شەرت نادیاری**
**لە داری دنیا نەحەسامەوە**
**ساتێ بە بێ خەم سەر نەنامەوە**

**ئەنجام:**

١- کورد لە نەتەوە دێرینەکانی سەر گۆی زەوییە، مێژوویەکی دوورو درێژ و پڕ لە چاك و خراپی هەیە، بەڵام نەیزانیوە یان نەیتوانیوە لەبەر هەر هۆیەك بێت بینووسێتەوە و بیکاتە بەڵگە و ناسنامە و بەرگری لە مافەکانی خۆی پێ بکات لە ناوچەکە و جیهاندا.

٢- تا ئێستاش کورد نرخی کەلەپوور و کەلتوور و فۆلکلۆرەکەی خۆی نازانێت، بە دەستی خۆی لەناوی ئەبات یان ئەیفرۆشێ، لەجیاتی کۆکردنەوە و پاراستنی.

٣- تا ئێستاش کورد لە بارودۆخێکی یەکجار دژواری (سیاسی و دیبلۆماسی و سەربازی و ئابووری و کۆمەڵایەتیو زانستیو فەرهەنگیو کەلتووریدایە و خۆی داوەتە دەست قەدەر لەم جیهانە خێرایەدا.

**پێشنیازەکان:**

١- هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی زیاتری کەلەپوور و کەلتوور و فۆلکلۆری کورد و رزگارکردنیان لە لەناوچوون، چونکە وەکو ناسنامەی کەسێتیمان پێ نەبێت و کەس نەمانناسێ وایە.

٢- ڕێگرتن لە بازرگانیو قاچاخچییەتی بە شوێنەوارەکانەوە و دانانی سزای گونجاو بۆ ئەنجامدەرانی.

٣- دانانی لیژنەی پسپۆڕ لە هەر ناوچەیەك بۆ کۆکردنەوە و تۆمارکردنی ئەوەی تا ئێستا تۆمار نەکراوە و دەماودەم ئەگێڕدرێنەوە و تەرخانکردنی بودجەی گونجاو بۆیان.

٤- هاندانی رۆشنبیران و نووسەران و خەمخۆرانی ئەم بوارە بۆ نووسینی هەرچی نەنووسراوە و کۆکردنەوەی ئەوانەشی بە پەرشو بڵاوی لێرەو لەوێ نووسراوە و رزگارکردنیان لە لەناوچوون، لەبەر ئەوەی موڵکی گشتی گەلەکەمانن.

## لیستی سەرچاوەکان

**یەکەم / دیدەنی :**

١- ئاڵتون قادر ئیسماعیل، خەڵکی گوندی سەراوی سوبحان ئاغا، لەدایکبووی ١٩٣٦.
٢- هاوار والی حەمە عەلی، لە دێی سەراوی سوبحان ئاغا ، لەدایکبووی ١٩٧٥ .
٣- فاتمە سابیر نادر ، لە دێی سەراوی سوبحان ئاغا ، لەدایکبووی ١٩٥٦.
٤- قادر مەحموود مارف، خەڵکی گوندی سەراوی سوبحان ئاغا، لەدایکبووی ١٩٢٤.
٥- کەریم ئەحمەد مەحموود ، خەڵکی سەراوی سوبحان ئاغای شارەزوور، لەدایکبووی ١٩٢٩.
٦- مەحموود ئەحمەد فەتاح، خەڵکی گوندی کەچەڵی ناوچەی شارەزوور ، لەدایکبووی ١٩٥٤.

**دووەم / کتێب بەزمانی عەرەبی :**

١– اوچ ئالان، عبدالله، ، من الدولة الكهنة السومرية الى الحضارة الديموقراطية، ج١–٢، مطبعة السالمي، ط٢، (بغداد: ٢٠٠٣) .
٢– احمد، كمال مظهر، كركوك وتوابعها حكم التاريخ والضمير، ج١، (السليمانية : د.م).
٣– احمد، كمال مظهر، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر ، (بغداد :١٩٨٥).
٤– بابان، بختيار مصطفى، احصاء الأراضي في محافظة السليمانية، (السليمانية: ٢٠٠٧).
٥– رشيد، ياسين محمود، الاستثمار والاسكان بين النقد والواقع، ط١(اربيل :٢٠١٦).
٦– الحموى، ياقوت، معجم البلدان، المجلد الثالث، ( لايبرغ: ١٨٦٨).
٧– الحفيد، صلاح الدين محمد، الوضع الاقتصادي في العراق وأهم مشاكله، الجزء الأول، اقتصاديات محافظة السليمانية، (السليمانية:١٩٩٢).
٨– خصباك، شاكر، الأكراد، دراسة جغرافية اثنوجرافية، دار العربية للمطبوعات، (بغداد:٢٠٠٥).
٩– غفور، عبدالله، 2005، التشكيلات الإدارية في جنوبي كردستان، سليمانية .
١٠– فهد، بدرى محمد، تأريخ العراق في العصر العباسي الأخير (1258-1157)م، بغداد:١٩٧٣).
١١– مودەریس، مەلا عبدولكەریم، دیوانی مەولەوی، انتشارات كردستان، چ ٢، سنه: 1389).
١٢– مراد، خليل علي، تاريخ العراق الاداري والاقتصادي في العهد العثماني الثاني -1750) (1638م، رسالة ماجستير غير منشورة، (كلية الاداب، جامعة بغداد ،١٩٧٥).
١٣– نوار، عبدالعزيز سليمان، تاريخ العراق الحديث في نهاية حكم داود باشا الى نهاية حكم مدحت باشا، (القاهرة:١٩٦٨ ).
١٤– ولستيد، جيمس ريموند، رحلتي الى بغداد في عهد الوالي داود باشا، ترجمة وتعليق: سليم طه التكريتي، ( بغداد: ١٩٨٤).

١٥- الوقائع العراقية، العدد 3175 في 22/10/1955)، قائمقامیەتی قەزای سەید سادق.
١٦- الدليل العراقي الرسمي لسنة 1936.
١٧- فرع المنطقة الزراعية في ناحية شهرزور، قسم الأراضي، 2006.

**سێیەم / کتێب بە زمانی کوردی :**

**١-** قانع، بورهان، دیوانی قانع، ( تاران، 2014).

**چوارەم / گۆڤار بەزمانی کوردی:**

١- احمد، محمود كريم، هەندێ لە مەتەڵە باوەکانی سەراوی سوبحان ئاغای شارەزوور، گۆڤاری کەلەپووری کورد ، ژمارە (٢٠)، (سلێمانی: ٢٠٠٨).
٢- باوەڕ ، ئەحمەد، کورتەیەك سەبارەت بە هۆزەکانی ناوچەی کەلار و دەوروبەری، گۆڤاری کۆچ، ژمارە (5)، (سلێمانی :٢٠٠٦).
٣- حەسەن، ئەحمەد، ئەستێرە و ئەستێرەناسی لە فۆلکلۆری کوردەواریدا، گۆڤاری کەلەپوور، ژمارە 17، ( سلێمانی: ٢٠٠٣).

## ملخص البحث

# دور الثقافة والتراث والفولكلور في التنمية الاقتصادية الزراعية والاجتماعية لناحية شهرزور

**أ. محمود كريم احمد**
الجامعة التقنية في السليمانية
المعهد التقني في بكرجو

أجريت هذه الدراسة في حدود المنطقة التي سميت بناحية شهرزور لغاية عام ٢٠٠٧، وتبعد 53 كيلومترا شرق محافظة السليمانية، وكانت مساحتها 341.4 كيلومتر مربع، وتضم 26 مقاطعة زراعية وحوالى 69 قرية، هدمت جميعها في نيسان عام 1988بسبب الاقتتال الداخلي والحرب العراقية – الايرانية، وتم ترحيل أهلها الى مجمعات (نصر وباريكه) السكنية قرب ناحية تانجرو (عربت). واعتمد الباحث للوصول الى الاستنتاجات على نفسه وخبرة عيشه أكثر من 64 سنة من العمر هناك وروايات الوالد والوالدة والاشخاص المسنين في القرية والمنطقة، اضافة الى الاستعانة بالكتب العلمية والمجلات المختصة بهذا الموضوع وديوان الشعراء كـ (قانع ومولوي). وقد اشتملت الدراسة على خمسة مباحث، وقد غطى المبحث الأول تأريخ وجغرافية ناحية شهرزور، أما الثاني فقد اختص ببحث الجانب الديموغرافي والاثنوغرافي للمنطقة، في حين كرس الثالث لدراسة البيئة الطبيعية لها، والرابع تتعلق بالاوضاع الاقتصادية والاجتماعية خلال العقود المنصرمة من القرن العشرين. اما الخامس يضم الثقافة والتراث والادب الكردي . هذه الوسائل كان لها دور في تغيير الحياة من مراحل الترحال الى مرحلة الاستقرار وكذلك في الثورة الزراعية الاولى وتنمية المجتمع والاقتصاد الزراعي في كردستان وفي جميع مراحل تطور المجتمع لاحقا ولحد الآن في المنطقة . واظهرت النتائج ان الكورد يملكون الخزينة الكبيرة من الثقافة والتراث والادب الا انهم لم يتمكنوا من استغلالها كمستمسك لاثبات هويتهم وضمان حقوقهم بها في المنطقة والعالم.

# Abstract

## The role of culture, folklore and heritage in the development of the agriculture economy and social aspects of Sharazur.

**MahmodKarem Ahmad, lecturer,**
Polytechnic University of Sulaimaniyah, BakrajoTecnical Institute

This study was conducted in the border of the area which was called Sharazwur during 2007, and 53 kilometers away from east of Sulaymaniyah, with area 341.4 $km^2$. The area consists of 26 agricultural land and approximately 69 villages in which they were destgroyed during 20/4/1988, due to an internal and Iran-Iraq war and their residences forced to leave and resided in the territory of (Nasir and Barika) Near Arbat city. This study is the result of more than 64 years of my life in the study area as well as my parents, the elderly people, the scientific books, booklets and magazines, poets of (Qanih and Mawlawi). This study including five parts, history, and geography of the study area, growing population and autobiography, natural environment, economy and society, and culture, folklore and lore of Kurds,. These materials had an effective roles in life change from immigration to settlement stage . Also, it had roles in first agricultural revolution , development society and agriculture economic of Kurdistan in all human development stages until now in the region. Finally, it can be concluded that Kurds owns a rich treasure, but they could not take advantage of this long history in order to make evidence to prove their rights in the world.

Keyword: Kurd, culture, lore, folklore, Sharazur

# مراحل سلوک عرفانی «مم» از چشم انداز هفت مرحله سلوک در آیین مهری

**جیهاد شکری رشید**
**دانشیار گروه زبان فارسی-دانشگاه صلاح‌الدین/اربیل**

**مقدمه**

«مهرپرستی» آیین اقوام آریایی بود که ریشهٔ آن به قرن ها پیش از مزداپرستی و ظهور زرتشت می رسد و مهر همان روح انسانی است که وقتی بر نفس اماره و حیوانی فایق آید، از هواهای نفسانی آزاد شده و به آسمان معنوی عروج می‌کند (مسکوب،۱۳۵۰: ۸۸). مثنوی "مم و زین" نمونهٔ بارزی از ماهیت وجود شناختی عرفانی است که در این روایت روح «مم» در هر دو جهانِ محسوس و غیرمحسوس به صورت دو قطب تجربه ظهور می‌یابد، زیرا زیست او در هر دو جهان متجلی است: در جهان محسوس به عنوان موجودی متعین که هر وجودی را سوای وجود خدا نفی می‌کند و می خواهد هر نوع فاصله ای را که بین او و خدا است طی نماید، و در جهان غیرمحسوس به عنوان یار خدا که تجربه روحانی به او امکان می دهد که از حد جهان حس فراتر رفته و در سیر خود به سوی پروردگار به نهایت حدآگاهی برسد که در آن قدرت عمل را منحصرا از آن خدا داند. مراحل و حالاتی که "مم" در تمرینات روحانی-اش به منظور نیل به کمال برای خود به آن متمسک می‌شود چیزی جز تصورات ذهنی و ماحصل پندارهای صوفیانه نیست و کلاً زائیدهٔ روح آرمان خواه و ذهن سازنده و مشتاق او به فضیلت و دستیابی به خیر محض و پیوستن به سرچشمهٔ کمال و فنا فی الله است. احمد خانی در روایت «مم و زین»، دیدگاه صوفیانه خود را از چشم انداز سلوک عارفانهٔ اسلامی بیان کرده است و تمایلات و تفکراتش را دربارهٔ عشق واقعی نمایانده است. اما در روایت مم و زین باورها و آموزه‌های صوفیانه و آنچه را در زمینهٔ سیر و سلوک و طرق وصول به کمالات معنوی در نظر داشته است و در پرورش

شخصیت «مم» نشان داده است با پاره‌ای از دقایق و اسرار سلوک مقام‌های میترائیسم مطابقت دارد. مطالعه‌ی اندیشه‌ها و گرایش‌های گوناگونی که در بینش و تفکر خانی و آیین میترایی وجود داشته است، نشان می‌دهد که تجارب عرفانی تجارب شخصی و خاص است و موضوع معرفت در هر دو سلوک، امور خارج از دایرهٔ محسوسات و قلمرو عقل؛ انتقال آن به کسانی که آن را نیازموده‌اند ممکن نیست زیرا وسیلهٔ رسیدن به این معرفت دل یا روح و یا نفس انسانی است و روح خود امری مجرد و بیرون از ادراک حس و عقل انسان است؛ بنابراین سالک پیرو هر دو آیین، با تحمل ریاضت و مجاهدت به مرحله تعطیل حواس و کشف حجاب رسیده و اموری را درک می‌کند که قابل بیان برای دیگران نیست.(۱) البته جهان بینی معرفتی‌ای که خانی در عرصه‌ی داستان نمادین خویش بیان کرده است، در حقیقت مسئله عشق است که یکی از مهم‌ترین عواملی است که منشأ پیدایش تفسیر عرفانی از طرح داستان مم و زین گردیده است. عشق از نظر خانی و بسیاری از متفکران شاعران کرد از جمله؛ فقی طیران، جزیری، محوی، مولوی و ... یک حقیقت واحد است. معنایی است که در همه موجودات عالم جاری و ساری است و بر این باورند که هر موجودی به حکم وجود از عشق نیز برخوردار است و عشق جذبه و کششی است که موجودات را در مسیر تکامل و حرکت به سوی مقصود خویش، هدایت می‌کند. از منظر خانی، سالک برای آنکه مرتبهٔ واقعی خود را کسب کند، باید مراحل مختلف را طی کند.(۲) از محسوس و موهوم که دنیای شهوت و هوی است درگذرد، معقول و معلوم را که سرمایهٔ جاه و غرور است پشت سر بگذارد و از معدوم و فانی که مایهٔ فریب و گمراهی است، چشم فرو پوشد تا به توحید واقعی که مقام فناست برسد و شایستهٔ مظهریت و خلافت حق شود. اما طی این مراتب البته آسان نیست، این راه دشوار پرخطر از میان هفت وادی که : طلب، عشق، معرفت، استغناء، توحید، حیرت و فقر است می گذرد و در مرحلهٔ آخر که مقام فنا پیش می آید، طالب خویشتن را فانی می بیند و همه حق می شود از فنای خویش به بقای حق می رسد و به کمال دست می یابد. او در مثنوی مم و زین به بیان احوال و تحولات باطنی سالک از مرحلهٔ طلب که معادل با مقام کلاغ در آیین میترایی، یعنی نخسین منزل سلوک تا آخرین قدم، یعنی فقر و فنا که در عرفان میترایی معادل با پدر است، می پردازد. نگارنده در این پژوهش

سعی بر آن دارد تا با بررسی و سپس تحلیل جزء به جزء روایت به اشارات و اندیشه‌های خانی و عوامل مؤثر تصوف و عرفان در انسجام ساختار روایت مم و زین از چشم انداز سلوک عارفانۀ آیین مهری بپردازد.

**طرح بیان مسأله:**

این تحقیق در پی آن است تا پاسخگوی این سؤالات باشد ؛

۱- آیا در مثنوی مم و زین نمودهایی از باور و اندیشه‌های عرفان مهری را می‌توان ردیابی کرد؟

۲- آیا هفت زینه مهری در هفت مقام عرفانی که «مم» در مسیر خویش طی می‌کند تأثیر داشته است؟

۳- مثنوی مم و زین تا چه حد و به چه صورت متأثر از باورهای آیین مهری است؟

**هدف، ضرورت و پیشینۀ پژوهش:**

بر پایۀ فرضیه ها و مستندات ارائه شده در این مقاله، عشق مجازی «مم» به عشق حقیقی خاتمه پیدا می نماید که از اینرو می‌توان پنداشت که سفر معنوی «مم» سفری آیینی بوده و وی در مقام سالک مبتدی به قصد انجام آزمایش برای کسب بالاترین درجۀ عرفانی، فنا، دشواری های ها و ریاضت های هفت گانۀ سلوک عرفان را متحمل می‌شود که از این منظر، سفر معنوی «مم» شباهت بسیار به سفرهای هفت گانه آیین میترایی داشته است که البته در هر دو مراحل سلوک؛ عارف یا مهر همان روح انسانی است که وقتی بر نفس اماره و حیوانی فایق آید، از هواهای نفسانی آزاد شده و به آسمان معنوی عروج می‌کند، از این چشم انداز است که سعی نگارنده بر آن است تا اندازه ای پیوستگی قابل ملاحظه ای را بین آنها در معرض دید قرار دهد و البته تا آنجایی که نگارنده مطلع است دربارۀ موضوع مورد نظر، تحقیق جامع و گسترده‌ای صورت نگرفته است و احساس نیاز به روشن شدن مسائلی پیرامون اندیشه‌های مهری در مثنوی مم و زین سبب ایجاد انگیزه پیرامون این تحقیق و در نتیجه مطالعه و بررسی موضوع مورد نظر گردید که با بررسی و تحلیل جزء به جزء روایت می‌توان به اندیشه‌های خانی و عوامل مؤثر تصوف و عرفان در انسجام ساختار روایت مم و زین از چشم انداز سلوک عارفانۀ أیین مهری پی‌برد و این نکته‌ای است که تاکنون بدان پرداخته نشده است.

**بحث و مباحث نظری**

**۱. میترا و مراحل میترایی:**

واژه مهر که «در زبان اوستایی میترا (mithra)، در پارسی باستان و سانسکریت میتره(mitra) آمده است. در زبان پهلوی به گونه میتر(mitr) دگرگون شده و در پارسی مهر گردیده است» (معین، ۱۳۸۸/ج۲) و در اصطلاح «میترا خدای روشنائی و نور و خدای موکل بر روز است. «میترا» و«وارونا» از خدایان کهن هندوها هستند و گاهی آنها را بزرگترین خدایان خوانده و با اورانوس یونیان برابر می‌دانند. میترا خداوند آبها و دریاها نیز هست و یکی از صفاتش اود-دام یعنی محاصرکننده است» (رضایی، ۱۳۷۲: ۷۲ ) زمان مهرپرستی به قرن‌ها قبل از میلاد مسیح برمی‌گردد و تا چهار قرن بعد از میلاد در سراسر گیتی کهن تداوم داشته است[۳] (ورمازرن، ۱۳۸۳: ۹۷). در واقع پارتیان مانند هخامنشیان، تثلیث، اهورامزدا، مهر و ناهید داشته‌اند و آیین مهر به احتمال قوی دین رسمی بوده ست. (گیرشمن، ۱۳۴۴: ۳۸) میترابیان به دوزخ و بهشت اعتقاد داشتند؛ به طوری که می‌توان گفت مبانی ثنویت از داده‌های این آیین است. (رضی و آمیدیانی، ۱۳۷۷: ۳۱). آیین مهر طریقتی بوده است که در چارچوب آن، پدران مهری، رهروان ویژهٔ خود را فرزند می‌خواندند در مهرابه های خود، پرورش معنوی می دادند و به پالایش روان آنها می پرداختند (همایونی، ۱۳۷۵: ۵۴) که ستون فقرات سازماندهی آیین میترائیسم، نظامی هفت مقامی بود که ارتباط محکمی با خدایان سیاره‌ها داشت. بر اساس باور فرانز کومن[۴] آسمان دارای هفت وادی، یا هفت طبقه یا قلمرو پنداشت می شد و هر طبقه یا قلمرو به نام و وابسته به سیاره ای بود. تصور، نردبانی بود به هفت پله یا هفت در که بر روی هم افراشته، رو به بالا بود و هر یک از فلزی ساخته شده که به کنایه، راه‌های رسیدن به طبقات آسمانی یا ستارگان را بیان می‌کرد. سالکی که وارد می‌شد برای سلوک باید از این درها یا پله‌ها یا طبقات عبور می‌کرد. روان در طول زمانی که این مرحله‌ها را می‌پیمود به تدریج پالایش می‌یافت. هواهای نفسانی را فرو می نهاد

و سبک‌بار می شد و از آن چه که هنگام فرود آمدن به زمین از تمایلات و غرایز انسانی کسب کرده بود به تدریج رها می شد. نیروی اصلی و محرکهٔ خود را در ماه می‌گذاشت. تمایلات و آرزوهایش را به مرکوری(Mercury) و دیگر خواست‌ها را به ونوس*(Venus)* و نیرومندی و هشیاری را به خورشید، ستیزه جویی و پیکارگری را به مارس(Mars)، آرزوهای جاه طلبی را به ژوپیتر(Jupiter) و آرزوهای دیگر را به ساتورن(Saturn) می-بخشید. چون به تدریج در هفت مرحله از گناهان و غرایز و نفسانیات تهی و عاری می شد، جور اصلی وجود وی باقی می‌ماند که در خور و شایستهٔ ورود به وادی هشتم یا (اقلیم هشتم) می شد تا در روشنایی بی کران«اَنَغر رَئو چَنگَه» مقیم شود. (رضی، ۱۳۸۱: ۵۶۰-۵۶۳) با این وجود مهریان «دارای هفت مرحله سلوک بودند که هریک از این مراحل نمایانگر یکی از فلک های هفت گانه بوده است. به اعتقاد مهرپرستان بعد از این آسمان هفت طبقه، یک طبقه دیگر نیز وجود دارد که جایگاه نور محض و روشنایی است. ارواح پس از گدشتن از هفت آسمان شایستگی می یابند که بی مانع به آسمان هشتم که جایگاه نور و روشنایی بی پایان است، برسند»(ملک زاده، ۱۳۸۶: ۱۷۴). در حقیقت آیین مهر دارای هفت مقام پرریاضت بود که عبارت بودند از:«کلاغ Corax، پوشیدهCryphius ، سرباز miles، شیر Leo، پارسی Perses، پیک خورشید heliodromus، و پدر Pater بر سالک و رهرو نهاده می شد که پیروان این آیین، همگان تکلیف داشتند در زندگی سه مقام را به اجبار بگذرانند و چهار مقام پسین، اختیاری بودند» (فرانتس کومن،۱۳۸۳: ۱۵۳-۱۵۵).از اینرو، هریک از مراحل سلوک در آیین مهری نامی داشت و در طی مسیر کمال هر یک از این پله‌ها، از معنی و مفهوم ویژه‌ای برخوردار بود که به صورت نمودار زیر میتوان نشان داد (رضایی،۱۳۷۲: ۹۰-۹۵):

| نظام هفت مقامی آیین میترائی | |
|---|---|
| **مقام اول** | مقام خدمتکاران مهرابه بوده است که بعد از انجام مراسمی به مقام کلاغ مقدس می رسیدند. |
| **مقام دوم** | مقام کری‌فیوس که برخی آنرا مقام کرکس معرفی کرده‌اند که همان پوشیدگان است. |
| **مقام سوم** | سومین منصب که مقام سرباز است. اینان سرباز مخصوص بودند که تحت امر میترا قرار داشتند. |
| **مقام چهارم** | منصب شیر بود که اینها ناگزیر از گذراندن آزمایش‌هایی بودند. |
| **مقام پنجم** | مقام پارسی بوده است که حکایت از آزادی و آزادگی بود. |
| **مقام ششم** | منصب خورشید است، کسی که به این مرحله می‌رسید در حقیقت پیک خورشید بود. |
| **مقام هفتم** | این مقام والاترین و عالی ترین درجه تشرف برای یک سالک میترایی بوده که آن را مقام پدر یا پدر پدران می‌نامیدند. |

### ۲. تأثیر آیین مهری در عرفان اسلامی:

آیین مهر در عرفان تأثیرات فراوانی برجای نهاده است. مهرپرستان بر این باورند که روان انسان‌ها از بهشت که "گروتمان" نامیده می شد به دلیل فریفته شدن در مقابل ظواهر گیتی و علایق مادی فرود آمده‌اند تا در زمین خاکی زندگی کنند. در این جریان هفت بار آلوده می‌شوند و از هفت آسمان که پایگاه هفت اخترند می‌گذرند تا بتوانند در زمین زندگی کنند و آلایش آنرا تحمل کنند. این روان‌ها از ماهپایه که دروازه مردمان خوانده می‌شده است، می‌گذرند و به زمین می‌رسند و در زندان تن گرفتار می‌شوند. این جان‌های گرفتار اگر بخواهند به جایگاه اولیه خود که همان بهشت است باز گردند می-باید که هفت بار خود را از آلودگی خاکی و تعلقات بزدایند که در این راستا می‌بایست که هفت مرحله را سپری کنند که هر مرحله دارای آزمون‌های دشواری است تا اینکه از دروازه خدایان (خورشید پایه) عبور کنند این سقوط و صعود دوباره همان است که صوفیان و عرفا از آن «قوس نزولی» [۴] و «قوس صعودی» [۵] نام می‌برند.(کزازی، ۱۳۶۸: ۱۰۷) در صورتیکه بسیاری از محققین بر این باورند که هفت وادی سلوک عارفان از

این هفت مرحله آزمون مهری دینان تأثیر گرفته‌اند. چنانچه «بازتاب هفت رده مهری در افسانه‌های پهلوانی هفت خوان را پدید آورده و در آیین‌های درویشی هفت وادی طریقت را .... رهرو خدای جوی برای آنکه بتواند از بند من و آلایش تن برهد و به رستگاری و زندگی مینوی راستین راه ببرد می‌باید هفت زینه‌ی آیینی، پیروزمند و سربلند بگذرد. هفت شهر عشق را بسپرد تا به کوی دوست راه جوید.»(رضایی، ۱۳۷۲: ۱۸۵ ) به این سبب است که می توان گفت که بدون تردید برترین اثر پذیری عرفان اسلامی از دین مهری همین هفت مرحله سلوک است. و از سوی دیگر در دین مهری آخرین مقام پیر است. پیر عالی‌ترین درجه در آیین میترا و نمایندهٔ مهر در روی زمین است. زمانی که فرد مراحل را سپری می‌کند و به مرحله پیری می‌رسد خود مریدان را راهنمایی می‌کند. همچون طریقت سلوک در عرفان اسلامی که سالک از جادهٔ طریقت به مدد شریعت به حقیقت می‌رسد و به مقام پیری دست می‌یابد و خود راهبر سالکان می‌گردد: «پیری چونان نهادی باور شناختی به فرهنگ‌ها و آیین‌های باستانی ایران بازمی‌گردد به ویژه به آیین و فرهنگ رازآمیز و نهانگرای مهری. بسیاری از بن‌مایه‌های باورشناختی در دبستان‌های درویشی از این آیین کهن به یادگار مانده.... یکی از این بن‌مایه‌ها که ارزش بنیادین و بی‌چند و چون دارد پیری است آن رهبری شگفتی که هیچ نو گرویده و سر سپرده‌ای از آن بی‌نیاز نمی‌تواند بود در آیین رازناک مهر، پیری برترین رده‌ی پیشوایی دینی است.»(همان: ۱۸۶) که «مقام پیر در تصوف و عرفان الگوی بی خدشه‌ای از مقام پتر(پدر) در آیین میترایی می‌باشد.»(رضی، ۱۳۸۱ :۵۷۳) و «پیر هرچه باشد بی‌گمان با فلسفه و حکمت مزدایی و مفاهیم اصیل اوستایی و آیین میترایی که میراث‌دار این حکمت ایران باستان است پیوندی مستقیم دارد.»(رضی، ۱۳۸۰: ۱۹۴) در مثنوی معنوی، شمس پیر و مراد مولانا است اسناد لقب شمس به معنی خورشید، آفتاب، مهر، برای استاد معنوی و پیر مولانا قابل تامل است. مولانا درباره او می گوید:

شمس تبریزی که نور مطلق است　　　آفتاب است زانوار حق است

چنانچه در مثنوی مم و زین،«مم»؛پیر و مراد «زین» است که چنین القابی به او تعبیرداده شده است و در بیت زیر بیانگر پیوند بنیادین «مم» با آفتاب می باشد و پیوستن «مم» با آفتاب از مهمترین نشانه های شباهت و ارتباط با آیین مهری است:

**فیلجــومله ژ مەرکەزا تــورابێ          ئەو ذررە گیــهانە ئافتـــــابێ**

(م، ۱۹۶۲: ۱۵۹)

دیـــــدم که ز مــــرکز ترابش          آن ذره رسـید بـه آفــتابش

(م،۲۰۱۲: ۲۵۷)

و در آیین مهری وظیفۀ مهم مهر، نظارت بر پیمان ها و نگهبانی از نظم و راستی بوده است (مینوبی خرد، پرسش ۲۶ف بند ۳۳) که در مثنوی مم و زین، این خویشکاری به «مم» نسبت داده شده است. زیرا پیمان گیتی که رسیدن به مرتبۀکمال در راستای عشق حقیقی و وصال با حق است، «مم» به خوبی ایفا می کند. خانی با توجه به لقب بخشیدن مم به لقب خورشید[۶] چنین ابراز بیان دارد:

**عیشــق ئایــینەیێ خودا نومایە          خورشید صیفەت خودان صیایە**

(م،۱۹۶۲: ۱۹۱)

عشـــق آییـــنه خـدا نمـــایم          خورشیـد صفت یـد و ضیایم

(م،۲۰۱۲: ۳۰۸)

البته مثنوی "مم و زین" را می‌توان عرصۀ یک تمثیل سترگ دانست که در یک سوی آن (جزء حسی) ماجرایی عاشقانه بین تاجدین و ستی؛ نمایان است و در سوی دیگر (جزء انتزاعی) سلوکی عارفانه میان مم و زین نهفته است. در لابه لای زیرین و رویین داستان مم و زین، اشارات و قضاوت های عارفانۀ زیادی موج می زند که از بن مایه های آیین هایی چون آیین مهری به صورتی استعاری و رمزی سود برده است. داستان "مم و زین" در باطن، با هفت وادی عطار، پیوندهای ویژه ای دارد و سفر جان و تن مم عاشق و دل سوخته را در هفت منزل عشق در عرفان اسلامی به نمایش می گذارد که این سلوک به نوعی مطابق و یادآور هفت مرحله ای است که سالک در آیین مهری طی می-کند در مثنوی مم و زین به بیان احوال و تحولات باطنی سالک از مرحلۀ طلب که معادل با مقام کلاغ در آیین میترایی، یعنی نخسین منزل سلوک تا آخرین قدم، یعنی فقر و فنا که در عرفان میترایی معادل با پدر است، می پردازد که به صورت نمودار این مطابقت را می توان در معرض دید قرار داد:

**نمودار(۲):**

**مطابقت مراحال سلوک عرفانی در آیین میترایی و عرفان اسلامی**

| مراحل سلوک درعرفان میترایی | مراحل سلوک در عرفان اسلامی |
|---|---|
| کلاغ | طلب |
| پوشیده | عشق |
| سرباز | معرفت |
| شیر | استغنا |
| پارسی | توحید |
| خورشید | حیرت |
| پدر | فنا |

### ۳. خلاصه‌ای از داستان مم و زین:

فرمانروای سرزمین بوتان، زین الدین، دو خواهر داشت به نام های زین و ستی. در روز نوروز، مم و تاژدین به قصد تفرج از شهر بیرون می‌روند و زین و ستی را دیدار می-کنند و در این دیدار مم عاشق زین و تاژدین عاشق ستی می شود. پیران قوم به خواستگاری ستی برای تاژدین می‌روند و امیر موافقت می‌کند. ازدواج ستی و تاژدین، آتش حسد را در دل بکر، حاجب امیر، شعله‌ور ساخت. در پی توطئه‌ای نزد امیر رفت و گفت: «تاژدین در همه جا شایع کرده که به زودی زین را هم به مم می‌دهیم. این خبر امیر را تحت تاثیر قرار می‌دهد و زین را از ازدواج با مم منع می‌کند.» از قضا یک روز زین‌الدین به شکار می‌رود. در این فرصت، زین و مم در باغ یکدیگر را دیدار می‌کنند و سپس امیر پس از اینکه از شکار برمی گردد، از در و پنجرۀ بازِ کاخ متوجه حضور اغیار می‌شود. زین خود را به زیر قبای مم پنهان می‌کند. اما امیر مم را می‌بیند. تاژدین هم برای انحراف ذهن امیر از وجود زین، خانه‌اش را به آتش می-کشد. تاجدین با این عمل جوانمردانه توانست توجه میر و همراهانش را به آتش جمع کند. پس همگی برای دفع آتش، سرای پادشاه را خلوت کردند. مم با حضور در محل حادثه از گرفتار شدن بدست امیر نجات پیدا میکند. پس از چندی آوازۀ عشق مم و زین همه جا را فرا می‌گیرد. بکر

ماجرا را به امیر گزارش می‌دهد. امیر دنبال صحت این خبر است. بکر بازی شطرنج با مم را به این شرط که حریف مغلوب، خواسته شخص برنده را عملی کند، به او پیشنهاد می‌کند. امیر مم را شکست می‌دهد و از او می‌خواهد که نام معشوقش را بگوید. مم نام معشوقهٔ خود را فاش می‌کند. امیر مم را به زندان انداخت. مم در آن سیاهچال، به تکمیل روحی خود پرداخت و با مناجات و چله نشینی توانست به درک عمیقی از عشق حقیقی نایل آید. تاژدین و برادرانش تصمیم میگیرند که هر سه به نزد امیر بروند اگر با آزادی مم موافقت نکرد، ابتدا بکر و بعد دیگر ستمکاران را بکشند. امیر این بارهم تسلیم نیرنگ بکر می‌شود. او امیر را به موافقت ظاهری با ازدواج آنها دعوت می‌کند و از طرفی هم امیر را به دادن جام زهر به تاژدین و برادرانش ترغیب می‌کند و سپس از امیر می-خواهد که دستور دهد زین شخصا به زندان رود و مم را آزاد کند، تا مم با دیدن زین جان دهد. امیر به حضور زین می‌رود و از کار رفته عذرخواهی می‌نماید. آنگاه اجازه رؤیت مم و ملاقاتش را به زین می‌دهد. اما زین به گریه افتاد و چنان شیون و زاری کرد که از دهان، خونابه بیرون داد و بعد از مدتی بیهوش شد. بیهوشی زین، امیر را متأثر کرد، چنان که تمام شب بر او گریست. تا اینکه در این هیاهو جوانی از در وارد شد و گفت: مم مرده است. با این خبر، زین که مرده بود، دوباره زنده شد و دید که امیر و اطرافیان، همه گریه می‌کنند. رو به برادرش کرد و گفت: برادر! تو باعث شدی تا ما به صفای باطن برسیم و سعادت ابدی را نصیبمان کردی. امیر گفت: « از ته دل پشیمان اعمال خود هستم. برخیز و خودت به زندان رو و با مم سخن بگو دوباره زنده‌اش کن» زین قبول می‌کند و خود را به زندان می‌رساند تا از حال مم آگاه شود. قبل از زین، ستی وارد زندان می‌شود و از دیگر زندانیان دربارهٔ مرگ مم می‌پرسد. جواب می‌دهند که:« فروغی از بیرون آمد؛ از سرمم نیز فروغی دیگر برآمد، این دو فروغ به هم رسیدند و با هم پیوند خوردند.» دایه و ستی به مم گفتند که برخیز یارت آمده اما مم به هوش نیامد، اما به محض اینکه زین نزد جسد بی‌جان مم می‌رسد و برقع را از سر برمی‌دارد، می‌گوید: «ای مم! با دم مسیحاییم برخیز! مم زنده می‌شود. با دیدن سیمای زین روح در جسم بی‌جان مم دمیده می‌شود». اطرافیان به مم می‌گویند: امیر تو را مورد عفو و بخشش خویش قرار داده و زین را به تو می‌دهد. مم قبول نمی‌کند و از خدا می‌خواهد که زود به بارگاهش برگردد. با این سخنان جان مم به یکباره، قالب تن را رها می‌کند و

